زنجیرە کتێبی زانست و مرۆڤ (5)





# گەردونی نادیار

## (میتافیزیك)



محمد حسین سەرگەینێلی

یەکەم چاپ ٢٠١٥



ناسنامەی کتێب


ناو : گەردوونی نادیار.

نووسینی: محمد حسن سەرگەڵێنیلی.

بڵاوکار: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی – هەولێر.

دیزاینی بەرگ: فەرهاد رەحیم

چاپ : یەکەم چاپ. ٢٠١٥






لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردن (٢٠٢)ی ساڵی (٢٠١٥ )ی پێدراوە





07504671394

mdmaktaba@gmail.com

زنجيره كتێبی زانست و مرۆڤ (٥)

# گەردوونی نادیار

(میتافیزیك)

(الكون اللامرئي)

بـه بەلگـەی قورئـانی سـوننەتی و عیرفـانی و فەلسـەفی و زانسـتی و میتـافیـزیكی و پاراسایكلۆجی بوونی گـەردوونی نادیـارو ڕوح و ژیـانی دوای مـەرگ دەسـەلمێنێت ، كـه دیوی دووەمی گەردوونه

(بەتیۆری و ڕاهێنان و كرداریەوە)

محمد حسن سەرگەینێلی

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

﴿ فَلَا أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَا لَا تُبْصِرُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾ الحاقة: ٣٨ - ٣٩

﴿ وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ ﴾ الإسراء: ٨٥

﴿ لَّقَدْ كُنتَ فِي غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَاءَكَ فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ ﴿٢٢﴾ ﴾ ق: ٢٢

(القرآن الكريم)

**(معرفة النفس انفع المعارف)**

**(الناس نيام فاذا ماتوا انتهبوا) (الامام على ﷺ)**

**(ئەو کەسەی کۆمپیوتەر بەکاردێنێ کۆمپیوتەرێك نییە ، تۆ منی ، تۆ ڕوحی)**

**(لەش وەکو ئوتۆمبیلە ، گیان وەکو شوفێرەکەیەتی)**

**(مامۆستا چوکوك سوی)** / تأملات لادراك الروح / ل:١٦.

**مرۆڤ لە لەش و دەروون و گیان پێك دێ ، لەش ئەوەیە دەیبینن ، دەروون هزرە ، گیان لەشی ئەتیرە هاوشێوەی لەشە ، ڕوح لەشی ماددی دەبەستێتەوە ، مردن تەنیا جیابوونەوەی ڕوحە لە لاشەو هزرو دەروون لەگەڵ خۆیدا دەبات.**

**(ئارثەر فندلاي / على حافة الالعالم الاثيري / ل:٢٥)**

**(زۆر لەوانەی پیشەیان ناوەندیاری ڕوحی یە قووڵبڕو فێلبازن بۆیە زۆر لە خەڵکان لە مەسەلە ڕوحی یەکان کەوتونە گومانەوە)** (القوى الخفية / انيس منصور).

## پێشەکی

## بسم الله الرحمن الرحیم

**(الحمدلله ، والصلاة والسلام علی عباده الذین اصطفی)**

**سوپاس بۆ خوای گەورە جارەکی تریش بە خزمەت خوێنەرانی خۆشەویست گەیشتینەوە لە مامۆستایان و قوتابیان و خولیایانی ئەم بوارە ئیعجازییە ، کە بریتییە لە زانستە ئیعجازییەکان بە گشتی و گەردوونی نادیار (میتافیزیک) یان پاراسایکۆلۆژیا بە تایبەتی ، لە ئاستێکی بەرزی ئایینی و فەلسەفی و عیرفانی و میتافیزیکی قووڵدا خستوومانە ڕوو بۆ پیشاندانی دیوی دووەمی گەردوون ، دوای ئەوەی لەبەشەکانی ڕابردوو تەنیا دیوی دەرەوەمان پیشاندا بە گشتی ، بەناوی گەردوونی بینراوەوە ، وەکوو (گەردوونناسی ، زەوی ناسی ، گەردیلە ناسی ، ... هتد) ، بەم هیوایەین لە ئاستی تێگەیشتنی خوێنەرانیدا بێ ، بەتایبەتی پسپۆڕان و قوتابیانی ئەم بوارە هەستیارو گرنگە ، توانیمان کەلێنەکی گەورەی کتێبخانەی کوردی لەم بوارەدا پڕ بکەینەوە ، ببێتە سەرەتاو دەسپێکێ بۆ چوونە ناو دەریای قووڵی ئەم زانستەوە .**

**قورئانی پیرۆزیش گەردوون بە دیو ناو زەد دەکات (بینراو) (نەبینراو) :** ﴿ فَلَآ أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَا لَا تُبْصِرُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾ الحاقة: ٣٨ – ٣٩ **، واتە : سوێند دەخۆم بەم شتانەی دەبینرێن نابینرێن .**

**یان دەفەرمووێ :** ﴿ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ﴾ المؤمنون: ٩٢ **، واتە : زانای جیهانی نادیارو جیهانی بینراو.**

مەبەست لەدونیای بینراو ئەو جیهانانەن بە پێنج هەستەکان پەییان پێ دەبردرێ . بەلأم دونیای نەبینراو ئەو جیهانانەن بە پێنج هەستەکان پەییان پێ نابردرێ لە جیهانی (نەست – اللاشعور) و خەون و ئیلهامدا نەبێت کە چاوی دڵ تێ یاندا هۆشیارە ، ﴿ مَا كَذَبَ ٱلۡفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ﴾ النجم: ١١ .

(جیهانی نەبینراو) ئایین و فەلسەفەو عیرفان و میتافیزیکی کۆن و تازە قسەیان لەبارەکردووە ، سەرباری زانستی نوێ لەچەرخی تەکنەلۆژیادا .

(ئایین) بریتییە لە پەیامی ئاسمانی بۆ ڕێنومایی مرۆڤ ، کە بە پاکژی لە ڕێگای فریشتە بالأکانەوە گەیشتۆتە دڵی ڕەوانەکراوانی خوایی : ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ ﴾ آل عمران: ١٩ .

بەلأم (عیرفان) درێژە پێدەرو پاڵپشتی یە بۆ پەیامی ئاسمانی و سەلمێنەری ئەم حەقیقە تانەیە ئایین هێناویەتی ، بە ئیلهام و کەشف و شوهودو کەرامەتەکان ، بەلأم (فەلسەفە) بریتییە لە لێکدانەوەی چەمکە هزرییەکان ، عەقڵ ڕاڤەو شرۆڤەیان بۆ دەکات ،وەکو بوونی خوداو پێغەمبەرایەتی و پاشەڕۆژ لە ڕێگای هزرەوە.

(میتافیزیك) یان (پاراسایکۆلۆژیا) ئەو زانستەیە لە بوونی خواو گیان و ژیانی دوای مەرگ و دیاردە ڕوحیەکان دەکۆڵێتەوە ، کە لە ئایین دا باسکراون و سۆفیگەری ڕاڤەو لێکۆڵینەوەی لەسەر کردوون ، بەتاقیکردنەوەی بینراون ، هەرچی زانستی نوێ یە هەوڵ دەدات تاقیکردنەوە لەسەر بابەتە ماددیەکان بکات و لەڕازو نهێنی یەکانیان بکۆڵێتەوە ، وەکوو زانستی فیزیایی ، کیمیایی ، بایۆلۆجی ، و لە تاقیگەدا بیانسەلمێنێت.

لەم کتێبە دا دەبینی هەمووو سەرچاوە زانستی یەکان لە ئایین و عیرفان و فەلسەفەو زانست ڕاڤەو لێکۆڵینەوەیان دەربارەی دیوی دووەمی گەردوون و ڕوح و دونیای نادیار کردووە ، هەموویان کۆکن لەسەر بوونی ئەم دیوە ، کە ئایین ڕوونی کردۆتەودو بە

موعجیزەی پێغەمبەران و ڕاستگۆکان سەلمێنراوە ، عیرفان و زانستی ڕوحی نوێش بە ئەزمون ئەم راستی یانەیان بۆ ئاشکرا بووە ، ئالێرەدا زانست و ئایین یەك دەگرنەوە ، هەر چەندە زانست و عیرفان و فەلسەفەو زانستی ڕوحی هەموویان چەند لقێکن لە ئایین جیابوونەوە .

قورئان هەموویان بەسەرچاوەیێ دەزانێ بۆ خوداناسی : ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَلَا هُدٗى وَلَا كِتَٰبٖ مُّنِيرٖ ﴿٨﴾ ﴾ الحج: ٨ .

(علم) زانستە ، (هدى) فەلسەفەو لۆژیکە ، (کتاب) ئایین و سرووشی ئاسمانی یە.

(جاك ماریتان) لە کتێبی (درجات المعرفە) دا دەنووسێ : جیاوازی لەنێوان زانستی سروشت ناسی و زانستی میتافیزیکی و زانستی سۆفی گەری دا هەیە ، ئەوانە هەموویان چەند دیمەنێکی ڕاستن تەواوکەری یەکترن[1].

ئەم کتێبە ڕێنوما بەخشە بۆ بێ بڕوایان ، ئەوانەی بڕوادارن زیاتر ئیمانیان دا دەمەزرێنێ و بەرەو یەقینیان دەبات ، کە ئیبراهیم (علیە السلام) لە ڕێگای تاقی کردنەوەی زیندووکردنەوەی مردووان لە تاقیگەدا داوای دەکات : ﴿ وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِي كَيۡفَ تُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰۖ قَالَ أَوَلَمۡ تُؤۡمِنۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطۡمَئِنَّ قَلۡبِيۖ ﴾ البقرة: ٢٦٠ . ئەوەی بڕواو یەقینی دەربارەی ئەم جیهانەدا بۆ دروست ببێ خواپەرستی و توێشووی سەفەری بۆ ئامادە دەکات بەر لەوەی هەل و دەرفەت لەدەست بدات ، چونکە لە نێوان دیوی دیارو نادیاری ئەم جیهانەدا بەربەستێکی ئەستوور نیە ، تەنیا پەردەیەکی ناسکەو مەودایەکی کورتی زەمەنی یە ، کە بە ئاسانی کۆتایی دێت و تەواو دەبێت.

---

[1] الموسوعة الفلسفية المختصرة / ت: فواد كامل واخرين / ل:٤٠٣.

ئـەم بەشـەیەش کـە تایبەتـە بـەدیوی دووەمـی گـەردوون و خراوەتـە بـەر دەسـتی خوێنەرانی تەواوکەری زنجیرە ئیعجازەکانی تـرە ، لـە (گەردووونناسـی / زەوی ناسـی / گەردیلەناسـی / ژینگـە زانـی / کارەسـاتە سروشـتی یـەکان / ئـاو و هـەوا ناسـی) لـە یـەزدانی مـەزن تکـا کـارین سـوودی دونیـایی و پەسـڵانی بـۆ هـەمووو لایـێ هـەبێ و هۆشیاری ئیسلامی خوێنەرانی ئازیزمان پتر بکات .

دواجار بەم فەرمایشتەی شافیعی ئامۆژگاریتان دەکەم کە دەفەرمووێ :

| | |
|---|---|
| اخي لن تنال العلم الا بستة | سأنبئك عن تفصيل ربيان |
| ذكاء وحرص واجتهاد وبلغة | وصحبة استاذ وطول زمان |

واتـە : ئـەی بـرام ناگەیتـە زانسـت بـە شـەش شـت نـەبێ ، کـەمن بـۆتی دەکەمـەوە : زیرەکـی ، گـەرم و چـالاکی ، سـوربون ، هەوڵـدان ، پـاروی ژیـان ، هـاورێتی مامۆسـتا ، بەردەوامی لەسەر ئەم کارە.

نووسەر / حاجیاوە / ٩-٩-٢٠١٢ زایینی.

## بەندی یەکەم : ( جیهانی نادیار ) ( العالم اللامرئي )

### ( پێشەکی یەك )

﴿ الٓمٓ ﴿١﴾ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ
﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ
ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٥﴾ ﴾ البقرة: ١ ــ ٥ .

ئەم کتێبە وەکو زنجیرە ئیعجازەکانی پـێش خـۆی کتێبـەکی ناوازەیـە ، تیشـك دەخاتـە سـەر دیـوی دووەمـی گـەردوون ، کـە بـە (دیـوی غـەیب) یـان (دیـوی نادیـار) یـان میتافیزیك ناسراوە ، بەپشت بەستن بە قورئـان و عیرفـان و فەلسـەفەو میتافیزیـك و

زانستی نوێ ، ئەم کتێبە دەیەوێ بە بەڵگەی ئایەتی قورئان و فەلسەفی و عیرفانی میتافیزیکی بوونی کردگارو راستی نامە ئاسمانییەکان و ڕەوانەکراوانی خوایی و راستی ڕوح و ژیانی دوای مەرگ و دیاردە ڕوحییەکان بسەلمێنن ، کە بەدیاردە نائاسایی یەکان (الظواهر الخارقة) ناسراون ، زۆرێ لەو دیاردانە بە ژیانماندا ڕەت دەبن ، بە چەند دەرەنجامێك مەیدانداری (کات) و شوێن دەکەن.

کارە نائاسی یەکان ، کە سەلمێنەری دونیای غەیبین بۆ ڕەوانەکراوانی خوایی و پێغەمبەران و صدديقينەکان (موعجیزە) یە ، بۆ ئەولیایان (کەرامەتە) : ﴿ قُلْ قَدْ جَآءَكُمْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِي بِٱلْبَيِّنَٰتِ ﴾ آل عمران: ١٨٣ ، واتە : بلێ : بەراستی بەر لە ئێوە ڕەوانەکراوانی خوایی بە چەند موعجیزەیەکی ڕۆشن هاتن .

بێگومان موعجیزەی پێغەمبەران لوتکەی دیاردە نائاساییەکانن ، وەکوو سەلماندنی راستی یە زانستەکانە لە تاقیگەدا زانستی ئەزمونی دا ، کەس ناتوانێ خۆیان لەقەردبدات ، نمونەمان ململانێی کاری نائاسایی نێوان ساحیرانی کۆشکی فیرعەونە لەگەڵ موعجیزەکانی موسا (علیه السلام) لە میسردا .

دیسان موعیجزە بەفەرمانی خوایە و بەخلۆەو راهێنانی دەروونی بەدەست نایەت : ﴿ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾ غافر: ٧٨ ، موعجیزەکان سەلمێنەری زانستیە ڕوحیەکانن لە تاقیگەدا ، کە ڕامەتیش سەلمێنەری موعجیزەکانن لەکاتێ دا پاراسایکۆلۆجی و میتافیزیکیانی کۆشکی فیرعەون لە سەر شانۆدا موعجیزەکانی موسایان (علیه السلام) بینی و لەگەڵ ئاستی توانای ڕوحی خۆیان بەراورد کرد بینیان ئەم دیاردانە موعجیزەن ، بۆیە بڕوایان هێنا : ﴿ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالُوا۟ لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿٤١﴾ ﴾ الشعراء: ٤١ .

بێگومـان ئـەم زانستە لـە زانسـتی نـوێ دا پێـی دەگـوترێ (خەوانـدنی موگناتیسـی – Hypnotism and Hypnosis) ئەم زانستە وەكو (بـیتر مـالكیر) باسـی كـردووە ، یەكـەمجار (جـێمس بریـد – Jems Blaid) بـۆ یەكـەمجار لەسـاڵی (١٨٤٢) دا ئـەم زاراوەیەی بەكارهێنا ، هەر چەندە (ئـەنتوان مسیر) كتێبـی (دۆزینـەوەی خەوانـدنی موگناتیسـی لـە گیانـداران (The discover of Animal magnetism) دەنووسێ و ئەو ناوەی بۆ دادەهێنێ ، كە بزمارییە ، بەڵام لەدۆزینەوەی ئەم هونەرەدا سەرنەكەوت ، یەكـەم كـەس نـەبوو ئامـاژەی بـۆ كـردووە . بـەڵكو لای میسـرییەكان و ئینگلیزییەكان لەبارەی ئەم هونەرەوە شارەزایی یان هەبووە [٢].

(هـ.س.وارین) دەڵێ : (خەوانـدنی موگناتیسـی) دۆخێكـی دەسـت كـردە ، بـە خـەوتنی ئاسـایی دەچـێ ، بـەڵام لـە ڕووی فسـیۆلۆجیادا لێ ی جیایـە ، بـەوە جیـا دەكرێتـەوە توانایەكی بەرزی هەیە بۆ پێ گوتن (الایحاء) یان تیفرۆسماندن)[٣].

شایانی باسە (میتافیزیـك) و (پاراسـایكۆلۆژیا) ئێسـتا پێیـان دەوتـرێ زانسـتی ڕوحـی نوێ (السید سابق) دەڵێ : (زانایان ئـەم (الایـات)منـەیان بـە (مـوعجیزە) نـاو دەبـەن ، چـونكە هـزری مـرۆڤ لەبـەیان كردونیـان دەستەوەسـتان دەبـن و توانـای مـرۆڤ لـە دووبارکردنەوەیانـدا دادەمێنێـت ، موعجیزەیـان پێناسـە كـردووە ، كـە بریتییـە لـە كارێكی لە ئاسایی بەدەر (الخارق للعادە) لەسەر دەستی ڕەوانەكراوێكدا ڕوودەدات ، تـا پێغەمبەرایـەتی و ڕەوانـەكراوی خـۆی بسـەلمێنێ ، لەبـەر ئـەوە مـوعجیزە پێویسـتەو دەركردنیان واجبە ، تـا مەبەسـتی ڕاگەیاندنەكە ئاشكرا ببـێ و ببێتـە بەڵگە بەسـەر خەڵكەوە .

ئەم بەڵگانە لەزات دا ڕێ تێ چوون ، هزر قبوڵیان دەكات ، زانست یاسـاغی ناكـات و واقیـع پشـت ڕاسـتی دەكاتـەوە ، كۆمەڵـە پیـاوێ هەڵكـەوتن جارێـان دا پێغەمبـەران و

---

[٢] انشطار الذهن / بيتر مالكير / ت: د.حلمي نجم / ل: ١٣٧.
[٣] انشطار الذهن / بيتر مالكير / ت: د.حلمي نجم / ل: ٢٣٥.

ڕەوانەکراوانی خودان ، بە موعجیزەوە مەیدانداری گەلانیان کرد . خەڵکی لەمەیدانی تاقی کردنەوە دا بە چاوی سەر بینییان ،چە لەدوای وەچە هەزاران هەزار کەس بڕوایان پێیان هێنا ، زانستی تازە بەدەستی خۆی سەلماندی دەکرێ لەیاسایە سروشتی یەکان بە یاسای بالآتر لابدرێ ، دیسان زانست سەلماندی موعجیزەی پێغەمبەران ڕاستن .

ئەو کەسەی سەیری کتێبی ئەو زانایە تازانە بکات لەبارەی (جیهانی گیانەکان) و (سەیری ئامادەکرنیان) و شتە سەیرەکانی (هیپنۆتیزم) و شتی تر نوسیویانە پێگومان تێ دەگات ئەم ڕووداوانە شیاوەو هیچ کام لەم موعجیزانە ڕێتی نەچوونین[٤].

(ج. اج . رایز) دەنووسێ : (نابێ کارە نائاساییەکان لە ئاستی دونیادا دایان بنێین ، واتە : بەرەو خوارەوە دایان ببەزێنین تا جیایان بکەینەوەو حەقیقەتیان تێ بگەین ، ئەو شیکارەی ئەوانە چەند کارێکی ئاسایی و موعجیزەن ، پێناسەی سروشتی بۆ وشەی (موعجیزە) ئەوەیە : (ڕووداوێکی سەیرە لەلایەن هێزەکی نائاسایی یەوە ڕوودەدات) ، باشترین پێناسەیان فەیلەسوفی ڕووسی (ئۆسپینسکی) کردوویەتی و دەڵێ : (موعجیزە دیاردەیێکە لەم جیهانەدا ڕوودەدات و مل بۆ چەند یاسایەکی دونیای تر کەچ دەکات)[٥].

وشەی (پاراسایکۆلۆجیا) یەکەم کەس (ماکس دیسوار) لە سەدەی (١٨) بۆ دیاردە ڕوحیەکانی دا هێنا واتە : (تەنیشت دەروون) .

وە بەپێی قورئان دیاردەی پاراسایکۆلۆجیاو میتافیزیك و گەردووناسی و ئەستێرە گەری (تەنجیم) ، دیاردەو زادەی مێشك نیە ، بەڵکو یەکەمجار لەلایەن فریشتەی

---

[٤] العقائد الاسلامية / السيد سابق / ل: ٢٠٨-٢٠٩.
[٥] عصر الخوارق / ج. اج . رايز / ت: ماجدة صحيح / ل:١٣.

**ئیلهامەوە فێری خەڵکی زاناو شایستەی (بابل) کراوە :** ﴿ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَ ﴾ البقرة: ١٠٢ .

**لە (کتاب المقدس / سفر التکوین /١١/١٤)دا (بابل) شەنگارە (shinar) .**

**کەواتە : بۆ یەکەمجار لە کوردستان دا لە (نەینەوا) دا زانستی پاراسایکۆلۆژی و جادوو و ئەستێرە گەری (تەنجیم) سەری هەڵداوە ، لەوێوە بۆ میسرو یۆنان گوازراوەتەوە .**

**(کولن وڵسن) دەنووسێ : (کەهانەت بەر لە شەست هەزار ساڵ پەیدا بووە) ، هەر لە کۆنەوە زانراوە کلدانییەکان دامەزرێنەری گەردوونناسی و هونەری ئەستێرە گەری (تەنجیم) بوون**[٦]**.**

**(السفیر عزت علی البحیری) سەرۆکی کۆمەڵەی میسری زانستی بۆ تاو و توێ کردنی گیانیی لە قاهیرەدا دەنووسێ : دیاردە ڕوحی یەکان (کارە نائاسایی یەکان) لە مەیدانی تاقی کردنەوەی زانستی دا وەکو : (تلەپاتی –** التخاطر – Telepathy**) و دووربینی (**الجلاء البصري – clairvoyance**) و دوور بیستن (**الجلاء السمعي clairaudience**) و دوور بۆن کردن (**الجلاء الشمي**) دەرچوونی لەشی ئەتیر (**الطرح الروحي – soul healing**) و پەیوەندی کردن بە دونیای گیانی یەوە ، (**الاتصال بالالعالم الاخر**) و کارکردنی هزر بۆ سەر مادده (سایکۆکینیزیا) و شت ئامادەکردن و خۆ بەلەش کردن (**التجسد**)و شتی تر لە دیاردەی گیانی .**

**پێویست ناکات ئاماژە بکەین هەمووو ئایینەکان ئەم دیاردانەیان باسکردووە ، بە تایبەتی ئایینی ئیسلام و مەسیحی**[٧]**.**

---

[٦] الانسان وقواة الخفية / (السحر) / كولن ولسن / ل:٩٩.

[٧] دراسات غي العالم الروح / السفير عزت على البحيري / ل:١١.

یەکەم : نمونەی تلەپاتی : ئەم وشەیە لە قورئاندا بە (البصیرة) هاتووە : ﴿ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدْعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِي ﴾ یوسف: ١٠٨ ، لە فەرموودەدا بە (الفراسة) هاتووە : (اتقوا فراسة المؤمن فانه ینظر بنور الله) ، واتە : لەدووربینی بڕوادار خۆت بپارێزە ئەو بە ڕووناکی خوا دەبینێت.

(فراسە) دوور بینی یە ، (نور الله) هالەی موگناتیسی و شەپۆلی ئەتیرە ، کە لە (شەپۆلی بێ تەل) خێراتر دەگوازنەوە ، بۆ نمونە (خودا) بە ئیبراهیم (علیه السلام) فەرمووی : ﴿ وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالٗا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٖ ﴾ الحج: ٢٧ ، واتە : جاڕبدە بۆ خەڵکی بۆ حەج کردن خەڵکی بەپیادەو وشتر دێنە لات .

یان لە نمونەی هاوەڵان بەسەر هاتەکەی عومەرە (یا ساریه الجبل الجبل) ، وەکوو کەرامەت بۆ عومەر ڕوویداوە.

وشەی (تلەپاتی) لە نێوان مرۆڤ و گیانداراندا ، یان لە نێوان زیندوووان و ڕوحەکاندا وەکو تەلەگرافی بێ تەل یان وەکو ئەنتەرنێت و مۆبایل ڕوودەدات ، کە شەپۆلی (ئەتیر) ئەو دەنگ و ڕەنگانە بێ کات خایاندن دەگوازنەوە .

(سیر ئولیفەر لودج) و (د.فونك) بە هیپنۆتیزم بوونی تلەپاتی یان لە نێوان مرۆڤەکاندا سەلماند و بە واقیعی یان بینی (سێر ولیام کروکس) لە شیکارەکەیدا دەنووسێ : (بیر لەردلەر پەیدا دەکات ، مێشکی شەپۆل وەرگر (المستقبل) بەردو مێشکی (ڕەوانەکەر – المرسل) دا کراوەیە وەکو رادیۆ ئەم لەرە لەرانە وەردەگرن[٨].

نمونەی تر (زەکەریا)یە (علیه السلام) کاتێ لە قسە دەکەوێ بە تلەپاتی قسە لەگەڵ یارانی دەکات نوێژەکانیان بۆ خۆیان بکەن : ﴿ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ مِنَ ٱلْمِحْرَابِ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُواْ بُكْرَةٗ وَعَشِيّٗا ١١ ﴾ مریم: ١١ .

---

[٨] التنویم المغناتیسی / محمود سعید / ل: ١١-١٢.

**دووەم : نمونەی دووربین ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی :** (لو تمريع قلوبكم لسمعتم ما اسمع) رواه احمد ، **واتە : گەر چڵکی دڵتان نەبوایە من چیم دەبیست ئێوەش دەتان بیست .**

**سێ یەم : نمونەی بۆن کردن لە دوورەوە : نمونەمان یەعقوبە (علیە السلام) ئەو لە دوورەوە بۆنی کراسی یوسف (علیە السلام) دەکات** ﴿ وَلَمَّا فَصَلَتِ ٱلۡعِيرُ قَالَ أَبُوهُمۡ إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ ﴾ یوسف: ٩٤ .

**چوارەم : نمونەی دەرچوونی گیانیی : (خەون) و (ئیلهام)ە ، نمونەی موعجیزە میعراجی پێغەمبەر ﷺ لەکاتی خەوندا ڕوحەکان دیداری یەکتر دەکەن :** (ان الروح ليلقى الروح) رواه النسائي ، **لەکاتی مردندا بە تەواوی ڕوح لە لاشە جیا دەبێتەوە ، تا یەکجاری ماڵ ناوایی لێ دەکات و مرۆڤ بە چاوی خۆی ئەوە دەبینێت :** (ان الروح اذا قبض تبعه البصر) رواه مسلم ، **واتە : گەر ڕوح کێشرا چاو شوێنی دەکەوێت .**

**(روبرت هورتون کامیڕوون/ پسپۆڕی ماتماتیکی) دەڵێ : زانست بە دوو ڕێگا بەمرۆڤ دەگات ، بە بینین و دوور بینی (البصيرة) ، مەبەست لە بینین (البصر) ئەو شتانەیە ڕۆژانە لە ڕێگای هەستەکانمانەوە بە دەستیان دێنین لە ئەزموونەکانی ژیان ، دوور بینی (البصيرة) ئەو ڕووناکییەیە خوا دەیخاتە دڵمانەوە ئەوەی نایزانین بۆمان ئاشکرا دەکاتە.**

**پێنجەم: نمونەی چارەسەری گیانی : لە قورئاندا عیسا (علیە السلام) کوێر و بەڵەکی بە هالەی گیانی و پاڕانەوە چاك دەکاتەوە ، مردووو زیندووو دەکاتەوە .**

﴿ وَأُبۡرِئُ ٱلۡأَكۡمَهَ وَٱلۡأَبۡرَصَ وَأُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ بِإِذۡنِ ٱللَّهِ ﴾ آل عمران: ٤٩ .

---

[٩] الله يتجلي في عصر العلم / ل:١٢٨.

نمونەمان کراسی یوسفە (علیه السلام) کە هەڵگری هاڵەی ڕوحی یوسفەو دوای لەبەر کردنی مژیویەتی ، ئەو وەزیە چاوی یەعقوب (علیە السلام) چاك دەکاتەوە ﴿ ٱذۡهَبُواْ بِقَمِيصِي هَٰذَا فَأَلۡقُوهُ عَلَىٰ وَجۡهِ أَبِي يَأۡتِ بَصِيرٗا ﴾ یوسف: ٩٣ ، نمونەی تر چارەسەری نەخۆشی نەیبوبە کە خودا بە (ناو) چارەسەری دەکات ، وەکو داهاتوو باسی دەکەین .

شەشەم / نمونەی پەیوەندی کردن بە ڕوحەکانەوە : قورئان فەرموویەتی ﴿ وَسۡـَٔلۡ مَنۡ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رُّسُلِنَآ ﴾ الزخرف: ٤٥ .

نمونە لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ و ئال و بەیت و هاوەڵاندا زۆرە ، بۆ نمونە : وەکو باسکرا (نووستن) بەشێکە لە پەیوەندی کردن بە ڕوحەکانەوە (ان الروح لیلقی الروح) رواه النسائي ، یان گەر سەیری کتێبی (الروح/ ابن القیم الجوزیة) و (اهوال القبور / الحافظ ابي الفرج) و (شرح الصدور / السیوطي) بکەین زۆر فەرموودەی (متفق علیە) دێنێتەوە ، کە مردوو گوێیان لە قسەی زیندووانە ، هەست بەسەلام کردن سەردانی کردنیان دەکەن ، ئاگایان لە هەڵس و کەوتی زیندووانە : نمونە : لە (صحیحین) دا هاتووە لە (ابن عمر) ەوە ، پێغەمبەر ﷺ سەیری کوژراوانی (القلیب)ی کردوو فەرمووی : (هل وجدتم ما وعدکم ربکم حقا)؟ واتە : ئایا ئەوەی خوا بەڵێنی دابونێ بەچاوی خۆتان بینیتان ، وتیان : ئایا قسە لەگەڵ مردووان دەکەی و بانگیان دەکەی ؟ فەرمووی : (ما انتم باسمع منهم) واتە : ئێوە لە ئەوان چاکتر گوێتان لێ نییە.

دیسان مەبەست لە ﴿ إِنَّكَ لَا تُسۡمِعُ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَلَا تُسۡمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوۡاْ مُدۡبِرِينَ ٨٠ ﴾ النمل: ٨٠ ، مەبەست لە لاشەیە ، کە مردووە و گیانی تێدا نەماوە ، نەك ڕوح ، چونکە ڕوح دەبیستێ و دەبینێ و دەڕوات.

دیسان له (صحيح البخاري) دا هاتووه مردوووان گوێیان له تەپەی پێی خەڵکە دوای ئەوەی بەجێیان دێڵن : (انه ليسمع قرع نعالهم).

(ابن حجر) له (التلخيص الحبير) دا به (اسناد صالح) گێڕاویەوە : کاتێ مردووو تەلقین دەدرێ ، دەڵێ : (ارشدني رحمك الله) واتە : ڕێنومام بکە خوا ڕوحمت پێ بکات .

(ابن عبدالبر) له (التمهيد) دا ، کە (عبدالحق) بە (صحیح)ی دانا وەرگێڕاویەوە : (ما من احد یمر بقبر اخیه المؤمن کان یعرفه في الدونیا فیسلم علیه ، الا عرفه ورد علیه السلام) ، واتە : گەر کەسێ بەسەر گۆڕی برایەکی بڕوا داری دا ڕەت بوو لە دونیادا دەیناسی و سەلامی لێ کرد ، دەیناسێتەوەو وەڵامی سەلامی دەداتەوە .

هەروەها (احمد) گێڕاویەوە : (ان الله تعرض اعمالكم على اقاربكم) واتە : کردەوەی ئێوە پیشانی مردوووانی نزکتان دەدرێت.

(ابن عباس) دەڵێ : ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ ٱلَّتِي قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾ الزمر: ٤٢ ، ئەم ئایەتە مەبەست لە ڕوحی مردوووان و زیندوووانە لەکاتی نووستندا دیداری یەکتری دەکەن و قسە پێکەوە دەکەن ، پاشان خودا ڕوحی مردوووان دەگرێ و گیانی زیندوووان بۆ لاشەیان دەگێڕێتەوە ، (الطبراني) له (الاوسط) دا گێڕاویەوە .

دیسان لە (تەریقەت)دا ئەم واقیعانە دەبینرێن ، (حجة الاسلام الغزالي) دەڵێ : ( سەرەتای تەریقەت بە موشاهەدەو موکاشەفە دەست پێ دەکات ، تا ئەوان لە بێداری دا فریشتەکان دەبینن ، لەگەڵ گیانی پێغەمبەراندا ، گوێیان لە دەنگی ئەوان دەبێ و سوودیان لە قسەکان دەبینن[١٠].

---

[١٠] المنقذ من الضلال / حجة الاسلام الغزالي / ل: ٥٠.

غەزالی بەر لە (فرۆید)و زانایانی دەروونی و ڕوحی خۆرئاوا ئاماژە دەکات مرۆڤ (هەست) و (نەست – اللاشعور) ی هەیە ، هەست لەکاتی بێداری دا هۆشیارە ، (نەست) لەکاتی خەون و ئیلهامدا (بزانە دڵ دوو دەرگای هەیە ، یەکەم بۆ خەونەکان و دووەم بۆ جیهانی بێداری ، گەر مرۆڤ نووست هەستەکانی دادەخرێن و دەرگای دەروونی بۆ دەکرێتەوە ، پەنهانی ئاسمانی بۆ والا دەبێت)[11].

(د. رودلف شتاینر) دامەزرێنەری بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی فەلسەفی پێی وایە مرۆڤ لەچوار پێك هاتە پێك دێ : (لەش ، لەشی ئەتیری ، لەشی وەهمی ، لەشی مـن ) کاتێ مرۆڤ دەخەوێ دەبێتە دووبەش ، لەشی وەهمی و لەشی من لە لەشی فیزیایی و ئەتیری جیا دەبێتەوە[12].

دیسان دەڵێ : (کاتێ دەچینە سەر جێگا بۆ نووستن دیداری مردووان دەکەین ، دیسان لەکاتی بێداربوونەوەدا ، کاتی خەریکە خەومان لێ دەکەوێ و خەریکە هەڵدەستینەوە زۆر گرنگە بۆ دیدار لەگەڵ مردووان و زیندەوەرانی تری گیانە بالاکان)[13].

(سێر ولیام کرۆکس) گەورەترین سروشت ناسی سەدەی ڕابردوو سەرۆکی بەشی کۆمەڵەی زانستی بەریتانی دەڵێ : ( من نالێم پەیوەندی بەگیانەکانەوە دوور نیە ، بەڵکو دەڵێم : بێگومان ڕوویداوە.

(سێر ولیام باریت) سروشت ناس و مامۆستای سروشتی لە زانکۆی دبلن دەڵێ : (یەکەم شت جیهانی گیانی سەلماوە ، دووەم : ژیان لەدوای مەرگدا ، سێ یەم پەیوەندی کردن بەو کەسانەی چونە ئەوێ) .

---

[11] كمياء السعادة / ل:٨٦.
[12] ما بعد الحياة / كولن ولسن / ل:٦٠.
[13] ما بعد الحياة / ل:١١٦.

(کامی فلامریۆن) گەردوونناس و دامەزرێنەری کۆمەڵەی گەردوونی فرەنسی دەڵێ : (تلەپاتی چۆن لە نێوان زیندووواندا هەیە ئەوەندەش لەنێوان مردووان و زیندووواندا هەیە).

(کرۆکس) دەڵێ : تارمایی یەکان (الاشباح) و ڕوحەکان هەیەو دەتوانرێ وێنەیان بەکامیرا بگیرێت[14].

حەوتەم / نمونەی کارکردن لە مادده ، بەبێ هیچ ئامرازێکی ماددی ، واتە : (سایکۆکینیزیا) نمونە لە قورئاندا زۆرە ، وەکوو هێنانی تەختی بەلقیسا لە سەبەئەوە بۆ قودس لەماوەی کەمتر لە چاوتروکاندنێکدا : ﴿ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ ﴾ النمل: ٤٠ ، یان خودا بە مەریەم دەفەرمووێ : ﴿ وَهُزِّىٓ إِلَيْكِ بِجِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ تُسَٰقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا ﴿٢٥﴾ ﴾ مريم: ٢٥ ، واتە : لقە دار خورماکە بەرەو لای خۆت ڕابوەشێنە خورمای گەیشتوو بەسەرتدا دێتە خوار .

یان پێغەمبەر ﷺ بەهاڵەی ڕوحی (مانگ) شەق دەکات و خۆر ڕادەگرێت : ﴿ ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ ﴾ القمر: ١ ، وەکوو (زغلول النجار) باسی کردووەو لە گەردووناسی دا باسمان کرد زانایانی ئەمریکی سەلماندوویانە ڕۆژێك لە ڕۆژان مانگ کەرت بووەو یەکی گرتۆتەوە ، ئەمەش لەکاتێ دا دەرکەوت بینرا کە چەند تاوێرێکی گۆڕاو مانگیان تا ناو جەرگەبڕیوە[15].

یان لە سیرەکاندا هاتووە چۆن ئیمام عەلی لە خەیبەردا قەڵای هەڵدەگرێ ، کە بە (٧) کەس ناجوڵێت ، یان (ابن مزاحم) لە (صفين) دا باس دەکات عەلی (عليه السلام) خۆر ڕادەگرێت ، ئەم دیاردانەش بە (هاڵەی موگناتیسی) ڕوودەدەن ، خودا دەربارەی

---

[14] مع القران في العالمه الرحيب / د.عمادالدين خليل / ل:٦٦-٦٩.
[15] موسوعة الاعجاز العلمي / يوسف الحاج / ل:٣٢٤.

**هاڵەی ڕوحی موسا (علیه السلام) فەرموویەتی : ﴿ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِيَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴾** الأعراف: ١٠٨ **، ئەم دەستە ڕووناکی بەخشە وزەی موگناتیسی بووە .**

**(بیل) دەڵێ : (ئێوە وزەییێکتان تێدایە دەتوانێ شاری نیورك بگۆڕێ بۆ خۆڵەمێش ، فیزیای پێشکەوتوو ئەوەمان پێ دەڵێ) دیسان دەڵێ : (فێری نوێژ ببن بە دروستی و زانستی ، لەنوێژی داڵغە خۆتان بپارێزن) چونکە ڕامان و بیرکردنەوەی دروست وزەیەکی ناناسایی ڕەوانە دەکات[16].**

**وشەی (هالە) یان (**The Aura**) وشەیەکی یۆنانی یە واتە (دەروون) یان (هەوا) ، بەکورتی سەرچاوەیەکی وزەیە دەوری گیانداارانی داوە ، ئەم وزەیە دەردەچێ و گەرمی و وزە دەدات و بەکامێرا وێنەی دەگیرێ و بە گەرمی پێو گەرمی یەکەی دەپێورێت[17].**

**پێغەمبەران و صددیقینەکان وێستگەی ئەم وزە ڕوحی یە بوون ، ئەم وزەیەش چاوگی سەر هەڵدانی توانا ڕوحیەکانە ، لە فەرموودەدا هاتووە :** (الصلاة نور) رواه مسلم **، واتە : نوێژ وزەو ڕووناکی یە .**

**هەشتەم / لەبارەی (خۆ بەلەشکردنی ڕوحەکان ، التجسد – التمثل) قورئان فەرموویەتی : ﴿ فَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا ﴾** مريم: ١٧ **، واتە : گیانی خۆمان نارده لای مەریەم خۆی بۆ کرد بە مرۆڤێکی تەواو .**

**یان پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی :** (من رانـي فـي المنـام فقد رانـي فـان الشيطان لا يتمثل بي) رواه البخاري **، واتە : کێ منی لەخەونیدا بینی ئەوە خۆمم شەیتان ناتوانێ خۆ بخاتە سەر شێوەی من.**

---

[16] حروب العقل / روونالد . م. ماكري / ل:١٣٠.

[17] تطوير المهارات النفسية / انايد هوفمان / ل:٧٤.

کەواتە : ڕوحە پاکەکان و چەپەڵەکان لەکاتی پەیوەندی ڕوحی دا دەتوانن بۆ بینین خۆیان بە لەش بکەن ، تا لە کاتی خەون و ئیلهامدا ببینرێن ، ئەویش بە هێواش کردنەوەی لەرەلەری ڕوحی دەبێت.

کاتێ (ج. ئارتەر فندلای) لە ڕوحێکی ئامادەکراو دەپرسێ : (چۆن دەتوانن ئێوە قسەمان لەگەڵدا بکەن لەسەر زەوی دا ؟ دەڵێ : بە بەلەشکردنی دەم و زمانی ئەتیریمان ، کاتێ لێیان دەپرسێ : چۆن هەوا بە دەست دێنن ، ئایا سمایەکان بەلەش دەبن ؟ دەڵێ : بەڵێ : لە خۆ بە لەش کردنی تەواودا[18].

لێرەدا قورئان ئاماژە دەکات خۆ بەلەش کردن (التجسد) دوو بەشە : خۆ بەلەشکردنی تەواو (بشرا – سويا) و خۆ بەلەش کردنی نا تەواو.

بێگومان کاری نائاسایی بۆ مەریەم ڕوودەدات بێ ئەوەی پێغەمبەر بێ ، بەڵکو ئەو (صديقه) یە ﴿ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٌ ﴾ المائدة: ٧٥ ، لە فەرموودەدا هاتووە : (الصديقون ثلاثة : ... وعلى ابن ابي طالب) رواه ابو نعيم وحسنة السيوطي.

دیسان بۆ ئەولیایان وەکو کەرامەت ڕوودەدات ، تا ئەو دیاردانە ببنە پاڵ پشت بۆ موعجیزەی پێغەمبەران ، بەشێك لەوانە لە ئاستێکی نزمتردا لە زانستی نوێ دا تاقی دەکرێنەوە تاببنە پشتگیری بۆ ڕاستی موعجیزەکان و ئایینە ئاسمانییەکان ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾ فصلت: ٥٣ ، واتە : لە ئاییندەیەکی نزیکدا بەڵگەکانی خۆمان پیشانی ئەوان (بێ بڕوایان) دەدەین لە ئاسۆداو لە خودی خۆیاندا هەتا بۆیان دەربکەوێ ئەوە حەقە.

دیسان قورئان پێشبینی دەکات : ﴿ وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلْمَوْتَىٰ وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَىْءٍ قُبُلًا مَّا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوٓا۟ ﴾ الأنعام: ١١١ ، واتە : ئەگەر ئێمە فریشتەیان

---

[18] على حافة العالم الاثيري / ج.ارثر فندلاي / ل:١١٠.

**بنێرینە سەرو مردوووان قسەیان لەگەڵدا بکەن و هەمووو شتێ لەبەرچاوی ئەوان زیندووو بکەینەوە بڕوا ناهێنن.**

**(ریچارد هودجسون) وەکو زانایەکی ئینگلیزی دەڵێ : (من و مامۆستا هایسلوب تا دوانزە ساڵ دەستمان بەلێکۆڵینەوە کرد ، ئێمە ماتریالیستی زەندیق بووین ، بڕوامان بەهیچ کام لەم شتانە نەبوو ، مەبەستمان لەم تاقی کردنەوەیە تەنیا ڕوماڵ کردنی فێڵ و فریودانەکان بوو ، بەڵام ئیمڕۆ بڕوام وایە دەتوانرێ قسە لەگەڵ مردوووانـدا بکرێت[19].**

**(ڕوونالد روبەرت کار) مامۆستای کیمیای جیۆلۆجی هاوچەرخ دەڵێ : (گەر گەردوون دیزاین و ڕێکی نەبوایە ، لێرەدا هیچ جێگایەك بۆ موعجیزەی پێغەمبەران نەدەبوو ، بەر لە هەمووو شتێ ئەم موعجیزانە دەرچوونە لە یاسایە سروشتی یەکان ، ناتوانرێ بەهای ڕاستی یان بزانرێ ، مەگەر لە گەردوونێکی ڕێکدا نەبێ ، کە دیاردەکانیان بەپێی چەند یاسایەکی دیاری کراو و کێشراو دەڕۆن)[20].**

**(ریشیە) لە کتێبی (حاستنا السادسة) دا دەڵێ : لە مرۆڤدا هەستی شەشەم هەیە ، لە چەند هەستێ پێك دێ ، دەتوانرێ بە هەستی حەوتەم و هەشتەم دابنرێ ، کۆئەندامێکی ڕوحی یە دەتوانێ هەندێ جار ڕووداوەکانی جیهانی سەروی ماددی تۆمار بکەن ، یان بیری کەسانی تر ، بەبێ هیچ ئاگادارییەکی هزری لە هەستە ئاساییەکانەوە و وەرگرتنی شەپۆلە هەستی یە ڕوحی یەکان ، هەندێ جار بەشێك دەربارەیی ئاوەڵە دەکاتەوە[21].**

**(السفیر عزت علی البحیري) دەنووسێ : (ئەم زانستەی لەم دیاردە نائاسی یانە دەکولێتەوە (ڕاستی گیانی نوێ یە) کە لە ناوەڕاستی سەدەی (١٩) دا بە**

---

[19] مع القرآن في العالمه الرحيب / د.عمادالدين خليل / ل:٦٧.

[20] الله يتجلى في عصر العلم / جون لكوفرمونسا / ل:٨٦.

[21] العالم الارواح والاشباح / خليل حنا تادرس / ل:٤٣.

(پاراسایكۆلۆجیا) ناودەبرا ، كە وشەیەكی یۆنانی یە ، بە واتای (سەروی دەروون) ناودەبرێ و جێگای (سایكۆلۆجیا)ی كۆن (علم النفس) دەگرێتەوە ، دیسان ئەم زانستە لە لەشی (ئەتیری) و (ڕوح) دەكۆڵێتەوە لەزیندەوەراندا (Ethiric body) كە مرۆڤ و گیانداران و ڕوودك و مێروەكان هەیانە .

دیسان ئەم زانستە ڕوحی یە لە (هالەی موگناتیسی) و (چەقی وزە) (chakras) كارامەیی و دەست ڕەنگینی (المهارات الروحیة) دەكۆڵێتەوە ، دەنووسێ : (هەمووو ئایینەكان بانگەشەمان دەكەن بڕوا بەڕۆژی دوایی بكەین ، ئیمڕۆش (پەیوەندی گیانی) واقیعی ئەم بانگەوازییە زیندووو دەكاتەوە ، كە لێرەدا جیهانەكی تر جگە لە جیهانی زەوی هەیە پەیوەندی بە ئێمەوە دەكات[٢٢].

بێگومان ئیسلام بەر لە خۆرئاوا زۆرێ لەزانایانی مەزنی ڕوحی و فەلسەفی و عیرفانی بەجیهان بەخشی ، كە دەبنە پێشەنگ بۆ زانایانی خۆر ئاواو زانستەكانی خۆیان دەربارەی جیهانی ڕوحی لە ئەوان وەردەگرن و درێژەی پێ دەدەن ، نمونەی (ابن سینا) و (ابن القیم الجوزیة) و (الفارابي) و (ابن رشد) و (الغزالي) و (ابن عربي) و (شیخ عبدالقادر الكیلاني) ... هتد .

(ابن القیم الجوزیة) كتێبی (الروح) و (حاوي الارواح) دەنووسێ ، (الغزالي) كتێبی (إحیاء علوم الدین) و (معارج القدس في مدارج معرفة النفس) و (كیمیاء السعادة) و چەندان نامەی تر لەبارەی (دەروون) و (گیان) و سۆفیگەری دەنووسێت ، (ابن عربي) كتێبی (فتوحات المكیة) و دەیان نامەی تر لەبارەی (ڕوح) و قۆناغەكانی و دیاردەكانی و تواناكانی و وەرزشەكانی دەنووسێت.

(فصوص الحكم) و (تفسیر ابن عربي) دو نووسراوی تری ڕوحی ئەم زانایەن ، كە جێگای ڕامان و سەرەنجی زانایانی خۆرئاوایە .

---

[٢٢] دراسات في العالم الروح / ل:١٤.

گه بڕوانیـه کتێبـی (ابـن عربـي حیاتـه ومذهبـه) / اسـین بلاثیـوس/ ت: د. عبـدالرحمن البدوي) ئەم کاتە مەزنی ئەو زانایەت بۆ دەردەکەوێ لە جیهانی ڕوحی و عیرفانی دا .

لەم کتێبەدا (ابن عربي) کەرامەتەکان دەکات بە چەند بەشێکەوە ، وەکوو : (کەرامەتی بینین) وەکو بینینی فریشتەو ئـەولیایان ، (کەرامـەتی بیسـتن) وەکـو بیسـتنی دەنگـی تەنە بێ گیانەکان و کەرامەتی قسەکردن ، وەکو قسە لەگـەڵ فریشـتەکان و پێشـبینی کردن.

(کەرامـەتی دەسـت) وەکـو گـۆڕینی مشـتە هەوایـەك بـۆ زێـڕو زیـو و . کەرامـەتی (سەرکوت کردنی ئارەزووی خواردن) ، وەکوو تێرکردنی زۆران بە کەمە خۆراکێك ... هتد .

یـان (ابـن رشـد) کتێبـی (تهافـت التهافـت) دەنووسـێت ، (ابـن سـینا) لـە (النجـاة) و (الشفاء) دا زۆر ئامـاژەی پـێ کـردووە ، (مـن) و (دەروون) لای ابـن سـینا یـەك شـتە ، (من) مەبەست لە لاشە نییە ، ڕوحە ، نەفس ڕوحە[٢٣].

لـە زانایـانی نـوێ ی هاوچـەرخ ، کـە گرنگـی یـان بـە زانسـتی ڕوحـانی دابـێ (شـیخ النورسـی) یـە لـە پەیامـەکانی نـوردا ، هـەروەها (شـیخ طنطـاوي)یـە لـە (تفسـیر الجواهر)دا ، (فرید وجدي)یـە لـە (دائرة المعـارف القـرن العشـرین)دا و (فهمـي ابـو الخیـر)ە کـە نووسـراوەکانی (ارثـر فنـدلاي) وەرگـێراوە ، هـەروەها (د.رؤوف عبید)ە لە کتێبە مەزنەکەیدا بەناوی (الانسان روح لا جسد) .... هتد.

بـە ویسـتی خـوای گـەورە لـەم نووسـراوە دا چـەند توێژینەوەیـەکی گـرنگ دەبیـنین دەربارەی جیهانی ڕوحدا ، کە ئیسلام بـڕوای خـۆی لەسـەر دامەزرانـدووە ، بـە پشـت بەستن بە قوڕئان و سوننەت و ئەزموونـەکانی عاریفـان و زانایـانی ڕوحـانی خۆرئـاوا . ئامـانجیش لەمـە بـۆ بـەهێزکردنی بـڕوا بوونـە بـە خـواو جیهـانی دوایـی و پـەیامی

---

[٢٣] ابن سینا / یوحنا قمیر / ل:٣٧.

بێغەمبەران ، سەیر بکە ئیبراهیم (علیه السلام) لەگەڵ بڕوابوونی بە جیهانی ڕوحی و تواناکانی خوا لەزیندووکردنەوەو نەمری ڕوح لەدوای مەرگدا داوا لە خوداوەند دەکات لە مەیدانی تاقی کردنەوەدا بە بینین ئەم ڕاستی یەی بۆ بسەلمێنێ ، بۆ مەبەستی گەیشتن بە دلنیایی : ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَىٰ وَلَـٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي ﴾ البقرة: ٢٦٠ ، بۆ ئەم مەبەستە خوداوەند لە تاقیگەدا زیندووکردنەوەی مردووانی پیشان دەدات .

بێگومان ئەزموونی ڕوحانیەکان و سۆفیەکان و ئەزموونەکانی هیپنۆتیزم لە تاقیگەدا پاڵ پشتی ڕاستی جیهانی ڕوحانی و دیاردەکانی دەکات ، لەبەر ئەوە حاڵی بوون لەم ئەزموونانە و ڕۆشنبیربوون لەو ڕوانگەوە ئەرکی هەمووو موسڵمانێکە بۆ گەیشتن بە دڵنیایی [٢٤].

وەکو نووسەرانی کتێبی (الفکر السیاسی بین الاسلام والغرب) ئامازەیان پێ کردووە بڕواو ئایدیای ئیسلامی لە (٦) خاڵدا خۆی ڕێك دەخات :

(١) **بڕوابوون بە خوداو زانینی ناوە جوانەکان و سیفاتە بەرزەکانی و ناسینی خوا بە بەڵگەکانی هەبوونی ئەو و دیاردە گەورەکانی لەگەردوون و سروشتدا.**

(٢) زانینی زانستی سەروی سروشت و گەردوونی نادیار بەهێزی خێرەوە کە لە فریشتەکاندا خۆی دەنوێنێ ، بەهێزی چەپەڵەوە ، کە لە شەیتان و سوپای دا خۆی دەنوێنێ ، ئاشنایەتی پەیداکردن لەگەڵ جنۆکەکان و ڕوحەکاندا .

[٢٤] لەبارەی سۆفیگەری کتێبی ( حقائق عن التصوف عبدالقادر عیسی) لە ژێر چاپدایە و وەرمان گێڕاوە و ڕاڤەمان کردووە.

(٣) ئاشنابوون بەنامە ئاسمانییەکانی خوای گەورە ، بەمەبەستی دیاری کردنی دروشمەکانی حەق و بەتاڵ ، خێرو شەڕ ، حەڵاڵ و حەرام ، چاك و خراپ.

(٤) ئاشنابوون بە پێغەمبەرانی خواو ڕەوانەکراوانی ، کە خوا هەڵی بژاردوون ببنە دروشمی ڕێنومایی و پێشڕەوی خەڵك بەرەو حەق و راستی .

(٥) ئاشنا بوون بە ڕۆژی پەسلاّن و قیامەت و ژیانی دوای مەرگ ، بەزیندووبوونەوەو پاداشت و سزاو ، بەهەشت و دۆزەخەوە .

(٦) بڕوا بوون بە(قەدەر) ی خوا کە سیستەمی بوونەوەر لە سەری دەڕوات لە دروست کردن و هەڵسوڕاندا .

ئەمە چەمکی بڕوایە ، ئەمە عەقیدەیە ، ئەم بڕوایەیە خوای گەورە لە کتێبەکانی خۆیدا ڕەوانەی کردووە بە پێغەمبەرانی سپاردووە ، کردوویە بە ڕاسپاردەی پێشینان و پاشینەکان)[٢٥].

بێگومان موعجیزەی پێغەمبەران و صدیقینەکان و کەرامەتی ئەولیایان و ئەزمونەکانی زانایان و چەمکە هزرییەکانی فەیلەسوفان و زانایانی کەلام سەلمێنەری ئەم (٦) پایانەن ، کە ئایدۆلۆژیاو عەقیدەی ئایینە ئاسمانییەکانیان لەوانە ئیسلام لەسەری دامەزراوە .

(ئالن کاردك) لەکتێبە ناودارەکەیدا بابەتێك دەنووسێ بە ناوی (پوختەی زانیاری ڕوحەکان) : دەنووسێ : ئەو ڕوحانەی لە ڕێگای ئامادەکردنی ڕوحەکان لەگەڵیاندا قسەمان کردووە ، گوتویانە ئەوانە ڕوحەکانن ، یان جنۆکەکانن یا ڕوحی مردووانن ، رابردوو لە زەوی دا ژیاون و ئێستا ئەوان دونیای ڕوحی پێك دێنن ، وەکوو چۆن ئێمە لەماوەی ژیانی زەمینی دا ژیانی جەستەیی پێك دێنین.

[٢٥] الفكر السياسى / فائز صالح اللهيبي / د.بان غانم الصائغ / د.احمد فكاك البدراني / ل:٦٠

ئەوان دەڵێن : (خوا ئەزەلی یە و ناگۆڕێ ، ماددی نییە ، تاکە ، توانایە بەسەر هەمووو شتێ دا ، زۆر دادوەرە تا ئەو پەڕ پاکەو بێ گەردە).

(ئەو گەردوونی دروست کردووە ، کە هەمووو ئەو بوونەوەرانە دەگرێتەوە خاوەن ژیانن ، یان بێ ژیانن ، واتە : بوونەوەرە ماددییەکان و نامادییەکان).

(بوونەوەرە ماددییەکان جیهانی بینراو (المنظور) پێك دێنن ، واتە : جەستەیی ، بەڵام بوونەوەرە ناماددییەکان گەردوونی نادیار یان جیهانی ڕوحی پێك دێنن ، کە مەبەست دونیای ڕوحەکانە).

(دونیای ڕوحی دونیای بنەڕەتی و نەمرو بەرجەستەیە ، بەر لە شتەکان هەبووەو دوای شتەکان دەمێنێتەوە).

(دونیای جەستەیی هەبووەو یەکەی بە پلەی دووەم دێ و لاوەکی یە ، هەبێ و نەبێ جیاوازی نییەو کارناکاتە سەر جەوهەری دونیای ڕوحی).

(بەکاتی ڕوحەکان بەرگێکی ماددی و زوو ڕەفتەنی دایدەپۆشێ کاتێ ئەم بەرگە بەمردن شی دەبێتەوە ڕوح ئازادی وەردەگرێتەوە).

هەروەها دەڵێن : (پەیوەندی ڕوحەکان لەگەڵ خەڵکی دا بەردەوامە ، ڕوحە چاکەکان هەوڵ دەدەن ڕێنمامان بەرەو چاکە بکەن لە ئەزموونی ژیاندا بەهێزمان دەکەن ، ڕوحی چەپەڵ بۆ خراپە رامان دەکێشن ، گەردەبینن دەکەوینە ئازارەوە یا خۆش حاڵ دەبن)[٢٦].

ئەوان دەڵێن : ڕوحەکان پلەیان جیا جیایە لە تواناو زیرەکی و زانایی و ڕەوشتدا ، ڕوحە پلە یەکەمینەکان ڕوحی بەرزن بە کەمال و زانیاری و نزیکی لەخواو چاکە خوازییان جیا دەکرێنەوە ، ئەوان فریشتەکان و ڕوحە پاکەکانن ، پلەکانی تر وردە

---

[٢٦] کتاب الارواح / الن کاردك / ل: ٢٥-٢٦ سەیر بکە.

ورده له كەماڵ دوور دەكەونەوە ، پلەی هەرە خوارووییان زۆربەی شەهوەتی خۆمان هەڵدەگرن لە كینەو ئیرەیی و خودپەرستی ، بەزیان دڵخۆش دەبن لەو نێوانەدا ڕوحانێ هەیە زۆر باش نین و زۆر خراپ نین[٢٧].

دیسان گەر بڕوانینە كتێبی (على حافة الالعالم الاثيري / ج. ارثر فندلاي) دەبینین لە ڕێگای ئەزموونە ڕوحیەكانەوە دەگاتە ئەو ئاست و بڕوایە شاهیدی بدات و بڵێ : هەمووو ئایینەكان بنەمایەكی ڕوحیان هەیە ، زۆر بەگرنگی یەوە ئەوەم خوێندەوە لەبارەی ئیسلام باست كردووە (كە مەبەست ڕوونكردنەوەكانی فەهمی ئەبولخێرە وەگێڕی كتێبەكە) ، من پێم وایە (محمدﷺ) وەكو (عیسا –علیه السلام) پیاوێكی ڕوحی بووە ، كە ئیمڕۆ بەناوەندی ڕوحی بالاّ ناودەبرێن[٢٨]. بەم شێوەیە دەبینین ئەزموونە ڕوحیەكانی تازە لە خۆرئاوادا هەمان پەیام پشت ڕاست دەكەنەوە ، كە نامە ئاسمانییەكان و قورئان بەئێمە گەیاندووە ، ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْـَٔافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾ فصلت: ٥٣

یەكەم هەنگاوی توێژینەوەی ڕوحی لە ئەمریكادا لە مانگی مارسی (١٨٤٨) دا دەستی پێ كرد ، دوای ڕوودانی دیاردەیێ لە گوندی (هید سفیل) ، كە وەكو تارمایی یەك خۆی پیشان دەدات و هاوار دەكات ئەو ڕوحی پیاوێكە لەو ماڵەدا نیشتەجێ بووە ، دراوسێ كەی ئەوی كوشتووەو لەوێ دا ناشتوویەتی تا ماڵەكەی ببات ، لەم كاتەوە لە ساڵێ (١٨٥٤)وە دەركەوتنی ئەو دیاردە ڕوحی یانە سەرنجی زانایانی ئەمریكای ڕاكێشا تاوەكو لێكۆڵینەوەی زانستی یان بۆ بكەن ، نموونەی قافڵەی ئەم زانایانە لە ئەمریكادا (John worth Edmond) بوو ، سەرۆكی كۆنگرێسی شیوخی ئەمریكی لە ساڵی (١٨٧٤)دا و ئەندامی كۆڕی زانیاری ئەمریكی ، دوایی (Roberd Hare) بوو مامۆستای كیمیا لە زانكۆی هارفارد ، كە لە ساڵی (١٨٥٨) دا دەمرێت ، نموونەی تر

---

[٢٧] كتاب الارواح / الن كاردك / ل: ٢٧.

[٢٨] على حافة العالم الاثيري / ل:١٣.

وەكو (ئـەبراهام لنكـولن/١٨٦٢) و ئەديسـون (١٨٧٨) ، يەكـەم كۆمەڵـەى توێژينــەوەى ڕوحـى ئـەمريكى (A.S.P.R) بـۆ سـاڵى (١٨٨٩) . (وليـام جـێمس) ئـەم نـوژداره سـاڵى (١٨٧٦) دەگۆڕێ بە دەروونـزانى فسيۆلۆجى و مامۆستاى فەلسەفە لەزانكۆى هـار فـارد ، لە توێژينەوەكانى دا زۆرێ لە دياردەكانى گەردوونى ناديار دەسەلێنێت.

هاوكات لە بەريتانيا توێژينەوەى ڕوحى دەستى پێ كـرد ، زۆر گـەوره پيـاو بـەم كـاره هەڵسـان وەكـو (ئوجسـتون دى مورجـان / ١٨٠٦ – ١٨٧١) و سـێروليام كـرۆكس (١٨٣٢ – ١٩١٩) و سێر ئوليفەر / لودج (١٨٥٢-١٩٤٠) (ئيدوار رانـدال).

ساڵى (١٨٧٣) يەكەم كۆمەڵەى توێژينەوەى ڕوحى لەم وڵاتەدا دەستى پێ كـرد ، ديسـان لەساڵى (١٨٨٢) (نارتـەر فندلاى) دەركەوت ... دوايى لە فەرەنسادا لەسەر دەسـتى (بـول جيبية) (١٨٥١ – ١٩٠٠) دەستى پێ كرد و گەشەى كرد.

لەدواى ئەمەدا زۆر تيۆرى ڕوحى سەريان هەڵدا وەك لەم كتێبەدا دەيان بينين.

## ئيعجازى (١) : تيۆرى لەرەلەرەكان (الذبذبات)

ئـەم تيـۆره پێـى وايـە گـەردوون لـە جيهـانى جـۆراو جـۆرێـك دێ ، هـەر جيهانـە لـە گەردەكان (الجزيئات) و ئەوان لە گەرديلەكان (الذرات) پێك دێن ، گەرديلـە نـاوكێكى هەيـە لەپرۆتۆنـەكان پێـك دێـن و چـەقى قورسـايى يـە و بارگـەى كارەبـايى موجـەبى هـەلگرتووه ، ديسـان نيـوترۆنى هـەلگرتووه هاوبارگەيـە بـڕێ لـە پرۆتـۆن سـووكتره ، لەدەورى ناوكدا ئەليكترۆنـە سالبەكان هەيـە لـەدوورى يـەكى چـەند خولگـەيى دا بـە

دەوری ناوکـدا بـە بازنــەیی دەســووڕێنەوە ، وەکـوو ســووڕی هەســارەکان بـەدەوری خۆردا[29].

ئەم دوورییانە ڕێژەیین ، بەلاّم لـە خولگەیێکـەوە بـۆ خولگـەی تـر بـاز دەدەن تیشـك دەدەنـەوە یـان وزە دەمـژن ، بـەهۆی بچووکی نـاوك و خێرایـی ئەلیکترۆنـەکان ، هـەر چەندە میکرۆسکۆب و وردبینی ئەلیکترۆنی ناتوانن ، نێو بڕی ئاشکرای تێدا دابنـێن ، بەلاّم زانایان ئەوە بەڕاست دەزانن لەدەوری ناوکدا هەورێکی چڕی ئەلیکترۆنی هەیە ، کاتێ لەم دوو سنوورەدا لەرەکانی زیادو کـەمیان کـرد (٣٨٠ – ٧٦٠) بلیـۆن لەرەلـەر لـە چرکەیەکدا هەستەکانمان ناتوانن پەییان پێ ببەن.

بەو پێیە هەمووو شتێ لەگەردووندا لەرەلـەری هەیـە لـەناو چـەند شـەپۆلێکی دیـاری کراودان ، ژیان بێ جووڵـە نـابێ ، ژیـان هەمیشـە لـە جووڵـەو بزوتنەوەدایـە ، تـا ئـەو لەرانە خێراتر ببن ناسکترو ڕوونتر دەبن ، لەرەی گازەکان لە لـەرەی شـلەکان زیـاترە ، لەرەی شلەکان لە لەرەی تەنە ڕەقەکان پترە ، تەنە ڕەقەکان لە کۆتایی دا تەنیا چەند جووڵەیەکن ، ڕووناکیش چەنـد جووڵەیێکە.

زانسـتی ڕوحـی بـاس لـە لەرەلـەر دەکـات ، سـەیری ژیـانی ڕواڵـەتی دەکـات لـە چـەند لەرەیــەك وزەی شــاراوە و مــات لــە هــەمووو شــێوەکانی ژیانــدا ، هــەمووو شــتێ لــە گەردووندا لەرەلەری هەیەو تیشك دەدات وەکو باسمـان کـرد ، لەرەلـەری کەسـانی نـاو

---

[29] (گەردیلە) یەکەم جار (دیموکرتیس) پێی وت (Atom) واتە : لەت نەکران ، بەلاّم قورئان فەرموویەتی ( ولا أصغر من ذلك) یونس ٦٧ ، واتە : بچووکتر لە گەردیلە ، دیسان قورئان ئاماژە دەکات گەردیلە سەنگی هەیە (مثقال ذرة) (یونس ٦١) ، دوای لەتکرانی گەردیلە لەسەدەی بیستەمدا بینرا تیرەی گەردیلە (١/١٠٠,٠٠٠,٠٠٠) سم و تیرەی ناوکی (١/١٠,٠٠٠) تا (١/ ١٠٠,٠٠٠)سم لەتیرەی گەردیلە.
پاشان دوای دۆزینەوەی ئەلیکترۆنەکان و پرۆتۆنەکان و نیوترۆنەکان بینرا ، دەیان تەنۆلکەی تر دۆزراوە وەکو لە (گەردیلەناسی)دا باسمان کرد ، ئیمرۆ لە ڕێگای میکرۆسکۆبی ئایۆنی و ئەلیکترۆنییەوە دەتوانرێ گەردەکان ببینرێن دوای ئەوەی (٥) ملیۆن هەندەی خۆیان گەورە دەکرێن وە بە میکرۆسکۆبی نانۆمەتری گەردیلە دەبینرێ (المادة والطاقة/ د.خالد).

جیهانی ڕوحی لەرەلەریان لە لەرەلەری گیاندارانی زەوی زیاترە ، بەلاّم بۆ ئەوەی جیهانی زیندووی ڕوحی بتوانن پەیوەندی بە جیهانی زیندوووی زەوییەوە بکەن پێویستە ئەوانەی لە ناوەندی زەوی دا دەژین لەرەیان بەرزتر بکەنەوە ، ئاسانترین ژوان لە ناوەندی ڕێگا دا دەبێت.

هەندێ زانا گەیشتونە ئەم بڕوایە لێرەدا چەند جیهانێ هەیە لەناو یەکتری دان و هەمان بۆشایی داگیر دەکەن و هەست پێ ناکەین ، هەر جیهانە لەرەی تایبەتی و شەپۆلی تایبەتی خۆی هەیە لە درێژی شەپۆلی جیهانەکانی تر جیاوازە ، هەستەکانی ئێمە تەنیا پەی بە مەودایێکی کەمی ئەو شەپۆلانە دەبەن دەکەونە بەر پێنج هەستەکانمان و مێشك وەریان دەگرێت ، چاو تەنیا ئەو شەپۆلانە دەبینێ لەرەیان لە (٣٠٠.٠٠٠) کەم لە چرکەیەکدا زیاتر نییە ، گوێچکە ئەو دەنگانە دەبیستێ لە نێوان (٢٠) و (٢٠.٠٠٠) لەرەلەر دایە لە چرکەیەکدا ، هەمان شتیش لەبارەی بۆن و چێژو بەرکەوتن دەگوترێت ، کە هەر کام لەوانە لە کۆمەڵە لەرەلەرێکی دیاری کراو دروست دەبن بە دەماری لووت و زمان و پێستدا ڕەت دەبن . وەکوو چۆن لەرەی کارەبایی بە تەلی تەلەفۆندا دەڕوات ، دیسانەوە هەستی بینین لەو ڕووناکییەوە پەیدا دەبێ کار لەچاودەکات ، ڕووناکی بەهۆی لەرەلەر لەناو (ئەتیر) دا پەیدا دەبێت ، دیسان هەستەکانمان لەپەی پێ بردنی هەرچی لە دەورمانە بێ توانان.

زانای ناودار تۆماس یۆنگ (Thomas yong) بڕیاری داوە زانست ڕێگر نابێ لە بەرامبەر بوونی جیهانی تردا یەکتری ببڕن ، لە زانستی سروشتی دا هیچ ڕێگری یەك نییە لەرەلەری جیا جیا هەبێ لە ئەتیر (الاثیر) دا ، سنووری ئەو لەرە لەرانەی زیندەوەران هەستیان پێ دەکەن لە نێوان (٣٤٠٠٠) و (٦٤٠٠٠) لەرەلەر دایە لەیەك ئینجدا.

(فیسا گۆرس) تا (ئەنیشتاین) دووپاتیان کردۆتەوە گەردوون و هەرچی لەناوی دایە بەشی بینراو و نەبینراوی لە (لەرەلەر) دایە ، شێوەی دونیاکان و زیندەوەران بەپێی

جیاوازی خێرایی لەرەکانیان جیاوازییان دەردەکەوێت ، دیسان ماددەی (ئەتیر) لەرەی ماددەو پەیوەندی نێوان کارەباکانیان رێك دەخات ، بەو پێیە هەمووو تەنێکی ڕەقی هەست پێ کراو تەنێکی تری ئەتیری لەناو دایە هەستی پێ ناکرێ و کارەبایی یەکەی دەسەتێتەوە و توند و تۆڵیەکەی دەپارێزێت.

(ئەتیر) بەپێی بۆچی زانای مەزن (ئارتەر فندلای) ئالقەی پەیوەندی نێوان جیهانی ماددی و ڕوحە[٣٠]، هەرچی لەگەردووندایە بینراو و نەبینراو بێ ، ڕەق بێ یان گاز بێ ، وزە بێ یان کارەبا ، ڕووناکی بێ یان ڕەنگ ، یان بۆن بێ . بەردەوام لەدرێژایی یەکی شەپۆلی دیاری کراودا دەلەرێنەوە ، تا ئەو تا ئەلەرەی پتر بێ ماددە ناسکترو ڕوون تر دەبێ ، لەبەر هەستەکانماندا ، ئێمە لە ڕێگای لەرەی ئەلکترۆنەکان و پرۆتۆنەکانەوە هەست بە تەنی ڕەق دەکەین لە (چەقە دەمار)ی هەستی لەشماندا ، گەر تەنی ڕەق لەرەی زیاتر بوو لەبەر چاوی هەستەکانمان دەبێ بە ڕووناکی ، پاشان ڕەنگ و دوایی بزردەبێت[٣١].

---

[٣٠] ئارتەر فندلای دەنووسێ : (مرۆڤ لە لەش و دەروون و گیان پێك دێ ، لەش ئەوەیە دەیبینین ، دەروون هزرە ، گیان لە لەشی ئەتیرە ، کەپێکاو پێکی شێوەی لەشی فیزیایی یە ، ئەو لەشەیە لەشی فیزیایی پێکەوە دەبەستێتەوە مردن تەنیا جیابوونەوەی لەشی فیزیایی پێکەوە دەبەستێتەوە ، مردن تەنیا جیابوونەوەی لەشی ئەتیرە لە لەشی ماددی ، ئەو لەشە ئەتیرە هزرو دەروون هەڵدەگرێ ، ئەوکاتە لە ڕووی ئەتیرەوە ئەك ماددییەوە سەیری گەردوت دەکرێ ، جیهانی ماددی گوێی پێ نادرێ ، بۆشایی (ئاسمان) ماددەیێکی حەقیقی یە لەرەلەری پترە ، ئەو جیهانی راستی یە گوێ ی پێ دەدرێ ، ئەو گەردوونەکی نەگۆڕە ، بەڵام گەردوونی ماددی گۆڕانی بەسەردا دێ و لەناو دەچێ ، لە گەردوونی ئەتیردا لەناوچون نییە ، هەمووو شتێك نەگۆڕو ڕێکە ) (على حافة العالم الاثيري / ل: ٢٥) .
(مامۆستای یۆگا) (چوکوك سوی) دەڵێ : (ئەو کەسەی کۆمپیوتەر بەکاردێنێ تۆ کۆمپیوتەرێك نیت ، ئەو منی ، تۆ گیانی) (لەش وەکو ترومبێلێکە ، گیان وەکو شوفێرەکەیەتی).

[٣١] ماددە چوار دۆخی هەیە : (ڕەق ، شل ، گازی ، پلازما) پلازما لەخۆردا هەیە کە پلەی ماددەی لەسەروی گازی دایە ، چونکە پلەی گەرم ناخی خۆر (٢٥) ملیۆن پلەی سەدی یە، دیسان باس لە دۆخی ماددە دەکرێ وەکو (دۆخی ماددەی تاریك) کە لە ٩٠٪ ی گەردووی ماددە پێکدەهێنی و چالاکە.

وەكو (سوورو پرتەقاڵی و زەردو شین) تەنیا لە هەستەكانماندا بوونیان هەیە ، ڕەنگی سوور بەخێرایی (٤٣٥) بلیۆن لەرە لە چركەیەكدا دەكەوێتە سەری ، ڕەنگی پرتەقاڵی بە خێرایی (٥٠٠) بلیۆن لەرە لەر لە چركەیەكدا و (زەرد) بەخێرایی (٥٢٠) بلیۆن لەرە لە چركەیەكداو شین بەخێرایی (٦٣٥) بلیۆن لەرەلەر لەچركەیەكدا دەكەونە بەر گوێچكەوە ، ڕەنگەكان تەنیا چەند ئاستێكن لە زنجیرە لەرەلەرێكی گەردوونی دیاری كراودا و چەند دیاردەیەكی چەند دۆخێكی وزەن و هەستەكانمان ڕەنگیان پیشان دەدەن[٣٢].

بێگومان گەر سەیرێكی قورئان بكەین وەكو سروش و موعجیزەی پێغەمبەر ﷺ و دوانامەی ئاسمانی پێغەمبەرایەتی، هەمووو ئەو ڕاستی یە ڕوحییانەی ڕوون كردوونەوە ، زانستی ڕوحی نوێ تەنیا ڕوونكەرەوەو پاڵپشتی ئەو ڕاستی یە قورئانیانەیە ، لەبارەی حەقیقەتی دونیای ڕوحی شیكاری داوە .

قورئان ئاماژە دەكات گەردوون لەگەردیلە پێك دێت : ﴿ وَمَا يَعۡزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثۡقَالِ ذَرَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ وَلَآ أَصۡغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكۡبَرَ ﴾ يونس: ٦١ .

گەردیلە لای (دیموكتیس) لە (Atom) ناو دەبرێ واتە : (لەت نەكران) ، چونكە پێیان وابووە بەش ناكرێت ، گەردیلە بچووكترین بەشی توخمی كیمیایی یە ، كە دەتوانێ پارێزگاری لە سیفەتە كیمیایی یەكانی توخمەكان بكات ، گە ئێمە یەك ملیۆن گەردیلە ریز بكەین لەسەر یەك هێڵ درێژی گرێ ی پەنجەێ ، یەك خاڵ لە قەڵەم رەساس لەسەر پەڕەیێ ئەوەندەی (٧) ملیار گەردیلە دەبێ ، واتە كۆی

---

(ولیەم فالكیر ئەتیكنسون) دەڵێ : (ماددە شێوەی ڕەقی ڕوحە ، ڕوحیش شێوەی ناسكی ماددەیە ، لەسروشتدا یەك جۆر ماددە هەیە ، شێوەی جیا جیا وەردەگرێ ، بەڕەق دەست پێ دەكات و بەگیان یان ئەتیر كۆتایی دێت) ، دەڵێ : (بیر) شێوەی ناسكی ماددەیە .
(قوة الفكر في الحياة العملية / ت : د.رؤف موسى الكاظمي / ل:٨٣) .

[٣٢] دراسات في العالم الروح / ل: ٢١-٢٤ .

دانیشتووانی زەوی دەبێت ، لەکاتی یەك پێ گرتنی گەردیلەکان، گەرد (الجزئي) پێك دێت ، بەهۆی بەستەری قایم یەکتر دەگرن ، ئێستا بە میکرۆسکۆبی ئەلیکترۆنی (گەرد) دەبینرێ دوای ئەوەی (٥) ملیۆن هەندەی خۆی گەورە دەکرێت ، تیرەی گەردیلە (٨ - ١٠)سم ، تیرەی ناوکی (١/١٠,٠٠٠) تا (١٠٠,٠٠٠) هەندەی تیرەی گەردیلەیە ، گەردیلە (الذرە Atom) یە تازە بەتازە خەریکە ببینرێ ، دوای داهێنانی میکرۆسکۆبی ئەلیکترۆنی و ئایۆنی و میکرۆسکۆبی (نانومەتری) ، کە لە دەرزیلەیێ پێك دێ تیشك دەخاتە سەر گەردیلە گوزرەکان تا هەسیان پێ بکات و پاشان لەسەر شانەی تایبەتی یان پیشان بدات[٣٣]. وە لەناو گەردیلە رژێمی خۆر هەیە ، ئەلیکترۆنەکان بەدەوری ناوکدا دەخولێنەوە ، گەر بڕوانینە ئەم ئایەتە دەبینین پیشانی دەدات گەردیلە جەوهەری تاك نییە ، لە وشەی (اصغر من ذلك) دەر دەکەوێ کە لەت دەکرێ و بۆ چەندان بەشی بچووك و تەنۆلکە دابەش دەکرێ ، وەکوو (ئەلیکترۆن و نیوترۆن و پرۆتۆن) ، گەردیلە کێش و پێوانەی هەیە ، زەوی و تەواوی تەنەکانی ئاسمان لەگەردیلە پێك دێ ، گەردیلەکان هەموویان یەك جۆرە ، ئەوانە توخمەکان (العناصر) ی کیمیایی پێك دێنن ، کە تا ئێستا (١١٠) توخم دۆزراوەتەوە .

دیسان گەردیلە بنەمای وزەی شاراوەیە ، بۆ نمونە : یەك گرام (یۆرانیۆم / ٢٣٥) لە یەك کاتژمێردا (٢٢,٩) ملیۆن وات دەبەخشێت ، ئەمەش لەکاتی کەرت بوونی ناوکی (الانشطار النووي) دا ڕوودەدات ، بەلاّم لەکاتی یەك بوونی ناوکی (الاندماج النووي) دا لە هایدرۆجین دا یەك گرامی لەکاتژمێرێکدا (١١٧,٥) ملیۆن وات وزە دەبەخشێت ، بەلاّم لەکاتێ دا ماددەی ئاسایی و دژە ماددە (المادة المضادة) بەر یەك دەکەون وزەیەك دەبەخشن هەزار هەندەی تەقینەوەی بۆمبای هایدرۆجینی دەبێت[٣٤].

---

[٣٣] بۆ زانستی پتر بڕوانە (گەردیلە ناسی) نووسەرو (المادة والطاقة / د.خالد فائق العبيدي/ ل:٦).

[٣٤] الذرة من الالف لای الياء / ك كلاد كوف / ل:٢٥-٢٦ بەکورت کردنەوە .

ئەتیریش گەردیلەی خۆی هەیە وزەکەی لە سنوور بەدەرە ، ئەتیرە ماددەی بونـەوەری راستەقینە و ئەو وزەی رەهاو راستەقینەی هەیە .

(مورس کلاین) دەنووسێ : (ماکسویل) دەتوانی بیسەلمێنێ (شەپۆلە کەهرومۆگناتیسی یەکان) بەخێرایی ڕووناکی بەناو (ئەتیر)دا دەگوازرێنەوە ، هەر لەسەردەمی نیوتنەوە (ئەتیر) بەناوەندێ دانراوە بۆ گواستنەوەی ڕووناکی[35].

(ئەنیشتاین) خاوەنی (تیۆری ڕێژەیی) دەری خست شوێن و کات رەها نین و هەردووکیان ڕێژەیین ، بەبێ جووڵە کات پەیدا نابێ ، دیسان سەلماندی ڕووناکی وەکو تەنۆلکە ماددییەکان مامەڵە دەکات ، ئەویش بارستایی هەیە ، دیسان وزە بارستایی هەیە .

(ئەنیشتاین) دەڵێ : زەمانی ڕەها وجودی نییە ، بەڵکو پەیوەستە بەجووڵەوە ، دیسان شوێنی ڕەها نییە بەڵکو پەیوەستە بە شتانەی شوێنێ داگیر دەکەن[36].

(د.انور الجندي) دەنووسێ : لە کۆتایی دا زانست سەلماندی ناونانی ماددەو وزەی سەربەخۆ ڕاست نییە ، بەڵکو لێرەدا ماددەی بەستو هەیە شێوەی ماددە وەردەگرێ ماددەی تیشکدەرەوە (المشعة) هەیە شێوەی وزە وەردەگرێ ، بەردەوام بە یاسایەکی نەگۆڕ بۆ یەکتری دەگۆڕێن .

بناغەی سەرەکی ماددەو وزە تیشکە ، کە یەکێکە لە توخمەکانی ڕووناکی ، ڕووناکی خاڵی دەست پێ کردنە ، بوونەوەر هەمووی لەڕووناکی دروست بووە ، کەواتە : ئ ئەم راستی یە ێمە بۆ یەك جەوهەرو هێز دەبات .

---

[35] الرياضيات والبحث عن المعرفة / ت: سمير ياسين يوسف / ل:١٤٤.
[36] اينشتاين والنظرية النسبية / د.محمد عبدالرحمن مرحبا / ل:١١٢.

ئەمەش ئەم ئایەتە پشت ڕاست دەکاتەوە : (الله نور السموات والارض) ، بەم شێوەیە ئەم تیۆرە ماددییەی قوتابیان لەزانکۆکان ، دەیخوێنن هەرەسی هێناو هەڵەی تیۆری جەوهەری تاك ئاشکرا بوو[٣٧].

گەر بڕوانیە کتێبی (المسلمون وعلم الحدیث/ د.عبدالرزاق نوفل) و کتێبی (الامام الصادق کما عرفه علماء الغرب/ مجموعة من المستشرقین/ ت: د.نور الدین) دەبینی زانا موسڵمانەکان وەکو (ئیمام عەلی) و (ئیمام جەعفەری سادق) و (حجة الاسلام الغزالي) و (العلامة ابن سینا) بەر لە ئەنشتاین ئاماژەیان بە بینینی کات و شوێن کردووە ، ئاماژەیان کردووە ڕووناکی چاوگی گەردوونە ، ڕووناکی کێش و بارستایی هەیە . لە دوعایەکی (زین العابدین) دا (علیهم السلام) هاتووەوە : (سبحانك تعلم وزن النور والظلمة)[٣٨].

یان ئیمام عەلی (ﷺ) فەرموویەتی: (وان الذرة لتحرق الالعالم)[٣٩] ، گەردیلە جیهان گڕ دەدات ، یان (ابن سینا) لە (الاشارات) دا دەنووسێ (هەمووو تەنێ شوێنی هەیە و بۆشایی هەیە، وەکوو ئاو لە قاپدا) لە کتێبی (النجاة) دا دەنووسێ : (لەگەڵ جووڵەدا نەبێ بیر لەزەمەن ناکرێتەوە ، گەر هەست بەجووڵە نەکرا ،هەست بەکات ناکرێت).

بەم شێوەیە دەبینین زانا موسڵمانەکان بەر لە زانایانی خۆرئاوا ئەم ڕاستی یە جەوهەرییانەیان باسکردووە ، کە لە قورئان هەڵیان هێنجاون و وەریان گرتون .

قورئان ئاماژە دەکات (ڕووناکی) چاوگی بوونەوەرە ، ڕووناکی بریتییە لە لەرەلەرو چەند شەپۆلێك دەکەونە سەر یەکتری : ﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشْكَوٰةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ ۖ ٱلْمِصْبَاحُ فِى زُجَاجَةٍ ۖ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّىٌّ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ

---

[٣٧] تأصيل مناهج العلوم والدراسات الانسانية / ل:٢٠.
[٣٨] سلوا عليا / هشام ال قطيط / ل:١٣٢ / ل:٣٨٢.
[٣٩] سلوا عليا / هشام ال قطيط / ل:١٣٢ / ل:٣٨٢.

زَيْتُونَةٍ لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيٓءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ ﴾ النور: ٣٥ ، لێرەدا قورئـان دەری دەخـات وزەو ڕووناکی چـاوگی بوونـەوەرە ، شـەپۆلە ڕووناکییەکان دەکەونە سەر یەکتری و هەر ڕەنگە شەپۆلی جیای خۆی هەیە ، قورئـان فەرموویـەتی : ﴿ فَلَآ أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَا لَا تُبْصِرُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ﴿٤٠﴾ ﴾ الحاقة: ٣٨ – ٤٠ ، واتـە : سوێند بـەو شتانەی دەیـان بیـنن و نایـان بیـنن ، ئـەم قورئانە قسەی سەر زاری پەیامبەرێکی بەڕێزە.

دیسان پێغەمبەر ﷺ لەبارەی ئاسمان دەفەرمووێ : (هذا موج مكفوف عنكم) رواه ابن ابي حاتم ، وەکوو لـە (گەردوونناسـی) و (گەردیلـە ناسـی)دا باسکرا، قورئـان و فەرمووده ئاسمان و ڕووناکی و تەنەکان دەکەن بە دوو بەشەوە ، بینـراو و نـەبینـراو ، ماددەو ئەتیر ، گەردوون بە شەپۆل و ڕووناکی ناوزەد دەکەن .

(ج.اج.رایز) ئاماژە دەکات : ئەو شەپۆلانەی بەهۆی هەست کـردن بـە ڕووناکی پەیـدا دەبـن ، بەشـێکن لـەکرداری فراوانـی تیشـکە نـەبینراوەکان ناسـراو بـە (شـەپۆلی کەهرۆموگناتیسی) کە تەواوی دونیای فزیایی یان پڕ کردووە ، سیفەتەکانی پشت بـە ئاستی لەرە لەر دەبەستێ ، لـە نێوان ریزبەندییـەکی هێواشـدا لەهـەر چـرکەیەکدا ڕوودەدا ، جار هەیە لە چرکە کەمترە و لەرەلەرەکە دەگاتە(بلیۆن بلیۆن لـەرە لـەر لـە چرکەیەکدا) و بە زمانی ماتماتیکی بە (٢٤١٠) پلە ناو دەبرێت، ئاماژە دەکات چاو ئـەو مەودایـەکی کـەم لـەو لەرانـە دەبینـی ، کـە مـەودای (٤٠٠ – ٧٥٠) بلیـۆن لـەرە لـە چرکەیەکدا داگیر دەکەن و بە (ڕووناکی بنیراو) دەناسرێن).

گوێچکە ئەو دەنگانە دەبیستێ لەنێوان (٣٠-١٦٠٠٠) لەرە دایە لـە چـرکەیەکدا ، کەچـی شەمشەمە کوێرە ئەو دەنگانە دەبیستێ (٥٠٠٠٠) لەرەیە لە چرکەیەکدا[٤٠].

---

[٤٠] عصر الخوارق / ج.اج. رایز / ل : (١٩) / ت: ماجدة صبيح / بەکورت کردنەوە.

هەروەها ئەم زانایە ئاماژە دەکات (تلەپاتی) و دیاردەکانی کاری نائاسایی تر لە نێوەندێکی ماددیدا روونادەن ، لەسەرووی کات و شوێن دێنە ئاراوە ، بۆ نمونە : (تاقی کردنەوە لە نێوان ژێر دەریایی ئەتۆمی (توتیلوس) و هەندێ لەو کەسانەی بۆ تلەپاتی راهێنرا بوون لەسەر کەنار ، دیسان لەسەر هەندێ ئاژەڵی وەکو کەروێشك کراوە ، گۆڤاری (سپۆتنیك) ی رووسی باس دەکات دوو کەس لە دەوری (١٨٠٠) میل تلەپاتی پێکەوە دەکەن ، ئەم تەلەفۆنە روحی یە گورج لە نێوان کەسەکاندا روودەدات ، هەمووو بەڵگەکان ئەوە پیشان دەدەن تلەپاتی و پەی پێ بردنی هەستی نائاسایی (الادراك الخارق) لە ئاستێکی نا ماددی دا روو دەدەن ، ئەم رایە لە هەمووو ئەزموونانە وەرگیراوە زۆر لە مێژە ئەنجام دەدرێن ، دیسان گەر هاندەرەکان تلەپاتی (التخاطر) هان بدەن و بە جووڵەیەکی ماددی جولابان دەبوایە جیاوازی هەبایە لە نێوان گواستنەوەی هزری دا لە بواری ماددیدا ، چونکە رووناکی خۆر بۆ زەوی بە (٨) خولەك دەگات ، ماددەی نێوان خۆرو زەوی (٩٣) ملیۆن میلە، لێرەدا دەر دەکەوێ ئەزموونی تلەپاتی ئەم ماوە زەمەنییەی نییەو گورج لەنێوان دوو کەسدا روودەدات[41].

دیسان قورئان و سوننەت ئاماژە دەکەن گەردوونی ماددی لە ناو گەردوونی ئەتیردایە لە چەند نێوەندێکی فرە لەرەلەردا ، پێغەمبەر دەفەرمویَ ﷺ (ان جهنم محيطة بالدونيا ، والجنة وراءها ، والصراط طريق الى ذلك) رواه ابو نعيم (كتاب اصفهان). ، واتە : دۆزەخ دەوری دونیای داوە ، بەهەشت بەدوایدا ، پردی سیرات رێگاییێکە بۆ بەرەو ئەوێ .

بەو پێیە حەوت دۆزەخ و (حەوت) بەهەشت دەوری گۆی زەوی ماددییان داوە ، لەشێوەی گۆیی دا .

دیسان بەهەشتەکان دۆزەخەکان و زەوی و گەردوونی ماددی لە (٧) ئاسمانەکاندا ، ئەو حەوت ئاسمانانە کورسی گۆیی دەوری داون ، ئەنجا عەرش بە گۆیی دەوری

[41] عصر الخوارق / ج.اج. رايز / ل : (٣٧-٣٨) / ت: ماجدة صبيح / بەکورت کردنەوە.

کورسی داوە : ﴿ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبْعِ وَرَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴾ المؤمنون: ٨٦ ، ﴿ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ﴾ البقرة: ٢٥٥ ، ﴿ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ ﴾ آل عمران: ١٣٣.

(ابن جرير الطبري) لە (تفسير) دا گێڕاویەوە ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (ما السماوات السبع في الكرسي الاكدراهم سبعة القيت في ترس) ، واتە : حەوت ئاسمانەکان لە کورسی دا وەکو حەوت درهەمە لە مەتالێکدا ، (ما الكرسي في العرش الاكحلقة من حديد القيت بين ظهر فلاة من الارض) ، واتە : کورسی لەناو عەرشدا وەکو ئالقەیەکە فڕێ ی بدەیە دەشتێکی کاکی بەکاکی یەوە .

دیسان پێغەمبەر ﷺ ئاماژە دەکات زەوی گۆیی یەو عەرش گۆیی دەوری داوە : (وارضه مثل قبة) كنز العمال / المنتقي الهندي). واتە: زەوی وەکو گومەزێکە.

بەو پێیە جیهانەکان هەموویان لە پاڵ یەکتردان ، گەردوون یەك پارچەیەو خێرایی لەرەلەرەکان جیاوازی تێدا دروست دەکات، وەکو توێکڵەکانی پیاز وان لەناو یەکتریدا.

(د.علی الوردی) لە کتێبی (خوارق اللاشعور) و (الاحلام) دا ڕوونکردنەوەی جوان و بەپێزی لەم بارەوە داوە ، ڕای زۆر زانای گەورەی خۆر ئاوای خستۆتەڕوو .

(چنر) بڕوای وایە نەست (اللاشعور) توانای شتی بێ مەکانی هەیە ، چونکە شتێکی بێ ڕێ و جێگایە (المکانی) هەروەها (سینیل) لە (هەستی شەشەمی) کتێبەکەیدا دەڵێ : هەموو تەنێکی بوونەوەر لەرەو شەپۆلی ئەنێرێ تایبەتین و پێنج هەستەکان پەیان پێ نابەن ، پێ وایە (گلاندی سنەوبەری) بچووك لەخوار مێشکەوە لەلای (دڕکە مۆخەوە) هەستی شەشەمە ، کە هەست بەلەرەکان دەکات و هەندێ جار کاری تێ دەکەن .

دیسان دەڵێ : مۆخی مرۆڤ دەزگای بێ تەلە ، جیاوازی نێوان بێ تەل و هێز ئەوەیە . یەکەمیان ماددەی نائەندامییە لەشێوەی پاتری و تەلدایە ، دووەم ماددەی زیندوووە لە خانەی هەستیار پێك دێ ، کاری هەردووکیان یەك شتە ، شەپۆلی ئەتیری نادیارو نەبیستراو لەشێوەی شەپۆلی جیا جیا لێ حاڵی بوو بۆ هەستەکان ڕەوانە دەکات .

(دنکان) مامۆستای سروشتی لەزانکۆی نیویۆرکدا لە ڕابردوودا دەڵێ : (هەمووو تەنێکی بوونەوەر بێ بڕانەوە شەپۆل دەنێرێ بەر شتی دەوروبەریان دەکەون کاریان تێ دەکەن)[42].

لە فەیلەسوفانی ئیسلام و کورد (سوهرەوەردی) عیرفانی خۆی لەسەر فەلسەفەی (نور) دا دەمەزرێنێ (٥٨٧ ك — ١١٩١ ز) ئەم زانا مەزنە بەشەهیدی ئیشراق ناسراوە ئەو زۆر کتێبی هەیە ، لەوانە (هیاکل النور) و (حكمة الاشراق) ئەو پێی وایە جیهان هەموووی ڕووناکی یە . لە ڕووناکی ڕەهای خواوە سەرچاوەی گرتووە ، مرۆڤ کاتێ دەتوانێ ئەو ڕووناکییە خوایی یانە وەربگرێ لە ڕووی ڕەوشت و ئەخلاقدا پێ هەڵچووەو خۆی ماندوو کردووەو ڕەشتی ڕوحانی وەرگرتووە ، ڕووناکییەکان کزو پڕتەویان هەیە ، ئەستوورو ناسکیان هەیە [43] ، وەکوو باسمان کرد.

(د. انور الجندي) دەنووسێ : لەمێژ نییە زانست راستی یەکی ترسناکی سەلماند، کاری کردە سەر گۆڕینی تەواوی هێزی زانستی : زانست سەلماندی ماددەو وزە دوو شتی دژی یەکتری نین ، لێرەدا ماددەو وزە نییە ، بەڵکو وزەی بەستو (طاقة مجمدة) و تاقەت کراو هەیە شێوەی ماددە وەردەگرێ ، ماددەی تیشك دەرەوە(المادة المشعة) شێوەی وزە (الطاقة) وەردەگرێ ، بەردەوام بۆ یەکتری دەگوازرێنەوەو بەپێی یاسایێکی نەگۆڕ دەڕۆن ، بنەمای یەکەم بۆ ماددە یان وزە تیشکدانەوەیە (الاشعاع) ، تیشك دانەوە توخمێکی ڕووناکی یە ، ڕووناکی لە بنەرەتدا خاڵی دەست پێ کردنە ،

---

[42] خوارق اللاشعور / د. علی الوردی / ل: ١٥٣- ١٥٤.

[43] بروانە (التجليات الروحيه في الاسلام / د. جوزيبی سكاتولين / احمد حسن انور / ل : ٤٦٢.

هەمووو بوونەوەر لە ڕووناکی پەیدا بووە ، ئەم ڕێگایە ئاوا بەرەوبەرپابوونی یەك جەوهەرو یەك هێزمان دەبات ، ئەمەش راستی وتەی خوای گەورە دەسەلمێنێ (الله نور السماوات والارض) ، بەم شێوەیە تیۆری ماتریالستی هەرەس دێنێ و هەڵەی جەوهەری تاك دەردەکەوێ ، کە قوتابیان لەزانکۆکاندا دەیخوێنن!!.

لە دوعای (الجوشن الكبير) دا هاتووە ، کە کردومانە بە زمانی کوردی : (یا نور النور ، یامنور النور ، یا مصور النور ، یا خالق النور ، یا مقدر النور، یامدبر النور ، یانور قبل كل نور ، یانور بعد كل نور ، يا نور فوق كل نور ، يا نور ليس مثله نور) ، ئەم (دوعایە) هەزار ناوی خوای تێدایە ، یەکێکە لە دوعاکانی پێغەمبەر ﷺ ، کە (جبریل) پێی دەدات بۆ پاراستن .

ئیعجازی دووەم : تیۆری (ئەتیر – الاثير) : (د. ا . س . راپوپرت) ئاماژە بەم سێ مەزهەبە گەورەیە دەکات دەربارەی میتافیزیك و جیهان و ماددەو ڕوح قسەیان کردووەو ئایدۆلۆژیاو ڕوانینی خۆیان لەسەر دامەزراندووە :

**تیۆری یەکەم : تیۆری ماددی : ئەم مەزهەبە پێی وایە** جیهان هەمووی لەیەك شت **پێك دێ ، ئەویش ماددەیە** ، ماددە بنەمای هەمووو شتێکە ، نکۆڵی لە بوونی ڕوح **دەکات ، کە سەربەخۆیەو هەندێ** جار پەیوەست دەبێ بە ماددەوە و هەندێ جار جیا دەبێتەوە وەك ئەسپ و داشقە .

(مولیشت) دەڵێ : (ئەو سەردەمە بەسەر چوو بگوترێ ڕوحی سەربەخۆ هەیە ، جیایە لەماددە) ، ماددییەکان پێ یان وایە جگە لەماددە هیچی تر نییە ، هزر تەنیا شێوەیەکی ماددەیە ، کە هەمیشە لەگۆڕاندایەو جۆراو جۆری وەردەگرێ ، (خودا) و (توانای ڕوحی) جیا لە ماددە نییە .

---

[11] تأصيل مناهج العلوم والدراسات الانسانيه / د.انور الجندى / ل:١٩-٢٠.

(موليشت) دەڵێ : (ئەو قسە هەڵیت و پەڵیتە دەڵێ : ڕوحی روت و هێزێکی خولقێنەری هەیە ماددە دەگۆڕێت).

لە مەزهەبی ئەواندا هەمووو دیاردە دەروونییەکان پیشەی مێشکە ، مرۆڤ بەهۆی مێشك بیر دەکاتەوە ، وەکوو چۆن بەهۆی گەدە خواردن هەرس دەکات ، هەمووو شتێ دیاردەی ماددەیە ، ماددە لەناو ناچێ ، ئەزەلی یە ، خوا دروستی نەکردووە نە مرۆڤ ، لەدونیادا هیچ شتێ لەناو ناچێ ، تا تۆزقاڵێکیش.

لە یۆنانیەکان (لیو سیبوس) هاوڕێ (دیموکریش) ساڵی (٤٢٠ پ.ز) ماددی بووە ، ئەبیقور هات گەشەی پێ داو وتی : ماددە بناغەی دونیایە ، دەروون و هزرو هۆش چەند دیاردەیەکی ماددەن .

لەسەدەی ناوەڕاستدا : (جیسیند)ی فرەنسی و (جیور دانوبرپوونو) ی ئیتالی ماتریالیستی بوون لە بەریتانیادا لە چاخی نوێ دا (توماس هوبز) ١٥٨٨ – ١٦٧٩ بووژانەوەی بەم ڕەوتە عەلمانیەدا ، لەوێوە بۆ فەرەنسا گوازرایەوە ، (لامینترییە) (١٧٠٩ – ١٧٥١) و (بارۆون هولبەك) هات مەزهەبی ماددییان شرۆڤەکرد .

لە ئەڵمانیادا لێشاوی مەزهەبی (میسالی) کە (فختە) و (شلنبخ) و (هیگل) دایاننا مەزهەبەی داپۆشی ، بەڵام زانستی سروشتی بوژانەوەی بەم ڕەوتەدا ، (موليشت) هات لە زانستی بابەتی یەقینی کۆڵییەوە ، تا لە سەدەی ڕابردوودا بوو بە بڵاوکەرەوەیەکی مەزهەبی ماددی بەهێزی تازە ، لە نووسراوێکی نووسی : (هێز بەبێ ماددە نابێ و ماددە بەبێ هێز نابێ) (کارل فجت) ڕەوتی ئەوی گرت ، پاشان (لدویج بخنر) ... هتد [٤٥].

---

[٤٥] هەر چی (مارکس) و (ئینگلز) بوون ماترالیستی دیالەتێکیان بە ناوەڕۆ کردنەوەی میسالی یەتی هیگل و سوود وەرگرتن لە توندڕەوە مادییەکانی فەرەنسا دامەزراند .

قورئانی پیرۆز ئەم مادییانە بە (الدهری) ناو دەبات ، کاتێ وتویانە (قالوا : ما هي الاحياتنا الدونيا نموت ونحيا وما يهلكنا الا الدهر وما غف بمبعوثين) (الجاپيە ٢٤)

**تیۆری دووەم : تیۆری ڕوحانی :**

ئەم تیۆرە پێچەوانەی تیۆری ماددی پێی وایە سەرچاوەی هەمووو دیاردەکان ڕوحە ، هەر چەند (بیر) وا بەستەیە لە مێشکەوە ، بەلآم ئاکامی مێشك نییە، بە زاراوەی فەلسەفی وەکو پەیوەندی نێوان هۆکارو هۆگر (العلة والمعلول) نییە، ڕاستە مێشك ئەندامێکە بۆ بیر پێویستە ، بەلآم بەرهەمهێنەری بیر نییە ، مادده بیر ناکاتەوەو بێ هەست و خوستە ، چونکە ئەو شتەی هەستی پێ دەکرێ ماددەیە ، ناکرێ هەمان شت بیرکەرەو هەستیار بێ ، وەکوو شاعیرێکی فرەنسی دەڵێ (ناکرێ هزرو بیر ئەو ڕووناکییە بێ لە ماددەیەکی چڕی تاریکەوە دەربچێت). ڕەوتی ڕوحانی و ماددی بەدرێژایی مێژوو ، هەر کام دەیەوێ کورسی دەسەلآتی دونیای فەلسەفە بەدەست بێنێت ، (ئەفلاتون) تیۆری ڕوحانی ڕاڤەکردووە وتی : (نمونە –المثل) بوونی حەقیقی هەیە ، هاوتەریبی ڕواڵەتەکانە.

**لە چەرخی نوێ دا فەیلەسوف** (ڕینەدیکارت) هات عەقیدەی ڕوحانی نۆژن کردەوە (لیبنتز) (١٦٤٦ – ١٧١٦) هات ئەو مەزهەبەی ڕێك خست و تۆکمەی کرد ، بەپێی ئەو مەزهەبە بناغەی هەمووو شتێ ڕوحە ، بۆ چەندان خاڵی بێ ئەژمار دابەش دەبێ ، هەر کام لەو خاڵآنە بە (گەردیلەی گیانی) ناو دەبرێن ، ئەم گەردیلەیە خوا بنیاتی ناوە ، هەر جەوهەرێکی تاك لە کۆمەڵێك لەو گەردیلانە پێك هاتووە ، کاتێ ئەو جەوهەرە فەردە دابەش بوون قبوڵ ناکات ئەوە لە ڕواڵەتدایە ، بەلآم لە واقیعدا دابەش بوون پەسەند دەکات ، ڕاستی شتەکان ماددە نیە ، بەڵکو هێزە یان گەردیلەی ڕوحییە ، خوا ئەو گەردیلانەی دروست کردووەو کردوونی بە سۆنگەی هێزو توانای

---

(غەزالی) لە (المنقذ من الضلال) دا دەڵێ : گرۆپەکی کۆنن بڕوایان بە کردگاری خولقێنەرو زاناو بەڕێوبەر نەبووە ، بڕوایان بە ئەزەلی یەتی دونیا بووە ، نەك خودا دروستی کردبێ ، وتویانە تۆو لە گیاندارە ، گیاندار لە تۆوە ، تا هەتایە ئاوا دەوام دەکات.

پەی پێ بردنی (الادراك)ی پێ داون و لەوەدا جیاوازی پێ داون ، گەردیلەی ڕوحی توانای ڕوحییە لە شێوە جیاوازە بەردەوامە گۆڕاوەکانی دا دەردەکەوێ .

ئەو گەردیلانە ئاوێنەی دونیان و زیندووو نەمرن ، لەناوی دا هێزێ هەیە هەوڵ دەدات لەباری (نەست)ەوە بۆ (هەست) بگۆڕێت ، (هەست) کۆمەڵێ بیرو هەستە لە حەقیقەتی گەردیلەی ڕوحییەوە هەڵدەقوولێ ، (ماددە)ش کۆمەڵێ گەردیلەی ڕوحییە، هەندێ جار ئەو گەردیلانە لەباری نەستدان و ماددەی نازیندەیان لێ پێك دێت .

هەرچی (بەرکیلی) (١٦٨٥ – ١٧٥٣) بوو بۆ ئەوە چوو ماددە لەدەرەوە بوونی نیە ، تەنیا هزرو گیانی بوونی هەیە ، ئەوانە بە خەیاڵ دروست دەبن لەبەرچاوماندا ، بەلای ئەوەوە خۆرو مانگ و دارو درەختەکان گەر هزر نەبێ بونیان نیە ، هیچ شتێ لەدەرەوەی هۆشەوە نییە ، لەچاخی نوێ دا (هیرمان لوتز) هات لە کتێبەکەی (جیهانی بچووك) مەزهەبی ڕوحانی ڕاڤەکرد ، (شوبنهاوەر) هات وتی (ویست) حەقیقەتی شتەکانە . (فنخر) وتی : هەمووو شتێ لەبووندا زیندووە ، بۆیە ئەوانەش لە پێڕی ڕوحانییەکان دادەنرێن.

### تیۆری سێ یەم : مەزهەبی دوانەیی (ماددە + ڕوح) :

ئەم مەزهەبە پێچەوانەی دوو مەزهەبەکەی تر پێیان وایە مرۆڤ لە دوو جەستە پێك دێ ، شان بە شانی یەکترن ، بریتین لە (ماددە) و (گیان).

(ولف) دەڵێ : دوانەیی یەکان ئەوانەن باس لە بوونی دوو توخم دەکەن ، ماددی و ڕوحی.

(ئەنگستا گۆرس) و (ئەرستۆتالس) و (رەواقیەکان) دوانەیی بوون ، لە چەرخی نوێ دا (دیکارت) پاڵپشتی ئەم مەزهەبەی کرد ، پاشان (جهلنکس) هەمواری کردو بۆ مەزهەبی ئۆکاسیۆنالیزم (occasionalism) گۆڕی.

دیسان (هربارت) و (لوتز) و (فختە) دوانەیی بوون ، (ئەنگساگۆرس) لە (٤٥٠ پ.ز)دا وتی : لێرەدا پرەنسیپەکی هۆشیار هەیە ، جووڵە پەیدا دەکات ، ماددە نیە ، چونکە ماددە بێ جووڵەو هەست و خوستە توانای خۆ جولاندنی نییە ، ڕوحە هەست و کارتێ کردن و تواناو هزری دەداتێ و جووڵەو ژیان لەم جیهانەدا بەرهەم دێنێت.

(ئەرستۆ) و (ئەفلاتون) ئەم دوو فەیلەسووفە گەورە دوانەیی بوون ، (ئەفلاتون) بڕوای بە پرەنسیپی (میسالی) و (ماددی) بووە ، یان جیهانی هەستەکان و جیهانی میسالی.

دیسان (ئەرستۆ) بڕوای بە دوو پرەنسیپ بووە (هیولی) و (وێنە) کە توانا بەخشە ، پێی وا بووە هەموو شتێ وێنەو هیولی هەیە ، یان ڕوح و جەستە ، لە چاخی نوێ دا (لوتز) و (فیختە) هاتن ، کە بە دوانەیی حیساب دەکرێن .

(هیگل) لە نامەکەیدا (الواحدیة) دەنووسێ (تەواوی ئایین و مەزهەبە کۆنەکان دوانەیی بوون ، بڕوایان وابووە خوداو جیهان ، دروستکەرو دروست کراو ، ڕوح و ماددە ، دوو ڕەگەزی جیان ، ئێمە دوانەیی لەپاکترینی ئایینە ئاسمانییەکان دا دەبینین ، سەرباری ئێ ئایینەکەی خۆرهەلاتی ناوەڕاست ، کە سێ پێغەمبەرەکان هێنایان و ناوبانگیان دەرکرد: ﴿ موسا ، عیسی ، محمد[٤٦]. (درودی خوایان لەسەر بێت ﴾.

---

[٤٦] مبادئ الفلسفة / أس . راثوثرت/ ل:١٤٧-١٦٢/ بە کورت کردنەوە.

**خوای گەورە لە قورئاندا ئاماژە بە دوو جیهان دەکات ، جیهانی ماددی و جیهانی گیانی : (فاذا سويته ونفخت فيه من روحي فقعوا له ساجدين) واتە : گەر ئادەمم رێك خست و گیانم بەبەردا کرد کورنووشی بۆ ببەن.**

**(بەهەشت ، دۆزەخ ، کورسی ، عەرش ، فریشتەکان ، جنۆکەکان ، روحی مردووان ...) هەمووو ئەوانە بە جیهانی نادیارو روحی دەژمێردرێن، بەشێکن لە دونیای غەیب کە روکنێکی برِوای مرۆڤی موسلمان پێك دێنن** ﴿ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ ﴾ البقرة: ٣ ، ﴿ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلۡكَبِيرُ ٱلۡمُتَعَالِ ٩ ﴾ الرعد: ٩ **واتە : زانا بە جیهانی نادیارو جیهانی بەرجەستە.**

**دیسان زانستی بایۆلۆجی و سروشتی و فیزیای بوونی دوانەیی لە تاقیگەدا سەلماندووە ، لە کتێبی (الله يتجلى في عصر العلم / چون كلوفر مونسا) زۆر زانای جیهانی هاوچەرخ لە ئەمریکا گەواهی ئەم راستییەیان داوەو وەکو زانستەکی سەلماو ناساندوویانە[٤٧] .**

**بۆ نمونە : (فرانك ئالن) زانای سروشتی بایۆلۆجی و لە ئەمریکا دەنووسێ﴿ پرۆتینەکان لە پێکهاتەی بنەرِەتی پێك دێن لەناو هەمووو خانەکاندا، لە پێنج توخم پێك دێن : کاربۆن ، هایدرۆجین ، نایترۆجین ، ئۆکسجین ،گۆگرد، یەك گەردی پرۆتینی لە (٤٠٠٠٠) گەردیلە پێك دێ ﴾.**

**دەنووسێ : (پرۆتینەکان چەند کەرەستەیێکی کیمیای نازیندەن ، کاتێ ژیانیان دەرِواتە ناو ، کە ئەو رازە سەیرەی هیچی لە نهێنی یەکەی نازانین دەرِواتە ناویەوە و هەندێ زانا و مرۆڤی وەکو کۆمپیوتەرێ سەیر دەکات ( جۆن لویسن ) رای زۆر زانا بۆ ئەمە وەردەگرێ ، لەوانە (ستیڤن ووز) کە دەڵێ : (پێك هاتەی مێشك و کردارەکەی بە تەواوی لە پێك هاتن و کرداری کۆمپیوتەر جیاوازە ، مێشك بەپێی وەڵامی (بەڵێ**

---

[٤٧] ئەم کتێبەمان کردووە بە کوردی و لە بازار هەیە بەناوی ( خوا لەسەردەمی زانستیدا دەدرەوشێتەوە ).

– نـەخێر) و (وریـان) کـار ناکـات بـۆ هەریەکـەك کـە دەتـوانرێ ئاکـامێ ببەخشـێ پێشـبینی بکرێـت ، مێشـك خانـەکانی بـەهۆی چـەند لقـە خانـەدەمارێك پێکـەوە بەستراون پاڵدانی دەمـاری هەڵـدەگرن ، هـەر لقێـك لەوانـە وابەسـتەیە بـە ژمارەیێـك گـرێ ی گشت لاگـرەوەی بـێ شـومار ، کـە لـە هـەمووو خانەکانـدا هەیـە ، لـە شێوەی پەیوەنـدی زۆر ئـاڵۆزدا ، ئـەو گۆڕانانـەی پەیوەندییـەکان هەڵدەبـژێرن بـە وردی ناکێشرێن و ناکەونە سنووری هیچ نوقلانەیێکی ئەگەر کراوەوە)

مامۆستا (کۆلن چیری) دەڵێ : (مێشکی ڕاستەقینە لـە هـیچ شـتێکدا لـە کۆمپیوتـەری ئەلیکترۆنی ناچێ ، کۆمپیوتـەر تەنیا بەپێی نەخشـەیێکی جیـاواز دروسـت نـەکراون ، بەڵکو هیچ کارێکی گرنگی هاوشێوەی مێشك ئەنجام نادات ، کە گرنگی یەکی حەقیقی هەیـە ، مێشـك بـەپێی سـۆراغ و بـەدوادا گـەڕان (الاسـتقرائي) کـار دەکـات ، بـەلام کۆمپیوتـەر بەشێوەی هەڵێنجانی دووبارە ، (الاستنباطي) ، وایە هـەمان هێمـاو وشـەی جیاواز دەڵێتەوە[48].

(کیبك) نووسەری شانۆگەری لەسەر شانۆی (سنت مارتن) لە لەنـدەن لەسـاڵی (١٩٢٣)دا وتی : (مرۆڤ هەست دەکات بەختەوەرە ، مرۆڤ کەمان دەژەنێ ، حـەز دەکـات بـڕوات ، حـەز دەکـات هەنـدێ کاربکـات پێویسـت نـین ، بـەلام مەکینـەکان دیـاری نـەکراوە لەسەریان کەمان بژەنن ، هەست بە بەختەوەری بکەن ، چەند شتێ پێکەوە بکەن[49].

پرۆفیسۆرو زانای نـاوداری جیهـان (کریسـی موریسـون) ڕاگـری پـەیمانگای نیویـۆرك و سەرۆکی ڕابردووی ئەکادیمیای زانستەکان لە نیویۆرکدا دەنووسێ : (مادده جگە لەوەی یاسـاکانی بـۆی دەیخوێنێتـەوە ئـەنجامی نـەداوە ، گەردیلـەکان گوێڕایـەڵی بناغـەکانی کیمیایی و هێزی کێش کردن و کاریگەری پلەی گەرمی هانـدەری کارەبایی دەکەن .

[48] الانسان ذلك الكائن الفريد / جون لويس/ ١٨٢.
[49] هەمان سەرچاوە ١٩٠.

مادده داهێنەر نییە ، بەلاَم ژیان بە پلان و پێك هاتنی تازەو جوانەوە دێتەوە دونیاوە ، بەبێ ژیان ڕووی زەوی دەگۆڕێ بە بیابانێکی ڕووت و ئاسمانێ لە ئاسمانی بێ سوود، بەبێ ژیان مادده ڕەق و بێ گیانە ، گەر ژیانی لەبەر چووەوەو دەگۆڕێتەوە بە ماددەیەکی ڕووت ، بەلاَم لە توانایدایە بەردەوامی بە ژیانی دروست کراوانی تر بدات ، بەمە ژیان لە زیندەوەراندا دەوام دەکات ، بەلاَم ژیان چییە ، تا ئێستا مرۆڤ نازانێ[50]

دەنووسێ : (هیکل – Haeckel) وتی : هەواو کەرەستەی کیمیاوی و کاتم بدەنێ مرۆڤێ دروست دەکەم، بەلاَم ئەو لە یەکەکانی بۆ ماوە بێ ئاگا بوو بەناوی (جینەکان – بۆ هێلّەکان) لە خودی ژیانیش هیچی نەزانیوە، گەر ئەمەی لە توانادا بایە دەبوایە هاتبایە گەردیلە نادیارەکانی و جینەکانی یەکەی بۆماوەی ڕێك خستبانە و ژیانی پێ دابان، لەو بارەشدا ئاکامەکەی بە ڕێژەی یەك بۆ ملیۆنان ئەوە دەبوو درندەیەکی بێ وێنەی دەهێنا ، گەر لەم کارەدا سەرکەوتبایە ، نەیدەگوت ڕێککەوتەکی ڕووت بووە ، بەلّکو دەیگوت بەرهەمێکی هزری خۆی بووە .

بەڕاستی خوا موعجیزەکانی بەشێوازێك دروست دەکات لە هزرەکان شاراوە بێت[51].

قورئانیش فەرموویەتی ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخۡلُقُواْ ذُبَابٗا وَلَوِ ٱجۡتَمَعُواْ لَهُۥۖ﴾ الحج: ٧٣.

واتە : ئەوانەی جگە لە خوا بانگ دەکرێن هەرگیز ناتوانن مێشێك (مێشوولەیێ) دروست بکەن ، گەر بۆشی کۆببنەوە .

دیسان دەنووسێ : (گەر ڕوح نەمربێ دەتوانێ شتەکان وەکو خۆی ببینێ ، ئەو دەتوانێ تەواوی هەستە ئاسکەکانی گیانداران بەدەست بێنێت ، بەوە دەتوانێ بڕواتە

---

[50] العلم يدعوا الايمان / ت:الاستاذ محمود صالح الفلكي/ ل:٨٩.
[51] العلم يدعوا اللايمان / ت: الاستاذ محمود صالح الفلكي : ل: ١٥٠.

ناو مەیدانی تازەو سەیری زانست و ئەزموون و هەستەوە ، دیسان گەر مەبەستی بێ دەتوانێ گەردیلەکان و تەنۆلکەکانیان ببینێ ، کە لە چەند تەنۆلکەیێ پێك دێن ، ئەو تەنۆلکانەن خۆرە هێرش بەرەکان تێك دەشکێنن ، چێژ لە مۆسیقای نوێ وەردەگرێ ، کە لە لەرەی ئەتیری بێ سنوورو هەزاران وەلآمی ئاوازییەوە پەیدا دەبن ، لێرەدا رەنگی جوانتر هەیە لەوە کە چاوی مرۆڤ بەرگەیان دەگرێ ، چاوەرێ ی گەشەکردنی تواناکانمان دەکات بۆ پەی پێ بردونیان ، لێرەدا رێرەوی بێ سنوور هەیە چاوەرێ ی روحی مرۆڤ دەکەن دوای ئەوەی لە لەش دەردەچێت).

(روحی مرۆڤ ، کە زەمەن نابێ بە ئاستەنگ لەبەرامبەریدا خۆشەویستانی دەبینێ و لە باوەشیان دەگرێ ، رامان بۆتە راستی یەکی روحانی ، ئەو دەتوانێ حەقیقەتی هەرە گەورە بە خوای دروستکەرو شکۆدارو بەهەشت ببینێ ، لە هەر کوێ بێت)

(گەر مرۆڤ روحە نەمرەکەی بەرەو خوا بەرزبێتەوە لە کاروانەکەی دا زانستی پتر فێر دەبێ ، کاتێ بەرەو مەلەکوتی بالآ بەرز دەبێتەوە جوانی دروست کراوانی خوا لە جیهانی ئاسایی دا لەبەر چاودا بچووك دەبێتەوەو نامێنێ ، چۆن داستانی منداڵی لە کاتی گەورە بوندا لە مێشکی مرۆڤدا دەپوکێتەوە ، بەو رەنگە لەگەڵ رامان لە گەردوون گۆی زەوی بۆ ئاستی نابووتی دادەبەزێت ، لە جوانی پەی پێ بردنی روحانی دا ماددە وەکو ئەو سێبەرەی لێ دێ لەبەردەم خۆری پرشنگدا بزر دەبێت.

بەم شێوەیە مرۆڤ بە توانای روحانی دەتوانێ توانای خوای وێنە بیر بکات ، لەگەڵ گەشەی روحانی دا لە پەی بردن بە شکۆو تواناو مەزنی کردگار نزیکتر دەبێتەوە .٥٢

هەروەها گوتراوە روح لە نەفس جیاوازە ٥٣ ، روح قوری ئاگرییەو روح نوری روحانییە ، گوتراوە : روح لاهوتییە و نەفس ناسوتی یە ، لای ئەهلی عیرفان هەردووکیان دوو لەتیفەن لە مرۆڤدا ، گوتراوە روح نورە...

---

[٥٢] العلم بدعوا اللايمان / ت: الاستاذ محمود صالح الفلكي : ل: ١٨٢-١٨٣.

(د.ئەلیکسس کاریل) لە کتێبە ناودارەکەیدا (الانسان ذلك المجهول)دا بڕوای بەدوانەیی هەیەو مرۆڤ بە جیهانێکی نادیار دەناسێنێ ، کە پڕە لە موعجیزەو شاکاری ، دەڵێ : ڕاستە لەشمان و ئامێر بریتین لە تەنێك ، بەڵام سیستەمی لەشمان بە سیستەمی ئامێر ناچێت ، چونکە ئامێر لە چەند بەشێك پێك دێ سەرەتا جیابوون ، کاتێ کۆکرانەوە بوونەیەك یەکە ، ئەو وەکو تاکە مرۆڤێکە بۆ یەك مەبەست دروست کراوە ، دیسان بەوەی جیا دەکرێتەوە سادەو ئاڵۆزە ، بەڵام یەکەم ئاڵۆزە ، دووەم جار سادەیە ، مرۆڤ بە پێچەوانەوە سەرەتا سادەیە دوایی ئاڵۆزە ، چونکە لەیەك خانە پەیدا دەبێت ، پاشان دەبێ بەدوو خانە ، ئەوانیش بۆ دوی تر ، ئەم دابەش بوونە تا کۆتایی دەوام دەکات[٥٤].

دەڵێ : (بیر کردنەوە لە زەمان و بۆشایی دا نییەو ناڕواتە ناویانەوە ، چالاکی ئەدەبی و ئایینی و هەست کردن بە جوانی و لەدەوامێکی ماددی دا بە جۆرێکی تایبەتی خۆی داڵدە نادات ، جگە لەوەش چاوی موگناتیسی شتی شاراوە لە دوورەوە دەبینن ، هەندێ کەس ئەو ڕووداوانە دەبینن لە ڕابردوو ڕوویداوە ، یان لە داهاتوودا ڕوو دەدەن ، پێویستە تێبینی بکەین ئەوان داهاتوو بە هەمان ڕێگای ڕابردوو دەزانن[٥٥].

هەمووو ئەو دیاردانە بە هۆی (ئەتیر) یان (ڕوح) ڕوو دەدەن ، (مورس کلاین) مامۆستای ماتماتیکی لەشاری نیورك دەنووسێ : (ماکسیول) توانی بیسەلمێنێ شەپۆلی کەهرۆموگناتیسی بەناو ئەتیردا بەخێرایی ڕووناکی دەگوازرێنەوە ، هەر لە ڕۆژانی (نیوتن)ەوە ئەتیر بە ناوەندێ دانراوە کە ڕووناکی پێدا ڕەت بوووە[٥٦].

دەنووسێ : (گالیلۆ دەیگوت ماتماتیك ئەو ئەلف و بایەیە خوا ئەم جیهانەی پێ نوسیوە).

---

[٥٣] بروانة (الروح / ابن القيم الجوزية/ ٢٩٣.
[٥٤] الانسان ذلك المجهول / د:الكيس كارل / ل:١٢٧.
الانسان ذلك المجهول / د:الكيس كارل / ل:١٨٦.[٥٥]
[٥٦] الرياضيات و البحث عن المعرفة/ مورس كلاين /ل:١٤٤.

نیوتن دەیگوت : (خودا ئەم جیهانەی بەپێی چەند یاسایەکی ماتماتیکی بنیات ناوە[57])

کپلەر دەڵێ : (خودا دونیای لەسەر شێوەی یاسایەکی ماتماتیکی سادەو جوان دامەزراندووە[58].

یان گەر بڕوانینە نووسراوە مەزنەکەی (رینە دیکارت) بە ناوی (تأملات میتافیزیکیە/ ت: د.کمال الحاج) بەڕاستی دونیایێك زانستمان لەبارەی جیهانی ڕوحی و میتافیزیك بۆ هەڵدەڕێژێت ، دەیسەلمێنێ خوا هەیەو مرۆڤ لە جەستەی جیاوازە.

(عزت علي البحري) دەنووسێ : (ماکسویل ساڵی (١٨٦٤) گریمانی کرد ناوەندێکی وەهمی هەیە هەمووو تیشکە جیاوازەکانی پێدا گوزەر دەکەن ، لە ڕووناکی بۆ گەرمی بۆ کارەبا بۆ موگناتیسی یەت ئەو ناوەندەی بە (الاتیر) ناساند ، لەم ڕێگایەوە زۆر ئاکامی گرنگ هاتە دی ، کاتێ (هرتز) شەپۆلی بێ تەلی دۆزییەوە بڕوابوون بە ئەتیر گەورەتر بوو). (ئەتیر) ماددەیەکی سەرەکییە لە بوونەوەردا ، بەڵام بەهۆی خێرایی لەرەلەرەکانی هەستی پێ ناکەین ، وەکو باسمان کرد نێوان ئاسمان و زەوی ئەستێرەکانی پڕ کردووە ، چۆتە ناو هەمووو شتەکان و تەنەکانەوە ، بەڵکو ئەتیر ڕووی ڕاستی شتەکانەو شێوەو یەکان گیری بە شتەکان دەدات .

زانای فیزیایی بەریتانی (سێرئۆلیفەر لودج- oliver lodge) گەیشتە ئەو ئاکامە هەمووو تەنێکی ماددی ، دیسان لەشی مرۆڤ و گیانداران و مێرووەکان و ڕووەك لەبەرامبەر دا لە شێکی (ئەتیری) هەیە ، هاو شێوەی ئەوە ، لەشە ماددییە تەنیا بەرگێکە بۆ لەشی ئەتیر ، بۆیە لەشی ئەتیر حەقیقییە ، ئەم لەشە ماددیەش تەنیا بۆ هەڵکردن و گونجانە لەگەڵ ئاستی ماددی ژیانی زەمینی دا ، دەکرێ بگوترێ ناوەندێکە گیانەکانی پێدا گوزەر دەکەن ، جۆرێکە لە تیشکدەرەکان دیسان زانایانی

[57] الرياضيات و البحث عن المعرفة/ مورس كلاين /ل: ٢٠٨.

[58] الرياضيات و البحث عن المعرفة/ مورس كلاين /ل: ٨٢.

ڕوحی دەریان خستووە لەشی ئەتیری پەیوەندی بە ساغی و نەخۆشییەوە هەیە ، چونکە لەشی ماددی و ئەتیر کار لەیەکتری دەکەن[٥٩].

(ئارتەر فندلای) کتێبەکی تایبەتی ئەم ناوە ناو دەبات (علی حافة الالعالم الاثيري / ت:فهمي ابو الخير) دەنووسێ : (ئەتیر وەکو ماددەی حەقیقی نەبینراوەو نەکێشراوە ، بەلأم دەکرێ پوختەی ڕاکان کۆبکرێنەوەو ئاسنامەکەی دەربهێنرێ ، ئەو تەواوی بۆشایی پڕ کردووە ، (٥٠٠) جار لە زەوی ساردترە ، بەردەوامی و بڕی هەیە دەجولێ ، پەستانی بێ شومارە بۆ هەر پێ یەکی دووجایی ملیۆنەها تەن دەبێ ، ملیۆنەها جار لە ئاو چڕ ترە ، بەلأم لەو جیڕی پترە . جوولەی بەردەوامی هەیە ، ئەو ماددە نامۆیە ناکرێ ببینین ، یان بیبیستین ، یان دەستی لێ بدەین ، گەر لە ئاسماندا جولأ دەتوانێ وزە هەلبگرێ و کار لە هەستەکانمان بکات وەکو ڕووناکی و گەرمی و کارەبا ، لەمێژ نییە دۆزییانەوە چۆن ئەو شەپۆلانە دەگۆڕێن بە قسەو مۆسیقا ، ئەم ماددەیە لە جوولە ناکەوێ ، کەچی نایبینین و دەستی لێ نادەین ، گەر نەبوایە نەماددەبینی و هەستمان بەسەرمای زۆر دەکرد ، چونکە ئەو ناوەندەیە ئەو شەپۆلانە دەگوازێتەوە لەرەلەر پەیدا دەکەن و کار دەکەنە سەر چاو و پێستمان.

ئەو ماددەیە ناوەندە لە نێوان شتی ماددی و هەستمان ، ئەو ماددەیە کە ئێستا بەو ئەتیرە دادەنرێ لەدۆخی لەرەلەری تایبەتی سنووردار دایە ، ئەلیکترۆنەکان لە گەردیلەدا چەند تەنۆلکەیەکی کارەبایی سالبین ، پرۆتۆنەکانیش بێگومان لەسروشتدا کارەبایین و ئەتیرین ، ماددەش ئەتیرە لەبارێکی تایبەتی دا ، ئەتیر هەمووی ماددەیە ، ماددە هەمووی ئەتیرە ، بەلأم ئەو ماددە فیزیایی یەی هەستەکانمان پەی پێ دەبات ئەو بەشە ئەتیرەیە لە بازنەیێکی کەمدا ئەلەرێتەوە ، لەم کتێبەدا جیاوازییت کرد لە نێوان هەردوو ماددەدا ، ماددەی فیزیایی کە هەستی پێ دەکەین و ماددەی

[٥٩] دراسات في العالم الروح / ل:٢٥:٢٤.

**ئەتیر کە هەستی پێ ناکەین ، هەرچەندە هەستەکانمان پەی پێ نابات ، بەڵام تا ڕاددەیێ بۆ تێ گەیشتن لە هزرمان دوورنییە.**

**هەندێ کەس پێی وایە (ئەنشتاین) نکۆڵێ لە (ئەتیر) کردووە یان (مورس کلاین) دەڵێ : ئەم ناوەندە لە ڕووی فیزیایی یەوە قبول نییە[60]، بەڵام (ئەنشتاین) لە وتارێکدا ساڵی (١٩٢٠) لە زانکۆی (لیدن) دا بەم دەستەواژەیە هەڵوێستی خۆی دەربارەی (ئەتیر) ڕاگەیاندو دواجار وتی : (بەپێی تیۆری ڕێژەیی گشتی ئاسمان سیفاتی فیزیایی داوە ، لەو واتایەدا ئەتیر پەیدا دەبێ ، بەپێی ئەو تیۆرە ئاسمان و بۆشایی بەبێ ئەتیر نابێ ، چونکە لەم بۆشاییە نەك هەر ڕووناکی ناتوانێ بلاْوبێتەوە بەڵکو هیچ پێوەرێ بۆ ئاسمان و کات نابێت ، بەڵام ئەو ئەتیرە ناشێ بگوترێ ئەو سیفاتی جیای بەو ناوەندانە داوە دەگونجێ بکێشرێ بەو پێناسەیەی لە چەند بەشێك پێك دێ لەماوەی زەمەندا دەکرێ رابکێشرێ ، هەرچی جووڵەیە ناتوانرێ بەسەریدا پیادە بکرێت[61].**

**دەربارەی (مادده و ئەتیر) مامۆستا (ئەدنجتون) دەڵێ : (ئەتیر جۆرێك لە مادده نییە ، ئەو نامادییە) .**

**زانست دەڵێ : هێزی کێش کردن گریمانەیەك نییە ، (ئەتیر) ئاسمانە، یان وەکو ئاسمان (الفضاء)ە .**

**(ابن كثير) لە (البداية والنهاية / ج١/ ل:١٢) ئاماژە دەکات هەندێ لە زانایانی کەلام پێ یان وایە عەرش لە هەموو لایەکەوە دەوری جیهانی داوە ، بە (الفلك التاسع)و ئەتڵەس و ئەتیر ناویان ناوە.**

---

[60] الرياضيات والبحث عن المعرفة : ل:١٤٥.
[61] على حافة الالعالم الاثيرى / ل:٤١.

**گەردووناسی ناودار (کامیل فلامریۆن) لە کتێبی (القوى الطبيعة المجهولة) دا دەڵێ : دەبینین بیر دەکەینەوە ، بەڵام بیر چی یە ؟ کەس ناتوانێ وەڵامی ئەم پرسیارەم بداتەوە ، دەبینین دەڕۆین ، بەڵام کاری ماسولکەیی چییە ؟ کەس ئەمە نازانێ ، دەبینم ویستی خۆم ماددی نییە . هەرچی سیفەتی دەروونی منە ماددی نییە ، کەچی هەر کاتێ ویستم ماددەی خۆم دەجوڵێنم ، چۆن ئەمە ڕوو دەدات ؟ ئەو ناوەندە چی یە هێڵی ناوەڕاست دەگرێ بۆ توانستی هزری لەبەرهەمهێنانی ئاکامێکی ماددیدا ؟ کەس ناتوانێ وەڵامی ئەم پرسیارەم بداتەوە ، بەڵکو پێم بڵێ چۆن دەماری بینین وێنەکان بۆ عەقڵ دەگوازنەوە ؟ پێم بڵێ چۆن هزرو عەقڵ ئەمە دەزانن؟ لەکوێ دادەنیشێ؟ سروشتی کرداری مۆخی چی یە ؟ ئەی گەورە پیاوانی (بێ بروایان) پێمی بڵێن ، بەڵام ئەوەندە بەسیەتی : من دەتوانم بیست ساڵی ڕەبەق پرسیارتان لێ بکەم ، گەورەترین سەری ئێوە ناتوانێ وەڵامی نابوت ترین پرسیاری من بداتەوە ٦٢.**

**سروشت ناسی ناودار (هایزنبرج) دەنووسێ : لە زانستدا شتێ نییە بەناوی حەقیقەت ، زانست ناتوانێ حەقیقەتی هیچ شتێ بزانێ ، ئەو دەزانێ لەباری دیاری کراودا چۆن ئەم شتە کاردەکات دەتوانی پەیوەندی ئەو لەگەڵ شتەکانی تر پەی پێ ببات ، بەڵام نازانێ زانست چییە ؟ بڕەکان (الكميات) دەزانێ ، بەڵام ماهی یە تەنەکان نازانێ .**

**زانست ناتوانێ بزانێ ڕووناکی چی یە ؟ یان ئەلیکترۆن چی یە ؟ کاتێ دەڵێ : تیشکاوەری ڕووناکی کۆمەڵە شەپۆلێکی کەهرۆموگناتیسی یە ، یان فۆتۆناتە ، ئەو مەتەڵەکان حەواڵەی چەند مەتەڵێکی تر دەکات ، شەپۆلە کەهرۆموگناتیسییەکان**

٦٢ العقائد الاسلامية / السيد سابق / ل:٣٨.

چین ؟ جووڵەنە لە ئەتیردا ؟ جووڵە چی یەو ئەتیر چییەو فۆتۆنەکان چین گوزرەیێك وزەن ؟ وزە چی یە ؟ [٦٣])

بەم پێ یە لەگەڵ پێشکەوتنی زانستی ماددی و ڕوحی دا توانا هەستی ییەکان و هزرییەکانی ئێمە ناتوانن پەی بە حەقیقەتی ڕەها ببەین ، بۆیە پشت گوێ خستنی دونیای نادیار ، بەو ئاسانییە لەلایەن هەندێ لە ڕۆشنبیرانی خۆمانەوە نەزانینەکە بەناوی زانستەوە ئەنجامی دەدەن.

خوای گەورە لەم بارەوە فەرموویەتی : ﴿ وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ الإسراء: ٨٥، واتە : کەمێك لە زانست نەبێ پێمان نەداون . ﴿ يَعْلَمُونَ ظَٰهِرًا مِّنَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ ٱلْءَاخِرَةِ هُمْ غَٰفِلُونَ ﴿٧﴾ ﴾ الروم: ٧ ، بێگومان مرۆڤەکان تەنیا چەند شتێکی ڕواڵەتی لەدیوی دەرەوەی گەردوون دەزانن لە دیوی دووەم بێ ئاگان .

## چۆن ڕوح و دەروون پەیدا بوون؟

**کێشەییێکی فەلسەفی یە ، چۆن سەرەتا ڕوح پەیدا بووەو چۆن پەیدا دەبێت.**

(د.عبدالرحمن البدوی) دەنووسێ : ڕایەکان دەربارەی ئەم کێشەیە دەبنە سێ بەشەوە :

١. ڕای یەکەم پێی وایە ڕوح بە (بۆماوە) لە پشتی باوکەوە دەگاتە منداڵ.
٢. ڕای دووەم : پێی وایە ڕوح سەرلەنوێ دروست دەکرێتەوە .

[٦٣] مع القرآن في العالمه الرحيب / د: عمادالدين خليل.

٣. ڕای سێ یەم : پێی وایە ڕوح ئەزەلی یە ، ئەمە ڕای (ئەفلاتون)ە ، بەلاَم (ئۆگستین) نەیتوانیوە قبولَی بکات و یەکێ لە دوو ڕایەکانی یەکەم و دووەم لەپێشتر دادەنێت[٦٤]

هەندێ لە موسلَمانان ڕای سێ یەم قبولَ دەکەن و دەلَێن ڕوح بەشێکە لەخوا ، چونکە خوا فەرموویەتی ﴿ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي ﴾ ص: ٧٢. بەلاَم (ابن القيم الجوزية) و موسلَمانانی تر دەلَێن : مەبەست لە (ڕوحی) بەمانای مولَکی من دێت ، نەك ڕوح بەشێك بێ لە خوا ، وەکوو لە ئایەتی تردا هاتووە ﴿ بَيۡتِيَ ﴾ البقرة: ١٢٥واتە : مالَی من ، بڕوانە کتێبی (الروح/ل:٢٠٧).

دیسان هەندێ زانای هاوچەرخ پێیان وایە ڕوح لە ژیانی خانەیی جیایە لە مانگی (٤) دا دەکرێ بە بەر کۆرپەلەدا وەك خاوەنی کتێبی (الطب محراب الايمان) پشت بەم گێڕانەوەیە دەبەستن لە (ابن مسعود)ەوە (ثم ينفخ فيه الروح) رواه البخاري ، بەلاَم لە گێڕانەوەی تر دا وەکو لە (مسند احمد) ئەم دێرە نەهاتووە ، (ثم ينفخ فيه الروح) ، وەکوو لە گێڕانەوەی (جابر)دا (مسند احمد / ح١٥٢٤٢)داو گێڕانەوەی (حذيفة)دا (مسند احمد/ح١٦٢٤١) لەبەر ئەوە کۆمەلێ زانا پێیان وایە خانە زیندووەو جیاوازی نێوان لەنێوان ژیانی خانەیی و ڕوحدا نییە و بەڕوح پرۆتینەکانی ناو خانە زیندوو دەبن.

بەپێی زانستی نوێ بەر لە چوار مانگەش کۆرپەلە زیندووە ، تا سپێرم و هێلکۆکە بەر لە زایگۆت و پیتان زیندووون ، کۆرپەوە بەر لە چوار مانگە دەخوات و گەشە دەکات و خانەکانی زۆردەبن و ئۆکسجین لە خوێنی دایکی وەردەگرن و هەمووو دیاردەکانی ژیانی پێوە دیارە.

---

[٦٤] فلسفة القرآن الوسطى / د.عبدالرحمن البدوي/ ل:٣٢.

(ابن القيم) دەڵێ : (ڕوحەکان هەموووی دروست کراوە ، ئەمەش ڕای (اهل الجماعة والاثر)ە ، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)فەرموویەتی : (الارواح جنود مجندة) رواه مسلم، مادام ڕوح سوپای خودا بن ، کەواتە دروست کراون.

ڕوحەکان ڕووناکین ووزەن وەکو لە فەرموودەدا هاتووە : (ان الله خلق خلقه في ظلمة والقی علیهم من نوره) رواه احمد والترمذی. واتە :خوا دروست کراوانی لە تاریکی دروست کردوون و ڕووناکی خۆی بەسەردا کردوون .

(ابن تیمیة) دەڵێ : بەکۆی دەنگی زانایان و سەلەف (ڕوح) دروست کراوە وەکو (محمد بن نصر المرزوی) باسی کردووەو لەسەردەمی خۆی دا لە هەموو کەسێ شارەزاتر بووە بە (الاجماع)[65].

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٍ ﴾ الزمر: ٦٢ ، واتە : خوا کردگاری هەموو شتێکە.

(القشیری) دەڵێ : زانایانی لێکۆڵەری ئەهلی سوننە هەندێ پێیان وایە ڕوح ژیانە ، هەندێ پێیان وایە چەند سەرچاوەیێکن بە لەشەکان سپێراون، دەڵێ : کێ پێی وابێ ڕوح کۆنە ئەوە هەڵەیەکی گەورەی کردووە ، بەڵکو ڕوحەکان وەکو لە هەواڵەکاندا هاتووە : چەند سەرچاوەو جەوهەرێکی ناسکن[66].

دیسان بەپێی ئایەت ڕوح لە پشتی باوکەوە هاتووە : ﴿ وَإِذۡ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمۡ ﴾ الأعراف: ١٧٢، واتە : کاتێ پەروەردگارت لە کوڕانی ئادەم وەری گرت لە پشتیان وەچەکانیان.

---

[65] الروح / ابن القیم الجوزیة / ل:٢٠٥.
[66] رسالة القشیریة / ل:٩٧.

دەربارەی دروست بوونی خانەی سەرەتایی مرۆڤ یان ئادەم قورئان فەرموویەتی :﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾ الحجر: ٢٩ ، واتە : گەر لەشی ئادەمم ڕێك خست و ڕوحم بەبەردا کرد کوڕنوشی بۆ ببەن.

سروشتناسی ناوداری ئەمریکی جەنابی (دکتۆر فرانك ئالن) دەربارەی دروست و ڕێك خستنی خانە لە ژێر چاودێری خوایی دا لە خاکی زەوی و پاشان زیندووکردنی بەگیان دەنووسێ : پرۆتینەکان پێك هاتەی سەرەکین لە خانە زیندووەکاندا لە پێنج توخم پێك دێن : (هایدرۆجین ، نایترۆجین ، ئۆکسجین ، گۆگرد ، کاربۆن) ژمارەی گەردیلەکانی یەك گەردی پرۆتینی (٤٠٠٠٠) گەردیلەیە ، توخمە کیمیاییەکانی سروشت (٩٢) دانەیە ، گەر هەمووو ئەوانە بە کوێرانە دابەش بووبن ، ئەگەری کۆبوونەوەی ئەم پێنج توخمانە بۆ پێك هێنانی یەك گەردی پرۆتینی دەکرێ بژمێردرێ بۆ زانینی ئەو برە ماددەیەی پێویستە تێکەڵ بکرێن بەبەردەوامی تایەك گەردی پرۆتینی پێك دێ ئەنجا ئەو ماوە زەمینە بزانرێ ، کە پێویستە تا ئەو کۆبوونەوەیە دروست ببێ لە نێوان یەك گەرددا.

دەنووسێ : (پرۆتینەکان لە زنجیرەی درێژی ترشی ئەمینی پێك دێن ، چۆن گەردیلەی ئەم گەردانە پێك دێن؟ گەر بەو ڕێگایە ئاسایی یە دروست نەبن بەکەڵکی ژیان نایێن ، بەڵکو هەندێ جار دەبن بە ژەهر.

زانای ئینگلیزی (ج.ب.لیثز J.B.Leathes) ئەو ڕێگایانەی ژمارد کە دەکرێ گەردیلەکانی یان لە ڕێگاوە دروست ببێ بۆ پێك هێنانی یەك گەردی پرۆتینی سادە ، بینی ژمارەیان دەگاتە بلیۆنەها(١٠٤٨) .

بەو پێیە ڕێتێ نەچووە ئەو هەمووو ڕێککەوتانە پێکەوە کۆ ببنەوە تا یەك گەردی پرۆتینی پێك بێنن ، بەلاّم پرۆتینەکان چەند کەرەستەیێکی کیمیایی بێ ژیانن . ژیان ناڕواتە ناویانەوە ئەو ڕازەیان نەخرێتە ناو کە هیچ لەنهێنییەکەی تێناگەین .

ئەو هزری بێ سنووره ، ئەو خوای تاك و تەنیایە ، كە توانیویەتی بەو پەڕی كارزانی یەوە بزانێ ، كە نمونەی ئەو گەردە پڕۆتینی یە بە كەڵكی ئەوە دێ ببێتە ئارامگایێك بۆ ژیان ، بۆیە بنیاتی ناوەو وێنەی گرتووەو ڕازی ژیانی پێ بەخشیوە[٦٧].

خوای گەورەش فەرموویەتی : ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلْجِبِلَّةَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٨٤﴾ ﴾ الشعراء: ١٨٤ ، واتە : لەو خوایە بترسن ئێوەی دروست كردووە ، (جیبیللەی) سەرەتایی.

(الجبلة) پڕۆتۆپلازمە ، كە (ئیرفنج ولیام نوبلوچی) سروشت ناس لەبارەیەوە دەڵێ : (من بڕوام بەخوای بێ گەرد هەیە ، چونكە ناتوانم بڕوام وابێ ڕێكەوت بەتەنیا دەتوانێ ڕاڤەی دەركەوتنی ئەلیكترۆنەكان و پڕۆتۆنەكانی سەرەتامان بۆ بكات ، یان گەردیلەكانی سەرەتایی ، یان ترشە ئەمینەكانی سەرەتایی یان پڕۆتۆپلازمی سەرەتایی ، یان تۆوی یەكەم ، یان هزری یەكەم ، شیكاری بۆ بكات و ڕوونی بكاتەوە[٦٨].

قورئانی پیرۆز فەرموویەتی : ﴿ فَإِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ ۚ وَنُقِرُّ فِى ٱلْأَرْحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ﴾ الحج: ٥ .

لێرەدا قورئانی پیرۆز ئاماژە بە قۆناغەكانی دروست بوونی كۆرپەلە دەكات ، كەهەمان ئەم وشانەن زانستی پزیشكی و بایۆلۆجی نوێ بەكاری هێناون.

١- (فانا خلقناكم من تراب) ، ئێمە لە خاك دروستمان كردون ، ئاماژەیە بەم توخمانەی خاك بەشداری دەكەن لە پێك هێنانی خانەی زیندوودا وەكو (فرانك

[٦٧] الله يتجلى في عصر العلم / ل:١٠.
[٦٨] الله يتجلى في عصر العلم / ل: ٥٤.

ئالن) باسی کرد (هایدرۆجین ، ئۆکسجین ، کاربۆن ، نایترۆجین ، گۆگرد) ئەمانە بەشداری دەکەن لە پێك هێنانی گەردی پرۆتینی دا .

٢- (نطفة) ، سپێرمی پیاوە ، کە وەکو (دیڤید روزفیك) باس دەکات درێژی (1/500) ئینجێکە و پانی (١/٨٠٠٠) ئینجێکە.

٣- (علقة) واتە : خۆ هەڵواس ، یەك لە ماناکانی خۆ هەڵواسینی سپێرمە بە هێلکۆکەدا ، کە لە شێوەی کرمی بۆقدایە (علقه) بەمانای کرم یان زەروو دێ.

لەکاتی پەیوەندی جنسی دا (٤٠٠) ملیۆن سپێرم ڕادەکەن بەرەو هێلکۆکە بەشلەکاندا بەزێ و ملی منداڵدانـدا مەلە دەکەن ، هێلکۆکە تیرەی (١/٢٥٠) ئینجە ، زۆربەی سپێرمەکان هەرچەندە ماددەی تفتیان پێ یە ، بەڵام زۆربەیان لەو ڕێگایە ترشە لۆکەدا دەمرن ، لە (٤٠٠) ملیۆنە یەك دانە دەچێ هێلکۆکە دەپیتێ و دەگاتە ناوکی هێلکۆکە بۆ یەك گرتن ، ئەوانەی تر دەمرن (٢٣) کرۆمۆسۆمی پیاو تێکەڵ بە (٢٣) کرۆمۆسۆمی ئافرەت دەبن ، ژیانەکی نوێ دەست پێ دەکات و بەپیتان (اللاقحة) دەناسرێ ، قورئان بە (العلوق) ناوی دەبات.

٤- (مضغة) واتە : پارچە گۆشتەکی جواو ، لە ڕۆژی چوارەمدا ئەو زایگۆتە بۆ (٦٠) خانە یان پتر دابەش دەبێ و بە (توتیا) دەناسرێ.

(مضغة مخلقة و غير مخلقة) ئاماژەیە بۆ توتیا کە دەبێ بەدووبەش ، بەشێکیان کۆرپەتك و پەردەو کیسی ئاوی و وێڵداش دروست دەکات ، لە چینی ناوەوەی خانەکان کۆرپەلە دروست دەبێت.

٥- (ونقر في الارحام ماشاء الله الى اجل مسمى) لە ڕۆژی (٥-٦) توتیە دەگاتە منداڵدان لەوێ دا دەڕوێ لەناوپۆشی منداڵدانـدا خۆی جێگیرو قایم دەکات ، سەرەتا خۆراك لە زەردێنەی هێلکۆکەی پیتراو وەردەگرێ ، دوای ڕوان لە منداڵدانـدا خۆراك و وزە لە شانەکانی دایك وەردەگرێت ، دوای گەیشتنی هێلکۆکەی پیتراو بە منداڵدان هۆرمۆنەکان ناوپۆشی منداڵدان چڕ دەکەنەوەو پڕ

له خۆراکی دەکەن ، هێلکۆکە لەناو پۆشدا خۆی دەڕوێنێ خۆراك لە خوێنی دایك وەردەگرێ ، کاتێ ئەم هێلکۆکەیە خۆی ڕواند بە (کۆرپەلە) دەناسرێت.

٦- (ثم نخرجكم طفلا) دوای تەواو بوونی کۆرپەلەو ئامادەبوونی، ژانی دایك دەست پێ دەکات لە پێشدا سەری دێتە دەر ، دوایی لەشەکەی بە ویستی خوا لە کتێبەکی تایبەتی ئیعجازی بەناوی (کۆرپەلەناسی) زیاتر درێژە بەم باسانە دەدەین و ڕوونیان دەکەینەوە ، بۆ زانستی پتر بڕوانە (خلق الانسان / د.زغلول النجار) و (دليل المرأة الطبي / ديفيد رورفيك) کە ئێمە سوودمان لێ وەرگرتووە .

بێگومان لە ڕووی بایۆلۆجی یەوە خانەکان لە سپێرم و هێلکۆکەدا زیندووون و گەشە دەکەن و ڕوحیان لەبەرە ، بەڵام لای هەندێ زانایان جیاوازی هەیە لەنێوان ژیانی خانەیی و ژیانی ڕوحی . وەك باسکرا.

ئەمە لە ڕووی بایۆلۆجی و فیزیکی یەوە بوو ، بەڵام لە ڕاڤەی میتافیزیکی دا (ج.ئارتەر فندلای) دەربارەی گیان و چۆنیەتی دووگیان بوون دەنووسێ : (دووگیان بوون لەکاتێ دا ڕوودەدات ، کە هزر لەگەڵ ماددەدا جووت دەبێ ، هزر لە ئاستی مادده جیایە ، هزریش ماددەیەکە ، جگە لەم وشەیە وشەی تر نییە شوێنی بگرێتەوە ، زۆر لە سەرووی شەپۆلی کەهرۆموگناتیسی وەکو شەپۆلی سەر بنەوشەیی دەلەرێتەوە ، ئەو مادده ناسکە دەبێ بەهۆی یەك پێ گرتنی خانەی نێرینەیی لەگەڵ خانەی مێ ینە یی دا ، پاشان دەرکەوتن و گەشە دەست پێ دەکات .

ئەو مادده تاکە لە تاریکی منداڵدا ماددەی فیزیکی لێ دەهاڵێ، سەرەتا ئەم یەکگرتنە لە تاریکی دا نەبێ ڕوونادات ، چونکە ڕووناکی (بەلەش بوون) قەدەغە دەکات ، واتە ماددەیەکی لە دەوردا کۆدەبێتەوە لەنێوان شەپۆلی ژێر سوورو سەر بنەوشەیی دایە ، ئەو مادده ناسکە سەرەتا بیر دەکاتەوە ، بازنە ماددییەکە چڕ تر دەبێ تا لە دەوریدا کۆ ببێتەوەو لە کۆتایی دا لەشەکە پێك بێنێت .

کاتێ لەشی فیزیایی قایم و تۆکمە بو توانی بەرگەی لەرەی ڕووناکی بگرێ ئەم تاریکی یە چۆڵ بکات ، کە بە لەدایك بوون ناوی دەبەین ، پاشان هزر یان دەروون بەرەو دونیای فیزیایی لێژ دەبنەوە تا ئەرکی خۆیان ئەنجام بدەن ، کرداری گەشەکردن و پێ هەلاچوون دەوام دەکات ، ماددەی فزیایی دەوام دەکات لەکۆبوونەوە لەدەوری چوار چێوەی ئەتیری دا ، گەشەی هزری شان بەشانی گەشەی فزیایی دەڕوات . لەگەڵ پیر بوونیشدا گەشەی هزری ناوەستێ ، هەر چەندە بەهەمان ئاسانی ناتوانێ چالاکی خۆی ئەنجام بدات هەر چەندە کەسایەتییەکە دیاری کراوە ، چونکە هزر ئەو سیفاتانە وەردەگرێ کەوامان لێ دەکات ، ئێمە لەسەری ببین ، مۆخی فیزیایی تەنیا بەرگێکە هزر لە (لەرەی فیزیکی) دەپارێزێ ، تا بتوانێ لە (مۆخی ئەتیری)دا کارەکانی بەڕێوە ببات . زاکیرەو سۆز شوێن هزر دەکەون ، بەڵکو ڕەوشت و کەسایەتیش ، کە پەیدابوون ، لەکاتی مردندا بەرگی فیزیایی بەجێ دێڵێ تا بەرەو زەوی بگەڕێتەوە کە لێوەی هاتووە ، هزرو ڕوحیش بۆ ئەو ناوەندە دەگەڕێنەوە وە لێوەی هاتوونە ، پێویست نییە گۆڕان لەنیشتەجێ بووندا ڕووبدات ، ڕوح دەتوانێ لە ژووری خۆی ئەو سەقفەی تێ یدا مردوووە بمێنێتەوە ....)[٦٩].

(احمد فهمی ابو الخیر) دەنووسێ : تەواوی سپێرمەی زیندووو یان خانەیەکی زیندەگی لەسێ کوچکەی هزرو ماددەی ئەتیری و ماددەی فیزیایی پێك دێ ، ئەو دوو ماددانەی دوایی واتە لەشی ئەتیرو لەشی فیزیایی لەش پێك دێن ، هەر خانەیەکی فیزیایی خانەیێکی ئەتیری هەیە ، بۆیە لەشی ئەتیری پێکاو پێکی لەشی فیزیایی یە خانە بە خانە)[٧٠].

قورئانی پیرۆز ئاماژە بەم تاریکی یە دەکات کە کۆرپەلەی تێدا دروست دەبێ : ﴿ يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقًا مِّن بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ ﴾ الزمر: ٦ ، واتە :

[٦٩] على حافة العالم الاثيرى (ل:٧٠).
[٧٠] على حافة العالم الاثيرى (ل : ٧٠/ پەراوێزەکە).

لەسکی دایکتا دروستتان دەکەین دروست بوون لە دوای دروست بوون لەسێ پەردەی تاریکدا ، چونکە لەپەردەی تاریکیدا نەبێ خانەکان لەبەر ڕووناکی دەمرن . لە کەموڵەی کۆرپەلەشدا هەمان یاسا ڕەچاو دەکرێت. بڕوانە : موسوعة الاعجاز العلمي / یوسف الحاج / ل:١٢٥.

**ئیعجازی سێیەم : مورشیدی ڕوحی کێیە؟**

﴿ ۞ وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَا إِلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ الْمَوْتَىٰ ﴾ الأنعام: ١١١ ﴿ ئەم ئایەتە ئاماژە بە مورشیدی ڕۆحی پاك دەكات ﴾.

﴿ هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ الشَّيَاطِينُ ﴿٢٢١﴾ تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ﴿٢٢٢﴾ ﴾ الشعراء: ٢٢١ — ٢٢٢ ﴿ ئەم ئایەتە ئاماژە بە مورشیدی ڕۆحی پیس دەكات ﴾.

**(الحاكم) لە (المستدرك) لە پێشەوا عەلی (ﷺ) گێڕایەوە : پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی :** (ما من عبد ولا امة ينام فيمتلئ نوما ، الا يعرج بروحه الى العرش **فالذي لا يستيقظ** الا عند العرش فتلك الرؤيا التي تصدق ، والذي **يستيقظ دون العرش فتلك** الرؤيا التي تكذب) **، واتە : هەر پیاو و ژنێ نووستن و چوونە خەوەوە ، مسۆگەر ڕوحیان بەرز دەبێتەوە بەرەو عەرش ، گەر گەیشتە عەرش و بێدار بۆوە خەوەكەی ڕاست دەردەچێ ، گەر نەگەیشتە عەرش ئەو خەونەی ڕاست دەرناچێت و بێگومان ڕۆحی پێغەمبەر -د.خ- و فریشتەكان ڕابەری ڕۆحی بەرزن.**

(النسائی) **لە (خزیمە) گێڕایەوە : لەخەونمدا بینیم لەسەر ناوچەوانی پێغەمبەر (ﷺ) كوڕنووشم دەبرد ، كاتێ بۆم گێڕایەوە فەرمووی :** (ان الروح تلتقي بالروح) **واتە : ڕوح ژوانی ڕوح دەكات .**

ـ ـ رـى في المنام فقد رآني ، فان الشيطان لا يتمثل بي) متفق عليه، واته : كێ ـ ـه خەوندا ببینێ ئەوە منم ، شەیتان ناتوانێ لەسەر شێوەی من خۆی بەلەش ـكـ .

ـ ـرؤيـ ثلاثة : فبشرى من الله ، وحديث النفس ، وتخويف من الشيطان) رواه ـ ـرـ ـی / صححه السيوطي/ الجامع الصغير ، واته : خەون سێ بەشە : مژدەیە ـدێمن خواوە ، یان دالغە و خەیالە ، یان ترساندن و کابووسی شەیتانە.

ـ ـرێـا ئەم ئایەت و فەرموودانە پەرچی هەندێ لە دەروونناسان و فرۆیدییەکان ـ ـدـەوە کە پێ یان وایە خەونەکان دالغە و خەیالێکن (نەست) پەیدایان دەکات ، کە ـ ـگ و ریشەیان لەڕووداوی ڕابردوو حەزەکانی هەنووکەیی یەوە سەرچاوەیان گرتووە ـ ـلام بێگومان خەونە پێشبینی ییەکان و ئامادەکردنی ڕوحەکان سەلمێنەری ئەو ـ ـستی یەن کە خەونی خوایی هەیە ، نەك هەر خەونی دالغەی دەروونی کە ـ ـستەکان دروستی دەکەن .

ـ ـەر بڕوانیە کتێبی موسڵمانان وەکو (الروح / ابن القيم) و (شرح الصدور / ـ ـيوطي) و (المنامات / ابن ابي الدونيا) و (حلية الاولياء/ابو نعيم) زۆر نمونە ـ ـەر خەونە ڕاستەکان و ئیلهامی ئەولیایان دەبینێ ، کە وەکو دۆخێ هاتوو نەدی و ـ ـیوەست بوون بە داهاتووەو ، زۆربەی ئێمەی موسڵمانیش تاقی کردنەوەی لەم ـ ـیوەیەمان هاتۆتە پێش و بینیومانە.

جۆن لە خەونی ئاسایی دا سێ جۆر خەون هەیە ، لەخەوی دەستکردیشدا هەمان یاسا ـ ـیادە دەبێت.

(شتاینر) دەنووسێ : (لە جیهانی توخمەکاندا ڕوحەکانی زەوی (النوم) و ڕوحی ئاوەکان (الاندين) و ڕوحەکانی هەوا (السلف) و ڕوحەکانی ئاگر (السمندل) دەبینین، لە وتارێکی لەساڵی (١٩١٨) بە ناو و نیشانی (مردووان لەگەڵ خۆماندا ئامادەن) قسە دەکات .

**له هیپینۆتیزم و ئامادەکردنی ڕوحی دا (خەوێنـەر – المنوم) یـان رابـەر هەڵدەستێ ناوەندێ (مەدیوم) دەخـەوێنێ ، کـە کەسێکی لـەبارەو ئامـادەیی وەرگرتنـی ئیجاکـانی هەیەو زوکـاری تـێ دەکرێ بـە مەبەسـتی پەیوەنـدی کـردن بەڕوحەکانـەوە ، یـان بـۆ تلـەپاتی و دیـاردەی تـری وەکـو دیـاردەی سـیخوری و پۆلیسـی و ...هتـد ، وەکـوو (ڕوونالدم . ماکری) له (حروب العقل)دا بەدرێژی باسی کردووە له ئەمریکاو روسیادا ، وەکوو تیشکی بـڵاوە ، بـەڵام کێشـەی هیپنیـۆتیزم لەوەدایـە وەکـو (د.ئـۆرن) باسـی کـردووە ئەوانـەی دەخـەوێنرێن بـە موگناتیسـی زوو وەڵامـی ئیحانەسـتی یـەکان دەدەنەوە ، کە خەوێنەر ڕەوانەیان دەکات ، دوور نیە (خەوێنەر) دەربارەی ڕووداوێـك بڕوای خۆی هەبێ ، یان لەبارەی ناسنامەی تاوانبارێ ، دوورنییە ئەو بڕوایە بـۆ یـادی خەوێنراوەکان بگوازرێتەوە .**

**یـان گـەر خـەوێنراوەکان لـەبارەی بابەتێکـەوە بـڕوای خۆیـان هـەبێ یـان لـەبارەی تاوانێکەوە دوورنیـە بـۆ چـەند یاداشـتێکی ناڕاسـت بگۆڕێ و شـاهیدەکەی بەڕاسـتگۆ دابنـرێ ، سوێند بخـوات ئـەوە ڕاسـتە ، دادگاکـان ڕێگـا بـە پـۆلیس دەدات ، بـەهێنانی شاهید لەژێر هیپنۆتیزمدا ، بەڵام بەپێی چەند قەیدوبەندێك ، ولاتی سۆڤیەت زیاتر مەیلی هیپنۆتیزم کرد ،وەك له ئاژانسی هەواڵگری سۆڤیەتی دا باسکراوە [٧١].**

**(ریفا) یەکێکـە لـە ڕوحانیـەکان و دەڵـێ : ئـەو ڕوحانـەی پەیوەنـدییان بـە ئـەوەوە کردووە ڕوحی بنەڕەتی بوون نەك عەقڵی یە نەستی یـەکان ، هەنـدێ لـەو ڕوحانـەی پەیوەندییان کردووە خۆیان بە (جنۆکە) ناساندووەو هەندێکیان بـەڕوحی مـردوووان ، کە لەمەوپێش لەزەوی دا ژیاون[٧٢].**

(عزت علی البحیري) دەڵـێ : (رابـەری ڕوح ، یـان ڕوحـی رابـەر (سـیلڤەر بـرش) ڕوحێکی رابەرە له جیهانی ڕوحی دێ ، ئـەو نـاوەی هەڵبـژاردووە بـۆ ناسـاندنی خـۆی

[٧١] حروب العقل / رووناڵد.م.ماکري/ل:٣٧-٣٨.
[٧٢] ما بعد الحیاة ، کولن ولسن/ ل:٨٥.

ـەکێتی پەیوەندی کردن بە دونیای زەمینەوە ، لە ئاستی زەویدا قسە دەکات لە ـۆوبازنەی ڕوحانی دا .

یەکەم : لە (لەندەن) دا لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا ، لەوێدا ناوەندەکە (الوسیط) ـرێتی بوو لە (موریس باربائیل) سەرنووسەری ڕۆژنامەی (سیلك نیوز) و ئەندامی ـزنەی ڕوحانی (مستر سویفر) راگری ڕۆژنامە نووسان لە لەندەن لەسەدەی ـیستەمدا ، لەساڵی (١٩٨١)دا گەڕایەوە دونیای ڕوح ، لەم ناوەندەدا بەزمانی ئینگلیزی ـەروا.

ـوودم : لە (قاهیرە)دا لە کۆمەڵەی ئیسلامی ڕوحانی دا ، کە راوێژکار (رافع محمد ـ فع) بەڕێوەی دەبرد لە کۆتایی چلەکانی سەدەی ڕابردوودا ، ناوەندی ڕوحی ـدمینی (سید محمد عید غریب) بوو ، کە ساڵی (١٩٧٦) بۆ دونیای ڕوحی گەڕایەوە ، ـە دێ دا رابەرەکە (المرشد) بەزمانی عەرەبی میسری قسە دەکات ، ئەوە دەڵێ : ـەندمیەکی خوایە ، ڕوحێکە لە ڕوحەکانی خوا ، بڵێسەیەکە لە ڕووناکی خوا ، ئەو جەند هۆیێك بەکاردێنێ لەرەکانی هێواش بکات ، تا بتوانێ پەیوەندی بەجیهانی زەمینەوە بکات[٧٣]).

ئەمانید هوفحان) لە کتێبە ناودارەکەیدا (تطویر المهارات النفسیة) دا (ل:١٩١) باسێ دەنووسێ بەناوی : (نەفسانییەکان – ناوەندەکان – رابەرەکان).

ـەفسانیەکان یان دەروونییەکان کەسێکی هەستیارە بەگەشەپێدانی کارامەیی خۆی هەڵدەستێ لەوەرگرتندا ، بە ویستی خۆی سروشتەکان و نیگاکان لە کەسێکی تر وەردەگرێ ، نەفسانی دەتوانێ دۆخی بۆشایی زەینی (الفراغ الذهبي) بێنێتەدی ، یان (نەست۔اللاذهن) . دەتوانێ لەرەلەری کەسانی تر دەربخات و بیری بخوێنێتەوە ، بەمە دەگوترێ بیر خوێندنەوە یان خوێندنەوەی هالەی کەسانی تر.

---

[٧٣] دراسات في العالم الروح / ٢٥-٢٦.

ناوەند (الوسيط – مەديوم) : لەبیر خوێنەرەوە ئاستی بەرزترە ، هەمووو ناوەندەکان نەفسانین ، بەلأم هەمووو نەفسانیەکان ناوەند نین ، ناوەند لە توانای دا پەیوەندی لەگەلّ ڕوحەکاندا بگرێت ، ناوەند دوو جۆرە : ناوەندی دەروونی و هزری ، یەکەمیان لەشی بەکاردێ لەلایەنی ڕوحی دا لە ژیاندا ، ناوەندی هزری نامەی ڕوحەکان دەگوازنەوە لەلای ترەوە .

هەرچی رابەرە ، هەیە پێی وایە بەشێکن لە نەستی تایبەتی (اللاواعی) دەورمان و ئێمە شێوەیان پێ دەدەین ، هەیە پێی وایە بوونەوەری سەربەخۆن بۆ پاراستن و گەشەی ئێمە دیاری کراون[٧٤].

لە جیهانی سۆفیگەری ئیسلامی دا شێخی مورشید هەیە کە تەواو (الکامل) و تەواکەر (المکمل)ە ، بە پەروەردەو ئیحای ڕوحانی (مرید-دەروێش) بۆ ڕێگای راست ڕێنوما دەکات و سینەی خاوێن دەکاتەوەو مەقامی ڕوحی پێ دەبرێت و لە تیفەکانی ڕوحی زیندووو دەکاتەوەو بەجیهانی ڕوحانی ئاشنا دەکات و دەیگەیێنێتە ئاستی ئەو ناوەندەی بتوانێ پەیوەندی بەفریشتەکان و ڕوحەکانەوە بگرێت و سەیری لەوح و قەلّەم بکات .

(غەزالی) دەفەرمووێ : (سەرەتای تەریقەت بە موشاهەدە و موکاشەفە دەست پێ دەکات ، تا ئەوان لە بێداری دا فریشتەکان و ڕوحی پێغەمبەران دەبینن و دەنگی یان دەبیستن و سوودیان لێ وەردەگرن[٧٥]).

لەفکری ئیسلامی عیرفانی دا (تەصەوفی عیسەوی) و (تەصەوفی فکری) و (تەصەوفی ئاسایی) و (تەصەوفی موحەممەدی –صلى الله عليه وسلم-) هەیە .

---

[٧٤] تطوير المهارات النفسية ، انايد هوفمان/ ل:١٩٤ – ٢٠١ سەیر بکە.
[٧٥] المنقذ من الضلال/ل:٥٠.

وشەی (التصوف) وشەیەکی قورئانی یە وەکو (شێخ عبدالقادر) ی گەیلانی (قدس سرە) فەرموویەتی : (وشەی صۆفی) لە (الصفا) وە هاتووە ، وەکوو فەرموویەتی (ابو قاسم الجنیدی) دەڵێ : (صۆفی ئەو کەسەیە خۆی ساف کردووە لە بوونی خۆی ، دڵی دەبێتە باڵوێزو سەفیر لە نێوان خۆی و کردگاری دا ، صۆفی نابێ بە صۆفی تا پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) لە خەونـدا نەبینێ ، فەرمانی پێ نەکات بە شتێ و قەدەغەی نەکات لە شتێك[٧٦]).

قورئـان فەرموویـەتی: ﴿ وَإِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰكِ وَطَهَّرَكِ وَٱصْطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾ آل عمران: ٤٢

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾ ﴾ التوبة: ١١٩.

(یحیى بن معاذ) دەڵێ : قسەی (صددیقیەکان) کە لە شوێنی پێغەمبەرانن و ئەبدالی ئەوانن لەسەر سیرەکانی ئەوان ئیلهامی خوایە .

دیسان دەفەرمووێ : (تەصەوف لە (صفا)وە هاتووە نەك لە (صوف)وە هاتبێ واتە خوری)[٧٧].

لێرەدا گەیلانی بەرپەرچی ئەوانە دەداتەوە دەڵێن : (تصوف) لە (الصوف)وە هاتووە ، واتە : خوری ، چونکە خوریان کردۆتە بەر ، یان (نودلکە) دەڵێ : ئەوە بە دوور دەزانێ ئەو وشەیە (سوفیا)ی یۆنانی یەوە هاتبێ و (س)ی یۆنانی بێ لە عەرەبی دا گۆڕابێ یە (ص). [٧٨].

---

[٧٦] الفتح الرباني والفيض الرحماني/ السيد عبدالقادر الكيلاني/ ل:٢٤٠.
[٧٧] الفتح الرباني والفيض الرحماني/ السيد عبدالقادر الكيلاني/ ل:٩٥.
[٧٨] الفرقة الصوفية / سسنر ترمنجام/ ل:٤٦.

کەواتە : صۆفیگەری ئیسلامی نە لە زەردەشتییەکان و نە لە یۆنانییەکان و نە لە هیندییەکان وەرنەگیراوە ، بەڵکو هەڵقوڵاوی ڕوحی ئیسلامە ، لەناو هەمووو ئایینە ئاسمانییەکاندا جێگای خۆی گرتۆتەوە ، وەکوو بوونی بڕوابوون بە خواو نوێژو ڕۆژو لەناو ئایینەکانی تردا .

عەللامە (ابن حدید المعتزلی) دەڵێ : (زانراوە زانستی تەریقەت و حەقیقەت و حاڵەتەکانی سۆفیگەری ، کە تەواوی ئەوانەی خاوەنی ئەم هوونەرە بوون دەیدەنە پاڵ ئیمام عەلی (سەلامی خوای لەسەر) ، لەوانە (الشبلی) و (الجنید) و (سری) و (أبو یزید البسطامی) و (معروف الكرخي) و هتد)[79].

لە خۆرهەڵاتان (ماسینیون) و (تورنەندریە) دوای تاقی کردنەوەی زۆر سەلماندیان (سۆفیگەری) لەسەر خاکی ئیسلام گەشەی کرد ، بەو ناوەی ڕوحێکە لە ئیسلام و هەناوێکی ئەوە ، زاراوەکان و چەمکەکانیان و ڕێساکانی لە قوڕئان وەرگرتووە [80].

دوای مەقامی (ئالو بەیت) و دوانزە پێشەوایانی شێخی گەیلانی گەورەترین قوتبە بۆ ئەولیایان ، دەرگای تەریقەتە لە ئەوە دەکرێتەوە تا ئیمام عەلی (سەلامی خوای لەسەر بێت) لە ئەویشەوە دەگاتە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) .

١- لە کتێبی (التعريفات) الجرجانی) و (طبقات الصغری/ المناوي) ئاماژە بە (الرشد)ی پاکژ کراوە ، ئاستی ئەولیایان کراوە جەمسەر (قوتب) باسکراوە ، کە بریتی یە لەو تاکەی جێگای نەزەرو سەیرکردنی خوایە لە جیهان لە هەمووو سەردەمێکدا ، ئەو لەسەر دڵی (ئیسرائیلە).

بە چەند پلەیێکەوە :

---

[79] شرح نهج البلاغة / ابن حديد المعتزلي / ج١/ل:٤٦.
[80] التصوف الاسلامي / تور اندرية/ ت:د:عدنان عباس علي / ل:٢٢.

له فه‌رمووده‌دا هاتووه : (ان الله يبعث لهذه الامة على كل مائة سنة من يجدد لها دينها) (رواه ابو داود/ صحيح) ، واته : خوداوه‌ند هه‌موو سه‌ره سه‌ده‌يێك كه‌سێك بۆ ئه‌و ئۆممه‌ته ڕه‌وانه ده‌كات ئايينى خوا نوێ بكاته‌وه .

جه‌مسه‌ر ، يان قوتب نوێكه‌ره‌وه‌ى ئايينه ، دوانزه ئيمامه‌كه‌ى ئال و به‌يت هه‌موويان جه‌مسه‌ر بوون ، كه كۆمه‌ڵێ نووسراو له‌سه‌ريان نووسراوه ، وه‌كوو (الفصول المهمة / ابن صباغ المايكي) و (نور الابصار/ الشبلخي) و (الصواق المحرقة/ابن حجر الهيثمي).

قورئانى پيرۆز ده‌رباره‌ييان فه‌رموويه‌تى ﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴿٣٣﴾ ﴾ الأحزاب: ٣٣.

٢- (البدلاء) : حه‌وت كه‌سن له‌سه‌ر دڵى ابراهيمن (عليه السلام) ، به‌لام له فه‌رمووده‌دا (٣٠) يان (٤٠) كه‌سه ، (الابدال في امتي ثلاثون) رواه الطبراني / صحيح ، (الابدال اربعون رجلا واربعون امرأة) (رواه الفردوسى)، واته : ئه‌بدال چل پياوه‌و چل ئافره‌ته ، له فه‌رمووده‌دا هاتووه : (وبهم ترزقون) رواهما الطبراني / صحيح في الجامع الصغير للسيوطي ، به‌دوعاى ئه‌وان زه‌وى ده‌وه‌ستێ و باران ده‌بارێ و ڕۆزى دێت .

٣- (النقباء) ژماره‌يان (٣٠٠) كه‌سه .

٤- (النجباء) هه‌يه (٤٠) كه‌سن ، يان (٨) كه‌سن.

٥- (الامامان) ده‌رباره‌ى و چه‌پى جه‌مسه‌رو قوتبه‌وه‌ن و جێگرى ئه‌ون.

٦- (الاوتاد) چوار كه‌سن.

٧- (خه‌تم) كه‌مۆركى ويلايه‌تى موحه‌ممه‌ده (صلى الله عليه وسلم).

٨- (رجال الغيب) : ١٠ كه‌سه .

زۆر پايه‌ى تر باسكراوه ، ئه‌مانه به‌شێكن له‌مانه ، كه هه‌ر كام له‌وانه هه‌ڵگرى په‌يامى شه‌ريعه‌ت و ته‌ريقه‌تن و ئه‌رك و به‌رپرسيارى خۆيان هه‌يه .

قورئـــانی پـــیرۆز فەرموویـــەتی: ﴿ أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾ یونس: ٦٢.

وشـەی (الـولی) واتـە : خـاوەن ویلایـەت ، لـە کتێبـی (التعریفـات الجرجـانی) دا هاتووە (وەلی خواناس و سیفات ناسە ، بە پێی بـەردەوامی لـە گوێ ڕایـەڵی خـوا) پاشـان خوداوەنـد وەسـفی (الـولی) دەکـات : ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٤﴾ ﴾ یونس: ٦٣ – ٦٤

واتە : ئەولیایانی خوا ترسیان لەسەر نییەو خەمبار نابن ، ئەوانەی بڕوایان هێنـاوە ، تەقوا دەکەن ، مژدەیان هەیە لە ژیانی دونیا ، وشە خـوای یـەکان گۆڕانیـان بەسـەردا نایەت ، ئەمەش سەرکەوتنێکی گەورەیە .

(البشری – کلمات الله) مەبەست لە مژدە خوایی یەکانە ، وەکوو ئیلهام و کەرامـەت و خـەونی ڕاسـت ، وەکـوو (احمـد) لـە (درداء) ی گێڕاوەتـەوە (سـەلامی خـوای لەسـەر) فەرموویـەتی : (الرؤیـا الصـالحة یراهـا المسلم اویـری لـە) ، واتـە : خـەونی بـاش بـڕوادار دەیبینـێ ، یـان پیشـانی دەدرێـت. بێگومـان ئەمانـە کۆمـەدەربارەیی یەکـەی ڕوحـین ، لەسـەر چەند بنەمایـەکی زانسـتی نـەك خـەیاڵی دادەمـەزرێن ، تـا زانایـانی ڕوحانی خۆرئاوا بنەماکانی زانستی ڕوحی خۆیان لە عاریفانی موسڵمان وەرگرتـووەو قەرزداری ئەوانن.

خۆر ئاوا هـەمووو زانسـتە ڕوحیـەکانی خۆیـان لـە سۆفییەکانی ئیسلام وەرگرتـووە ، وەکوو چۆن یاساکان و زانستەکانی وەکو کیمیاو فیزیا و فەلسەفە لە زانا موسڵمانەکان وەردەگرن و شارستانی خۆرئاوای پێ دادەمەزرێنن.

**ـرِونه** : (المسلمون والعلم الحديث/ د.عبدالرزاق نوفل) و (شمس العرب تسطع عـى الغرب/ زيغريد هونكه) و (الامام جعفر الصادق كما عرفه علماء الغرب/ جـ عةً من المستشرقين).

**وِد دعيـان كتێبـی عيرفـانی لەلايـەن خۆرئـاوای يـەكان نووسـراوەو دەنووسـرێ وەكـو** ـغرق الصوفية / بسرتر منجام) و (التصوف الاسلامي/تور اندرية) و (ابن عـربي حياته ومذهبه / اسين بلا سيوس) و (كتاب اخبار الحلاج/ماسينيون) ـتجليات الروحية في الاسلام/ د.جوزيبى سكاتولين) ، (الانسان الكامل في ـلاسلام/ماسينيون) ...هتد.

**هـەمووو ئـەم كتێبانـە گـەورەيی ئـايينی ئيسلام و شارستانييەكەی پيشان دەدەن لـە ـەستی جيهـانی دا دەری دەخـەن ئيسـلام ئايينــە ، دوا ئايينــە ، عيرفانــە ، ياسـايە ، فەلسـەفەيە، زانسـتە ، گـەورەترين مەرجـەعی مرۆڤايـەتی يـە ، گـەورەترين ئـايينی يەكتاپەرستی يە ، گەورەترين ئايينی ڕوحانی و ماددييە.**

**ا جۆرج روبـير) دەڵـێ : (ئيسلام هـەر ئايينێك نييـە ، بـەڵكو دوا ئايينـە لـە مێـژوودا دەركـەوتووە ، ديسـان ئيسلام كۆمەڵگايـەكی ڕوحـی و كۆمەڵايـەتی يـە ، سيسـتەمێكی سياسـی يـە ، شـێوازی ژيانـە ، ئيسـلام مـافی خـۆی بـەدونيا داوەو حـەقی خۆشـی بـە ئاخيرەت داوە ، گيان لەسەر حيسابی لەش ماندوو ناكەين ، نـە لـەش لەسـەر حيسابی ڕوح ماندوو دەكەين ، دوانەيی ڕوحی و ماددی لە كەسايەتی مرۆڤی موسڵمانـدا هەيە)**

**مامۆسـتا هـورتن دەڵـێ : (لـە ئيسـلام دا يـەك گرتـوويی دەبيـنين لـە نێـوان ئـايين و زانستدا ، تاكە ئايينە پێكەوە يان گرێ دەدات[81]. بـەكورتی مورشـيدەكان دوو جـۆرن: ( مورشيدی پاك ) كە ڕوحە پاكەكانن، (مورشيدی چەپەڵ) كە شەيتانەكانن.**

---

[81] سقوط العلمانية / د.انور الجندي / ل:١٩٥.

**ئیعجازی چوارەم : دیاردەی نووستن و خەون و ئیلهام**

﴿ وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ﴿٩﴾ ﴾ النبأ: ٩ ، واتە : خەومان بۆ کردوون بە مایەی پشوودان و حەسانەوە .

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيْلِ ﴾ الأنعام: ٦٠ ، واتە : خودایە لە شەودا دەتانمرێنێت.

﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِى لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا ۖ فَيُمْسِكُ ٱلَّتِى قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ ﴾ الزمر: ٤٢

لێرەدا قورئانی پیرۆز دوو ڕاستی فیزیایی و میتافیزیکی ئاشکرا دەکات ، کە زانست جاران لێ یان بێ ئاگابووە :

**یەکەم : نووستن لە ڕووی فسیۆلۆجی یە تەمبەڵی نییە** ، بەڵکو لەم خولە سروشتی یەدا چالاکی و پشوودان و حەسانەوە بۆ مێشك و هزرو ماسولکەو ئەندامانی دەگەڕێتەوەو باری ئاسایی خۆی وەردەگرێتەوە[٨٢].

(سبات) بە مانای پشوودان دێ ، لە هەمان کاتدا بە مانای سڕبوون (Dormant) دێ ، کە هەندێ گیاندار پەنای بۆ دەبەن ، بەڕێکی یان نارێکی بە مەبەستی خۆپاراستن

---

[٨٢] سوودەکانی نووستن زۆرە وەکو (لندال .دافیدوف) باسی کردووە : چالاکی و گورجی و حەسانەوە بە مرۆڤ دەدات ، نەنووستن پیشەی بایۆلۆجی تێك دەدات ، گەر مرۆڤ (٥) ڕۆژ نەخەوێ دڵ و کۆئەندامی هەناسەی بە تەمبەڵی کاردەکەن ، زۆربەی خەڵکی تووشی وڕێنە و بیر بڵاوی و دڵەڕاوکێ و داهێزران دەبن و کارەکان بە سستی بەڕێوە دەبەن .

هەندێ جار ئاسەواری خراپ لەکەم خەوی دا نابینن و پێیان وایە گەر کەسێ زۆر نەخەوت و دوایی (١٢-١٥) کاتژمێر قەرەبووی دەکاتەوە .

(مدخل علم النفس / ل:٢٠٥).

ـەو دژوارییـەی لەدەوروبـەرەوە دێتـە ڕویـان ، دوای هەڵسـانەوە چـالاك دەبنـەوەو ـێـدووو دەبنـەوە ، نووسـتن دیاردەیـەكی بـایۆلۆجی حـەتمی یـە شـوێن كـاتێنێكی ـتوقیت) زەمەنی خولی دەكەوێت مرۆڤ و گیانداران تێ یدا خۆنەویستن.

ـیـان قورئان دەری دەخات نووستن مردنە ، لە نووستندا هەستەكان لەكار دەكەون و چـالاكی نەسـت و ڕوح دەسـت پـێ دەكـات ، نووسـتن دەرچـوونە لـە زەمـەن و شـوێن ، ـووستن ئامرازی پەیوەندییە بـە ڕوحەكانـەوە ، نووسـتن پـەروازە كردنـە بـە ڕوح بـۆ ـونیای ئەتیرو دووركەوتنەوەیە و ئازاد بوونە لە دونیای فیزیایی سنووردار ، نووستن ـزێكی چالاكی جەستەیی و ڕوحی یە ، ئاستی زیرەكی و هۆشی تێدا بەرز دەبێتەوە ، ـووسـتن دۆخـی نەسـتە بـۆ وەرگرتنـی ئیلـهام و ڕێنومایـە ڕوحـی یـەكان ، نووسـتن جووڵەیەكی دەغی كارەبایی یە،گۆڕانی فسیۆلۆجی روودەدات .

ـەپێی تیـۆری دەمـاری كیمیـایی هەنـدێ بـەش لـە مێشكدا وەكو نـاوكی (تلامـوس) و هـایبوتلاموس) و ناوچـەكانی (پـۆنس) قـەدی مێشـك بەرپرسـن لـە ڕوودانـی بـاری ـووسـتندا ، بەهـەرحاڵ نووسـتن بـارێكی بـایۆلۆجی و ڕوحـی یـە و تـەوقیت كـراوەو ـووبارەیـە بـۆ ڕوح و هـزرو لەشـی مـرۆڤ پێویستـە ، زۆر نووسـراو هەیـە لـەم بـارەوە ـووسراوە ، كە لەبەردەستمدایە وەكو (باب النوم و باب الاحلام/ د.علي الكمال) و (الاحلام بين العلم والعقيدة/ د:علي الوردي) و (تفسير الاحلام/ د:احمد صباحي عوض الله).

(ابـن القـيم) لـە كتێبـە ناودارەكەیـدا (الـروح) لـە (ابـن عبـاس) ی گێڕاوەتـەوە ئـەم ئایەتـەی (٤٢)ی (الزمـر)﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِى لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ ٱلَّتِى قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ ﴾ الزمر: ٤٢ دەری دەخـات لـەكاتی نووسـتندا ڕوحـی مـردووان و زینـدووان دیـداری یـەكتری دەكـەن ، خـوا ڕوحـی مـردووان دەگـرێ و ڕوحی زیندووان بۆ لاشەیان دەگێڕێتەوە .

**(ابن القیم) دەڵێ : (نوستوو لە خەوندا مردوو دەبینێ پرسیاری لێ دەکات ، مردووەکە شتی وای پێ دەڵێ نایزانێ ، هەواڵی ڕابردوو و داهاتووی پێ دەدات ، جار هەیە مردووو ئەو شوێنەی ئاشکرا کردووە پارەکانی تێدا شاردۆتەوەو کەس پێی نەزانیوە ، یان هەواڵی داوە قەزری فلان کەسی لەسەرە و بەڵگەکانی باس دەکات ، یان کارێکی کردووە کەس پێی نەزانیوە** [83].

**(ابن القیم) نمونەی زیندووی مێژوویی زۆر لەم بارەوە دێنێتەوە ، کە مرۆڤ دەتوانێ بیانخوێنێتەوە ، بە تایبەتی ئێستا کە بە کوردی کراوە ، هیچ ئۆممەتێ نییە وەکو ئیسلام گرنگی بە عیرفان و خەون و ئیلهام دابێ ، بەتایبەتی ئال و بەیت و ئەهلی عیرفان و فەیلەسووفان ، تا غەزالی پێی وایە ئەو زشتانەی لەکاتی خەوندا بەدەست دێنرێت لە پێشترن لەو زشتانەی بەهەستەکان دەست دەکەون .**

**پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (خەون بە شێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی)** (الرؤیا صالحة جزء من ستة وسبعین جزءا من النبوة) (رواه الحاکم).

**یان فەرموویەتی : (ذهبت النبوة وبقیت المبشرات)** (رواه ابن ماجة) ، **واتە : سروشتی پێغەمبەرایەتی ڕابرد ، بەڵام ئیلهامە مژدە بەخشەکان ماون.**

**(ابن القیم) خەونەکان دەکات بە چەند بەشێکەوە (خەون سێ بەشە : خەونی خوایی ، خەونی داڵغەو خەیاڵ).**

**خەونی ڕاست چەند بەشێکە :**

**١) ئیلهامە: خوای گەورە سروشتی دڵی بەندەی دەکات ، قسەی کردگارە لەگەڵ بەندە دا لە خەودا ، وەکوو** (عبادة بن الصامت) **و کەسانی تر باسیان کردووە .**

[83] الروح این القیم الجوزیة / ل:٤٢.

٢) هەیە فریشتەی خەون خۆی بۆ دەنێوێنێت و بەلەش دەکات .
٣) هەیە پەیوەندییە بە ڕوحی مردووەوانەوە لە خزم و دۆست و ئازیزو برادەرەکانی .
٤) هەیە پەروازەو فڕینە بەرەو خوا .
٥) هەیانە ڕوحەکە دەڕواتە بەهەشت بۆ دیداری زیندووان لەگەڵ مردووواندا[٨٤] .

بێگومان هەمووو ئەو بەشانە لە قوڕئان و فەرمووودەدا نمونەیان هاتووە.

نمونەی سروشی (مەریەم) و (دایکی موسا) و (طالوت) و (حەوارییەکان) و پاشای میسر (ئەخناتون) و خەونی زیندانییانی بەندیخانەی میسر... هتد.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (من رآني فقد اراني ، فان الشيطان لا يتمثل بي) رواه البخاري.

وە (ابن القيم) لە کتێبی (الروح) دا زۆر نمونەی زیندووو دێنێتەوە کە سەلەف تەحەکومییان بە خەون کردووە ، باسێکی هێناوە بەناوی (هل تثبت الاحكام برؤيا المنام؟) لە لاپەرە ٣١ دا ، چونکە وەکو لە فەرمووودەدا هاتووە (الرؤيا الصالحة من الله) رواه الترمذي ومسلم، واتە : خەونی ڕاست لە خوداوەیە.

(شيخ الاسلام محمد عبدالحي عبدالكبير الكتاني) دەنووسێ : ئیلهام لای ئەهلی حەق و سۆفی هەندێ فەقیهەکانی وەکو (فخر الرازي) لە (التفسير) داو (ابن الصلاح) لە (الفتاوى)دا دەکرێ بە بەڵگە ، مادام سنگی بۆ گوشاد ببێ و هیچ دژێکی نەبێت.

---

[٨٤] الروح / ل:٥١-٥٢.

(السهروردي) بەلگەی ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ ﴾ القصص: ٧ ﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ ﴾النحل: ٦٨ دێنێتەوە.

**(ابن السمعانی) دەڵێ : نکۆڵی کردنی دروست نییە[٨٥].**

**(السفیر علی البحیری) دەڵێ : خەون دیاردەیەکی گرنگە لە ژیانی مرۆڤ و زیندەوەراندا مرۆڤ لە جیهانی زەمینی ماددی هەستی دا سێ یەکی ژیانی بە نووستن دەباتە سەر ، بەڵام لە جیهانی ڕوحی دا نووستن نییە ، چونکە جەستە نییە پێویستی بە نووستن هەبێت ، نووستن مردنی بچووکە هەستەکان دەخەون ، لەشی ئەتیری لەشی ماددی لێ دەگەڕێ و ڕوح لەگەڵ خۆیدا دەبات ، بەڵام پەتێکی ئەتیری زێوین بە لەشی ماددییەوە بەستویەتەوە ، بە گەشتێکی دونیای ڕوحی هەڵدەستێ و وزەی گەردوونی وەردەگرێ ، پاشان بەرەو لەشی ماددی دەگەڕێتەوە ، واتە : نووستن هەلەکی ڕەخساوە بۆ لەشی ئەتیری تا بۆ ئەو دونیا ڕوحی یە بگەڕێتەوە لێوەی هاتووە ، بەمەبەستی بەدەستهێنانی وزەی گەردوونی ، ئەمەش مانای پێویست بوون بە نووستن دەگەیەنێت.**

**تاقیکردنەوەکان دەریان خستووە بێ بەش بوون لە نووستن بۆ سێ ڕۆژ ئەندێشەو بیر بڵاوی ترسناك پەیدا دەکات ، دوای (٩٠) کاتژمێر نە نووستن مرۆڤ هەستەکانی لەدەست دەدات ، گەر بۆ سەر خەو شکاندنێکیش بێت دوای بێداربوونەوە هەست بە چالاکی و گورجی دەکەین .**

**دیسان ئەزموونەکان دەریان خستووە نووستن قۆناغێکی تەمبەڵی تەوەزلی نییە . بەڵکو ماوەیەکی چالاکی بەردەوامە بۆ خانەکانی مێشك بەمەبەستی پاراستنی لەش و قەرەبووکردنەوەی ئەو توخمە زیندەگی یانەی لەدەست داون ، زۆرێ لەو کەرەستە کیمیایی یانە پێویستن ئامادەیان بکات .**

---

[٨٥] السر الحق الامتناني (الكتاني/ل:١٥٢)

هەندێ زانای ڕوحی پێیان وایە لە کاتی نووستندا ئەم چالاکییانە ڕوو دەدەن :

(١) خانەکانی لەش نوێ دەبنەوە ، لە چرکەیەکدا (١٢٠) ملیۆن خانە تازە دەبنەوە .

(٢) ئیلهامی خوایی تێدا دەبینین بۆ زانینی مەسەلەیەکی گرنگ .

(٣) گیان کە بە بەتێکی زێوینەوە بە لەشەوە بەستراوەتەوە بەرەو چینە جیا جیاکانی جیهانی ڕوحی گەشت دەکات و لە توانایدایە گیانی زیندووان و مردووان ببینێت ، فریشتەکان و جنۆکەکان دیدار بکات ، سەیری ڕابردوو و ئێستا بکاتەوە ، بڕواتە هەر خاڵێکی هەسارەکان و گێتی یەکانی ترەوە ، پاشان لە چاو تروکاندنێکدا بۆ لەش بگەڕێتەوە ، چونکە مۆخ ناتوانێ هەمووو ڕاستی یەکانی ئەوێ هەرس نەکات بەشێکی کەمی لەیاد دەمێنێت ، بەلأم گەر ڕوحی مرۆڤ گەشە بکات و پێ هەڵبچێ و بگاتە ئاستێکی بەرزی ڕوحانی ئەو کاتە لەبەرامبەر جیهانە ڕوحییەکان و وشیار دەبێ ، دەتوانێ مێشك لەکاتی نووستندا بۆ یاد کردنەوەی ڕووحەکان ڕابێنێت.

## چەند سەنتەر دام و دەزگایێ بۆ لێکۆڵینەوە لە نووستن:

لە وڵاتە پێشکەوتووەکان چەند سەنتەرێ دامەزراون لە نووستن و خەونەکان دەکۆڵنەوە ، دیسان سەر دانگەی تایبەتی بۆ تاو و توێ کردنی خەونەکان لە میسردا دروست دەکرێن.

زانایان سەلماندوویانە شەپۆلی کارەبایی مێشك لە خانەکانی دەگۆڕێن ، شەپۆلی (ئەلفا) کە لەکاتی بێداری دا بەخێرایی (٨-١٢) لەرەلەر لە چرکەیەکدا پەیدا دەبن ون دەبن ، ئەمە لەباری ڕامان و بیرکۆکردنەوە (التأمل)دا دەردەکەوێ ، سیفەتی شەپۆلی (ئەلفا) ئەوەیە مێشك لە سەرقاڵیەکانی پاکژ دەکاتەوە ، شەپۆلی بچووکترو خێراتر پەیدا

دەبن ، کە شەپۆلی (بێت)یە بە خێرایی (١٣-٢٢) لەرەلەر لە چرکەیەکدا ، لە پێشەوەی مێشك کە کرداری زەینی ئاڵۆزی تێدا ڕوودەدات دەردەچن ، گەر مرۆڤ بڕواتە قۆناغی قووڵی خەوەوە شەپۆلی کارەبایی گەورەترو هێواشتر پەیدا دەبن ، کە بە شەپۆلی (پیتا) ناودەبرێن بە خێرایی (٤-٧) لەرەلەر لە چرکەیەکدا[٨٦].

**قۆناغەکانی نووستن:**

قورئانی پیرۆز ئاماژە دەکات نووستن یەك دۆخی نییە ، بۆ نمونە : ﴿ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ﴾ البقرة: ٢٥٥ ، واتە : خودا سووکە خەو و نووستن نایگرێت.

﴿ إِذْ يُغَشِّيكُمُ ٱلنُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ ﴾ الأنفال: ١١ ، کاتێ خەوی سووك دەتان گرێ وەکو ئاسایشێ لەلایەن ئەوەوە.

﴿ وَتَحْسَبُهُمْ أَيْقَاظًا وَهُمْ رُقُودٌ ﴾ الكهف: ١٨، واتە : تۆ دەبینی یارانی ئەشکەوت **بێدارن کەچی ئەوان خەوتون . ئەمە ئاماژەیە بۆ سووکە خەو ( نێوان خەو و بێداری ).**

ئەم سووکە خەو و خەوی قووڵە لەکاتی نووستن و ئیلهام و خەونی ڕاست و هینۆتیزم دا ڕوودەدات ، تا سروشی ڕەوانەکراوانی خوایی لە دۆخی خەو و بێداری دا بووەو وەکو داهاتوو باسی دەکەین.

---

[٨٦] (ج.اج رایز) لە (عصر الخوارق/ل:٣٧:٣٢) باسی کردووە .

دیسان قورئان گرنگی بە مێشکی پێشەوە دەکات ، کە کرداری زەینی ئاڵۆزی تێدا ڕوودەدات (ما من دابة الاهو اخذ بنا صيتها) هود/٥٦ ، (ناصية كاذبة خاطئة) العلق/١٦، بڕوانە (دراسات في العالم الروح / ل:٢٦-٢٨.

ـ ـتی گەورە (دافید فولکیر) قۆناغەکانی نووستن دەکات بە پێنج بەش و قۆناغەوە تا ـگتە خەوی قووڵ :

قۆناغی یەکەم : کاتێ مێشك دەست بە نووستن دەکات سروشتی کارەبای گۆڕانی ـەردا دێ ، تیشکی شەپۆل درێژی (ئەلفا)ی تێدا کۆدەبێتەوە ، ئەمە قۆناغی گۆستنەوەیە لە نێوان خەو و بێداری دا ، هەندێ خورپە لە خۆی دەگرێ ناگاتە ـستی خەون ، پاشان چەند خولەکێ دەڕوات مێشك دۆخی نوێ وەردەگرێ و جۆرەها ـەپۆلی تێکەڵ دەبێ لەرەی جیا جیای کارەبایی یان هەیە ، ئەمە قۆناغی یەکەمی ـووستنەو خولەکێ تا حەوت خولەك دەخایەنێت ، لەم قۆناغەدا ڕوح لەش بەجێ ـێنێت .

قۆناغی دووەم : لەسەر دەزگای پێوەری کارەبای مێشك چەند هێڵێك دەردەکەوێ ـێواو و ناجێگیرن ، ئامازە بە چوونە ناو قۆناغی دووەمی نووستن دەکەن ، هەر کەسێ لەو دوو قۆناغەدا بێداربکەیەوە سورن لەسەر ئەوە ئەوان بە تەواوی خەویان ـێ نەکەوتبوو . هەندێ زانای تر دەڵێن : لەم قۆناغەدا گرژی ماسولکەیی کەم ـدەبێتەوە ، بەلآم جار هەیە نوستوو کەلەکەو کەلەکە دەکات ، چاوەکانی لە جووڵە کەوتوون ، پێیان وایە قۆناغی دووەم درێژترێن ماوەیان هەیە ، نزیکەی نیوەی کاتی ـووستن داگیر دەکات.

قۆناغی سێ یەم : لەم قۆناغەدا چالاکی زیندەگی لەش دادەبەزێ ، (لێدانی دڵ ، فشاری خوێن ، پلەی گەرمی) هەمووو چاودێرێك گەر مەبەستی بێ کەسەکە خەوتووە . زانای تر پێیان وایە لەم قۆناغەدا قووڵ بوونەوەکە زیاد دەکات ، وێنە مێشکی کارەبایی شەپۆلی بەرزترو فراوانترو هێواشتر پیشان دەدات ، بە شەپۆلی (دەلتا) دەناسرێت ، (١-٤) لەرە لەر دەبێ لە چرکەیێکدا.

قۆناغی چوارەم : شەپۆلەکانی مێشك هێواش تر دەبن ، لەم قۆناغەدا هەڵساندنەوەی خەتوو قورس دەبێت ، ئەگەر بێدار تر بکرێتەوە هیچ کام لەو خەون و خورپانەی

پێی گوتراوەو بینیویەتی لە یادی نامێنن ، هەرچەندە مێشك لە دەزگای پێوەردا دووپاتی دەكاتەوە چالاك بووە . هەندێ زانا پێیان وایە لەم قۆناغەدا خەو قوولّ تر دەبێتەوەو شەپۆلی (دەلتا) پتر دەبن .

قۆناغی پێنجەم : دوای (٩٠) خولەك كەسەكە لەباری نووستنی قوولەوە بۆ نووستنی ڕواڵەتی دەگوازرێتەوە ، لە زاراوەی زانستی دا بە نووستنی جووڵەی خێرایی چاو ناو دەبرێ ، چونكە دۆخی شەپۆلەكانی وەكو دۆخی شەپۆلەكانی دۆخی بە ئاگایی وایە ، لەم قۆناغەدا گرژی ماسولكەیی نامێنێ لە لەشداو وێنەكێشی كارەبایی ، جووڵە خێراكانی چاو تۆمار دەكات ، چەند خولەكێ دەخایەنێ ، پاشان لەكار دەكەوێ ، مرۆڤ بۆ دۆخی سێ یەم و دووەمی نووستن دەگەڕێتەوە ، زۆری پێ ناچێ بۆ قۆناغی پێنجەم دەڕوات.

ئەو سوڕانە (٤-٥) جار لە شەوێكدا دووبارە دەبنەوە ، لەكاتی چاو سوڕاندنی زۆردا وەكو (د:كلینتمان/١٩٥٦) باسی كرد خەونەكان دروست دەبن ، لەم قۆناغەدا ماسولكەكان لەكاتی خەون بینینەكە بەكاتی ئیفلیج دەبن و ناتوانین جووڵە بكەین ، ئەمەش لەچاكەی خوداوەیە .

هەندێ پێیان وایە قۆناغی پێنجەم بواری ڕاستەقینەیە بۆ نوێ بوونەوەی خانەكانی لەش .

هەندێ لە زانایان دەڵێن : لەم قۆناغەدا كۆئەندامی دەمار لە ڕووی هەستی یەوە چالاك دەبن یارمەتی دەدەن بۆ پێ گەیشتنی .

هەندێ پێیان وایە ئەمە بوارێكە بۆ بەتاڵ كردنەوەی چڕی ئەو فشارەی وردە وردە لەسەر مۆخی منداڵ پەیدا دەبێ لە قۆناغی پێ گەیشتن و هەراش بووندا ، وەكوو دەرچەی ئەمانە بەتاڵ بوونەوەی بارگە زۆرەكانی وزە ڕێك دەكات كە لەش دروستیان دەكات بەبێ بەتاڵ كردنەوەیەكی لەبار بۆی.

ڕێبازی ئەڵمانی (Elskkites) پێی وایە نووستن بریتییە لەکاتی بەتاڵ کردنەوەی وزەی سەلبی و بارگە کردنەوەی (لەشی نەتیری) بەوزەی گەردوونی (موجەب) ، ئەم پێناسەیە ئەوە ڕوون دەکاتەوە چۆن خۆ خاوکردنەوە (الاسترخاو) لەگەڵ ڕامان و بیر کۆکردنەوە تا لەکاتی بێداری دا وەکو جۆرێکە لە نووستن هۆشیارانە ئەو خۆ خاو کردنەوەیە لەگەڵ ڕامان (التأمل) دا کاریگەریی سەیری هەیە بۆ سەر گێڕانەوەی توانای جەستەیی و زەینی.

**نیعجازی ( ٥ ) : سووکە خەو و ڕامان ( النعاس – التأمل ) و نوێژو کۆڕی زیکر بە ڕامانەوە :**

لەکاتی ڕامان و بیر کردنەوە هەست بە وزەی گەردوونی دەکەین لەشمان بە وزەی تازە بارگاوی دەکاتەوە بۆ ژیان لە ڕێگای ناوەندی گیانی یەوە ، ڕوحی یەمت دێ بۆمان شیکار دەکات ئێمە لەسەر زەوی چەند گیانێکی نامۆین ، نووستن گەشتێکی جیهانی ڕوحی و ماددییە ، چەند ڕاهێنانێکە بە مەبەستی نەپچڕانی شیرازەی لەشی نەتیرە بەجیهانی ڕوحی یەوە لەکاتی ژیانی زەمینی دا تەواوی ، کە مرۆڤ لەکاتی مردنی دا ماوەیەکی زۆری پێ دەچێ بۆ هەڵسانەوە تووشی هەینو گرتن و راتەکان (الصدمە) نەبێت.

زۆر لە زانایان و هونەرمەندان و ئەدیبان و شاعیران زۆرترینی کارە باشەکانیان لە دۆخی سووکە خەو و ڕاماندا ئەنجام داوە .

فەیلەسوفی ئیسلام (ابن سینا) دەڵێ : هەر کە خەمێ دەمگرێ مەسەلە قورسەکان لە خەونمدا دەبینم و زۆرێ لەو مەسەلانەم لە خەوندا بۆ ڕوون دەبێتەوە .

موسیقاری گەورە (موزار) دەڵێ : ئیلهامە موسیقی یەکانی وەکو ئیلهام شێوە دەگرن بەبێ ویستی ئەو.

**دیسان زانای گەورە نیوتن دان بەوەدا دێنێ دژوارترین مەسەلە ماتماتیکی یەکانی لەکاتی خەو لێ کەوتندا بە بیرکردنەوە بۆ ڕوون بۆتەوە** [٨٧].

**قورئانی پیرۆز فەرمانمان پێ دەکات بە نوێژی ڕامان و بێ دالغەو خەیال :** ﴿ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ﴾ الماعون: ٤ – ٥ ، **واتە : هاوار بۆ ئەو نوێژ خوێنانەی لە نوێژیاندا بێ ئاگان .**

**پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی :** (تفکر ساعة خير من عبادة سنة) (مکاشفة القلوب / الغزالي). **واتە : بیر کردنەوەی یەك کاتژمێر لە خواپەرستی ساڵێك باشترە .** ﴿ ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْ ﴾ آل عمران: ١٥٤ ، **پاشان ناردمانە سەرتان دوای غەمەکە ئارامیەکی سووکە خەو (وەنەوز) ، کۆمەڵێ لە ئێوە دەگرێتەوە .**

**لێرەدا قورئان دەری دەخات ئەم حاڵە دەروونی یە ڕوحی یە تەنیا ئەوانە دەگرێتەوە ئامادەیی ڕوحیان هەیە ، دەری دەخات ئیلهام و ئارام و چالاکی لەو دۆخەدا دەست دەکەوێت .**

**(نورمان فنسنت بیل) نووسەری ناودار دەڵێ : (ئێوە نوێژ بە ڕێگای دروست و زانستی فێر ببن ، لە نوێژی بە دالغەو بێ ئاگا خۆ دوور بگرن) ، بیرکردنەوەی ساغ وزەیەکی نائاسایی بەرێ دەکات ، (بیل) دەڵێ : (ئێوە وزەییەکتان لەناودا هەیە دەتوانێ شاری نیویۆرك بکاتە خۆڵەمێش ، فیزیای پێشکەوتوو ئەوەمان پێ دەڵێت)**[٨٨].

---

[٨٧] دراسات في العالم الروح / ل:٢٧-٣٠.

[٨٨] حروب العقل / روونالد م . ماکری / ل:١٣٠

- ـتاینر) دەڵێ : (ئەو کاتەی بەرەو نووستن دەچین و ئەو کاتەی خەریکە بێدار ـەینەوە ، تووشی مردوووان دەبین ، ئەو دوو کاتە زۆر گرنگە بۆ پەیوەندی کردن ـە مردوووان و ڕوحەکانی تری دونیای باڵا)[89].

- مصطفی محمود) لەبارەی سووکە خەو (وەنەوز) ڕوونکردنەوەیەکی پوخت و ـڕمانای نووسیوەو دەڵێ : (سووکە خەو (النعاس) ساتەکی قووڵە ، چونکە هزر لە ـزنەی باری خۆی دەردەچێ لە ئولفەت و ڕاهاتن و نەریتی ئاسایی دەڕواتە دەر ، ـەیری دەوری خۆی دەکاتەوە ، تا یاساو حوکمی تازەترو ئازادترو ئیلهام دەربکات).

ـێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر) لەو ساتەدا ئیلهام و سروشیان وەرگرتووە ، ـرووشیان لە نێوان سووکە خەو و بێ ئاگایی تەواودا وەرگرتووە .

ـیوتن) هێزی کێش کردنی زەوی لەو بارەدا دۆزییەوە ، بەچاوی سووکە خەو ـەیری سێوەکەی کرد لەدار سێوەکە کەوتە خوارەوە ، بینی کەوتنی ئەو سێوە ـسایی نیە ، سێوەکە ناکەوێتە خوار گەر زەوی کێشی نەکردبایە .

تەواوی داهێنەران و نووسەران و شاعیران و بیرمەندان لەو ساتەدا هزریان دەبێتەوە ، کە ساتێکی گرنگە شتی ئاسایی ڕۆڵی نامێنێ و ژیان بە واق وڕمان دەردەکەوێ و هزر بە تەواوی بە پرسیاری نوێ دەردەکەوێ گەر لەباری بێداری تەواودابێ و تەواوی پەیوەندی بەشتەکانەوە هەبێ ئەم ڕاستی یانە وەرناگرێت ، جیاوازی نێوان پێغەمبەرو بلیمەت لەو ساتەدا بریتییە لە ڕووبەری ئەو خەون و جیهانە واتایەی بۆی ئاشکرا دەبێت ، پێغەمبەر بە دەزگای تەلەفزیۆنی دەچێ ، ملیۆنەها دەرچە (الصمام) ی هەیەو ڕووبەری خەونەکەی فراوانە ، توانای وەرگرتن و ڕاکێشانی زۆرە ، ئەو دەتوانێ چەند وێنەیێ لە مەریخ وەربگرێ بۆ سەر شاشەی پانۆرامای فراوانی ، چونکە هۆیە خوایەکانی لە پشتەوەیە بۆ یارمەتی ، بلیمەت دەزگایەکی (ترانزیستور)ی بچووکە بەدژواری یەوە خەریکە گوێ لە وێستگەی قاهرە دەبێ .

[89] ما بعد الحياة / كولن ولسن / ل:١٦٦.

لەبەر ئەوەی پشت بە ئەرکی خەیاڵ دەبەستێ ، کە ڕەنگە جار هەیە ڕاستی ببێکێ و جار هەیە هەڵە بکات ، بەڵام هەردوو لا لە دەریای ڕاستی یەکاندا مەلە دەکەن)[٩٠].

(باترینشا کارنگتون) ئاماژە دەکات (ڕامانی ئایینی و نوێژ) لە زۆربەی دونیادا وەکو وەرزشێکی ڕوحی وەکو ڕێگایەکی کرداری بەکاردێنرێ ، ئایینی هیندۆسی و بوزی و صۆفییەکان هەوڵ دەدەن ، ئەو هونەرو شاکارییە گەشە پێ بدەن ، دەڵێ (ماوثن) پێی وایە (نوێژی بەرامان و بێ هەست و خوست بۆ ماوەیەکی درێژ تاکە ڕێگایە بۆ ڕامان).

(ڕامان) بە چەمکی خۆرئاوا بەشێکە لە هیپنۆتیزم (ابراهام مازلو) بە هیپنۆتیزمەکی پڕ لە چالاکی ناوی دەبات ، هیپنۆتیزم و ڕامان هەندێ سیستەمی ڕوحی وەکو (یۆگا) سوودی لێ وەردەگرن ، دروستە (هیپنۆتیزمی زاتی) جۆرێك بێ لە جۆرەکانی ڕامان ، ئاماژە دەکات زۆربەی ئەوانەی ڕامان دەکەن مەیلی شەپۆلی دەماغی لەجۆری ئەلفا دەکەن ، لەناوچەی پێشە سەرو چەقی مێشکدا دەردەکەون[٩١].

(د:میلان ریزل) دکتۆرا لە فیزیاو کیمیا لە زانکۆی براگ و پسپۆڕ لەبواری میتافیزیك دەنووسێ : (نووستن و هپنیۆتیزم و باری بێداری زۆر دژ بەیەك نین ، بەڵکو پەیوەندی زۆریان بەیەکەوە هەیە ، نێوبڕێکی ڕوونیان لەنێواندا نیە ، دەتوانن باری ناوەندی وەربگرن بۆ زنجیرەیەکی بێ هەژمار ، تا دووبارە نەبنەوە) ، قوڵایی هیپنۆتیزم پشت بە جیاوازی ئاستەکانی نێوان بەشە وروژێنراوەکان و بەشە کۆسپەکان دەبەستێ ، لەمەوە دەردەکەوێ دۆخی هیپنۆتیزم لەدوو ڕێگاوە بەدەست دێ لە کرۆکدا :

(١) لە ڕێگا تەگەرە خستنە بەردەم زۆربەی کاری مێشك و پاراستنی دۆخی بە ئاگایی لە بەشێکی دا لەوانە (ئولفەت Raport) ، ئەم دۆخە لەباری

---

[٩٠] لغزالموت / د.مصطفى محمود / ل:٦٤.

[٩١] بروانة (التأمل/ باتريشا كار نعتون/ ت:اقبال ايوب).

هیپنۆتیزمی ئاسایی دا ڕوودەدات ، کە لە نۆڕینگەی پزیشکی دا دێتە ئاراوە ، لەماوەی کردارێکی دژەوانەدا ، واتە : لە ڕێگای وروژاندنی ئاگایی لە بەشێکی دا ، دەتوانین نمونەیەك بۆ ئەو کردارە بێنینەوە ، ئامادەکردنە دروشمی یەکان لەجادوی ئاسایی دا ، ئەو کردارە ئامادە کردنە لە ڕێگەی وروژاندنە هەستی بەهێزەوە دەبێ وەکو (ترس و تۆقین و چاوەڕێ ی بەدڵەڕاوکێ وە) کە تەواوی چالاکی هێزی لەسەر ئەو هەستە کۆ دەکاتەوە .

(٢) ئەو نوێژەی پاڕانەوەکانی ڕاستگۆیانەو تەواو ڕامان و بیری تێ دا کۆدەکرێتەوە ، نمونەی دووەمی ڕێگای دووەمە .

من لێرەدا بیر لە نوێژی ڕۆتینی ناکەمەوە ، بەڵکو نوێژێك ناخی تێدا دەکرێتەوە ، مرۆڤ لە قوڵایی دڵەوە ڕو لە کردگاری دەکات ، ئەو نوێژخوێن دەخاتە جەزبەی سۆفی گەرییەوە لەگەڵ کردگاردا ، هەست و بیری لەخوادا ، دەچەسپێت و هیچ شتێ نایهەژێنێ ، دونیای دەوروبەری لەیاد دەباتەوە ، کۆرە ئایینییەکان بەشداری ئەو سووکە خەو و بێ ئاگابوونە ئایینی دەکات (الغيبوبة) .[٩٢]

بێگومان نوێژو پاڕانەوەو یادی خودا هەمووو ئەوانە گەر بە ڕامان و بیر کۆکردنەوە ئەنجام بدرێت مرۆڤ دەخەنە حاڵەتی سووکە خەو و ڕووچوون بۆ ناو دونیای غەیب و چالاك بوونی دڵ و نەست و ئازادی ڕوح و دەبنە تێفرۆسماندنێکی بەهێز کار لە نەست و دڵ دەکەن ، نەخۆشی و تاوانە دەروونییەکان ڕەش دەکەنەوە ، پڕی دەکەن لە ئیحای ئیجابی ، دیسان دڵ دەبێتە شوێنی دابەزینی ڕوحی پاك و ئیحاو ئیلهامی ڕەوانە دەکەن.

﴿ وَٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ﴾ البقرة: ٤٥ ، واتە : داوای یارمەتی بکەن بە ئارامگرتن و نوێژ.

[٩٢] تدريب الادراك الحسي الفائق/ د.ميلان ريزل/ ل:٥٤.

﴿ فَنَادَتْهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٌ يُصَلِّى فِى ٱلْمِحْرَابِ أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَىٰ ﴾ آل عمران: ٣٩ ، واتـه : فريشـتـەكان بـانگی زەکـەرییایان کـرد لـە میحـراب دا نوێـژی دەکـرد ، خـودا موژدەت پێ دەدات بە یەحیا.

﴿ كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا ﴾ آل عمـران: ٣٧ ، واتــه : هــەر کاتێ زەکەریا دەچووە میحراب بۆ لای (مەریەم) ڕۆزی و خواردنی لای ئەو دەبینی.

بێگومان وشەی (الصلاة) وەکو شـێخی گـەیلانی (قدس سرة) لـە (الفتح الربـاني)دا فەرموویەتی : لە (الصلة) وە هاتووە ، واتە : پەیوەندی گرتن.

لە نوێژدا پەیوەندی بە دونیای غەیبەوە دەکرێ ، لەبارەی سووکە خەودا ئیلهام دێ و کـاری ئاسـایی ڕوودەدات وەکـو تلپـاتی و سـایکۆکینیزیا و شـیفای ڕوحـی و پەیوەنـدی بەڕوحەکانەوە .

گەیلانی فەرموویـەتی : ﴿ (التصـوف) لـە (الصـفا) وە هـاتووە نـەك پۆشـینی خـوری ، سۆفی ڕاستگۆ ئەو کەسەیە دڵی پاکژ دەکاتەوە تەنیا خوای گـەورەی تێدایـە ، ئـەمـەش بە گۆڕینی بەرگ و زەردی دەم و چاو و بەستنی کلکەو لقە لقـی زەمـان و گێڕانـەوەی بەسەرهاتی خواناسان و جوڵاندنی پەنجەکان بە تەسبیح و تەهلیل نایێتە دی ، بەڵکو بە ڕاستگۆ بوون دێتـە دی لـە داواکردنـی حـەق و زوهـد کـردن ، لـەدونیاو بـەدەرنانی خەڵك لە دڵ و تەنیا خوای شکۆداری تێ دا دەهێڵێتەوە)﴾[٩٣].

غـەزالی وەکـو باسمـان کـرد لـە (المنقذ من الضـلال/ ل:٥٠)دا دەنووسـێ : سـەرەتای تەریقەت بە موشاهەدەو موکاشەفە دەست پێ دەکات ، ئەوان لە بێداریـدا فریشـتـەکان

[٩٣] الفتح الرباني والفيض الرحماني/ ل:٩٦.

و گیانی پێغەمبەران دەبینن و گوێیان لە قسەی ئەوان دەبێ و سوودیان لێ وەردەگرن[٩٤].

(د.میلان ریزل) دەڵێ : سادەترین ڕێگا بۆ ڕامان و بیرکۆکردنەوە مەشقی ئێوارانە بەر لە چوونە سەر جێگا ، قەڵەم و دەفتەرێ لە تەك خۆتدا دانێ ، بۆ نووسینی تێبینی یەکان لەکاتی شەودا ، کاتێ خەریکە دەکەوییە سووکە خەوەوە پرسیارێ بکە لە دڵی خۆتدا ، یان نوێژ بکە بۆ وەڵامەکەی ، هەوڵ بدە بکەویەوە سووکە خەوەوە و ئەو پرسیارەت لە زەینی دا بێ ، شایەد خەونێك ببینی یارمەتیت بدات بۆ چارەکردنی کێشەکەت[٩٥].

ئەم حاڵەتە لای موسڵمانان بە نوێژی (الاستخارة) و (الحاجة) ناو دەبرێت ، بۆ بینینی خەونی ئیلهامی و وەڵامی پرسیارەکان و داواکاریەکان.

دیسان (د.میلان ریزل) ئاماژە دەکات ئیحاو پێ گوتنی غەیری هەیەو زاتی هەیە ، کە کاردەکەنە سەرمان.

لەبارەی ئیحای غەیری (الایحاءات الغیریة) دەنووسێ : زۆربەی ژیانمان دەکەوینە ژێر کاریگەرییە ڕوحی یەکانەوە ، پێت سەیر دەبێ گەر ببیستی تا کام ئاتە ژیانت دەخاتە کاریگەرییەوە .

لەسەردەمی منداڵی یەوە ڕامانی تەواوت بۆ ژیان بەهەر ئاستێ بێ بەهۆکاری کاریگەری ئیحای قەناعەت بەخشی ژینگەی کۆمەڵایەتیت پاکژبۆتەوە ، وەکوو دایك ، مامۆستایان ، هاوڕێیان، ئەوانەی بە دڵت بوون ، لەسیاسەتدا ئەم کاریگەرییە شوشتنەوەی مێشك (تغسیل الدماغ) ناودەبرێت ، نەخوازەك کاتێ لەلایەن نەیارمانەوە بەکاردێ ، ئێمە هەموومان مل بۆ شوشتنەوەی مێشك کەچ دەکەین ،

---

[٩٤] المنقذ من الضلال / ل:٥١.

[٩٥] تدريب الادراك الحسي الفائق/ ل:٩٢.

ئەو ڕۆژنامەی دەیخوێنینەوە ، بەرنامەکانی ئێستگە و تەلەفزیۆن کە دەیانبینین و دەیان بیستین...)[96].

قورئانی مەزن ئاماژە بە شوشتنەوەی مێشك دەكات بەهۆی ئیحای شەیتانی و مرۆیی یەوە ، ئاماژە دەكات باشترین چارە بۆ ڕەش كردنەوەو بەرایی كردن لێیان یادی خودایە ﴿ ٱلَّذِى يُوَسۡوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ۞ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ۞ ﴾ الناس: ٥ – ٦ .

لەبارەی ئیحای ئیجابی زاتی فەرموویەتی : ﴿ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ﴾ الرعد: ٢٨ ، واتە : دڵنیابە بەیادی خوا دڵان ئارام و دڵنیا دەبن.

دیسان باس دەكات (نویز) كاریگەری سایكۆلۆجی و فسیۆلۆجی بۆ سەر ناخ هەیە ، هەروەها پاڕانەوەكان و یادی خوا كاریگەرییان لە هیپنۆتیزم و ڕامانی زاتی پترە ، دەنووسێ : (دەتوانی لە ڕێگای ئیحا چالاكەكان كەسایەتی خۆت بگۆڕی و ئەو دیاردە ئاشكرایانەی هاوكات دەبن لەگەڵ حاڵەتی ماندووبوونی دەماری و تێك چوونی دەروونی سادە لا ببەیت ، دیسان دەتوانی ئازارەكان و سەرئێشەو دەمارگرژی و ترس كەم بكەیەوەو خوی خراپ و خەوزڕان و برسێتی فرە لاببەیت ...هتد).

دیسان دەڵێ : (ئیحایەكان دەتوانن گۆڕانی بابەتی لەلەشدا دروست بكەن ، هاندانی كۆئەندامی دەماری دەتوانێ كار لە هەمووو لەش بكات ، ئیحای لەبار لەكاتی هیپنۆتیزم دا فشاری خوێنت دەگۆڕێ ، سەرباری گۆڕینی لێدانی دڵ و پێك هاتەی خوێن و شیلاوگ و هۆرمۆنی لەش[97].

(ولیەم جێمس) دەڵێ : ﴿ گەورەترین چارەی دڵەڕاوكێ (القلق) بڕوایە ﴾.

---

[96] تدريب الادراك الحسي الفائق/ ل:٥٩.
[97] تدريب الادراك الحسي الفائق/ ل:٦٣-٦٤.

(داهاتوو) له باسی نوێژو بڕوابوون به خوا شتی زیاتر باس دەکەین.

### ئیعجازی شەشەم : سەرخەو شکاندن (قەیلولە)

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (قيلوا فان الشيطان لا تقيل) رواه نعيم حماد.

قەیلولە سەر خەو شکاندنێکە بەر لە نیوەڕۆدا ، سوننەتەو لە ڕووی زانستیەوە سوودی زۆرە بۆ چالاکی دانەوە بە مرۆڤ ، لەبەر ئەوە زۆر لە کۆمپانیاکانی جیهان هانی کرێکارو فەرمانبەران دەدەن قەیلولە بکەن بۆ کەم کردنەوەی ماندووبون و زۆر کردنی بەرهەم ، لەوانە دەستەی ڕێگای ئاسنینی (ویلایەتی نیومەکسیکۆ) لە ئەمریکادا بەڕێوبەرەکەی (تۆمی جیبسون) دووپاتی کردەوە ، دوای ئەوەی ڕێگا بە کرێکارانی دراوە سەر خەو بشکێنن مێشکیان وریاترە بۆ کارکردن ، کارگەی (دەلتا)ی ئاسمانی ئەمریکا ڕێگای بەفڕۆکەوانەکان داوە لە گەشتیاندا بەسەر ئەتڵەسی دا قەیلەلولە بکەن .

(د.راسل روز نبرخ) لێکۆڵەر لە مەڵبەندی خەوزڕان لە نەخۆشخانەی (نورت سايد) دەڵێ : (ئەمریکی یەکان زۆر ماندوو دەبن بەهۆی کارکردن و داخوازییەکانی ژیانی ڕۆژانە ، قەیلولە پێویستی یەکی سروشتی یە بۆ لەش بۆ پشوودان لەنیوەڕۆدا ، کەپلەی گەرمی لەش دێتە خوارو تواناى دا ئەبەزێت).

### ئیعجازی حەوتەم : خەوزڕان (الارق) :

خەوزڕان (الارق) : بریتییە لە لێ تێك چوون و خەو لێ نەکەوتن ، ئەمەش نەخۆشییەکی توندە ژیان لە مرۆڤ تاڵ دەکات ، چونکە لەش پێویستی بە نووستن هەیە وەکو پێویستی بە خواردن و خواردنەوە ، بگرە پتریش ، یەکێ لە هۆیەکانی

**خەوزڕان تێك دانی نەریتی نووستنە ، یان جێ گۆڕی یە ، یان زۆر ماندووبوونە ، یان بەهۆی خواردنی هەندێ حەبی ڤیتامین و چالاکی بەخشە ، بەڵام بەهۆی سەرەکی خەوزڕان خەم و شپرزەیی دەروونی یە ، بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئەم دوعایەی داناوە بۆ خەوزڕان بەر لە نووستندا** (اللهم رب السماوات السبع وما اظلت ، ورب الارضين وما اقلت ، ورب الشياطين وماضلت ، كن لي جارا من شر خلقك كلهم اجمعين ان يفرط علي منم احد منهم او يبغى على عز جارك ، و جل ثناءك ولا اله غيرك).

**لێرەدا زۆر جۆر حەب و دەرمانی نووستن هەیە وەکو (ڤالیۆم و هیتەر) بۆ چارەسەری ئەم نەخۆشییە ، بەڵام بەهۆی مودمین بون و خوگرتن پێ یانەوە زیانی زۆر دەبەخشن ، لەبەر ئەوە زیانی زۆریان هەیە ، گەر خەو زڕانەکە چاك نەبوو وا باشە سەردانی پزیشکی دەروونی بکرێ ، یارمەتی کێشەکەی بدات)[٩٨].**

**ئیعجازی ( ٨ ) ( خەونی دالغەیی ) :**

**ڕابردوو بینیمان پێغەمبەر (ﷺ) خەونی کردووە بەسێ بەش : (خەونی خوایی و ئیلهامی ، خەونی دالغەیی، خەونی کابووسی)، بەڵام لەلای فرۆیدەوە ناوەڕۆکی خەون سێ بەشە :**

**(١) ناوەڕۆکی نەست (اللاواعی) لە ئارەزووەکان و بیرەکان و غەریزە منداڵییە کپ بووەکان پێك دێت.**

**(٢) لە ئەزموونی ڕۆژانەو ڕابردوویەکی نزیك .**

**(٣) هەست و وروژێنەرە هەستی یەکان ، کە تاك لەکاتی نووستندا توشی دەبێت[٩٩].**

---

[٩٨] الموسوعة الطبية الفقهية ، د: احمد محمد كنعان/ ل:٩١٥- ٩١٦.

[٩٩] باب النوم وباب الاحلام / د.على كمال / ٢٨٠.

بەو پێیە (فرۆید) بڕوای بە سرووش و ئیلهام و خەونی خوایی و شەیتانی نییە ، هەمووو خەونەکان لە خەونی دالغەیی دا کورت دەکاتەوە ، فرۆید کتێبێك بە ناوی (خەونەکان) دەنووسێ ، بەلام بەهۆی ڕەخنەی زۆری زانایان چەند جارێ دەسکاری دەکات و وەلامی ڕەخنە گرانی دەداتەوە .

یەك لە ڕەخنە گرە مەزنەکان کە لە (فرۆید) زیرەکترو زاناتر بووە (کارل یۆنگ)ە پێی وایە خەونەکان ڕازەکانی ژیانی ناوەوە ئاشکرا دەکەن ، نەستی تاك زۆر شتی تێدایە لە ئەزموونی تاکدا هیچ ڕەگ و ریشەیەکی ڕابردووی نیە .

(یونگ) نەستی کۆمەلایەتی بەرکاردێنێ چونکە نەست شەخسی نییە ، بەلکو گەردوونی یە ، هەرچی (ئەدلەرە) گرنگی کەمتر بە مەسەلەی خەون دەدات و پێی وایە خەون پشت بە هەستکردن بەکەمی کەسایەتی (الشعور بالنقص) و قەرەبووکردنەوەی دەبەستێت ، هەرچی (ئەلسکەندەر)ە بۆچوونەکانی یۆنگی لا پەسند دەبێت.

(کارنی هۆرنی) پێچەوانەی فرۆید کە دەلێ: خەون گوزارش دانە ل ئارەزووەکان پێی وایە خەون هەولێکە بۆ دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەك بۆ ئەو کێشەیەی لە ژیانی خەون بیندا ڕوویداوە ، ئەو ڕای (بجیری) کاری تێ دەکات لەبارەی خەونەوەو پێی وایە خەون ئەوە دەخوازێ لە ڕێگای توانای بنیات نەرو ئامانجدارەوە سەیری بکرێ بە مەبەستی کامل کردنی کەسایەتی نەك وەکو هەولێ بۆ رازی کردنی سێکسی لە ئاستی ئەزموونی مندالێ دا .

(سەمویل فرنش) پێی وایە خەونەکان ڕێك خەری سۆزەکانن لای (توماس فرنش) خەون خزمەت بە مەبەستی لێکۆلینەوەی چارە کردنی ئەو کێشانە دەکات لەنێوان کەسەکاندا ڕوودەدەن.

زۆر تیۆری تـر باسکراوه کـه دهتـوانی بـۆ زانسـتی پـتر بڕوانیـه (بـاب النـوم و بـاب الاحـلام/ د.علـی کمـال/ل:٢٧٧-٣١١) ، بـهڵام لـه ئیسلامداو بـهپێی میتـا فیزیکا خـهونی داڵغـهیی تـهنیا بهشـێکه لـه خهونـهکان ، کـه پێغهمبـهر (ﷺ) بـه (حـدیث النفس) ناوی بـردووه ، خهونـه پێشبینی یـهکان ، گـهورهترین پـهرچ دهرهوهی تیـۆری فرۆیـدن ، کـه هـهموومان ئـهزموونمان لهگهڵیانـدا ههیـه ، کـێ ههیـه چـهندان جـار خهونی نهبینی بێ و ههر له خـهیاڵی دا نـهبووهو دوایـی وهکـو ڕۆژی ڕوونـاك هاتۆتـه دی ؟!

**ئیعجازی ( ٩ ) ( خهونی کابوسی ) و ناخۆش :**

بێگومان کـابوس و خـهونی نـاخۆش و پـڕ تـرس و ئهندێشـه لـه شـهیتانهوهیه ، ئیحـا شهیتانهکان لهسـهر نهسـتی مرۆڤـدا پهیـدایان دهکـات ، ﴿شَيَـٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا﴾ الأنعام: ١١٢

**واته : شهیتانهکانی مـرۆڤ و جنۆکه ئیحای بریقـهدار بـه مهبهسـتی فریـودان ئیحـای یهکتری دهکهن ، ئیحای شهیتانی به (وهسوهسه) ناسراوه.**

**پێغهمبـهر (ﷺ) فهرموویـهتی** : (ان احـدکم اذا رأى رؤیـا یحبهـا فهـي مـن الله ولیحمد الله علیها ولیحدث بها النـاس ، واذا رأى غیر ذلك بمـا یکره فانمـا هـي مـن الشـیطان فلیسـتعذ بـالله مـن شرها ولا یـذکرها لاحـد فانهـا لا تضـره) رواه البخـاري، **واته : گـهر یـهکێ لـه ئێـوه خهونـهکی خۆشـی بینـی پێـی خـۆش بـوو ئـهوه ئیلهامی خوایه با سوپاسی خوای لهسهر بکات و بۆ خهڵکی بگێڕێتهوه ، گـهر نـا خـۆش بوو دڵێ گران کرد ئهوه له شهیتانهوهیه با بڵێ** : (اعوذ بـالله من الشـیطان الرجیم) **ولای کهس باسی ناکات ، ئهو کاته زیانی بۆ نابێت.**

(ئـالن كـاردك) لـه كتێبـه ناودارەكەيـدا (الارواح) دا دەنووسـێ : پەيوەنـدی ڕوحـەكان لەگەڵ خەڵكی دا بەردەوامە ، ڕوحە چاكەكان هەوڵ دەدەن ڕێنومايان بكەن بۆ چاكە ، لە ژيانی ئەزموونی دا بە هێزمان دەكەن ، يارمەتيمان دەدەن بە ئازايانە بەرگە يـان بگـرين ، ڕوحـی چـەپەڵ بـۆ خراپـەمان فريـو دەدەن ، كـاتێ دەكـەوين و تووشـی بەرێشانی دەبـين شـادمان دەبـن ، قسـەی ڕوحـەكان لەگـەڵ مرۆڤـدا بـە ئاشـكرايی و ناديارييەوە ڕوودەدات ، بەهۆی كاريگەری ڕوحەكان بەسـەرمانەوە بـەرەو خێـرو شـەڕ قسەو ئاخاوتنی شاراوە ڕوودەدات ، بێ ئەوەی پێ بـزانين ، پێويسـتە جيـاوازی بكـەين لەنێوان ئيحای باش و ئيحای خراپ كە بۆمان دێت[100].

لەهيپنۆتيزميشدا جار هەيە خەونی دالغەيی ئيحای شـەيتانی كـار لـە مێشكی ناوەنـد (الوسيط) دەكات و بينين و وەڵامەكانی ڕاست دەرناچن ، جار هەيە لە حاڵەتی ئيلهام و خەون و هيپنۆتيزم دا بە ئاشكرايی ئيحای ڕوحـی شـەر پڕدەبيستين و پـەييان پـێ دەبەين.

**ئيعجازی ( ١٠ ) ( خەونی ئيلهامی ) ( الرؤيا الصالحة )**

(نەسـت) بەشـێكی دڵـی مرۆڤـە ، بەهەسـتی شەشـەم و هەسـتی ڕوحـی ناسـراوە ، ئـەم بەشە شوێنی پەيوەندييەكانە بەڕوحەكانەوە ، شوێنی دابەزينی ڕوحی پـاك و ڕوحـی چەپەڵە ، چاوگی زانست و فەلسەفەو عيرفانـە ، بەشـی پەيوەنديـيە بـە ڕوح و ژيـانی دوای مەرگەوە .

غەزالی فەرموويەتی : (دڵ دوو دەرگای هەيە بۆ زانيارييەكان ، يەكەم بـۆ خەونەكانـە ، دووەم بۆ دونيای بێدارييە ، دەرگـای ڕواڵـەتی يـە بـۆ دەرەوە ، گـەر نووسـت دەرگـای هەسـتەكان دا دەخـرێ ، دەرگـای نـاخ دەكرێتـەوە غـەيبی مەلـەكوتی بـۆ دڵ دەبـێ ،

---

[100] كتاب الارواح / الن كاردك / ل:٢٩.

هەروەها لەوحی مەحفوزو وەکو ڕووناکی دەبێ ، جار هەیە کەشفە کە پێویستی بە لێکدانەوەی خەونان دەبێت[101].

بێگومان زۆر جار ئەو خەونانە ، پێشبینین ، یان زانست و فەلسەفەو عیرفان دەبەخشن ، یان مژدەو هۆشیارین ، کە لە مەلەکوتی ئاسمان و لەوحی پارێزراوی خوادا نووسراونەوەو بەشێکی کەمی بۆ دەردەکەون.

پرۆفیسۆر (جینز) دەڵێ : (زەمەن لە سەرەتاوە تا کۆتایی هەمیشەیی وەکو وێنەیەك لەبەر چاومان کێشراوە ، بەلاَم تەنیا یەك ساتی دەکەوێتە بەرچاومان ، وەکوو چۆن تای پاسکیلێ تەنیا یەك خاڵی زەمینی دەبینێت ، کەواتە وەکو (ڤایل) باسی کردووەو ڕووداوەکان ڕوونادەن ، بەڵکو ئێمە پێیاندا ڕەت دەبین ، هۆشمان لەو ساتەدا وەکو هۆشی مێشێکە بەسەر ئەتڵەسێکدا یان وێنەیەکدا دەڕوات ، هەمووو وێنەکە هەیە لە شوێنی خۆیەتی ، بەلاَم ئەو مێشەیە یەك سات کاری دەکات ، هەرچەندە بەشێکی کەمی وێنەکە دەبینێ ، ئەو فێڵ لەخۆی دەکات پێی وایە ئەوە یارمەتی دەدات ، بۆ کێشانی ئەو وێنەیەی لەبەردەمی دا درێژ بۆتەوە)[102].

بەو پێیە ئێمە لە ڕەهەندی چوارەمدا (زەمەن) تەنیا بەشێکی کەمی لێ دەزانین ﴿وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ٨٥﴾ الإسراء: ٨٥ ، واتە : کەمێ زانیاری نەبێ پێتان نەدراوە ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ﴾ الأنعام: ٥٩ ، واتە : کلیلەی غەیب لای خوایە تەنیا ئەو دەیزانێت.

﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَۚ﴾ البقرة: ٢٥٥. واتە : ناتوانن شتێ لە زانستی خوا بزانن ئەو بڕە نەبێ خوا ویستی لەسەرە.

---

[101] خوارق اللاشعور / د:علي الوردي / ل:١٦١.

[102] خوارق اللاشعور / د:علي الوردي/ ل:١٦١.

بەو پێیە زانستەکان لای خوا شاراوەن بەبڕێکی کەم نەبێ مرۆڤ پێیان ئاشنا نابێت ، هەمووو ئەو فێربوون و دۆزینەوانەش بە ئیلهامی خوایی نەبێت دەست ناکەون .

تەواوی عاریفانی ئیسلام و فەیلەسوفانی و تەواوی زاناو بلیمەتانی گەورەی خۆرئاوا دان بەوە دێنن ، دۆزراوەکانیان ئیلهامی بووە ، لەکاتی خەوتن و سووکە خەودا دەستیان پێ گەیشتووە .

(د.علی الوردی) ئاماژە دەکات (ابن سینا) فەیلەسوفی ناودار کاتێ کێشەیەکی دژواری دەهاتە پێش، دەست نوێژی دەگرت و نوێژی دەکرد پاشان دەخەوت شیکاری کێشەکەی لە خەونەکەیدا دەبینی ، هەمان داستان لە (دیکارت) دەگێڕنەوە ، ئەو دەڵێ : دۆزراوە مەزنەکەی لەکاتی خەودا سەر لەبەیانی دەستی پێ دەگات .

دیسان (ئەنسۆلین) لەکاتی خەودا لەلایەن دۆزەرەکەی دەدۆزرێتەوە ، (ولیەم جمس) سکرتێری پێشووی دارایی ئەمریکا بۆ چارەکردنی کێشەکانی پەنای بردۆتە بەر خەون لەنیوە شەودا ، تێبینی ییەکانی خەونەکانی لەو پەڕەیە دەنووسییەوە کە لە پشتی سەریەوەی دادەنا ، (ابن خلدون) بەهەمان شێوە دوعایەکی تایبەتی بەکارهێنا بەر لە نووستن بە ناوی (حالومیە)[١٠٣].

ئیمرسن (١٨٠٣ — ١٨٨٢) فەیلەسوفی ئەمریکی دەڵێ : (بیر کردنەوە وەکو ئیلهام دا دەبەزێتە سەر پیاوی تەقواکار) دەڵێ : (لە توانای هەمووو مرۆڤێکدایە خوا لە قولایی دڵی دا ببینێ ، گەر گوێ لە ویژدانی بگرێ و گوێی هۆشیاری بۆ بکاتەوە گوێی لە دەنگی خوا دەبێ لەناخی دا[١٠٤].

---

[١٠٣] خوارق اللاشعور / ل: ١٧٢/ بەکورت کردنەوە.

[١٠٤] الله ذاتا وموضوعا / عبدالکریم خطیب / ١٤٩.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (من رآنی فقد رآنی فان الشیطان لا یتمثل بي) رواه البخاري. واتە : کێ من لە لەخەوندا ببینێ ئەوە خۆمم ، شەیتان لە توانای دا نییە خۆی بخاتە سەر شێوەی من.

خەونی ئیلهامی لە قورئان و سوننەتدا زۆرە بۆ پێغەمبەران و غەیری پێغەمبەران ، نمونەی خەونی پادشای میسر (ئەخناتون) و زینندانیانی بەندیخانەی میسر لە سەردەمی یوسفدا (علیه السلام) .

سەلەفی صالح پشتیان بە خەون بەستووە ، نمونەمان (أم سلمة) یە دایکی موسڵمانان کە وەکو خەدیجە بووە ، بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ، (سلمی) گێڕاویەوە : چوومە لای (أم سلمة) دەگریا ، وتم : بۆچی دەگری ؟ فەرمووی : پێغەمبەری خوام (ﷺ) لە خەودا بینی دەگریا خۆڵ و تۆز بەسەرو ڕیشیەوە بوو ، وتم : چی یە ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی (ﷺ) ئێستا کە کوشتنی حوسێنم بینی . (حاکم و بیهقی) گێڕاویانەوە .

عومەری کوڕی خەتتاب وتی : ئەی ئەبو حەسەن پیاو خەون دەبینێ ، هەیانە ڕاست دەردەچێ و هەیە درۆ دەردەچێ؟ (علی -کرم الله وجهه-) فەرمووی : لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست ، هەر پیاو و ژنێ خەوتن ڕوحیان بەرەو عەرش بەرز دەبێتەوە ، کاتێ ڕوح گەیشتە عەرش و بێدار بۆوە خەونەکەی ڕاست دەردەچێ ، بەڵام گەر نەگەیشتە عەرش و خەبەری بۆوە خەونەکەی ڕاست دەرناچێت.

(حاکم) لە (المستدرك)دا گێڕاویەوە لە عەلی (علیه السلام) .

## ئیعجازی یانزە : نووستن لەسەر لای ڕاست

## ئیعجازی دوانزە : شێوازی نووستنت کەسایەتی تۆ دەردەخات

(د.احمد عوض الله) سەرۆکی بەشی خەون لێکدانەوە لە میسر دەنووسێ : (گەر بتەوێ خەونی ڕاست ببینی لەسەر کەلەکەی ڕاست بخەوە : ڕاسترین خەون ئەوە لە ڕۆژدایە بەتایبەتی کاتی نیوەڕۆ ، یان نووستنی کۆتایی شەو ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (اصدق الرؤیا ماکان بالاسحار) ، واتە : ڕاسترین خەون لەسبەیناندایە ، (اصدق الرؤیا رؤیا النهار) ڕاسترین خەون لە ڕۆژدایە .

لە ئیمام جەعفەری صادق (علیه السلام) گەڕاوەتەوە : (اصدق الرؤیا رؤیا القیلولة) ، واتە : ڕاسترین خەون لە کاتی قەیلولە دایە .

زانایان کۆکن خەونی ڕاست لەکاتێ دا دێت ئەو کەسەی خەوتووە لەسەر کەلەکەی ڕاست خەوتووە ، کە شێوەی ڕاستی نووستنە ، دڵ پشووی دەدات و فشاری سی چەپی لەسەر نامێنێ ، چونکە سی ڕاست بچووکترو سووکترە بۆ سەر دڵ ، دیسان جگەر ئارامی گرتووە نەك هەڵواسرابێ ، جگەر لە هەناوەکاندا لەلای ڕاستەوە لە بەشەکانی تر سەنگینترە ، پێغەمبەر (ﷺ) بە (براء بن عازب) ی فەرموو (اذا اتیت مضجعك فتوضأ و ضوءك للصلاة ثم اضطجع علی شقك الایمن ثم قل : اللهم اسلمت وجهي الیك وفوضت امري الیك) ، واتە : گەر چوویە سەر جێگا دەست نوێژێکی وەك دەست نوێژی نوێژ بگرە و لەسەر کەلەکەی ڕاست بخەوە ، پاشان بڵێ : خوایە ڕووم لەتۆ کردو خۆم بەتۆ سپارد.

خەونەکان لەو کاتەدا ئیلهامی خوایی دەبن ، بەڵام نووستن لەسەر کەلەکەی چەپ دڵ لەو کاتەیدا نائارامە ، کاتێ دەکەوێتە لای چەپ سی لای ڕاست قورس ترە، فشاری دەخاتە سەر لە چالاکی کەم دەکاتەوە ، جگەر هەڵدەواسرێ و نا ئارام هەڵدەکەوێ ، بۆ خەونەکان ناخۆش و نادروست دەردەچن ، نووستن لەسەر گازی پشت نا سروشتی

یە ، مرۆڤ بەدەم هەناسە دەدات و پووکی وشك دەبنەوەو هەو (الالتهاب) پەیدادەکات ، سەرباری پرخەو خرە ، خەونەکە ناخۆش و ناڕاست پەیدا دەبن[105].

دیسان لە گۆڤارێکی فرەنسی دا دەروونزان (بییر فلوشیر) بلاوی کردبۆوە ، کە شێوازی نووستن کەسایەتی مرۆڤ پیشان دەدات :

(١) ئەو کەسەی لەسەر سك دەخەوێ بەزۆری تووشی (گرێی دەروونی) بووە و بڕوای بەخود نییە ، بە شاردنەوەی سەری لەبن سەرین (بالیف) دەیەوێ لەدەست شتەکان ڕابکات .

(٢) ئەو کەسەی وەکو کۆرپەلەی ناو منداڵدان دەخەوێ تووشی (گۆشەگیر)ی بووە هەست بە پێویستی سۆزو پاراستن دەکات ، وەکوو منداڵ هەوڵ دەدات سەرەنجی کەسانی دەوری ڕابکێشێت.

(٣) ئەو کەسەی لەسەر گازی پشت دەخەوێ متمانەی زۆرە بەخود و ئامادەیی هەمیشەیی تێدایە بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەڵوەستەکان و بەگری کردن لە بۆچوونەکانی .

(٤) ئەو کەسەی بالیفی دەخاتە باوەش هەست بە پێویست و سۆزەکان دەکات.

(٥) ئەو کەسەی سەری لەژێر پەتۆو لێفەدا دەشارێتەوە ڕەش بینەو لە داهاتووی ترسی هەیە .

(٦) ئەو کەسەی لەسەر لای ڕاست دەنوێ زۆر هەستیارەو بەزۆری هونەرمەندەو داهێنانی هەیە .

(٧) ئەوانەی لەسەر لای چەپ دەخەون دەری دەخات ئەوانە لەکاردا نقوم دەبن و زۆری لەگەڵدا دەڕوات ، بەلام لەوانە نییە بگاتە ئاستی بالاو بەڕێوەبەری و سەرکردایەتی.

[105] تفسير الاحلام / د: احمد عوض الله / ل: ٤٧-٤٨.

**ئیعجازی (١٣-١٤)( هزر – العقل ) و ( دەروون – النفس ) :**
**یان ( هەست – الشعور ) و ( نەست – اللاشعور ):**

پرۆفیسۆر (ئەنایدهوفمان) دەنووسیّ : کەسایەتیمان دوانەیە و هزرمان سیّ دانەیە : لە ناختدا دوو کەسایەتی هەیە ، یەکەمیان نەفسی دەرەکی ، کە مامۆستاو ڕابەرە ، کەسایەتی دووەم : نەفسی ناخ ، (کرێکارو شاگردە) و کارامەکان پیشان دەدات بەو دوو کەسایەتی یە دەگوتریّ (هەست – نەست) ، (زات) و (ئەو)، نەفسی دەرەکی خەملاّندن و بیرکردنەوەی هەیە ، لە ڕەفتارەکانی دا لۆژیك بەکاردیّنیّ ، دەروونی ناخ (الداخلی) ئەوەی بۆ تۆ پەیدا دەبیّ تۆماری دەکات ، سەربەخۆ وەلاّم دەداتەوە ، بەبیّ گەڕانەوە بۆ هزر.

پاشان دەڵیّ : لەدەروونی ناخدا سیّ ئاستی زەینی و هزری هەیە (زەینی واقعی- الذهن الواقعي) و (زەینی بەرنامەڕێژ کراو – الذهن المبرمج) ، (زەینی خەملاّندن – الذهن الحديسي).

(زەینی واقیعی) بۆ دونیای بابەتی و ماددی دەگەڕێتەوە و ناوەڕۆکی ئەو زەینە بە هەستیارە سروشتی یەکانمان ڕەنگدەدەنەوە ، ئێمە دەبیستین و دەبینین و چێژ دەکەین و بۆن دەکەین و دەست لە دونیای دەورمان دەدەین ، ئەو زانیارییانەی پێمان دەگەن لەسەر ماددەی جەستەمان تۆمار دەبیّ ، زەینی واقیعیمان ئەو ماددە زیرەکەیە بەرپرسیارە لە تۆمارکردنی تەواوی ئەزموونەکانمان ، ئەو دونیای ڕاستی یەکانە .

(زەینی بەرنامە کراو – الذهن المبرمج) : مەبەست لە نەست و ئاستی خوار هۆشە ، کەبیرەکان سەرچاوەی لیّ دەگرن ، لەوێدا هەڵسەنگاندنی دونیای بابەتی ڕوودەدات ، واتە : حوکمی ئەمە ڕاستەو ئەمە هەڵەیە ، ئەمە چاکەو ئەمە گوناهە .

لە هۆشەوە بۆ نەست زانستەکان دەڕۆن و لەویّ دا وەکو کۆمپیوتەر خەزن دەکەن ، (زەینی خەملاّندن) لەسەر هەست (الشعور) بەندە ، کاتیّ چەند بۆچوونیّ لە

**هزرماندا دەكەوینە كێشە بە زەینی خەملاندن و هەڵسەنگاندن یان هەستی یەكەمی دەگەینە دوا بڕیار ، زەینی خەملاندن دەكەوێتە لای ڕاستی مێشك زەینی هۆشیار دەكەوێتە لای چەپی مێشك ، زەینی بەرنامەڕێژ دەكەوێتە خوار هەردوو زەینەوە ، ئەم زەینە (نەستە) تەواوی كەرەستەی دەورمان و هەستەكان و هەڵسەنگاندنەكان دەمژێ ، حوكم بەسەر تەواوی كارەكانی لەشدا دەكات**[106].

**گەر بڕوانینە قورئان بەر لە (فرۆید) دەروون و هزرەكان دەكات بەسێ بەسەوە .**

**(١)** ﴿ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴾ القيامة: ٢ **، واتە : سوێند دەخۆم بە دەروونی سەرزەنشتكەر (ویژدان)**

**(٢)** ﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ﴾ الفجر: ٢٧ **، واتە : ئەی دەروونی دڵنیا.**

**(٣)** ﴿ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ ﴾ **یوسف: ٥٣ ، دەروون فەرمان بە خراپە دەكات.**

**(فرۆید) ئەم سێ دەروونە لە قورئان دەدزێ و ناویان دەگۆڕێ بە دەستكارییەكی زیرەكانەوە ، كە لە خزمەت ئایدۆلۆژیاو ڕوانینەكانی خۆیدا بێ ، وەكوو (ركس نایت) ئاماژەی بۆ كردوون ئەم سێ دەروونە بریتین لە** (الذات – **خود**) **و** (الذات العليا- **خودی باڵا**) **و (الهو – ئەو) ، واتە** (Ego) **و** (Superego) **و** (Id) .

**(زات – خود) بریتییە لە هزری هۆشیاری و پەیوەستە بە دونیای دەرەوە ، (منی باڵا** – الذات العليا) **بریتییە لە (نەست) لە ئەزموونی ڕابردوو پێك دێ داخوازی كاری نموونەیی و كەماڵ دەكات ، (ئەو) هاندەری غەریزە كوێرەكانە مل بۆ پڕەنسیپی چێژ كەچ دەكەن**[107].

---

[106] تطوير المهارات النفسية / انايد هوفمان / ل:٢١-٢٤ بە كورت كردنەوە .

[107] بروانە (المدخل الى علم النفس / ركس نايت / مرجريت نايت/ ل:٣٥٤-٣٥٥.

بێگومان (نەست) ئیحاو تێفرۆسماندنەکان کاری تێ دەکەن و دەکەوێتە ژێر کاریگەری ڕامان و هیپنۆتیزم و خەون و ئیلهام ، بە ئیحاکان دیاردە خراپەکانی نەست لادەبرێن و بە ئیحای ئیجابی پڕ دەکرێنەوە ، بە ئیحاکان لە باری هیپنۆتیزم دا یاداشتەکانی کۆن زیندووو دەکرێنەوە ، بە مەبەستی چارەکردنی دەروونی .

غەزالی پێی وایە (النفس) و (القلب) و (الروح) و (العقل) چەند وشەیەکن هاو واتای نەفسن .

لای صۆفیەکان (نەفس) هێزی ئاژەڵی دژ بە هێزی هزریە ، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) جیهاد لە دژی نەفسدا بە باشترین جیهادی داناوە ، دووەم شت : (نەفس) ە حەقیقەتی ئادەمی دەگوترێت ، نەفسی هەر شتێ واتە : حەقیقەتی ئەو شتە.

(دڵ – القلب) بەو پارچە گۆشتە دەگوترێ لەلای ڕاستی مرۆڤ هەیە ترۆمپای خوێنە ، دووەم : بە ڕوحی مرۆڤ دەگوترێ کە هەڵگری ڕاسپاردەی خوایەو بە سروشت ئیلهامی تاك خواپەرستی کراوە ﴿قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ﴾ الإسراء: ٨٥ ﴿أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ﴾ الرعد: ٢٨ .

(ڕوح) بەو هەڵمە ناسکە دەگوترێ لە چاوگی دڵەوە بەرز دەبێتەوە بەهۆی دەمارەکانەوە دەگاتە مێشك و تەواوی لەش و لە هەمووو شوێنێ کار دەکات ، ئاوێتەی ژیان ئەو هەڵمە وەکو چرایە ، ژیان کە بەهۆی ئەو دروست دەبێ وەکو ڕووناکییە ، کارکردنی بۆ سەر لەش وەکو ئەو چرایەیە بەشەکانی ماڵ ڕووناك دەکاتەوە ، ئەو داهێنراوەیە لە فەرمانی خواوە دەردەچێ ، شوێنی زانست و سروشت و ئیلهامە ، لە ڕەگەزی فریشتەکانە ، لەدونیای بەرجەستە جیادەبێتەوەو سەربەخۆیە .

هزر (العقل) مەبەست هزری یەکەمە ، کە پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی فەموویەتی (اول ما خلق الله العقل) ، دووەم مانای هزر نەفسی مرۆڤە ، سێ یەم بە سیفەت

نەفس دەگوترێ و چاوی نەفسە ، چۆن بە چاو دیاردە هەست پێ کراوەکان دەبیندرێ ، بەچاوی نەفس ڕێتێ چووەکان (المعقولات) دەزانرێت[108].

(ابن سینا) ئەم فەیلەسووفە مەزنە خواناسەی ئال و بەیت لە (النجاة) و (الشفاء) دا زۆر بە گرنگی و درێژی باسی لە (النفس) کردووە ، بە کورتی (النفس) دەکاتە سێ بەشەوە : (ڕووەکی ، ئاژەڵی ، مرۆیی ) پاشان ئاماژە دەکات زانستەکان یان لە ڕێگای هەستەکانەوە بە مرۆڤ دەگات ، یان لە ڕێگای هزرەوە ، یان لەڕێگای زانینی ئیشراقی یەوە دەگات ، واتە : بە هەستەکان و هرز مرۆڤ پەی بەدونیای بینراو دەبات ، بە (هزر) بوون و سیفاتی خوا دەسەلمێنین و بە بڕواو ئیمان بە تەواوی خوا دەناسین ، باس دەکات (نەفس) شتە ڕێتێ چووەکان پەی پێ دەبات ، ئەوە ڕوحە ، نەفس بەبێ لەش هەست بە شت دەکات ، ئەوە ڕوحە ، نەفس بریتییە لە من ، من بریتییە لە ڕوح ، نەفس ڕوحە[109]، بەڵام لە زانایانی ڕوحی جیهانی خۆرئاوا (ئارتەر فندلای) پێی وایە ، (نەفس ، هزرە ، هزری مرۆڤ لەسەروی ڕوح و ئەتیرەوە ، کەس ناتوانێ لەلەشی فیزیایی دا ڕاڤەی هزر بکات ، بەڵام پێویستە لە ئاستی باڵای (ئەتیر) دا بێ ، چونکە دوای مردن کار دەکات ، ئەو ڕێنومای لەشی ئەتیر دەکات و ڕێکی دەکات ، گەر هزر لە سەرووی ئەتیرەوە نەبات ڕوحە چەپەڵەکانی دونیای ئەتیر تێکیان دەدا ، بۆیە ئەوان دەتوانن وێنە کێشراوەکانی سەری ببینن ، بەڵام ناتوانن زیانی لێ بدەن و هیچی لەبارەوە بکەن ، هەرچی لەشی ئەتیریە لەسەر زەوی لەشی ماددی دەپارێزێ ، دروستە هەموو شتێ لە بوونەوەردا لەشی ئەتیری هەبێ ، هزر بە مردن ناگۆڕێ ، بەڵکو لە ناوەندێکی تردا کارەکانی جێ بەجێ دەکات ، تەنیا دروست بوون و یادەوەری پەرەیان پێ دەدرێت[110].

---

[108] بۆ زانستی پتر بڕوانە (معارج القدس في مدارج معرفة النفس/ حجة الاسلام الغزالي / ل:٢١-٢٤.

[109] ابن سینا (یوحنا قمیر) سەیر بکە.

[110] على حافة العالم الاثيرى / ارثر فندلاي/ ل:٢٦.

قورئانیش فەرموویەتی ﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾ فَٱدْخُلِى فِى عِبَٰدِى ﴿٢٩﴾ وَٱدْخُلِى جَنَّتِى ﴿٣٠﴾ ﴾ الفجر: ٢٧ – ٣٠ ، ئەی دەروونی دڵنیا بگەڕێوە لای پەروەردگارت بەڕازی بوون دڵی ڕازی بوون ، بڕۆ ناو بەندەکانی منەوە ، بچۆ ناو بەهەشتی منەوە .

پاشان قورئان ئاماژە دەکات یادەوەرییەکان لەناو ناچن : ﴿ يَوْمَ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ مَا سَعَىٰ ﴿٣٥﴾ ﴾ النازعات: ٣٥ ، واتە : ڕۆژێ دێ مرۆڤ چی کردووە یادی دەکەوێتەوە .

بەو پێ یە بە مردن نەست یان دەروونی دڵنیا یان یاد تۆمار کراوەکانی ناوی ئاوەڵە دەبنەوە ، مرۆڤ ڕابردوو و ئێستاو داهاتوو لەسەر یەك ڕاستەهێل دەبینێ ، لەفکرەی زەمان و مەکان دەرواتە دەر .

(ج ، اج ، رایز) پێی وایە : (هێشتاش بیرۆکەی بوونی کات لە دەرەوەی زەینی مرۆڤ ، لەزۆر لایەوە خوێندنەوەی بۆ دەکرێ ، پێش هەمووو شتێ زانینی ڕاستی زەمەن بە پێوانە لەگەڵ زانینی ڕواڵەتەکان ئایا ڕاستەقینەن یان چەند خەیاڵێکن زەینی مرۆڤ بۆ حاڵی بوون بە دونیای دەرەکی دروستی کردوون؟

دیسان لەگەڵ ئەو بابەتەشدا لە مەسەلەی یادو زاکیرە دەکۆڵینەوە ، ئایا (یاد) تەنیا عەمبارێکەی ڕووتە بۆ بیرەکان و ئەزموونەکان ، وەکو دانانی چەند شتێ لەناو سندوقێکدا ؟ یان جۆرێکی ترە لە وزەکان و توانا ئاسایی یەکانی مرۆڤ؟

کاتێ ئێمە باسی (یادو زاکیرە) دەکەین باس لە کرداری (فێربوون) و (یادکەوتنەوە – التذكر) دەکەین ، ئەم دوو توانایە بریتین لە دوو توانای مێشکی مرۆڤ ، کە مێشکی مرۆڤ لە هەستەکان وەریان دەگرێ و بۆ کردارێکی دیاری کراوەتەر جومەیان دەکات ، هەوڵ دەدات لەگەڵ خۆی و دونیای دەرەوەدا بیانگونجێنێت ، بەڵام هێشتاش مەسەلەی (یاد – زاکیرە) کە توانایەکی ترە وەکو توانای (جیاکردنەوە – التمیز) کە

چەند خانەیێکی جیاواز لە دەماردا بەناوی (خانەی نیوترۆنی) پێ وەی هەڵدەست تایبەتمەند کراون بۆوە.

دیسان بێبینی کردووە (یادو زاکیرە) شتێکە لە سەرووی تواناکانی (نیوترۆن)ەوەیە ، لەسەرووی توانای بڕیاردانە لەناویدا ، ئەوەی گومان هەڵناگرێ وەکو لە ئەزموونی زانستی دڵنیاوە ڕوون بۆتەوە یادو زاکیرەکان یەك جۆر نییە ، زۆر جۆرە)[111].

گەر ئێمە خوێندنەوەیەك بۆ فەلسەفە بکەین وەکو کتێبی (فلسفتنا) (محمد باقر الصدر) و (الموسوعة الفلسفية/ د. عبدالرحمن البدوي) و )هكذا نبدأ/ عبدالغني شكر الشمري) دەبینین پێچەوانەی مادییەکان و فەلسەفەیان پەی پێ بردنی هەستی (الادارك الحسى) لە پەی پێ بردنی هزری (الحس العقلي) جیاوازە.

پەی پێ بردنی هەستی زایینی وێنە هەستی یەکان و حاڵی بوونی واتاکانیانە ، بەڵام پەی پێ بردنی هزری شیکارکردنی ئەو کێشانەیە بەهزری چارە دەکرێن ، یان بردنی زەینە لە دیارەوە بۆ نادیار بە دۆزینەوەی ئەو پەیوەندییانەی لەنێوان ڕەگەزەکانی کێشەکاندا هەیە ، کە مەبەستە چارەیان بکرێ ، لە نێوان ئەو زانیارییانەدا مرۆڤ لایەتی ، چار هەیە (بیر) بۆ کرداری (بیرکردنەوە) و پەی پێ بردنی هزری بەکاردرێت.

(د.ولز) پێی وایە وشەی (سایکۆلۆجیا) وشەیەکی گومڕاکەرە ، وەکو لە کتێبی (الحياة الان الى الابد) ڕوونی کردۆتەوە ، دیارە مادییەکان و سایکۆلۆجییەکان مۆخی ماددی بە بارەگای هزر دادەنێن ، هەرچی سایکۆلۆجیایە مەسەلەی دەروون و گیان پشت گوێ دەخات و پشت بە تاووتوێ کردنی میکانیکای هزرو کارەکەی دەبەستێت ، لەکاتێ دا هزر تەنیا جوڵێنەری نەفسە ، بەلای (د.ولز)ەوە پێویستە بە (سایکۆلۆجیا) بگوترێ (منتولۆجیا) واتە :هزر زانی (علم العقل).

---

[111] عصر الخوارق/ ج:اج:ر ايز/ ل:٣٨.

(د.اینموزر) دەڵێ : وێنە وردەکان سەلماندوویانە لێرەدا زۆر نەخۆشی توندی دەماغی هەیە مێشك تێ یدا بە تەواوی لەناو دەچێ ، کەچی هۆش و توانای ویست لە دەست نادات و گۆڕانی بەسەردا نایەت.

(هوفلاند) باس لە پیاوێکی ئیفلیج دەکات بە درێژایی ژیانی تا مردن زاکیرەو یاد لە دەست نادات ، کەچی بەپێی توێکاری کەللەی سەر بەتاڵەو کەمێك ئاوی تێدایەو ، ئاسەوارێکی ماددی مێشکی تێدا نییە.

(نتل) لە کتێبەکەیدا (الاسرار الروحیة) دا باس لەژنێك دەکات بە کوێری لە دایك بووە ، کەچی خەونەکانی بە وردی وەسفی شتەکان دەکەن و کەچی نەیبینیون ، یان (هاریت مار تینو) باس لە پیرەژنێ دەکات بە کوێری لەدایك بووە ، کاتێ خەون دەبینێ و دەڵێ فلان کەسم بینیوە جلەکانی بە تەواوی وەسف دەکرد ، گەر خەونەکان خەیاڵێك بووانە چۆن ئەم دوو کوێرە شتەکانیان بەو وردییەوە وەسف کردووە لەکاتێ دا بە چاوی سەر نەیان بینیوە؟

(عزت علی البحیري) دەڵێ : زانایانی ڕوحی جەخت لەسەر ئەوە دەکەن هزر بەهرەیەکی نامادديیە ، خوا بە تایبەتی بە مرۆڤی بەخشیوە ، وەکوو ڕوح و نەفس لە مەسەلە غەیبی یەکانە بەرپرسیارە لە هۆش و هەستەکان ، ئامۆژگاری دەروون دەکات و شتە جیاکان هەڵبژێرێ و چاکەو خراپەو حەلاڵ و حەڕام بناسێت .

عەقڵ بەرپرسیاری ڕوڵی نان و ئەرك هەڵگرتنە (التکلف) لە مرۆڤدا ، گەر نا وەکو ئاژەڵان بەرپرسیاری نەدەما ، هزر ڕێنوماکەری لەشی ئەتیرە لە جیهانی ڕوحی دا.

یەکێك لە زانایانی میکرۆ کیمیا باس دەکات ژمارەی کارلێکردنە کیمیاییەکان لە دەماغدا لە یەك خولەکدا (١٠٠)هەزار ملیۆن کارلێکردنە . هزر لە مۆخ جیایە ، مۆخ بە مردن لەکار دەکەوێ ، بەڵام هزر بە هەستەکانیەوە دەمێننەوەو زۆر بە تواناتر

دەبن لە ڕۆژانی زەمینی دا ، وەکوو خوا فەرموویەتی ﴿ لَقَدۡ كُنتَ فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٞ ﴾ ق: ٢٢ .

دیسان دەڵێ : لە (٥٧) شوێنی قوڕئاندا باسی هزر (العقل) کراوە ، بەپێی ئایەت و فەرمووده بارەگای هزر دڵە ﴿ لَهُمۡ قُلُوبٞ يَعۡقِلُونَ بِهَآ ﴾ الحج: ٤٦ ، بەلام (د.احمد شوقی) لە کتێبی (الروح) دا دەڵێ : بارەگای هزر (دڵ) نییە ، دڵ لە قوڕئاندا کینایەیە بۆ هزر)[112].

لە ڕوانگەی سۆفیگەرییەوە لەتیفەو هەستە ڕوحی یەکان لە مرۆڤدا (٦) یان (٧) لەتیفەیە ، لای (ابن عربی) وەکو لە (تفسیر ابن عربی / ج١/ل:٢٥)دا باسی کردووە ئاستەکانی جیهانی ڕوحانی (٧) ئاستە :

(١) جیهانی مەلەکوتی زەمینی و توانا نەفسانی یەکان و جنۆکە.
(٢) جیهانی نەفس (دەروون).
(٣) جیهانی دڵ (القلب).
(٤) جیهانی هزر (العقل).
(٥) جیهانی سڕ (السر).
(٦) جیهانی گیان (الروح).
(٧) جیهانی خەفاء (الخفاء) کەسڕی گیانی یە نەك دڵی.

بزانە (عەقڵ) بە زاراوەی ئەهلی عیرفان ڕوحەو لە زاراوەدا حیکمەتە ، ئەوەی ئێمە لێرەدا بە هزر باسی دەکەین بەپێی زاراوەی ئەهلی سۆفی گەری هێزی هۆشیار (القوة العاقلة) کەلای دانایان بە (النفس الناطقة – دەروونی بێژەر) ناو زەدی دەکەن ، بۆیە

[112] دراسات في العالم الروح / ل:٣١-٣٢.

سۆفیەکان دەڵێن : عەقڵ شوێنەکی پاکژە لە دڵ ، بە ڕووناکی ڕوح ڕۆشن بۆتەوە ، دڵ نەفسی بێژەرە ، چاك حاڵی ببە تا بەپێی جیاوازی زاراوە کان لێت نەلەشێوێت)[113].

لە تەریقەتی نەقشی دا لەتیفەکان بریتین لە (نەفس) کە لەسەردایە ، (سڕ) دەکەوێتە لای چەپی سینەو لەسەرەوەی دڵەوەیە ، (دڵ) لەلای چەپەوەیە ، (خەفی) دەکەوێتە لای ڕاستەوە لەسینەدا ، (ڕوح) دەکەوێتە خوار خەفی یەوە ، (ئەخفا) لەنزیك ناوکەوەیە.

هەر یەکێ لەو لەتیفانە سەر بە یەکێ لە پێغەمبەرانە : (دڵ) لە ژێر پێی ئادەمدایە زەردە ، ڕوح ڕەنگی سورە لەژێر پێی نوح و ئیبراهیم دایە ، (سیر) سپی یە لەژێر پێی موسادایە ، خەفی ڕەشە لە ژێر پێی عیسادایە ، پێویستە (مرید) هەمووو ئەو لەتیفانە بەکار بخات و بیانکاتە ڕووناکی لە سینەدا ، سەرەتای چالاکی یان بە زیکرو تەوەجوهی ڕابەر دەست پێ دەکات [114] ، بەلآم لای (ابن عربي) و هەندێ قوتبی تری عیرفان جیاوازی هەیە لە ژمارەی لەتیفەکان و شوێنیان و لەژێر پێی کام پێغەمبەردان ، بۆ نمونە (السر) لەسەردایە ، لەژێر پێی یوسفدایە ، **موسا (دڵە)** نەك (سیڕ) ... هتد. ئەم (٧) لەتیفەیە لە زانستی یۆگایی دەبن بە (٧) **وزە لە مرۆڤدا:**

١. ساکراتشاکرا.

٢. ئاجناتشاکرا.

٣. واشوو تشاکرا.

٤. ئەناهاتا تشاکرا.

٥. مانیبورا تشاکرا.

---

[113] تفسير ابن عربي / ج١/ ل:٢٥.

[114] بروانە (ما هو التصوف/ الشيخ امين علاء الدين النقشبندي/ ل:١٩٨-٢٠٠.

٦. سودا هیشتها ناکرا.

٧. مولاد هارا تشاکرا.

ئەم (٧) وزانە چالاك دەکرێن بە ڕاهێنانی (ڕامان) بۆ بەدەست هێنانی وزە و نواندنی چالاکی روحی. بڕوانە (الإنسان والروح/یو أم.ایفافۆف/ت:فایز البرشه/ل:٧٣).

(ج.اج، رایز) دەڵێ : (جەوهەر یان ڕوح ڕەفتارەکانی مرۆڤ لەماوەی زیرەکی یەکی ناوەندییەوە تیراسا دەکات ، کە مەبەستمان لەو زیرەکی یە هزرە ، ئەم جەوهەرە زۆری لەسەر چەند ئاستێ کار دەکات و مل بۆ دەسەڵاتێکی وشیارانەی جەوهەر یان ڕوح کەچ دەکات)[115]

**ئیعجازی ( ١٥ ) : کاریگەری ڕاستەوخۆی هزر ( عەقڵ ) بۆ سەر ماددە :**

**ئیعجازی ( ١٦ ) : هزر لەسەرووی ماددەوەیە :**

**کاریگەری هزر بۆ سەر ماددە بڕوایەکی کۆنە** ، پەیوەست بووە بە بوونی گیان و **نەرمی یەکەی لە جیهانێکدا** ، **کە** ماددە ڕاستەوخۆ ملکەچی هزر دەبێت ، ئەم **کارتێکردنە لەم چاخەدا بۆ ڕاستی یەکی** زانستی ، چونکە دەرکەوت سروشتی ماددەی ڕەق تەنیا (ئەتیر)**ە لە ئاستی لەرەلەرێکی** دیاری کراودا ، ئەو لەرەلەرەش (الاهتزاز) **پێویستی بەسەرچاوەیەکی بەردەوامە ئەویش هزرە** .

موعجیزەی پێغەمبەران و صددیقەکان و کەرامەتی ئەولیاکان و ئەزموونە ڕوحیەکان وەکو تلەپاتی و سایکۆکینیزیا و شیفای ڕوحی هەمووو ئەوانە ئەم ڕاستی یە دەسەلمێنن. بۆ نموونە : (نوح بە سایکۆکینیزیا و دوعا لافاوێکی سەرتاسەری قرتێ

---

[115] عصر الخوارق / ل:٩١.

کـەر پەیـدا دەکـات ﴿ رَبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴾ نـوح: ٢٦ ، پاشـان فـەرمووی ﴿ وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِى مُنزَلًا مُّبَارَكًا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾ المؤمنـون: ٢٩، واتـە : ئـەی نـوح بپـاڕێوەو بڵـێ : پـەروەردگارم لـە شـوێنەکی پـیرۆزو بەفـەڕ دامبەزێنـە ﴿ وَٱسْتَوَتْ عَلَى ٱلْجُودِىِّ ﴾ هود: ٤٤ ، کەشتیەکە لەسەر جودی لەنگەری گرت ، (جودی) سەر بە زنجیرە چیاکانی ئەراراتە لە کوردستانی گەورەدا ، میزۆپۆتامیا جارەکی تر بۆ تەلانەی ژیان وەکو لە (گەردووننـاسی) و (زەوی ناسی) بەدرێژی باسمان کردووە .

(ابراهیم –علیه السلام-) مردووان زیندووو دەکاتەوە لە تاقیگـەدا بـۆ زانینـی توانـای ڕوح بەسـەر مـاددەداو گەیشـتن بـە ئیمـانی دڵنیـا ﴿ رَبِّ أَرِنِى كَيْفَ تُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾ البقرة: ٢٦٠.

(یوسف) بـۆ نمونـە : بەکراسـی پـڕ لـە هالـە ڕوحیەکـەی چـاوی کـوێری بـاوکی چاك دەکاتەوە کە تووشی ئاوی سپی بووە ﴿ وَٱبْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ ٱلْحُزْنِ ﴾ یوسف: ٨٤ ، واتە : بەهۆی نیگەرانی چاوەکانی سپی بوون .

دیسـان لێـرەدا دەبینـی چـۆن نەخۆشـییە دەروونییـەکان و ڕوحیـەکان کـار لـە ئەندامـەکانی لـەش دەکـەن و نەخۆشـییان دەکـەن ، بـۆ نمونـە (د.خیر الدین شریف العمري) لە کتێبی (القلق) ئامـاژە دەکـات چۆن (دڵە ڕاوکـێ) کاریگـەری سووك یـان دژواری دەبێ بۆ سـەر تـەواوی ئەنـدامانی لـەش و دەنووسـێ : (دڵە ڕاوکێـی بـەردەوام کاریگـەری دەخاتـە سـەر تـەواوی لـەش و ئەنـدامانی ، ئـەم کاریگەرییانـەش چـەند دیاردەیەك پەیدا دەکەن پەیوەندی بـەوەوە هەیـە ، ئـەو دیاردانـە پیشـەیین ئەنـدامی نین و لەنەخۆشییەوە پەیدا نەبوون لەو ئەندامانەدا) دیسان باس دەکات (دڵە ڕاوکـێ ی درێژ خایەن کاریگەری توند دەکاتە سەر ئەندامەکان و گۆڕانی ئەندامی دیار پەیدا دەکات ، وێرانکردنێکی ئاشکرا لەو ئەندامـەدا پەیـدا دەکـات ، بۆیـە پێویسـتە بگـوترێ ئەمە ماکەکانی دڵەڕاوکێن).

دەڵـێ : (مـرۆڤ وەكـو لـە دەروونزانـی دا باسـكراوە لـەبارێكی گونجـاو و هاوسـەنگی دەروونی دا دەژی ، كاتێ تووشی هەندێ كارەسات هات ئەو هاوسەنگی یە تێك دەچێ ، تێك چوونی جەستەیی پەیدا دەكات كە لە دەروونەوە سەرچاوە دەگرن) بـۆ نموونـە : (برینی گەدە ، هەڵسانی فشاری خوێن ، شـەكرە ، ئەستووربوونی گلانـدی دەرەكی و تێك چوونی جنسی و شـەقیقەو ڕەبوەو جیوبی لووت و نـەخۆشی پێست و چـركە میزە ...هتد)[116] ، بەڵام خودا بەكراسی یوسف (علیه السلام) یـەعقوب (علیـه السـلام) چاك دەكاتـەوە ، وەكـوو تەبـەروكێ ، وەكـوو فەرموویـەتی : ﴿ ٱذۡهَبُواْ بِقَمِيصِي هَٰذَا فَأَلۡقُوهُ عَلَىٰ وَجۡهِ أَبِي يَأۡتِ بَصِيرٗا ﴾ یوسف: ٩٣، واتە : ئەم كراسەم ببەن بەسـەر چاوی باوكمدا بیهێنن چاك دەبێتەوەو بینا دەبێتەوە .

یـان موسـا (علیـه السـلام) بەدەسـتی هـالاوی چـەندان مـوعجیزە دەنـوێنێ ، وەكـوو زیندووكردنـەوەی مـردووان و بەرزكردنـەوەی ڕوبـاری نیـل بـە سـایكۆكینیزیا بـۆ پەڕینەوەی كوڕانی ئیسرائیل و بـە عەسا هالاویەكە لەبـەردێ دەدات (١٢) سەرچاوە دێتـە دەر ...هتـد ، ﴿ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِيَ بَيۡضَآءُ ﴾ الأعراف: ١٠٨ ، واتـە : دەسـتی دەرهێنا سپی بـوو ، ﴿ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرۡقٖ كَٱلطَّوۡدِ ٱلۡعَظِيمِ ﴾ الشعراء: ٦٣، واتـە : (ئاوە شەق بوو ، هـەر پارچـە وەكـو چیایەكی مـەزن بـوو) ، ﴿ فَقُلۡنَا ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡحَجَرَۖ فَٱنفَجَرَتۡ مِنۡهُ ٱثۡنَتَا عَشۡرَةَ عَيۡنٗاۖ ﴾ البقرة: ٦٠ ، واتـە : وتمـان بـە گۆچانەكە لەبەردەكەیدا دوانزە كارێزی لێ هەڵقووڵی.

بێگومـان هـەمووو ئـەو موعجیزانـە كاریگـەری عـەقڵ و ڕوح بـۆ سـەر مـاددە ئاشـكرا دەكەن ، یان (عیسا – علیه السلام) مردووو زیندووو دەكاتەوە ، شیفای نەخۆشـی پـێ چارەسەر دەكات ، یان گیان دەكات بەبەر پەیكەری قوڕداو زینـدووی دەكـات : ﴿ أَنِّيٓ

[116] القلق بلباس الحاضر / د:خير الدين شريف العمري / ل: ٦٠-٦٦.

تَخْلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۖ وَأُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ وَأُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۖ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِى بُيُوتِكُمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٤٩﴾ ﴾ آل عمران: ٤٩ .

**لێرەدا عیسا (علیه السلام) چەند موعجیزەیەك دەنوێنێ لە تاقیگەدا وەكو دروست كردنی وێنەی پەیكەرو زیندووكردنی بە ویستی خودا ، چاك كردنەوەی كوێری زگماك و بەڵەك و زیندووكردنەوەی مردووو زانینی ئەو شتانەی لەماڵەوە حەشاردراون بەدووربینی (الاستبصار) و (تلەپاتی – الفراسة) هەموو ئەوانە مانای دەسەڵاتی ڕوحی و هێزی دەسەڵێنن بەسەر ماددەدا ، بوونی خوداو پێغەمبەرایەتی ئاشكرا دەكەن ، هەروەها بوونی ژیانی دوای مردن ، یان وەكو (صدیق) وەزیری سولەیمان بە (سایكۆكینیزیا) تەختی بەلقیسا دەگوازێتەوە بە ماوەی كەمتر لە چاوتروكاندنێك ، واتە : لەماوەیەكدا كات سفرە** ﴿ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ ﴾ النمل: ٤٠ **، مەریەم وەكو (صدیقة) قسە لەگەڵ فریشتەكان دەكات ، دار خورما دەهەژێنێ ، خواردن بە سایكۆكینیزیا ئامادە دەبێ بۆی** ﴿ وَإِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ يَـٰمَرْيَمُ ﴾ آل عمران: ٤٢ ، ﴿ وَهُزِّىٓ إِلَيْكِ بِجِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ ﴾ مريم: ٢٥ ، ﴿ كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا ﴾ آل عمران: ٣٧ ، **.... هتد.**

**(سولەیمان) فڕیوە بەهەوادا** ﴿ وَلِسُلَيْمَـٰنَ ٱلرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ ﴾ سبأ: ١٢ **، داودی باوكی (علیهما السلام) بە (هالەی دەستی موعجیزەی) ئاسنی تواندۆتەوە** ﴿ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ ﴾ سبأ: ١٠.

**گەر بڕوانینە سەرچاوە زانستی یەكانی گیانی نوێ ، بۆ نمونە كتێبی (پاراسایكۆلۆجیا** سر من اسرار الدولة/ هزي كرايس و وليم ديك) **ئاماژە بە (بوریس ئەرمو**

لاجیف) دەکات لە ڕوسیادا چۆن بە هەوادا دەڕوات ، ئەو بە توانای ویستی نا ئاسایی مرۆڤ و تەنی تر بەرەو هەوا بەرز دەکاتەوە ، (ئەرمولاجیف) (شیبیشینا) لە هەوادا بەرز دەکاتەوە مەلە دەکات و بەهێواشی دایدەبەزێنێتەوە ، (پرۆفیسۆر پوشکین) لە حەفتاکاندا پێی وابووە ئەم (ئەرمولاجیف)ە خاوەنی هێزێکی کارەبایی ئەستاتیکی یە ، بارگەی کارەبایی کار دەکاتە سەر کەرەستەکان و دەیانجولێنێ ، بەڵام دوای چەند ئەزموونەکی تر لەگەڵ ئەرمولاجیفدا گەیشتە ئەو ڕاستی یە ئەم کارتێکردنە لە ناسایی بەدەرە ، دەستەکانی ئەرمولاجیف دروستی دەکات و ناشێ چاوگەکەی توانای کارەبایی ئیستاتیکی بێت ، (ئەرمولاجیف) ئەم نووسەرە بەناوی (هێزی کرایس) لەسەر ئێشەی توند شیفا دەدات[117].

ئەم کتێبە باس لە (تەوفیق دا داجیف) دەکات کە توانای خوێندنەوەی بیرەکانی هەیە ، کە لە زاراوەی عیرفانی صۆفیگەری دا بە (تلەپاتی – الفراسة) ناسراوە ، هەروەها ئەم کتێبە باس لە (نینل سیر جیفنا) دەکات توانای پەنهانی هەیە بۆ کارکردنە سەر ماددەو جوڵاندنی و لەژێر چاودێری پرۆفیسۆرانی سۆڤیەتی دا بەڕێوە دەچێت ، دیسان بەچاوی تیژی سەر ئێشەو هەوی گورچیلەو هەوی جومگەو هەوی سی یەکان چاك دەکاتەوەو لەساڵی (١٩٦٨)ەوە ناوبانگێکی جیهانی بۆ خۆی دروست دەکات[118].

(ج.اج ، رایز) باسێ دەنووسێ بەناوی (هزر لەسەرووی ماددەوەیە) : دەنووسێ ( ١٩٦٣ ) پیاوێ بینرا دەرگەوان بوو بەسەیرکردنێکی فیلمەکان لەکامێراوە شێوەی دیاری کراوی پەیدا کردووە .

(ئیزن بود / دەروونزان لەزانکۆی (دنمز)ی پزیشکی دەربارەیی ئەم دیاردەیە دەکۆڵێتەوە ، بینی ئەم دیاردەیە هیچ فێڵ و ساختەیێکی تێدا نییە ، دیسان دیاردەی تلەپاتی (التخاطر) هەیە ، پەیوەستە بەو جیاوازییانەی لەنێوان ماددەو هزردا

---

[117] باراسایکولوجیا سر من اسر الدولة / هنري كرايس ووليم ديك / ل:١٣-١٤.
[118] باراسایکولوجیا سر من اسر الدولة / هنري كرايس ووليم ديك / ل :١٦-٢٥.

دەوەستێ ، لێرەدا کەسێك لە ئێستگە بەریتانیادا بەرنامەیەکی پێشکەش کرد ، توانی چەند کەوچك و دڕکێ خوار بکاتەوەو بیشکێنێ ، بەبێ بەکارهێنانی توانای ماددی ، توانی هەندێ لەو کاتژمێرانەی ئامادەبووان لە دەستیان بوو ڕایانگرێت .

ئەم نمونانە وەکو ئەفسانە دەردەکەون ، بەلام بە ئەزموون و دووبارە بوونەوەی ئەو دیاردانە لەلای هەندێ کەس کە ئەو مەشقانە دەکەن ڕاستی ئەو ئەزموونانەی سەلماندووە ، پاشان دوای نمونەی زۆرتر باس دەکات ئەو جۆرە کەسانە بارگەی کارەبایی و موگناتیسی دەوری داون ، ئەو بارگە کارەبایی یە (هالە) بەرپرسیارە لە پەیداکردنی دیاردەی لە ئاسایی بەدەردا ، سەرباری ئەوە لێرەدا دیاردەی بەرزبوونەوە هەیە بۆ هەوا بەبێ ستوونەکی دیار ، هەندێ کێشکردن ڕۆڵی لەوەدا هەبێت ، هەندێ نووسەر وەکو (سێرولیەم کروکس) لە نووسراوێکی زانستی دا لەساڵی (١٨٧٤)دا دەنووسێ : ناوەندێ کۆمەڵێ لەو دیاردانە دەبینێت ، واتە : دیاردەی بەرزبوونەوە بۆ هەوا ، کەسانێ هەیە دەتوانن لە پەنجەرەوە بۆ دەرگای تر بفڕن ، ئەم دیاردەیە بەوە ڕاڤە دەکرێ ، جۆرێکە لە سازان لەگەڵ گەردووندا)[١١٩].

کراسی (یوسف) (علیه السلام) و عەسای موسا (علیه السلام) بەهۆی مژینی وزەی ڕوحی ئەم دوو پێغەمبەرە موعجیزە یان پێ ئەنجام دراوە ، (ئەنایەد هوفمان) دەنووسێ : (جل و بەرگ ، خشڵەکان ، کەل و پەل...) تا زیاتر لەگەڵ مرۆڤەکەدا بمێننەوە وزەی زیاتر وەردەگرن)[١٢٠].

بێگومان هەمووو ئەو دیاردە نائاسایی یانە بە (هالەی موگناتیسی) ڕوودەدات ، کە پێغەمبەران و صدیقەکان وێستگە بوون ، ئەولیایان بەڕادەی جیا جیا بەدەستی دێنن ، هەندێ جار برێکی کەم بەهۆی وەرزشی ڕوحی و یۆگا بەدەست دێت ، هەندێ کەس لە سروشتدا ئەم وزەیان بە نائاسایی هەیە .

---

[١١٩] عصر الخوارق / ل٨٧-٨٩ سەیر بکە.

[١٢٠] تطوير المهارات النفسية / ل:٩٤.

(ڕونالد ماکری) کتێبەکی تایبەتی بەناوی (سایکۆکینیزیا) دەنووسێ (سمیر محمد) بەناوی (حروب العقل) وەری دەگێڕێت ، (سایکۆکینیزیا ESP) واتە : کارکردن لە تەنەکان و جوڵاندونیان و بەبێ بەکارهێنانی هیچ هێزەکی فیزیای ناسراو ، لە خۆرئاوادا ئەو دیاردەیە لەسایەی (یودی گیلەر) دەرکەوت ، کە دەیتوانی بەهێزی هزری کەوچك و کلیل خوار بکاتەوە[١٢١].

ئاژانسی رۆتیەر لە (١٩٨٥/١/٢٧) دا بڵاوی کردەوە بەکرێ گیراوی هەندێ حکومەت توانای هزری و سایکۆکینیزیایان هەیە دەتوانن بە ڕاگرتنی دڵ لە دوورەوە کوشتنی سیاسی ئەنجام بدەن و تووشی جەڵتەی دڵیان بکەن ، جۆرە تیشکەکی کوشندە لەمێشکەوە دەهاوێژن و بۆ کوشتن بەکاری دەهێنن[١٢٢].

ئاشکرایە ساحیرانی کۆشکی فیرعەون ویستیان (بەکۆی نەستەکان) موسا (علیە السلام) بکوژن و ترس بخەنە دڵیەوەو تیرۆری بکەن ، بەڵام خودا ئیحای پێ دا نەترسێ و دەستی هالاوی ڕوحی لەسەر دڵ دابنێ تا ئیحاو تیشکی ساحیران کاری تێ نەکات ﴿ اَسْلُكْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ وَاَضْمُمْ إِلَيْكَ جَنَاحَكَ مِنَ ٱلرَّهْبِ ﴾ القصص: ٣٢ ، یان جولەکە ساحیرەکان ویستویانە بەسیحرو چاوەزارو هالەی ڕوحی چاو، پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) تیرۆر بکەن ﴿ وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَٰرِهِمْ ﴾ القلم: ٥١ .

(ڕوونالد . م . ماکری) دەنووسێ (دبلیونی دۆزەرەوەی دیاردەی هاوسەنگی لەش ، دەڵێ ڕۆژەکی بەچاوی خۆی بینی چۆن ساحیرێك بە جادوو تاوانی تیرۆر ئەنجام

---

[١٢١] حروب العقل / ل:٥٠.
[١٢٢] الباراسایکۆجی ظواهر و تفسیرات / سامي احمد الموصلي / ل:٦٧.

**ندات دوای ئەوە بایۆلۆجییەکان سەلماندیان ئەو کەرەستە کیمیایی یەی لەش بەهۆی ترس پەیدایان دەکات لە تاقیگەدا مشك دەکوژێت)[١٢٣].**

**(بیروون) باس لە (Zarg) دەکات کە کۆڕی نەستی مرۆیی (اللاداعي الجميعي للانسانية) پێی هەڵدەستێ ، ئەو توانایە ڕوحییە زیاتر لە خەساندنی ئاژەڵانی لە توانادایە ، ئەو توانایە دەتوانێ ئەستێرەکان لە خولگەکان ڕابکێشێ ، گۆی زەوی و کۆمەڵەی خۆر بشێوێنێ ، زەوی ڕابگرێ ، یاسا سروشتی یەکان بگۆڕێت[١٢٤].**

**هەمووو ئەو دیاردانە موعجیزەی پێغەمبەران و صدیقینەکان دەسەلمێنێ ، کە بەرنامەی خواناسی و دەستوورو یاسای ژیانیان بۆ مرۆڤ هێناوە ، دیسان بوونی گیان و بەردەوامی ژیان لەدوای مەرگدا دەسەلمێنن ، وەکوو خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾ فصلت: ٥٣ .**

**زانای ناوداری نەمساوی (مسمر) دەڵێ : شلەیەکی موگناتیسی لە لەش هەڵدەقوڵێ ، زانایانی سەردەمی خۆی گەمەیان پێ کرد (الكسندر كانن) زانای ئینگلیزی دەڵێ : (بەلام من ئامادەم بەڵگە بۆ هەمووو زاناو پزیشکی بێنمەوە ، کە ئەم ماددەیە لە لەش دێتە دەرو بەکامێرای وێنە بگرم ، دیسان کارێگەریەکەی بسەلمێنم ، ئەم ڕاستی یە بۆ زۆر کەس لەوانە سەلما گاڵتەیان بەتیۆری من دەهات ، بەلام دوای بینینی ئەم ڕێگایە بەکرداری گەردن کەچی ئەم ڕاستی یە بوون). (العالم الطيف)[١٢٥].**

**(د. ولنر كلنر) لە کتێبی (المحيط الانساني) دا دەنووسێ (تیشکی ڕوحی و شەپۆلە دەرچووەکان لەناویدا ڕاستی یەکی واقیعی یە زۆر ڕەنگ دێنێ لەناو یەکتری دان ، بەشێوەی کۆلکە زێڕینە دەچێت).**

---

[١٢٣] حروب العقل / ل:١٠٠.

[١٢٤] حروب العقل / ل: ١٠٠.

[١٢٥] حروب العقل / ل: ١٣٢.

بێگومان لەکاتێ دا ئەم زانستە لە ڕوسیادا بلاوبۆوە ماتریالستەکانی وەکو (ستالین) و (لینین)ی خستە سەر سوڕمانەوە .

(خلیل حناتاترس) دەڵێ : (لینین) جارێکیان ڕای گەیاند ئەو بڕوای بە توانای ڕوحەکان و توانای لە ئاسایی بەدەر هەیە ، ئەم ڕایەشی لەکاتێ دا درکاند ، کە لەگەڵ مامۆستایەکی پاریسی پسپۆڕ لەو بوارەدا قسەی دەکرد[126].

**ئیعجازی ( ١٧ ) دیاردەی دەرچوونی گیان و لەشی ئەتیری ( ظاهرة الطرح الروحي )**

**Out of Body Experience**

قورئانی پیرۆز لە چەندان ئایەتدا ئاماژە بە دەرچوونی گیان یان لەشی ئەتیری دەکات وەك لە حاڵەتی موعجیزەو خەون و دۆخی تری ڕوحی دا ، یان لەکاتی مردندا بەیەکجاری﴿ سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِ لَيْلًا مِّنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا ۚ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ﴿١﴾ ﴾ الإسراء: ١.

بێگومان سەلەف لەسەر ئەم گەشتە ئاسمانییەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕای جیاوازیان هەیە ، هەندێ لە هاوەڵان پێیان وابووە گەشتەکە بە ڕوح و لاشەوە بووە ، هەندێ پێیان وابووە کە گەشتێکی رووحی بووە بەرەو دونیای مەلەکوتی بەرز بۆتەوە .

بۆ نمونە (ابن اسحاق) و (ابن جرير) لە (عائيشه) دەگێڕنەوە : (ما فقد جسد رسول الله (صلى الله عليه وسلم) ولكن اسرى بروحه) واتە : پێغەمبەر (ﷺ) لەشەکەی لەشوێنی خۆی بوو، گەشتەکە بە ڕوحەکەی کرا .

---

[126] العالم الارواح والاشبح/ ل:٦١.

(مسری) دەڵێ : (كانت رؤيا من الله صادقة) ، واتە : جیهانی واتایی ڕوحی بووە لەلایەن خواوە بوو ڕاست بوو[127].

بێگومان هەردوو ڕێگا بۆ خودا ئاسانەو لەتوانای خوا بەدەر نابێت ، هەرچەندە زۆربەی ئەهلی سوننە پێیان وایە کە گەشتەکە بە رووح و جەستەوە بووە و لە ولآخی (بوراق) ئەنجامی داوە .

لە فەرموودەی (البخاري) هاتووە ، رووحەکان جەستەن لە لەشی ماددی دەردەچن و لە هەوادا دیداری یەکتری دەکەن ( ان الارواح جنود مجندة تلتقي في الهواء ...) ، واتە : ڕوحەکان بە سوپا کراون لە هەوادا دیداری یەکتری دەکەن .

دیسان پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (ان الروح ليلقى الروح) رواه النسائي ، واتە : لە خەوندا ڕوح دیداری ڕوح دەکات . دیسان مردن دەرچوونی ڕوحە بە یەکجاری (ان الروح اذا قبض تبعه البصر)رواه مسلم ، واتە : گەر ڕوح کێشرا چاو سەیری دەکات .

گەر بڕوانینە سەرچاوە سۆفییەکان لە نووسراوەکانیاندا زۆر باسی گەشتی ڕوحی یان کردووە و نووسراوی تایبەتی یان لەم بارەوە نوسیوە ، لەوانە (مراتب الوجود/ صدرالدين القونوي) ئاماژە دەکات پلەکانی بوون (الوجود) چل پلەیە ، کە پلەکانی جیهانە و کاتێ مرۆڤ توانی بیانبڕێ دەبێتە مرۆڤی کامڵ .

دیسان (ابن قضيب الالبان) لە کتێبی (المواقف الالهية)دا ئاماژە بە گەشتە ڕوحییەکەی دەکات و بەدرێژی دەیگێڕێتەوە کە وەکو کەرامەتێ بۆ ئەوان ڕوودەدات[128].

---

[127] الدر المنثور / السيوطي/ ج٥/ل:٢٠٠.
[128] بروانة كتيبى (الانسان الكامل في الاسلام/ د.عبدالرحمن البدوي).

بڕوانە (رسائل ابن عربي) وەکو (الاسراء الى مقام الاسراء) و (فصوص الحكم) ، پاشان دەرچوواندنی ڕوحی (مرید) ئەرکی سەر شێخی مورشیدە ، دەبێ ئەو ئاستەی بگەیێنێت .

بێگومان میعراجی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لوتکەی میعراجەکان بووەو گەورەترین موعجیزەی ڕوحی بووە ، کەس ناتوانێ بگاتە ئەو ئاستە لە پێغەمبەران و فریشتەکان ﴿ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ﴿٩﴾ ﴾ النجم: ٩ ، نێوان ئەو و زاتی خوا لەنێوانی دوو کەوان نزیکتر بووە ، کەلای سۆفییەکان بە (الفناء) ناسراوە ، ئاشکراشە ئەم دیاردانە بێ کات خەیاندن ڕوو دەدەن .

(دەرچوواندنی ڕوحی) لەحاڵەتی هیپنۆتیزم دا ڕوودەدات ، کە خوێنەری دوای خەواندنی ناوەند بە ئیحا پێدان دەتوانێ لەشی ئەتیری دەربچوێنێ ، دیسان لە هینۆتیزمی زاتی و رامان (التأمل) دا ئەمە ڕوودەدات ، دواجار (کیرلیان) توانی وێنەی هالەی ڕوحی دەوری مرۆڤ بگرێ ، کەلای پاراسایکۆلۆجی یەکان بە (وزەی بایۆلۆجی) ناسراوە ، ئەم هەواڵە هەمووو دونیای گرتەوەو بە (دیاردەی کیرلیان) ناسرا ، ئەم دیاردەیە بە (ڕوح) یان (ئەتیر) ناسراوە ، کە لە سەرووی خێرایی تیشکەوە دەگوازێتەوە ، وەکوو لەتاقی کردنەوەکاندا بینراوە .

لە ساڵی (١٨٠٤) دا پرۆفیسۆر (توماس یونگ) ڕایگەیاند ڕووناکی چەند تەزوویەکە لە گەردیلە ڕووناکەکان ، بەلام چەند جووڵە شەپۆلێکە لەناو ناوەندی (ئەتیر)دا[١٢٩].

(نیکولایف) دەڵێ : من بڕوام وایە دەربارەی تلەپاتی دا ، کە کۆمەڵە گەردێکی وزە بەرزە لە ئاسمانەوە بەزەوی دەگەن ، بە خێرایی زیاتر لە دەنگ لە مێشکێکەوە بۆ مێشکەکی تر دەگوازرێتەوە.

---

[١٢٩] عصر الخوارق/ ٥٧.

(ئـادامنکۆ) دەڵێ : (زانیارییـەکانی پـەی پـێ بردنـی هەسـتی ڕۆحـی و تلـەپاتی وەکـو (نیوترۆنەکان) کە لە ئاسمانەوە بـۆ زەوی دێـن و وەکـو بۆمبـا دەردەچـن و تەنۆلکەی نادیارن ، بەڵام لە تواناياندایە زەوی و هەمووو شتێ ببڕن بۆ گەیشتن بە مێشك ، ئـەو بڕوای وایە : نیترۆنەکان زانیارییەکان لە مێشکێکەوە بۆ مێشکەکی تر دەگوازنەوە)[130].

(ج.اج.رایز) دەڵێ : (هەمووو بەڵگەکان ئەوە پیشان دەدەن تلەپاتی و پـەی پـێ بردنـی ڕوحـی لـە ئاسـتێکی سـەروی ماددییـەوە ڕوو دەدەن ، ئـەم بۆچـوونە لـە هـەمووو ئـەو ئەزمونانە وەرگیراوە ، کە ماوەیەکی زۆرە ئەنجام دەدوێن ، گـەر شـەپۆلەکانی تلـەپاتی لەسەر بناغەی مـاددی ڕوویاندابایـە لـە هاندەرەکانیانـەوە لێـرەدا لـە بـواری مـاددی دا نێوان دەبوو لە نێوان گواستنەوەی هزری دا[131].

(ولیەم فالکیر ئەتکینسون) دەڵێ : کاتێ بیر دەکەینەوەو ڕادەمێنین کۆمەڵە لەرەلەر بۆ دونیای دەرەوە ڕەوانە دەکەین ، کە بە لەرەی ماددی بەرزترین و ناسکترن و ئـەتیرین ، کە وەکو بوونی هەڵم و گاز و تەنۆلکـەی شـل و ڕەق هەیـە ، ئێمـە نـاتوانین بیرەکـان ببینین وەکو چۆن گازەکان نابینین).

(پرۆفیسۆر ئەلیزیە گریە) لە نامیلکەی (معجزات الطبیعـة)دا دەنووسـێ : (بیرەکـان شەپۆلی دەنگی یان هەیە هیچ گوێیەك ناتوانێ بیانبینێت لە مرۆڤدا ، شـەپۆلی ڕەنگـی هەیە هیچ چاوێ نـاتوانێ بیـان بینێـت تـا ئەگـەری زۆر وشـیار بـە بیرکردنـەوە بـدات لەنێوان (٤٠٠٠ – ٤٠٠٠٠٠٠) لەرەلەر لە چرکەیەکدا لە ئاسمـانی فراوانـی تـاریکی بـێ هەست و نەستدا لەبەردەم هەستە دەرەکییەکانی ئێمـەدا ، ئـەو لەرانـەن بـۆ وەرگـرتن لە خەونەکاندا وێنە ناوەوە)[132].

---

[130] الباراسايكولوجيا سر من اسرار الدولة / ل : ٤١.
[131] عصر الخوارق / ل:٣٧.
[132] قوة الفكر في الحياة العملية/ وليم فالكير اتكينسون/ل:٨٤.

(الكساندر كانن) له كتێبی (العالم الطيف/ل:٥٦)دا له باری دەرچوواندنی ڕوح له حالەتی ڕامان و خۆخەواندندا دەنووسێ : (سەیرترین دیمەن کە بینیومە کەسانێك بوون هەوریان پەرش دەکرد لە ئاسماندا و کەچی پێشبینی کەش و هەوا پێچەوانەی ئەوەی دەگوت ، لە ولآتی (تیبت) کۆمەڵە پیرێك هەبوون لە دۆخی نەست و بێ ئاگایی (الغيبوبة) و سووکە خەودا دەچوونە ئاسمان و هەوریان پەرت دەکردن ، دوو ژن بەم کارە هەڵسان ، یەکێ ڕووسی بوو ، ئەوەی تر خۆرهەڵاتی بوو، بێ ئەوەی بە کاری یەکتری بزانن)[١٣٣].

(السفير علي عزت البحيري) لەبارەی دیاردەی دەرچوواندنی ڕوح دەنووسێ : ( ئەو کاتەی دەرچوواندنی گیان خۆویستی دەبێ ، گەر ئەو کەسەیە توانای بڕیاری دانی هەبێ لە دەرچوواندنی لەشی ئەتیری و گەشت پێ کردنی بۆ جیهانە جیاجیاکانی ماددی و ڕوحی ، یان جار هەیە بە خۆنەویستی ڕوح لە جەستە دێتەدەر ، وەکو لە (خەواندنی موگناتیسی) و (بێ ئاگایی ناوەندکاری – الغيبوبة الوسطية – Trance) یان ئەزموونی لە مردن نزیك کەوتنەوە (N.D.E) کە ئەو دۆخەیە ڕوح لاشەی ماددی بەجێ دێڵێت ، لەبارەی ڕوودانی ڕووداوێ یان کردارێکی نەشتەرگەری یان نەخۆشییەکی خەستدا ، بەهۆی پەتێکی زێوی ئەتیری بەلەشی ماددی بە بەستراوی دەمێنێتەوە ، گەشتێکی جیهانی گیانی دەکات ، پاشان بەرەو لەشی ماددی دەگەڕێتەوە ، ئەوەی لە دونیای ڕوحی دا بینیویەتی دەیگێڕێتەوە ، یان ئەوەی ڕووی داوە لەو شوێنەی تێ ی دا ڕاکشابوو لەکاتی دەرچوونی گیانی لەلاشە باسی دەکات و قسەکانیشی ڕاست دەردەچن ، ئەوەی گێڕایەوە لەبارەی دەورەکەی هەموووی دروست بووە .

ئەم دیاردەیە لە کۆنەوە زانراو بووە ، بەڵام لەمێژ نییە خراوەتە ژێر شیتەڵی زانستی یەوە ، لەشی ئەتیر تاکە بەرپرسیارە لە ڕوودانی ئەو دیاردەیە ، کە گەردنی بۆ تاو و

---

[١٣٣] نداء الروح / ل:٩٤.

توێ کردنی زۆر له زانایان کەچ کرد ، کە سەر قاڵ بوون بە هیپنۆتیزم و دیاردەی گیانی ڕووتەوە ، زۆر ئەزموونی سەرکەوتوو دەربارەی دەرچوواندنی گیانی ئەنجامدرا لەژێر چاودێری ورددا ، دوور لە پەلەکردن لە تۆمارکردنی دیاردەکەو وەرگرتنی ناکامەکان.

یەکێ لەو زانایانەی گرنگی بەو باسەدا پرۆفیسۆر (جوزیف بانکس راین)ە سەرۆکی بەشی (پاراسایکۆلۆجی) لەزانکۆی (دیوك)ی ئەمریکاو سەرۆکی بەشی دامەزراوەی لێکۆڵینەوەی سروشتی مرۆڤ توانی لە ڕێگای دەروونزانی یەوە ناوچەیەکی تازە لە مرۆڤدا بدۆزێتەوە بەناوی (هزری سەرووی هۆش) ، ئەو هۆشە بەرزە بەرپرسە لە ئیلهام و ناوەندی بەرزو نکۆڵی خود (الإنكار الذات) [١٣٤]

**ئیعجازی ( ١٨ ) دیاردەی مردن :**

﴿ يَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ ﴿٥٤﴾ ﴾ العنكبوت: ٥٤ .

(د.محمد احمد كنعان) دەنووسێ: (مردن – Death) بریتییە لە گواستنەوەی مرۆڤ لەباری ژیانەوە بۆ مردن ، ساڵانە (٩-٢٦) لە هەزار کەسی دانیشتووان دەمرێ ، بڕی مردن لەشارێکەوە بۆ شارێکی تر جیایە لەبەر هۆکاری دروستی و کۆمەڵایەتی فرە.

مردن لەکاتی سەرەمەرگەوە (الاحتضار) بەسێ قۆناغدا ڕەت دەبێ وەکو لە پزیشکی نوێ دا باسکراوە : لەبواری ئاسایی دا دیاردەی مردن بە وەستانی دڵ و هەناسە دەست پێ دەکات و خوێن کە هەڵگری ئۆکسجینە بۆ لەش ناڕوات و وردە وردە مردنی تووش دێ ، یەکەم ئەندام کۆدەمارەکانە (مێشك – مێشکۆڵە- قەدی دەماغ) دوای چەند

---

[١٣٤] دراسات في العالم الروح / ٣٧-٣٨.

خولـەکێ لـە وەسـتانی ئۆکسـجین بـۆی دەمـرێ و وردە وردە مـردن ئەندامـەکان و خانەکانی تر دەگرێ و مردنی خانەکان پەیدا دەبێ کە دوا قۆناغی مردنە[١٣٥].

مـردن لـە ئیسـلامدا تـەنها جیابوونـەوەی لەشـی ڕوحـی و هـزرە لـە لەشـی مـاددی و دونیایی ، لەشی ئەتیر کە ڕوح و هزری هەڵگرتووە لە لەشی فیزیـایی جیـا دەبێتـەوەو بـــەرەو قۆنـــاغی (بـــەرزەخ) دەڕوات، ﴿ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ طَيِّبِينَ ۙ يَقُولُونَ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمُ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾ النحـل: ٣٢ ، واتـە : ئەوانـەی خـەڵکی باشن و فریشتە گیانیان دەکێشن پێیـان سـەلامتان لێ بـێ بڕۆنـە بەهەشـتەوە بـەهۆی ئەو کارە باشانەی دەستانکرد.

﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۙ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَٰرَهُمْ وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿٥٠﴾ ﴾ الأنفال: ٥٠، واتە : گەر دەبینی فریشتەکان بێ بڕوایان دەمرێنن زەبر لە دەم و چاو و پشتەوەیان دەدەن و پێیان دەڵێن دەبچێژن سزایەکی سوتێنەر.

مردن لە ئیسلامدا وەکو پەککەوتنی ئامێرێك نیە و بە تـەواوی کۆتـایی بێـت ، بـەڵکو مردن جیابوونەوەی بەرگی فیزیـایی یـە لـە بـەرگی ئـەتیری ، کـە بـە (الغطـاء) نـاوی دەبـات ﴿ لَّقَدْ كُنتَ فِى غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلْيَوْمَ حَدِيدٌ ﴿٢٢﴾ ﴾ ق: ٢٢ ، واتە : بەڕاستی تۆ بێ ئاگا بووی لەوەی ، ئینجا پەردەمان لەسەر لابردی و ئەو ڕۆژە چاوت تیژ بینە.

ئیسلام باس دەکات ئەم ڕوحە لەناو بـەرگێکی ئـەتیری دایـە کـە بـە (الطير الخضر) نـاوی بـردووە : (لـە پێغەمبـەر (ﷺ) پرسـیار کـرا ڕوحـی چاکەکاران لـە کـوێ یـە ؟

[١٣٥] الموسوعة الطبية الفقهية / د:احمد محمد كنعان/ ل:٨٧١ – ٨٧٤.

فەرمووی : (في طير خضر تتسرح في الجنة حيث شاءت) واتە : (لە باڵداری سەوز دایە کوێ ی حەز لێ بێ لە بەهەشت بۆی دەڕوات)، لێیان پرسی ڕوحی بێ بڕوایان لەکوێ یە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی (محبوسه فی سجین) ، واتە : لە (سجين) زیندانی کراون (الطبراني) و (ابن مندة) گێڕاویانەوە .

(الحكيم الترمذي) لە (نوادر الاصول) دا لە پێغەمبەری (ﷺ) گێڕاوەتەوە : (ما شبهت خروج المؤمن من الدونيا الاكمثل خروج الصبى من بطن امه من ذلك الغم والظلمة الى روح الدونيا) ، واتە : دەرچوواندنی گیانی بڕوادارم لەدونیا بە دەرچوونی ئەو منداڵە چواندووە لە سکی دایکەوە لەناو ئەو غەم و تاریکی یە بۆ گیانی دونیا دەردەچێت.

لە کتێبی (بوتیبە) لەبارەی (چین) هاتووە ( کونفشویس) بڕوای وابووە ڕوح بەرگێکی تری جەستەیی هەیە لەبەرگی لەشی ئاسایی جیا وەکو لەشی ئاسایی تووشی مردن و لەناوچوون نابێت[١٣٦].

دیسان لەفەرموودەدا هاتووە (ارواح المسلمين في صور طير بيض في ظل العرش ، وارواح الكافرين في الارض السابعة) (رواه ابن مبارك عن ابن عمر)، واتە : ڕوحی موسڵمانان لە شێوەی باڵداری سپی دایە لەسایەی عەرشدا ، ڕوحی بێ بڕوایان لەزەوی حەوتەمدایە.

دیسان (ابن سعد) گێڕاویەوە : پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (النفس المطمئنة في طير خضر في الجنة) ، واتە : دەروونی دڵنیا لە باڵندە سەوزدا لە بەهەشتدا.

بێگومان بڕوا بوون بە ژیانی دوای مەرگ و بوونی ڕوح لە لەشی ئەتیردا لەناو هەمووو ئایینە ئاسمانییەکاندا هاتووە ، مامۆستا (فریدوجدی) باسی کردووە : (میللەتانی کۆن بە گشتی بڕوایان بە بوون و نەمری ڕوح کردووە ، هیندستانییەکان

---

[١٣٦] العالم الارواح والاشباح/ ل:٣٣.

تا ئیمڕۆش بت پەرستانیان بڕوایان وایە ڕوح هەناسەیەکی خوایی یە ، هەر کاتێ مرۆڤ مرد ڕوحەکەی بە لەشێکی ڕووناکی ڕوون دادەپۆشرێ ، چاوی زیندووان پەی پێ نابەن و بەرەو جیهانی باڵا بەرز دەبێتەوە ، هیندییەکان بەر لە چەند هەزار ساڵێ ئەم بڕوایەیان هەبووە ، لێکۆڵەرانی هاوچەرخ لەبارەی گیانەوە هەمان شتیان بۆ دەرکەوتووە و دەڵێن : (ڕوح) بەرگێکی ماددی هەیە ، بەڵام ناسکترە یاساکانی سروشت نایگرێتەوە و لەناو ناچێ ، لە جیهانی دووەمدا گیان دەهێڵێتەوە ئەم بڕوای هەمووو گەلانی تری دێرین بووە .

میسرییەکان بەر لە زایین بە (٥) هەزار ساڵ بڕوایان وابوو مردن بریتییە لە گواستنەوەی بارێك بۆ بارێکی باڵاتر ، دەیانگوت : ڕوح دوای دەرچوونی لە لەش لەشێکی تازە دایدەپۆشێ ، کە لەلەشی دونیا باڵاترەو کارتێ کەرەکان کاری تێ ناکەن و بە (کا) ناویان بردووە.

چینەکان کۆنترین گەلن لە بڕوابوون بە نەمری ڕوح ، (میسوبوتیة) لە کتێبەکەی دا لەسەر (چین) لاپەرە (٣٦) دەنووسێ (کۆنفسیوس – ٦پ.ز) بڕوای وابووە ڕوح لەشێکی تری هەیە جگە لە لەشی ماددی ، لەناوچوون نایگرێتەوە ، ڕوحەکان لە هەمووو لایەك دەوریان داوین ، دەتوانن خۆمان بۆ بەلەش بکەن[١٣٧].

(ئالن کاردك) لەکتێبە ناودارەکەیدا (الروح / ل:٢٦) لەبارەی ڕوح و مردن و لەشی ئەتیر کە لە فەرمووده‌دا بە (الطیر الخضر) هاتووە دەڵێ : (گیاندارە ماددیەکان جیهانی بینراو پێك دێنن ، بەڵام گیاندارانی نامادی جیهانی نادیارو ڕوحی پێك دێنن ، جیهانی ڕوحی دونیای بنەڕەتی یەو نەمرە ، بەر لە هەمووو شتەکان هەبووەو دوای هەمووو شتەکان دەمێنێتەوە ، جیهانی جەستەیی لە ڕووی گرنگی یەوە دووەمە ، بوون و نەبوونی کار لەجەوهەری ڕوح ناکات ، بەکاتی بەرگێکی ماددی و لەناو چوو و ڕوحەکان دادەپۆشێ کاتێ بە مردن ئەم لەشە لەناو دەچێ ئازادی بۆ دەگەڕێتەوە ).

---

[١٣٧] دائرة المعارف القرن العشرين / فريد وجدي/ج٤/ل: ٣٢٤.

دەڵێ : (لە لەشی مرۆڤدا سێ توخم هەیە : یەکەم : لەشی ماددی کە هاوشانی لەشی گیاندارانە پرەنسیپی زیندەگی دەیژیێنێ ، دووەم : نەفسە کە بوونەوەری ناماددییە ، یان ڕوحە کە لە لەشدا دەرکەوتووە ، سێ یەم : شیرازەی نێوان ڕوح و لاشەیە کە بە یەکتریانەوە دەبەستێتەوە).

دەڵێ : (ئەو شیرازەیە (الصلة) بەرگی ڕوحە ، کە لەش بە ڕوح دەگەیەنێت ، بەرگێکی نیمچە ماددییە ، بەمردن لەشە ئەستوورە ماددییەکە لەناو دەچێ ، بەڵام ڕوح بەرگی دووەم لەدەست نادات ، کە بەرگی ئەتیری بۆ پێك دێنێت ، لەباری ئاسایی دا نابینرێ ، بەڵام لە هەندێ دیاردەدا وەکو دەرکەوتنی تارمایی (الشبح) یەکان دەتوانرێ ببینرێ و دەستی لێ بدرێت)[138].

﴿ وَمِن وَرَآئِهِم بَرۡزَخٌ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴾ المؤمنون: ١٠٠ ، لەمنێوان ئەوان و دونیادا پەردەیەك هەیە تا ئەو ڕۆژەی زیندوو دەبنەوە .

بە کورتی مردن تەنیا جیابوونەوەی ڕوح و هزرە لە لەشی ماددی و قۆناغێکە لە قۆناغەکان ، نەك دوا خاڵی ژیانی مرۆڤ بێت، بێگومان لەشی ئەتیر هاوشێوەی لەشی ماددییە ، بۆیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : (من راني فقد راني فان الشيطان لا يتمثل بي) رواه البخاري ، واتە : کێ من لە خەوندا ببینێ ئەوە خۆمم ، شەیتان ناتوانێ لەسەر شێوەی من خۆی بەلەش بکات.

ئیمام جەعفەری صادق (عليه السلام) فەرموویەتی : (لو كنت تراه لقلت هو هو) ، واتە : گەر ڕوح ببینی دەڵێ ی فلانە کەسە خۆیەتی ئەوە ! .

(جلال الدين المحلي) لە (تفسير الجلالين) دا دەڵێ : (الروح جسم لطيف يحيى به الانسان بنفوذه فيه) ، واتە : ڕوح لە شێکی ناسکە گەر چووە ناو مرۆڤ پێی دەژییێت.

---

[138] كتاب الروح / الن كاردك/ ل/٢٦.

(ئارتەر فندلای) دەنووسێ : (مرۆڤ لە لەش و دەروون و ڕوح پێك دێ ، لەش ئەوەیە دەیبینین ، نەفس یان دەروون هزرە ، ڕوح لەشی ئەتیرە هاوشێوەی لەشی فیزیایی یەو پێکاو پێکی ئەوە ، ئەو لەشی فیزیایی دەبەستێتەوە . مردن تەنیا جیابوونەوەی لەشی ئەتیرە لە لەشی ماددی ، ئەو لەشە دەروون و هۆش لەگەڵ خۆیدا دەبات ، ئەو کاتە لە ڕووی ئەتیرەوە لە گەردوون دەڕوانین نەك ماددەوە)[139].

(السفیر عزت علی البحیری) دەڵێ : زانایانی ڕوحی دەڵێن : مردن دەرچوونی لەشی ئەتیرە، ڕوح لە لەشی ماددییەوە هەڵ دەگرێ ، ئەو پەتە ئەتیرە زیوەی بە لەشی ماددییەوە دەبەستێتەوە دەپچڕێ ، ئەگەر نا بێ جارەکی تر بگەڕێتەوە ، لەدایك بوونی ڕوح لە دونیای نوێ دا کە دونیای ڕوحە دەست پێ دەکات . ئەوانەی مردوون هەموویان دێنە پێش ڕازی کردنی لە دونیای ئاخیرەتدا)[140].

ئەم ڕاستیانەش لە مردن و پێش ڕازی کران لەم ئایەتەدا دەبینین : ﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ﴿٢٨﴾ فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ﴿٢٩﴾ وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي ﴿٣٠﴾ ﴾ الفجر: ٢٧ ــ ٣٠ واتە : **ئەی دەروونی دڵنیا بگەڕێوە لای پەروەردگارت بەڕازی و لێ ڕازی بوو ، بڕۆناو بەندەکانی من و بچۆ ناو بەهەشتی منەوە.**

**ئیعجازی ( ١٩ ) دونیای ( بەرزەخ ): ( عەرش – کورسی – بەهەشت – دۆزەخ )**

﴿ وَمِن وَرَآئِهِم بَرۡزَخٌ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾ المؤمنون: ١٠٠.

وشەی (البرزخ) بەمانای (الحاجز) دێ واتە : بەر بەست ، یان بەرگ . (ابن القیم) لە (الروح) دا دەڵێ : (ای الحاجز بین شیئین) ، واتە : بەربەست لەنێوان دووشتدا ، بەڵام لە (مجمع البحرین / الطریحي) دا بە (القبر) هاتووە ، واتە : مەبەست لە بەرزەخ گۆڕە.

---

[139] على حافة العالم الاثيري / ل:٢٥.
[140] دراسات في العالم الروح/ ل:٤٠.

(ابن القيم) له كتێبی (الروح/ل:١٣٥)دا باسێکی نوسیوه بەناوی : (بارەگای گیانەکان له کوێیه لەنێوان مردندا تا پەسلآن -القیامه-)؟! هەیه دەڵێ : ڕوحەکان چاکەکاران له بەهەشتن و خراپکاران له دۆزەخن ، هەیه دەڵێ : لەبەردەم گۆڕەکانن و پاداشت و رزقیان بۆ دێت ، هەیه دەڵێ : ڕوح ئازاده بۆ کوێ بچێت ، ئەمه ڕای مالیکه ، (احمد) گێڕاویەوه : ڕوحی کافران لەدۆزەخەو ڕوحی چاکەکاران له بەهەشته ، هەیانه پێیان وایه لای خوادایه ، هەیه پێی وایه : ڕوحی بڕواداران له جابیەیه و ڕوحی کافران له بەرهوته ، بیرێکه لەحەزەر مەوت ، هەیه پێی وایه له بەرزەخی زەمبینەو کوێی بوێ دەڕوات ، هەیه پێی وایه سەرەتا لەکوێ بووه بەر لەدایك بوون بۆ ئەوێ دەگەڕێتەوه ، هەیه پێی وایه ڕوحی بڕواداران له ئاوی زمزمەو ڕوحی کافران لەبیری بەرهوته... هەیه پێی وایه : ڕوحی چاکەکاران له ئاسمانی حەوتەمەو ڕوحی کافران لەزەوی حەوتەمه ... هتد.[١٤١]

## ڕای ڕاست چی یه ؟

بەدەقی قورئان چاکەکان له بەهەشتن و بێ بڕوایان لەدۆزەخدان ، گیان ئازاده له جیهانی ماددی و ڕوحی دا ، لەدەرەوەی بازنەی کات و شوێندا دەجوڵێنەوه . ﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ﴿٢٨﴾ فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ﴿٢٩﴾ وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي ﴿٣٠﴾ ﴾ الفجر: ٢٧ – ٣٠ ، واته : ئەی دەروونی دڵنیا بگەڕێوه لای پەروەردگارت بەڕازی و لێ ڕازی بوو ، بڕۆناو بەندەکانی من و بچۆ ناو بەهەشتی منەوه.

﴿ وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَۢاۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾ آل عمران: ١٦٩ ، واته : ئەوانەی لەپێناو خوادا کوژراون وامەزانن مردوون ، بەڵکو زیندووون و لای پەروەردگاریان ڕۆزی یان پێ دەدرێت.

---

[١٤١] الروح ابن القيم جوزية/ ل: ١٣٥ سەیر بکه تا کۆتایی باس .

له (صحیح مسلم) دا دەربارەی ڕوحی شەهیددا هاتووە (ارواحهم في جوف طير خضر تسرح في الجنة في اي شاءت...) ، واتە : ڕوحی ئەوان لەناو باڵداری سەوزدایە کوێیان بوێ لە بەهەشتدا گەشتی بۆ دەکەن.

ئەمەش وەکو (ابن القيم الجوزية) دەڵێ : پێچەوانەی ئەم فەرموودەیە نییە : (نسمة المؤمن طائر يعلق في شجر الجنة) (رواه مالك)، واتە : گیانی بڕوادار باڵدارێکە بەدارو درەختی بەهەشتدا هەڵدەواسێ.

وەکو باسمان کرد مەبەست بەو باڵدارە سەوزە لەشی ئەتیرە ، کە ڕوحی لەناودایەو لەگەڵ دونیای بەرزەخ دا دەگونجێت وەکو لەشی ماددی لەدونیای ماددیدا دەگونجێت.

لە (صحيح البخاري) دا پێغەمبەر (صلی الله عليه وسلم) بە دایکی شەهید (الحارثة) دەفەرمووێ : کە لەبەدردا شەهید دەبێ : (يا ام حارثة انما جنان ، وان ابنك اصاب الفردوس الاعلى) ، واتە : ئەی دایکی حاریسە ئەوە بەهەشتە ، کوڕی تۆ بەهەشتی فیر دەوسی باڵای پێکاوە .

(ابن القيم الجوزية) پێی وایە (ڕوح) لە گۆڕدا بە ڕێژەیی دێتەوە بەر لەش ، بەڵام (ابن حزم) دەڵێ : (کێ پێی وا بێ مردووو لە گۆڕدا زیندووو دەبێتەوە ئەوە هەڵەی کردووە ، چونکە گەر ئەمە ڕاست بێ دیارە خوا سێ جار زیندووومان دەکاتەوە ، کەچی قورئان فەرموویەتی : ﴿ رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثۡنَتَيۡنِ وَأَحۡيَيۡتَنَا ٱثۡنَتَيۡنِ ﴾ غافر: ١١ ، ئەم فەرموودەیە (فتعاد روحه في جسده) بە (الضعيف) دا دەنرێت.[١٤٢] ، بەڵام وەکو باسمان کرد بەپێی فەرموودەکانی تر ئەم لەشە لەشی (ئەتیرە) لەشێوەی باڵداری سەوزدا ڕوح دەڕواتە ناوییەوە ، یان لەناوی دایە .

[١٤٢] الروح / ابن القيم الجوزية / ل:٦٩ سەیر بکە.

له (صحيح مسلم) دا هاتووه پێغەمبەر (ﷺ) به یارانی فەرمووه لە بەدردا : (قوموا الى جنة عرضها السماوات والارض) ، واته : هەڵسن بەرەو بە هەشتێ پانتایی ئەوەندەی ئاسمانەکان و زەوییە.

(الحاکم) گێڕاویەوە : (رایت جعفر یطیر مع الملائکة) ، واتە : جەعفەرم بینی لەگەڵ فریشتەکان دەفڕی.

(الحافظ ابي الفرج) دەنووسێ : بەڕوونی لە سەلەفەوە هاتووە کە ڕوحی ئەوان لە بەهەشتە ، وەکو لە (ابن مسعود) گێڕاویەوە ، بێگومان (دۆزەخەکان) لەدەوری زەوین وەك حەوت گۆی ئەتیر دەوریان داوە ، بەهەشتەکان وەك حەوت یان هەشت گۆی ئەتیری دەوری دۆزەخیان داوەو دەکەونە ناو حەوت ئاسمانەکانەوە دوایی کورسی دێ ئینجا عەرش : پێغەمبەر (ﷺ) ئاسمان (بۆشایی) بەشەپۆل ناو دەبات (هذا موج مکفوف عنکم) (رواه ابن ابي حاتم). (ان جهنم محیطة بالدونیا والجنة وراءنها) رواه ابو نعیم في کتاب اصفهان. واتە : دۆزەخ دەوری دونیای داوەو بەهەشت دوای ئەودایە لەم فەرموودەیەشدا ئاماژە بە (٧) زەوی دۆزەخی کراوە : (من ظلم قید شبر من الارض طوقه من سبع ارضین) متفق علیه ، واتە : کێ بستە خاکێ ستەم بکات لەزەوی لە حەوت زەوی بەندی دەکات ، وەکوو لە (زەوی ناسی) و (گەردیلەناسی) و (گەردووnناسی)دا ، باسکرا زەوی حەوت بەرگی جیۆلۆجی یە ، حەوت کیشوەرە ، حەوت ئۆقیانووسە ، حەوت دۆزەخە دەوری داوە ، حەوت بەهەشت دەوری داوە ، ئاسمانەکان حەوتە ، ڕووناکی بینراو حەوتە ، گەردیلە (٧) ئەلیکترۆن وەردەگرێت ، (٧) بەرگی ئەتیری دەوری لەشی مرۆڤی داوە.

فەیلەسوفی ناودار (کانت) دەڵێ : (مرۆڤ لەگەردوونی ڕوحی و ماددی دا گەردەن کەچی یەك دەوڵەتی گەورەیە ، گیانی لەژیانی هەنووکەیدا پەیوەستە بەهەردوو دونیاوە لەیەك کاتدا ، بەلام تەنیا دونیای ماددی لەبارەو کەدەوری داوە پەی پێ دەبرێ ، بەو واتایەی ئەندامێکی دونیای ڕوحی یە چەند کاریگەرییەکی تایبەت

وەردەگرێ سروشتێکی نا ماددییان هەیە و پێ و دەدات ، ئەو ڕۆژەش دێ بسەلمێ ڕوحی مرۆڤ وابەستەیە بەدونیای ڕوحەوە ، ئەو جیهانەش کاریگەری بۆ سەر ئەو دونیایە هەیە ئێمە لەناوی دا دەژین)[143].

(برادلی) لە کتێبی (الکواکب) دا دەڵێ : (بڕوام بە نەمری گیان هەیە ئەو لە دونیای تر دروست دەبێ وەکو چۆن کۆرپەلە لەدونیای ئێمەدا دروست دەبێت)[144].

(ابن حزم الظاهري) وەکو زانایەکی ئیسلام ئاماژە دەکات ڕواڵەتی قورئان دەری دەخات کورسی و عەرش دەوری حەوت ئاسمانەکانیان داوە ﴿ وَٱلْمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرْجَآئِهَاۚ وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ ﴿١٧﴾ ﴾ الحاقة: ١٧ ، مەبەست لەو هەشتە (حەوت ئاسمان) و (کورسی یە) بە عەرشەوە دەبن بە (٩) دانە[145].

دیسان حەوت ئاسمانەکان لە کورسی دان ﴿ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ﴾ البقرة: ٢٥٥ ، بەو پێیە حەوت ئاسمانەکان و زەوی لە کورسی دان ، وەکوو ڕابردوو باسکرا لە فەرموودەدا هاتووە : (ما السماوات السبع في الكرسي الاكدراهم السبعة القيت في ترس) رواه ابن جرير، واتە : حەوت ئاسمان لە کورسی دا وەکو فڕێ دانی حەوت درهەمە بۆ ناو قەڵغانێك.

کورسی لە عەرشدایە (ما الكرسي في العرش الا كحلقة من حديد القيت بين ظهري فلاة من الارض) رواه ابن جرير ، واتە : کورسی لە عەرشدا وەکو ئالقەیەکی ئاسنە فڕێ ی بدەیە دەشتێکی کاکی بەکاکی .

پاشان بەهەشتەکان حەوت جیهانن و بە کورسی یەوە هەشت ئاستن و لەناو (٧) ئاسمانەکان دان ، یان خودی حەوت ئاسمانەکانن ، وەکوو لە فەرموودەی (براء بن

---

[143] العالم الارواح والاشباح/ل:٣٦.
[144] العالم الارواح والاشباح/ل:٤٠.
[145] الفصل /ج١/ ابن حزم/ل:٣٣٦.

جازب) دا هاتووه : (انها تصعد من سماء الى سماء ويشيعها من كل سماء مقربو ها حتى ينتهي بها الى السماء السابعة) ، واته : ئەم ڕوحە ئاسمان بە ئاسمان بەرز دەکرێتەوەو بەخێر هاتنی دەکرێ لەلایەن نزیکەکانیەوە تا دەگاتە ئاسمانی حەوتەم.

ڕوحی شەهیدان کورسی دەبڕێ و دەگاتە عەڕش (ان ارواح الشهداء تأوي الى قناديل تحت العرش) ، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەمیعراجدا گەیشتە (سدرة المنتهى) کە (جنة المأوى) دەکەوێتە ئەوێوە ﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ﴿١٥﴾ ﴾ النجم: ١٣ – ١٥ ، بەڵگەی تری ئایەتی کە حەوت بەهەشتەکان دەوری ئاسمان و زوییان داوە، ئەم ئایەتە ﴿ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ ﴾ آل عمران: ١٣٣، واتە : پەلە بکەن بۆ لێ خۆش بوون لە پەروەردگارتان و بەهەشتانێ پانتایی یان ئاسمانەکان و زەوییە ، بۆ تەقوا کاران ئامادەکراون.

عەڕش بە مانای تەخت ئایەت بەڵکو وەکو (الراغب) لە (مفردات) دا دەڵێ : (العرش في الاصل شئ مسقف وجمعه عروش ، ﴿ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا ﴾ البقرة: ٢٥٩ ، واتە : عەڕش (بان و سەقف)ە لەبنەڕەتدا ، بەو پێ یە عەڕش وەکو ئاسمانەکان سەقفە بەسەر کورسی دا.

دیسان کورسی بە مانای کورسی دانیشتن ئایەت ، (الراغب) دەڵێ : (في الاصل منسوب الى الكرسي) ، دەڵێ (الكرسي اصل الشيء) ، واتە : بناغەی شتێك.

بێگومان حەوت ئاسمانەکان و عەڕش و کورسی کە جیهانی ئەتیرن جیهانێکی ئاوەدانن و بەدونیای نادیار ناو دەبرێن : ﴿ وَتَرَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ حَآفِّينَ مِنْ حَوْلِ ٱلْعَرْشِ ﴾ الزمر: ٧٥ ، ﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبْعُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ﴾ الإسراء: ٤٤ .

(بەریت) لە کتێبی (على عتبة غير المنظور) دا دەڵێ : (ئەوەی لەگەڵ زانستەکانی ئێمەدا دەگونجێ قەناعەت بوونە بە جیهانێکی نادیار ، زیندەوەری لەناودا بژین ، هەندێکیان دەسەڵات و ئیلهامیان هەبێ ، دوور نییە توانایان لە سەروی توانای ئێمە دەبێ لەزەوی دا).

(ئارتەر فندلای) لە مەدیومە خەوێنراکەی دەپرسێ کە پەیوەندی بەڕوحێکی ئامادە وەکردووە و پرسیاری ئاڕاستە دەکات :

-ئاسمان لەچی پێك دێ ؟

وەڵام : بەپێی توانای زانستم وەڵام دەدەمەوە ، دونیای ئێوە دونیایەکی تر لەناوی دایە لەرەلەری بەرزترە لە لەرەی ئەو ماددەیەی ئێوە پێ دەکەن ، گەردوون یەکێکە ، بەڵام ئێوە تەنیا ئەوەندە دەزانن دەیبیستن و هەستی پێ دەکەن ، بڕوام پێ بکەن جیهانی تر هەیە ناسکترە لەدونیای ئێوە، پڕە لە ژیان ، بەڵام ئێوەی خەڵکی زەوی هەستیان پێ ناکەن ، دونیای ئێوە وابەستەیە بەم دونیایەوە من پێی شاد بووم دوای ئەو گۆڕانەی ئێوەی پێی دەڵێن : مردن ، ئاستی جیا جیاو پلەی جیا جیا دەوری دونیای ئێوەی داوە لە چڕی دا جیاوازن ، ئەو ئاستانە لەگەڵ دونیای ئێوەدا دەسووڕێنەوە)[١٤٦].

بێگومان قورئانیش بەر لە زانستی میتا فیزیکی نوێ سەلماندوویەتی گەردوون یەکێکە پلە پلەو ئاست ئاستەو لەناو یەکتری دایە ، بەڵام ئێمە ئەوەندە پەی پێ دەبەین بە پێنج هەستەکان هەستیان پێ دەکەین ، ﴿ مِّنَ ٱللَّهِ ذِى ٱلْمَعَارِجِ ﴾ المعارج: ٣ ، واتە : لەلایەن خودای خاوەن ئاست ئاست و پلە پلە .

ئەمە ئاماژەیە بۆ ئاستە ماددیەکان و ئاستە ڕوحی یەکان ، ئاستە بینراو و نەبینراوەکان لەگەردووندا.

---

[١٤٦] على حافة العالم الاثيري/ ل:٩٩.

قورئـان ئامـاژه دەكـات ڕوحـەكان و دونيـاى ئـەتير ڕوونـاكى و وزەيـەكن بـە پێـنج هەستەكان پەييان پـێ نابـەين : ﴿ وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴾ الحجر: ٢٧ ، واته : بەر لە ئادەم جنۆكەمان لە ئاگرێكى پڕتەو دروست كرد .

لەبارەى فريشته لـە فـەرموودەدا هاتووه : (خلقت الملائكة من نور) رواه احمد، واتـه : فريشـتەكان لـە ڕوونـاكى دروسـت كـراون ، بێگومـان فريشـتەكان و جنۆكـە لـە وزەى ئەتير دروست كراون ، نەك وزەى ڕووناكى ماددى كە بە (فۆتۆنەكان) ناسـراوە ، بەڵام ڕووناكى فريشتەكان ناسكترەو لەرەى زياترە.

ديسان ڕوحەكان هەر ڕووناكين و لە شێوەى جەستەى مادديانـدان لـەزەوى داو توانـاى خۆ بەلەشكردونيان هەيە ، وەكوو لە فەرموودەدا هاتووه : (من رآني فقد رآني فان الشيطان لا يتمثل بي) رواه البخاري. واته : كێ من لەخەوندا ببينێ ئەوە خۆمـم ، شەيتان ناتوانێ خۆى بخاته سەر شێوەى من .

(ئارتەر فندلاى) لە مەديومەكەى دەپرسێ لە ڕوحەكە پرسـيار بكـە: مـن تـۆ نـابينم ، بەلأم واى دابنێ دەتبينم تۆ چۆنى؟ وەلأم : من لەشێكم هەيە وەكو لەشى سـەرزەويمە ، هەمان دەست و قاچ و پێم هەيە ، چۆن پەلەكان دەجولێنن من ئاوا دەيان جۆلێـنم ، ئەم لەشە ئەتيريەم لەسەر زەوى دا لە ناو لەشى فيزياييم دابوو ، لەشى ئەتيرى لەشى ڕاستەقينەيەو پێكاو پێكى لەشى زەمينى منە ، لەكاتى مردندا لەو بەرگە گۆشـتى يـە ڕزگارمـان دەبـێ ، لـەژيانى ئـەتيرى ئەركـەكان ئـەنجام دەدەيـن چـۆن لەسـەر زەوى ئەنجاممان داون ، ئـەم لەشـە ئـەتيرەمان لەبـەر جەسـتەيى لـەو لەشـە مادديـيە كـەمتر نييە كە لەسەر زەوى هەمان بووە ، هەمان هەسـتەكانمان هەيـە ، گـەر دەسـت لەشـتێ بدەين هەستى پێ دەكەين ، گەر بڕوانينە شـتێ دەيبيـنين ، لـەشمان سـتايل و شـێوەى هەيـە ، هـەر چـەند ئـەو ماددەيـە نييـە ئێـوە لێ ى حـاڵى بـوون ، ئێمـەش هـاتوو چـۆ دەكەين بۆ شوێنەكان ، بەلأم زۆر خێراتر لەوەى دەيتوانن.

-هزر چى يە ؟ ئايا شتێكە لە مێشك جياوازە ؟

وەڵام : بێگومان جیاوازە ، تۆ هزرت لەگەڵ خۆتدا دێنیێ بۆ دونیای خۆمان ، مۆخی فیزیایی بەجێ دێڵی لەزەوی دا ، لێرەدا هزرمان کار دەکاتە سەر مێشکی ئەتیریمان بە مێشکی ئەتیری کار لە لەشمان دەکەین ، وەکوو چۆن مێشکی فیزیایی ئێوە کار دەکاتە سەر لەشی فیزیایی تان[147].

(ئارتەر فندلای) لە کتێبی (صخرة الحق) باس دەکات حەوت گۆی زەوی ئەتیری دەوری زەوی داوە ، حەوت گۆی ئەتیری دەوری خۆری فیزیایی داوە ، گۆی ئەتیری یەکەم کەلەرەی لە زەوی فیزیایی زیاترە ڕووناکی لەگۆی یەکەمی خۆری فیزیایی وەردەگرێ ، گۆی دووەمی ئەتیری زەوی ڕووناکی لە گۆی دووەمی خۆری ئەتیری وەردەگرێ ...هتد ، دونیای ئەتیر زۆر لە دونیای فزیایی جوانترە بۆ چاکەکاران و بۆ خراپکاران بەپێچەوانەوە [148].

(کارامازوف) دەڵێ : (ئایا ڕاستە ئایین دەڵێ : ئێمە لە مردندا زیندوو دەبینەوەو سەر لەنوێ بەیەکتری شاد دەبینەوە ، بێگومان سەر لەنوێ بەیەکتری دەگەینەوە ، هەر یەکە لە ئێمە بە شادمانی یەوە ڕووداوەکانی خۆی بۆ ئەوانی تر دەگێڕێتەوە)[149].

بێگومان ڕوحەکان لەبەرزەخدا ئازادن ، دەچنە ناو زەوی ئەتیری و ماددی و بەهەشتەکان و دۆزەخ و عەرش و کورسی ڕاو دەکەن ، سنووری زەمان و مەکان دەبەزێنن ، کاتێ سەلامیان لێ دەکەی دەگەڕێنەوە بۆ دونیای زەوی و وەڵامت دەدەنەوە ، کاتێ دەچیە سەر گۆڕو مەزارگەکانیان دێنە لات و دەتبینن و وەڵامی سەلامت دەدەنەوەو گوێیان لە قسەکانی تۆیەو بەتلەپاتی (الفراسة) بیری تۆ دەخوێننەوە ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ( ما من عبد يمر على قبر اخيه يعرفه في الدونيا فيسلم عليه الاعرفه ورد عليه السلام) اخرجه عبدالبر في التمهيد وصححه عبدالحق ، وابن ابي الدونيا والبيهقي ، واتە : هەر کەسێ

---

[147] على حافة العالم الاثيري / ل:١٠١.

[148] على حافة العالم الاثيري / ل: ١٧٥-١٧٧ سەیر بکە.

[149] موجز تأريخ الكون / هاني رزق/ ل:٢٢٣.

**بەگۆڕی کەسێك دا ڕەت بێ و لەدونیادا ناسیاری لەگەڵ هەبێت و سەلامی لێ بکات دەیناسێتەوەو وەڵامی سەلامی دەداتەوە.**

**(احمد) گێڕاویەوە :** (ان اعمالکم تعرض علی اقاربکم وعشائرکم من الاموات فإن کان خیرا استبشروا به ، وان کان غیر ذلك قالوا : اللهم لا تمتهم حتی تهدیهم کما هدیتنا)، **واتە : کردەوەی ئێوە پیشانی خزم و هۆزی مردووتان دەدرێ ، گەر چاك بوون شادمان دەبن ، گەر خراپ بوون ، دەڵێن : خوایە نەیان مرێنی تا وەکو ئێمە ڕێنومایان دەکەیت.**

**ئەم بابەتە لە** (الروح) ی (ابن القیم) و (شرح الصدور / السیوطي) و (أهوال القبور/ الحافظ ابي الفرج) **دا زۆر نمونەی تێدا باسکراوە ، ئێمەش چەند نمونەیەکی ڕاستمان وەرگرتووە ، مردووان بە دوعاو خێرو نوێژو قورئان خوێندنی ئێمە ئاستی ڕوحی یان بەرز دەبێتەوەو سزایان لەسەر سووك دەبێت، بۆ نمونە پێغەمبەر (ﷺ) دووداوی چاند لەسەر دوو گۆڕەکە سزایان لەسەر بوو** (لعله یخفف عنهما مالم ییبسا).

**(زعفرانی) دەڵێ : لە دەربارەی قورئان خوێندن لەسەر گۆڕەکان شافیعم پرسی ، فەرمووی : شتێکی باشە ، دیسان (النووی) لە** (شرح المهذب) **دا باسی کردووە سوننەتە لەسەر گۆڕەکان شتێ لە قورئان بخوێنرێ وەکو شافعی و یارانی بەڵگەیان هەیە لەسەری** (اقرؤا علی موتاکم یس) رواه ابو داود، **واتە : یاسین لەسەر مردووانتان بخوێنن.**

(ام شریك الانصاري) **گێڕاویەوە :** (امرنا رسول الله (صلی الله علیه وسلم) ان نقرء علی الجنازة بفاتحة الکتاب) رواه ابن ماجة ، **واتە : پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێ داین فاتیحە لەسەر جەنازە بخوێنین.**

(اذا صلیتم علی المیت فاخلصوا له الدعاء) رواه ابن ماجة وابو داود ، **واتە : گەر نوێژتان لەسەر مردوو کرد دوعای بەدڵی بۆ بکەن .** (لقنوا موتاکم لا اله الا

الله) رواه مسلم ، واتـه : مردووانتـان بـه (لا الـه الا الله) تـهلقين بكـهن ، تـهواوى ناوەرۆكى تەلقين (ابن حجر) له (تلخيص الحبير) دا به (اسناد صالح) هێناويەتى.

ئيمام عەلى (سەلامى خواى لـێبێ) فەرموويـەتى : (الناس ينام فاذا ماتوا انتبهوا) ، واته : (خەلكى خەوتون گەر مردن بێدار دەبنـەوە) چونكه ڕوح ئازاد دەبێت و لـه سنوورى زەمان و شوێن دەردەچێت.

( بەهەشت )

﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا ﴿٣١﴾ حَدَآئِقَ وَأَعْنَٰبًا ﴿٣٢﴾ وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا ﴿٣٣﴾ وَكَأْسًا دِهَاقًا ﴿٣٤﴾ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّٰبًا ﴿٣٥﴾ جَزَآءً مِّن رَّبِّكَ عَطَآءً حِسَابًا ﴿٣٦﴾﴾ النبأ: ٣١ — ٣٦ ، واتـه : تـهقواكاران چەند شوێنەكى پيرۆزو پڕ فەڕيان هەيە ، چەند باخچەو هەمووو جۆرە ترێيـەك ، وەكو چانى تـازەپێ گەيشتوى هاوتەمەن و پيالەى پـڕ ، لـەناوى دا قسـەى پـوچ و درۆ نابيستێ ، ئەوەش پاداشتێكه لەلايەن پەروەردگارتەوە ، بەخشيشەكى هەژمێراوە.

له فەرموودەدا لەبارەى بە هەشت هاتووە : پێغەمبەر (د.خ) فەرموويـەتى : (هل من مشمر من جنة؟ فان الجنة لا خطر لها ، هي ورب الكعبة نور كلها يتلأ لأ ، وريحانة يهتز ، وقصر مشيد ، ونهر مطرد ، وثمرة نضيجة ، وزوجة حسناء جميلة ، وحلل كثيرة ، ومقام في ابد في دار سلامة ، وفاكهة خضرة ، وخير نعمة في بهية عالية) رواه ابن ابي حاتم ، واته : ئايا كەس هەيه قۆلى بۆ بەهەشت هـەلمالى بـێ ؟ بەهەشـت وێنـەى نيـه ، بـەخوا كەعبـە هـەمووى ڕووناكييـه دەدرەوشێتەوە ، ريحانەيە دەلەرێتەوە ، كۆشكى توندو قايمه ، ڕوبارى درێـژه ، ميوەى هەراشه ، ژنـى جوان و قەشـەنگه ، جل و بـەرگى جوانـه ، چـەند پلەو شـوێنێكه لـه ئەبەددا لـه خانـەى ئاشتى دا ، ميوەى تـازه ، باشـترين بـەهرەى لەوەيدا لەشوێنەكى بەرزى بەها دارە.

لە فەرموودەدا هاتووە بەهەشت (٨) دەرگای هەیە ، لە گێڕانەوەی تردا هاتووە ، بەهەشت (٧) چینە ، بە کورسی و عەرشەوە (٩) بەشە لەناو یەکتری دایە ، لە شێوەی گۆیی دایە .

لە فەرموودەدا هاتووە : (وعرشه على سماواته ، وارضه مثل قبة) كنز العمال / ١١٣٣ ، بەو پێیە زەوی گۆیی یە ئاسمانەکان و عەرش بە گۆیی دەوری زەوییان داوە.

خوای گەورە ئاسمانەکان و زەوی بە (ڕووناکی) ناو دەبات ﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ النور: ٣٥ ، دیسان بەهەشت هەر ڕووناکی یە (هي ورب الكعبة كلها نور يتلألأ) رواه ابن ابي حاتم.

عەرش ڕووناکی یە و هەمووو شتێ لەڕووناکی و وزەی عەرش دروست کراوە ، (ابن عباس) دەڵێ : (ان جميع الاشياء المخلوقة اصلها من نورا العرش ، وان السماوات والارض في الاخرة تردان الى نور العرش الذي اخذتا منه ، فهما دائمتان ابدا في نور العرش) تفسير القرطبي / ج٩/ل:٨٥ ، واته : هەمووو شتێ سەرەتا لە ڕووناکی عەرش دروست کراوە ، ئاسمانەکان و زەوی لە پەسلاَندا بۆ ڕووناکی عەرش دەگەڕێنەوە هەتا سەر لەوێ دا دەمێننەوە ، هەمیشە لەناو ڕووناکی عەرشدان.

کەواتە : وزەو ڕووناکی عەرش بنەمای بوونەوەری ماددی و ڕوحی یە ، لە پەسلاَندا دونیای ماددی بۆ دۆخی ئەتیری دەگەڕێنەوە .

کەواتە : ڕوح و ماددە هەردووکیان دروست کراون و سەرەتای لەدایك بوونیان هەیەو خاوەنی ئەزەلی یەت نین .

بەپێی تیۆری تەقینەوە گەورەکە (الانفجار الكبير) وەك لە گەردووناسی و زەوی ناسی دا باسکرا گەردوون بە زەمان و شوێنەوە بەر لە (١٣) ملیار ساڵ لە (کوانتۆم) کە

تۆپەڵە وزەییێکە دروست بووە ، تیرەکەی (بەشێ بووە لە ملیۆن ملیار ملیار ملیار سەنتی مەترێك[150].

داهاتوو گەردوون لە کشان دەکەوێ و داخراوەو دەگەڕێتەوە دۆخی پێشوو کە تۆپەڵە وزەیێك بووەو دەڕواتە ناو یەك و وەکو نامە لول دەدرێتەوە ﴿ يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُ ﴾ الأنبياء: ١٠٤ .

تیۆری گەردوونی داخراو لە قورئاندا پشتگیری دەکرێ نەك گەردوونی کراوە ، کەهەتا سەر بکشێ ، واتە وەکو (د.فياض النجم) باسی کردووە ئەم تیۆرە دەڵێ : گەردوون وەکو تۆپێك داخراوە ، هێزی کێشکردنی چەقی دەروون زاڵ دەبێ بەسەر تەنە دەرچووەکانداو بەهۆی چڕی گەردوون و گەردوون لە کشان دەوەستێ و وردە وردە دەڕواتە ناو یەك ، وەکوو چۆن بەردێ فڕێ دەدەیە ئاسمان و بۆ زەوی دەگەڕێتەوە ، زۆر لە زانایان تیۆری تەقینەوە گەورەکەو داخرانی گەردوون پەسەند دەکات[151].

عەرش و کورسی و ئاسمانەکان و زەوی و بەهەشت و دۆزەخ هەمووویان دروست کراون سەرەتایان هەیە ، جیهانی ماددی لە گۆڕاندا دایەو دەمرێ ، بەلأم دونیای ئەتیر نەگۆڕەو جێگیرە ، ئیمام عەلی (علیە السلام) فەرموویەتی : (ان الله تعلى خلق العرش اظهارا لقد رته لامكانا لذاته) (الفرق بين الفرق/ ابو منصور البغدادي /ل:٢٤٨. ، واتە : خوای گەورە عەرشی دروست کردووە بۆ دەرکردنی توانای خۆی نەك جێگایێك بۆ خۆی.

---

[150] موجز تأريخ الزمن / هاني رزق / ل:٢٨.

[151] بروانە علم الفلك / د.فياض النجم/ ل:٤٠٩-٤١٠.

بێگومان زانستی نوێی فیزیایی توانی تیۆری ئەزەلی و ئەبەددی ماددە بە بەڵگەی سەلماوی تاقیگەی بەدرۆ بخاتەوە و ئەو چەکە تاسەر لە دەستی ماتریالستەکان بکێشێتەوە.

(فرانك ئالن / سروشت ناسی بایۆلۆجی) لە ئەمریکادا دەنووسێ : (یاساکانی دینامیکی گەرمی ئەوە دەردەخەن پێك هاتووەکانی ئەم گەردوونە ، پەیتا پەیتا گەرمی لەدەست دەدەن ، گومانی تێدا نیە رۆژێك دێ تەواوی تەنەکان پلەی گەرمی یان تا پلەی سفری رەها دا دەبەزێ ، ئەو کاتە وزە لە بن دێ و ژیان کۆتایی دێ ، رودانی ئەم رۆژگارە قوتار بوونی نییە ، کەوزە لە بن دێ و پلەی گەرمی تەنەکان دەبێ بەسفری رەها ، خۆری گەرم و ئەستێرە پرشنگدارەکان و زەوی پڕ لە جۆرەها ژیان ، هەموویان بەڵگەن کەسەرەتای گەردوون وا بەتەیە بە زەمەنێك لەساتەکی دیاریکراوەوە دەستی پێ کردووە ، کەواتە گەردوون رووداوێکە لە رووداوەکان ، کەواتە : پێویستە سەرەتای گەردوون کردگارێکی ئەزەلی هەبێ، کە سەرەتای نییە زانایە بە هەمووو شتێك ، توانای لە سنوور بەدەرە ، پێویستە ئەم گەردوونە کردەی ئەو بێت)[١٥٢].

زانای گەورەی جیهانی هاوچەرخ کریسی موریسون دەڵێ : بەهەشت لەکوێ یە ؟ چەندە دوورە لێمان ؟ ئەو کەسەی فەیلەسووفەو رۆشەنبیرە پێویستە بزانێ بەهەشت بەو واتایە مرۆیی یە شوێنێك نییە ، بەڵکو زۆر لەوە سەیر ترە مرۆڤ بیری لێ بکاتەوە ، بەو هزرە سنووردارە پەی پێ ببات ، ئەوەش لە بارەی ئەمری و بێ سنووری دەگوترێت ، بەراستی لەکاتی ناچاربوونمان بۆ ئەزموونەکانی مرۆڤ تا رێنومامان بکەن کە پێمان وابێ بەهەشت خودی ئاسمانە!)[١٥٣].

---

[١٥٢] الله يتجلي في عصر العلم : جون كلوفرمونسا / ل:٦ .

[١٥٣] العلم يدعوا للايمان / كريسي موريسون / ل:١٨٠-١٨٣.

دیسان دەڵێ : ئەگەر گیانی مرۆڤ بەرەو خوا هەڵچێ ، لە ڕێگادا زانیاری زۆرتر دەبێ ، گەر بەرەو مەلەکوتی باڵا بڕوا جوانی دروستکراوانی خوای لە دونیای ماددی لەبەرچاو دەکەوێ ، چۆن کاتێ مرۆڤ گەورە دەبێ داستانی منداڵی لە یاد دەچێت و نامێنێ ، ئاوا لەگەڵ ڕامانی گەردووندا گۆی زەوی تا خوار ئاستی دادەبەزێت)[154]

( دۆزەخ )

﴿قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَّوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ﴾ التوبة: ٨١، واتە : بڵێ ئاگری دۆزەخ گەرمترە لە بەتینی خۆر لە هاویندا.

لەفەرموودەدا هاتووە (فان شدة الحر من فيح جهنم) متفق عليه ، واتە : تینی گەرما بەشێکە لە تینی گڕی دۆزەخ.

بەو پێیە ئاگری دۆزەخ و ئەستێرەکان و ناخی زەوی و هەسارەکان یەك سەرچاوەیەو ماتە وزەیە دەرکەوتووە .

لە فەرموودەدا هاتووە دۆزەخ دەوری زەوی داوە بە گۆیی و حەوت چینە : (ان جهنم محيطة بالدونيا) ، واتە : دۆزەخ دەوری دونیای داوە. (من ظلم قيد شبر طوقه من سبع ارضين) متفق عليه.

گەر بڕوانینە زەوی لە ڕووی جیۆلۆجییەوە گۆیەکە لە حەوت بەرگ پێك دێ ، سەرەوەی ساردەو ناخی دۆزەخە ، بەهەمان شێوەش بەهەشت حەوت بەرگە ساردەو دەوری حەوت دۆزەخی داوە ، ئەو حەوت دۆزەخەش دەوری زەوی ماددییان داوە .

لە ڕووی جیۆلۆجییەوە بەرگەکانی زەوی بریتین لە :

---

[154] العلم يدعوا للايمان / كريسي موريسون / ل:١٨٠-١٨٣.

(١) تاوێرەكانی دەوری زەوی.

(٢) چینی سیمای خوارەوە .

(٣) چینی ئەتنو سفیر.

(٤) چینی میزو سفیر.

(٥) چینی ناوەوەی خوارو .

(٦) ناخی زەوی (چەق – دڵ). [١٥٥].

دیسان قورئان فەرموویەتی : ﴿إِنَّكَ لَن تَخۡرِقَ ٱلۡأَرۡضَ ﴾ الإسراء: ٣٧ ، واتە : تۆ ناتوانی زەوی ببڕیت، بۆچی؟

(د.ایمن الاسكندراني) دەنووسێ : سەر ڕوی زەوی تا دەگاتە كرۆك (٦٤٠٠)كم . نەكەی بیر لەم گەشتە بكەیەوە ، چونكە كرۆكی زەوی پلەی گەرمی دەگاتە (٧٠٠٠) پلەی سەدی ، واتە : لە پلەی گەرمی خۆر نزیكە)[١٥٦].

پلەی گەرمی دەرەوەی خۆر نزیكەی (٦٠٠٠) پلەی سەدییە ، بەڵام ناو جەرگەكەی دەگاتە (٢٥) ملیۆن پلەی سەدی و ماددە لە دۆخی پلازمادایە ، وەكو لە گەردووناسیدا باسكرا ، تاویری تواوەی ناخی زەوی تواوەیە و پلەی گەرمییان دەگاتە (٢٢٠٠) ° س ، وەكو لە بوڕكاندا دەبیندرێت . وەكو لە زەوی ناسی باسمان كرد.

قورئانیش سووتەمەنی دۆزەخ بە بەردی تواوەی گەرم دادەنێ ﴿فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ ﴾ البقرة: ٢٤ ، واتە : خۆتان لەو ئاگرە بپارێزن سووتەمەنییەكەی مرۆڤ و بەردە بۆ بێ بڕوایان سازكراوە .

---

[١٥٥] مع آيات الله في السماء والارض/ أ.د: حسن ابو العينين / ل:٤٣٢. گەردووناسی، زەوی ناسی/نووسەر.

[١٥٦] الزلازل والبراكين / د.ايمن الاسكندراني / ل:٧.

**پلەی گەرمی دۆزەخ (٧٠) هەندەی ئاگری زەوییە ، کە ئاو لە (١٠٠) پلەی سەدی دا دەکولێت** : (ان ناركم هذه جزء من سبعين جزء من نار جهنم) رواه ابن ماجة.

**(٧٠×١٠٠) = ٧٠٠٠ پلەی سەدی .**

**چینەکانی دۆزەخ بریتین لە** ﴿ لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَٰبٍ لِّكُلِّ بَابٍ مِّنْهُمْ جُزْءٌ مَّقْسُومٌ ﴾ الحجر: ٤٤ .

**(ابن عباس) دەڵێ** : (ئەو دەرگایا بریتین لە (جهنم ، السعير ، لظى ، الحطمة ، سقر ، الجحيم ، الهاوية) **کە خوارەوەیانە .**

**(ابو الشيخ) لە** (العظمة) **دا گێڕاویەوە** : (ﷺ) **فەرموویەتی** (خلق الله تعالى الجنة والنار يوم الجمعة) ، **واتە : خوای گەورە بەهەشت و دۆزەخی لە هەینی دا دروست کردووە .**

(القرطبي) **دەڵێ : بەهەشتەکان حەوت دانەیە** : (دار الجلال ، دار السلام ، دار **الخلد ، جنة عدن ، جنة المأوى ، جنة نعيم ، جنة فردوس)**[157].

**دیسان لە فەرموودەدا هاتووە** : (للجنة ثمانية ابواب) رواه ابو يعلي ، **ئەمەش پێچەوانەی (٧) نییە ، چونکە دوور نیە بە کورسییەوە (٨) بێ ، بە عەرشەوە دەبێ بە (٩)** : ﴿ وَٱلْمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرْجَآئِهَا ۚ وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ ﴾ الحاقة: ١٧ .

**قورئان فەرموویەتی** : ﴿ إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا ﴿٢١﴾ لِّلطَّٰغِينَ مَـَٔابًا ﴿٢٢﴾ لَّٰبِثِينَ فِيهَآ أَحْقَابًا ﴿٢٣﴾ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا ﴿٢٤﴾ إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا ﴿٢٥﴾ جَزَآءً وِفَاقًا ﴿٢٦﴾ ﴾ النبأ: ٢١ — ٢٦ ، **واتە : دۆزەخ لەچاوەڕێ دایە ، جێگای یاخی بووانە ، سەدەها ساڵی تێدا دەمێننەوە ، لەناویدا ناچێژن ساردییەك نە شەراب و خواردنەوەیێك ، تەنیا ئاوی**

---

[157] البدور السافرة / السيوطي / ل:٤٠٣.

گەرم و ساردی گەنیو نەبێت ، ئەمەش سزایەکی پڕ بە پێستی گوناهەکانی ئەوانە ، لە فەرموودەدا هاتووە (کل مؤذي في النار) اخرجه الخطيب ، واتە هەمووو گیانداریکی زیان بەخش (مارو دووپشك و میکرۆبەکان ...) لە ئاگردایە بۆ سزادانی گوناهباران ، واتە : گیاندارانیش نامرن و دەمێننەوە.[158]

**ئیعجازی (٢٠) / مەبەست لە دادگایی خوا لەناو گۆڕداو مەعادی بەرزەخ :**

شێخی گەیلانی (قدس سرة) فەرموویەتی : (من مات قامت قیامته) الفتح الرباني /ل:١٨٩، واتە : کێ مرد قیامەتی ئەو دەستی پێ کرد .

لە فەمووودەدا هاتووە : (ان المیت لیسمع خفق نعالهم حین یولون ، قال : ثم یجلس فیقال له : من ربك ، فیقول : الله ، ثم یقول له ، ما دینك؟ فیقول : الاسلام، ثم یقال له : من نبیك ؟ فیقول : محمد (صلى الله علیة وسلم)؟ فیقال : وما علمك؟ فیقول : عرفته آمنت به ، وصدقته بما جاء به من الکتاب ، ثم یفسح له في قبره مد بصره، وتجعل روحه مع ارواح المؤمنین) رواه البیهقي باسناد حسن ، واتە : گەر مردووو لە گۆڕدا گوێی لە تەپەی پێ یەکانی ئەوانەیە کاتێ دەڕۆنەوە ، فەرمووی : پاشان دادەنیشێ پرسیاری لێ دەکرێ : پەروەردگارت کێ یە ؟ دەڵێ (الله) ، لێی دەپرسێ : ئایینت چی یە ؟ دەڵێ : ئیسلام ، لێ ی دەپرسێ : پێغەمبەرت کێ یە ؟ دەڵێ : (محمد) صلى الله علیه وسلم ، پێی دەگوترێ : زانیاری تۆ چی یە لەو بارەوە ؟ دەڵێ : ناسیم و بڕوام پێ هێنا ، بڕوام بە نامەکەی هێنا کە هێناویەتی ، پاشان ئەوەندەی چاوی ببڕێ گۆڕی بۆ فراوان دەبێ و ڕوحی لەگەڵ ڕوحی بڕواداران دەبێت.

---

[158] (ابو یعلي) بة (اسناد جید) گێراویەوە پێغەمبەر (صلى الله علیة وسلم) فەرموویەتی : (الذباب کلها في النار الا النحل) ، واتە : مێشەکان هەمووی لە ئاگردان تەنها مێش هەنگوین نەبێت.

بێگومان کاتێ مردووو تەلقین دەدرێ دەڵێ : (ارشدني رحمك الله) رواه الطبراني / اسناده صالح في التلخيص، واستحسنه احمد كما قال ابن القيم في الروح واحتبح عليه بالعمل، واته : ڕێنومام بکە خوا ڕوحمت پێ بکات .

**مرۆڤ لەسێ باردا تەلقین دەدرێ و نەست (اللاشعور) لە هەر سێ دۆخدا زۆر هەستیارە : (١) لەکاتێکدا منداڵ لەدایك دەبێ ، (٢) کاتی سەرە مەرگ ، (٣) کاتێ لە گۆڕدایە.**

**چارەنووسی مرۆڤ پەیوەستە بەم ئەزموونەوە لە بەرزەخدا بۆی دەگرێ لەلایەن فریشتەی (نکیر) و (منکر) ەوە ، گەر وەڵامەکانی ڕاست بوو بەهەشتی یە ، گەرنا ئەوە دۆزەخی یە .**

**لێرەدا شایانی باسە گومان هەیە لەلایەن زانایانەوە ، ئایا ئەم مەعادە بەجەستەیە ، یان ڕوحانی یە :**

**هەندێ دەڵێن : ئەم فەرموودەیە : (فتعاد روحه في جسده) (ضعيفة) وەکو (ابن القیم) ئاماژەی پێ داوە ، واتە : ڕوح دەگەڕێتەوە بەر لاشە لە گۆڕدا .**

(١) **(ابن حزم) لە (الملل والنحل) پێی وایە مردوو لەگۆڕدا گیانی نایەتەوە بەر تا قیامەت ، چونکە خوا فەرموویەتی :** ﴿ رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثۡنَتَيۡنِ وَأَحۡيَيۡتَنَا ٱثۡنَتَيۡنِ ﴾ غافر: ١١ ، **گەر خوا لە گۆڕدا زیندووی کردباینەوە ئەو کاتە سێ جار دەیمراندین و زیندووی دەکردینەوە .**

(٢) **(ابن القیم) پێی وایە : پەیوەندی ڕوح بە لاشەوە لە گۆڕدا ڕێژەیی یە نەك گشتی ، ڕوح بە تەواوی لاشە بەجێ ناهێڵێ[159] . هەیە لە زانایان دوای گۆڕیش نکۆڵی لە مەعادی جسمانی دەکات .**

---

[159] الروح / ل: ٦٨-٧٠ سەیر بکە.

(٣) لە (تهافت الفلسفه / الغزالی) و (تهافت التهافت / ابن رشد) یەکێ لە کێشەکان باسکردنی (المعاد)ە : دیارە (المعاد) دوو جۆرە : ڕوحانی هەیەو جەستەیی هەیە ، مەعادی ڕوحانی نەمری ڕوح فەرز دەکات ، هاوکات پاداشتەکەی ڕوحی لە چێژدا یان لە ئازار دایە .
مەعادی جەستەیی زیندووبوونەوەی جەستەکان فەرز دەکات لە بەهەشت یان دۆزەخدا ، غەزالی و فەیلەسوفان کۆکن ، لە مەعادی ڕوحی دا ، بەڵام لە مەعادی جەستەیی دا ناکۆکن : غەزالی بە فەرزی دەزانێ و فەیلەسوفان تەئویلی دەکەن .

(ابو حامد الغزالی) دەڵێ : (فەیلەسوفان نکۆڵی لەزیندووو بوونەوەی جەستەکان و گەڕانەوەی ڕوح بۆ ناو جەستەکان دەکەن ، بڕوایان بە دۆزەخی جەستەیی و بەهەشت و دۆزەخی جەستەیی نییە) واتە : بڕوایان وایە ئەوانە ڕوحانین ، بەڵام (ابن الرشد) وەڵامی دەداتەوە کە ئەو باوەڕی بە زیندووبوونەوەو مەعادی جسمانی هەیەو لە شەریعەتی بەر لە هەزار ساڵ هەیە ، پێغەمبەرانی بەنوئیسرائیلی (سەلامی خوایان لەسەر) یەکەم کەس بوون باسیان لە زیندووبوونەوەو مەعادی جەستەیی کردووە[١٦٠] .

هەرچی گروپی (اخوان الصفا) یە بڕوایان بە تەنا سوخی ڕوحەکان (دۆنادۆن) هەیەو بڕوایان بە زیندووبوونەوەی جەستەکان نییە ، ئەوان دەڵێن : دەروونە پاکەکان لەدونیای فریشتەدا دەژین و ناگەڕێنەوە بەر لاشەکان و گەڕانەوە بۆ لاشە سزاو ئازارە ، هەرچی دەروونی خراپکارە لە خولگەی مانگ تێ ناپەڕن حەز دەکەن بۆ جەستەیان بگەڕێنەوە بۆ چێژی

[١٦٠] بڕوانە (تهافت التهافت/ ابن الرشد / ل:٣٧٢.

ڕابردوویان بەڵان ناتوانن و سەرگەردانن ئەوان بڕوایان وایە خۆشییەکان و سزاکان ڕوحانین"[١٦١].

(٤) غەزالی بڕوای وایە ڕاستە قورئان لەبارەی مانەوەی ڕوح دوای مردن فەرموویەتی ﴿بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ﴾ آل عمران: ١٦٩ ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (ارواح الصالحين في حواصل طير خضر) ، ڕاستە ڕوحەکان هەست بە چاکەو خێرو پرسیاری نەکیرو مونکیر و سزای گۆڕو شتی تر دەکەن وەکو لە گێڕانەوەکاندا هاتووەو مانای نەمری دەگەیێنێت ، هەمان کات بەڵگەیە لەسەر زیندووبوونەوەی لەش ، لەشی ڕابردووی بێ یان لە شتێکی تر"[١٦٢].
بەو پێیە لای غەزالی ئەم لەشە ئەتیریەی لەبەرزەخدا ڕوح دەپارێزێ جیایە لەزیندووبوونەوەی قیامەت ، کە لە شتێکی تر بۆ ڕوح دروست دەکرێتەوە لە خاکی زەوی ، لە هەمان خاك یان خاکی تردا.

(٥) زانایانی ئیعجازی زانستی نوێ دەڵێن : پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی(کل ابن ادم تأكله الارض الا عجب الذنب منه خلق وفيه يركب) (متفق عليه) ، واتە : تەواوی لەشی مرۆڤ زەوی دەیخوات، تەنیا (سەری کلێنچکە) نەبێ ، سەرەتا مرۆڤ لەو دروست بووەو لەو دروست دەبێتەوە ،وەکو (د.زغلول النجار) باسی کردووە زانایانی چینی لە چەند تاقی کردنەوەیەکدا سەلماندوویانە (سەری کلێنچکە)لەناو ناچێ ، لە ڕووی کیمیاوە بەهێزترین ترش بەکارهێنراوە نەتواوەتەوە ، لە ڕووی فیزیایەوە سووتێنراوەو هاڕدراوەو براوەتە بەر تیشك لەناو نەچووە ، ئەمەش ڕاستی ئەم فەرموودەیە دەسەلمێنێ ، کە پێغەمبەر (ﷺ) بەر لە

[١٦١] اخوان الصفا / يوحنا قمير /ل:٣٢ سەیر بکە.
[١٦٢] تهافت الفلسفة / الغزالي / ٢٠٤ سەیر بکە.

(١٤٠٠) ساڵ فەرموویەتی و دەستی خۆی پێش زانستی وە دەست هاتوو خستووە !"[١٦٣].

(٦) بێگومان زانایانی ڕوحانی بڕوایان وایە کاتێ ڕوح لە لەشی ماددی چووە دەر لەناو لەشی ئەتیر دایە ، مرۆڤ لە سنووری زەمان و مەکان دەڕواتە دەر ، ڕابردوو ئێستاو داهاتوو لەسەریەك ڕاستە هێڵ دەبینێ ، ئەو کاتەی گەردوون دروست بووە لەتەقینەوە گەورەکەدا تا وێران دەبێ فیلمە کە هەمووی وەکو یەك دەبینێت.

(پرۆفیسۆر جینز) دەڵێ وەکو باسکرا (زەمەن لەسەرەتاوە تا کۆتایی لەبەرچاومان وەکو دیمەنێ پان ڕاخراوە ، بەلآم ئێمە تەنیا یەك ساتی لێ دەبینین) ، بەو پێیە داهاتوو هەیە ، ئێمە بۆی دەچین نەك ئەو بەرەو لامان بێت ، مرۆڤ بەهەستی ڕوحی یان دوای مردن چاوی پێ دەکەوێت ، حەشرو لێ پرسینەوە وەکو خەونێك بەخێرایی دەبینێت و تێ دەپەڕێت.

واتە : ڕوحیەکان بڕوایان وایە مرۆڤ گەر مرد لەشێکی تری بۆ دروست دەکرێ ئەتیرییە ، کە پێغەمبەر (ﷺ) بە (طير خضر) باڵندەی سەوز ناوی دەبات ، بە هەشت و دۆزەخ ئەتیرین و بەرجەستەن نەك بەو مانا ماددییەی ئێمە لێی حاڵی بووین لەزەوی دا (وەکو باسکرا) ، بەلآم غەزالی و زانایانی تری ئەهلی سوننە بڕوایان وایە جیهانی بەرزەخ جیایە ، بەرزەخ ژووری چاوەڕوانییە بۆ کاتی زیندووبوونەوەی جیهانی ، حەشرو لێ پرسینەوە جەستەیی دەبێ ، بەهەشتەکان و دۆزەخەکان جەستەیین ، مرۆڤ بە ڕوح و جەستەیی ماددی دەڕواتە بەهەشت یان دۆزەخەوە ، ژیانی ناو گۆڕ کاتی یە ، لێ پرسینەوەی گۆڕ کاتی یە ، لێ پرسینەوەی گۆڕ قیامەتی بچووکە ، کێ لە گۆڕ ڕزگاری ببێ ، لە قیامەتی

---

[١٦٣] موسوعة الاعجاز العلمي / يوسف الحاج / ل:١٦٧ سەير بكە.

گەورەشدا ناسان بەسەر تاقی کردنەوەکانی دا زاڵ دەبێت و لەدادگای گەورەی ئیلاهی ڕزگاری دەبێت .

(السفیر عزت علی البحیری) پێی وایە (بەرزەخ) دیوارێکە لە نێوان ژیانی دونیاو پەسلاّندا ، قۆناغێکە بۆ چاوەڕوانی قیامەتی گەورە ، نەفس لەناوی دا کردارەکانی خۆی دەپاڵێوێت ، ڕوحەکان لەبەرزەخدا چاوەڕێی چارەنووسی مسۆگەریان دەکەن بەپێی کردەوەکانیان بەهەشت یان دۆزەخ ، بەرزەخ وێستگەیە ڕوحەکان دوای مردن تێیدا کۆدەبنەوە تا قیامەت بەیەك کەڕەت زیندووو ببنەوە ، وەکوو خوا فەرموویەتی : ﴿ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴾ المؤمنون: ١٠٠ ، واتە : پەردەیەك لەنێوانیاندا هەیە تا ئەو ڕۆژەی زیندووو دەبنەوە ، ڕوحەکان لەوێ (٥٠) هەندەی تیشك خێران ، لەوێ ژیان هزرییە بۆ حاڵی بوون لە یەکتری و خواردن و خواردنەوەو سەفەر بۆ جیهانەکانی تر ، ڕوح لەوێ دەتوانێ ڕابردوو داهاتوو ببینێ و هەموو مێژوی تێدا بخوێنێتەوە ، لەوێ (٧) قۆناغ هەیە ، یان (٤٠) ئاست وەکو لە کتێبی هاندێ لە خواناساندا هاتووە ، مرۆڤ بە پێی کردەوەکانی دەتوانێ بڕواتە نا ئەو ئاستانەوەو ژیانی بەرزەخیان تێدا بباتە سەر .

(صدرالدین القنوی) لە کتێبی (مراتب الوجود)دا بوونەوەر بۆ (٤٠) پلە دابەش دەکات ، دوا پلەی مرۆڤی کاملە .

لە کتێبی (الروح) ی (ابن القیم) دا پەیوەندی ڕوحەکان بە ڕوحەکان چەند جۆرێکە

١- پەیوەندی ڕوحی زیندووان بە زیندووانەوە وەك لەکاتی خەودا.
٢- پەیوەندی ڕوحی مردووان بە مردووانەوە لەکاتی مردندا.
٣- پەیوەندی ڕوحی زیندووان بە مردووانە وەکو لە کاتی خەودا (دواتر باسی دەکەین).

لە پەیوەندییەکی هیپنۆتیزمی دا (ئارتەر فندلای) زانیارییەکی زۆر لە ڕوحێکی ئامادە وەردەگرێ ، کە لە ڕێگای مەدیومە بالاکەوە پەیوەندی پێوە دەکات و دونیای بەرزەخی بۆ دەخوێنێتەوە .

## ئاسمان چیە ؟

- وەلام : بەپێی توانای زانیاری خۆم وەلام دەدەمەوە : دونیایەکی تر لەناو دونیای ئێوە دایە ، لەرەلەری پتر لەو لەرەلەرەی دونیای ماددی ئێوە پێك هێناوەو هەستی پێ دەکەن ، گەردوون هەمووی یەکەو مەزنە ، بەلام تەنیا ئەوەندەی دەیبینن و هەستێ پێ دەکەن لێی دەزانن ، بڕوام پێ بکەن دونیای ئاسکتر هەیە لە دونیای ئێوەی فیزیایی پڕە لە ژیان ، بەلام ئێوەی سەر زەوی هەستی پێ ناکەن ، دونیای ئێوە پەیوەستە بەو دونیای ئێمە لەناوی دا دەژین، پاش ئەو گۆڕانەی بەسەرمان هاتووە ، کە ئێوە بە مردن ناوی دەبەن ، ئاستی جیا جیا لە چڕی دا دەوری دونیای ئێوەی داوە ، ئەو ئاست و گۆیانە لە گەڵ سوڕی زەوی دا دەسوڕێنەوە.

پرسیار : کەواتە دونیای ئێوە ڕاستی و هەست پێکراوە ؟

وەلام : بەڵی بۆ ئێمە حەقیقی و ڕاستە ، بەلام ئەو دۆخانەی بەسەرماندا دێ لەسەر هزر دەوەستێ ، بۆ نمونە : گەر بمانەوێ لە لادێیەکی جواندا بین ، هزرمان لەوەدا ڕۆڵی گەورە دەگێڕێ ، دیسان ئێمە لەناوەندێکدا دەژین لەگەڵ ئاستی بەرزی هزرماندا بسازێت ، هەروەها هەمان هزرە هاوشێوەکانی هزری خۆمان ڕادەکێشین ، لە هەردوو دونیادا هاوشێوەکان یەکتری ڕادەکێشن ، خراپکارانی لای خۆمان بۆ لای خراپکارانی ئێوە ڕادەکێشرێن ، پیاو چاکانمان بەرەو لای چاکەکارانی ئێوە ڕا دەکێشرێن.

ئێمە بەپێی (ویست) شێوەی زەوی وەردەگرین ، لەشی ئەتیرمان لەرەلەری هێواش دەکەینەوە ، ئەو کاتە لەشمان قوڕستر دەبێ و توانای بینینمان پتر دەبێ لەبەر چاوی

مرۆڤدا ، لەبەر ئەوەشە هەندێ کەس کە هەستی شەشەمیان هەیە دەتوانن لەسەر زەوی بمانبینن)[١٦٤] .

بێگومان چۆن موعجیزەی پێغەمبەران لەمەیدانی تاقیکردنەوەدا بەردەوامی ژیانی دوای مەرگیان سەلماندووە ، هەروەها کەرامەتی ئەولیاکان و خەونە ڕاستەکانمان ، زانستی ئەزموونی ڕۆحیش لەم بارەوە توانی لە ڕێگای ئەزموونەکانیەوە ، ئەم ڕاستی یانە بسەلمێنێ و لە قۆناغی تیۆریەوە بیخاتە قاوغی زانستی چەسپیوەوە .

**پرۆفیسۆر** (وحيد الدين خان) دەنووسێ: توێژینەوەی گیانی (البحوث الروحية) ژیانی دوای مەرگی سەلماند ، ئەمەش لە ئاستی ئەزمونی و کرداری دا ، ئەوەی سەرنجمان بۆ ئەو زانستە ڕادەکێشێ وەکو ئەزموونێ ئەوەیە ئەم توێژینەوەیە تەنیا بوونی گیان ناسەلمێنێ ، بەڵکو مانەوەی ئەو کەسایەتی یانەش دەسەلمێنێ بەر لە مردن ناسیومانن.

پرۆفیسور (دوکاس) مامۆستای فەلسەفە لەزانکۆی براون لە کتێبەکەیدا ( A philosophical Scruting of Religion) دەنووسێ : زیرەکترین زانایانمان کە زۆرترین شارەزایی یان هەبوو بە تاوتوێ کردنی ئەو شەهادانە هەڵسان پەیوەست بوون بەمەسەلەوە ، واتە مەسەلەی ژیان لەپاش مەرگدا ، زۆر بە وردی لێکۆڵینەوەیان لەسەر کرد ، لە کۆتایی دا گەیشتنە ئەو ئاکامە، لێرەدا زۆر بەڵگە هەیە بیرۆکەی مانەوەی ڕوح دەکەنە تیۆرێکی ڕێتی چوو ، کە دوور نییە ڕووبدات، بەڕای ئەوان لێکدانەوەی ئەو بەڵگانە بەو پێ یە نەبێ نابێت ، نمونەی ئەو زانا گەورانەی بەو لێکۆڵینەوە هەڵسان بریتی بوون لە : مامۆستا ئەلفەرید راسل والیس ، سێر ولیام کرۆکس ، وف.ومایرز ، سیزار لومبرازو ، کمیل فلا ماریون ، سێر ئولیفەر لوج ، د.ریچاردهوجسن ، مستر هنری سیدویك ، پرۆفیسۆر هیسلوب ، بەو پێ یە دەردەکەوێ بڕوای نەمری ژیان لەدوای مەرگدا کە زۆر لە ئێمە وەکو عەقیدەیەکی

[١٦٤] على حافة العالم الاثيري / ل:٩٩.

ئایینی بڕوامان پێیەتی ، نەك هەر واقیعە ، بەڵكو تاك وێنە یە لە عەقیدە زۆرەكانی ئایین ، كە دەكرێ بە بەڵگەی ئەزموونی بسەلمێنرێت)[١٦٥] .

بەم شێوەیە دەبینین موسڵمانان ناكۆكن لەسەر مەسەلەی شێوازی (المعاد) ، دیارە هەموویان بڕوایان بە (مەعاد) هەیە ، بەلأم لەسەر شێوازی (مەعاد) ناكۆكن ، شیعەكان و سوننەكان بەشێكی فراوانیان بڕوایان بە مەعادی جەستەیی و ڕوحی هەیە ، بەلأم بەشێكی تر بە تایبەتی فەیلەسوفانیان بڕوایان بە مەعادی ڕوحانی هەیە ، پێیان وایە مەعادو حەشرو زیندووبوونەوە لە قیامەتدا بۆ ڕوحەكانە ، نەك جەستەكان ، بەندەكان بەڕوحەكان حەشر دەكرێن و پاداشت و سزا بۆ ڕوحە ، ڕوح بەرپرسە نەك لاشە ، بەلأم غەزالی لە (تهافت الفلاسفة)دا پەرچی یان دەداتەوە ڕای ئەهلی سوننەی تێدا دەخاتە ڕوو ، وەكوو باسمان كرد و (عبدالواحد الانصاري) لە (عقیدتنا / ج١) ڕەدیان دەداتەوە و دەری دەخات ئەوانیش وەكو ئیمامی یەكان بڕوایان بە مەعادی جسمانی هەیە.

## ئیعجازی ( ٢١ ) / پەیوەندی ڕوحی لە ڕێگای ئیلهام و خەون و هیپنۆتیزمەوە:

(ابن القیم الجوزیة) لە كتێبە ناودارەكەی (الروح) لە (ل:١٩)دا سەرەباسێ دەنووسێ بەناوی (ئایا مردووەوان هەست بەسەردانی زیندووەوان بۆ سەریان و سەلامیان دەكەن؟) ، پاشان باسی (تەلقین) دان دەكات ، دیسان لە مەسەلەی دووەمدا باس دەكات (ئایا ڕوحەكان ژوان و دیداری یەكتری دەكەن؟) لە مەسەلەی سێ یەمدا دەڵێ : (ئایا ڕوحی زیندووەوان و مردووەوان دیداری یەكتری دەكەن؟) دوایی باسی خەونە ڕاستەكان و ئیلهامەكان دەكات .

---

[١٦٥] الاسلام یتحدی / وحید الدین خان / ل:١٠٦.

(ابن القيم) بەر لە زانایانی ڕوحی خۆرئاوا کتێبی (الروح) دەنووسێ و هەموو مەسەلە ڕوحیەکان زانستی یانە تاو و توێ دەکات ، بوێرانە شرۆڤەیان دەکات و ، هەمووو ئەو دیوارانە دەشکێنێ کە دەبنە بەربەست لەبەردەم شرۆڤەکردونیان ، گەر لەبەر ئەو و (سیوطي) و (ابن ابی دنیا) و (غەزالی) نەبوایە قوتابخانەی موسڵمانان لەم بارەوە کەمتەرخەم دەبوو .

(ابن القیم) کتێبی (الروح) و (حادی الارواح) دەنووسێ ، (السیوطي) کتێبی (شرح الصدور) و (البدور السافرة) دەنووسێ ، (ابن ابی الدنیا) کتێبی (القبور) دەنووسێ ، (غەزالی) لە (الاحیاء) و کتێبی تری دا باس لە (ڕوح) دەکات ، (ابن رجب) (اهوال القبور) دەنووسێت .

لە کتێبی (الروح / ابن القیم)دا هاتووە (ابن عبدالبر) وتویەتی بە (صحیح)ی لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)گەڕاوەتەوە (ما من مسلم یمر علی قبر اخیه کان یعرفه في الدونیا فیسلم علیه الارد الله علیه روحه حتی یرد علیه السلام) رواه ابن عبد بر في التمهید والاستذکار وصححه. واتە : هەر کەسێ بە گۆڕی براکەی دا ڕەت بێ لەدونیادا ناسی بی و سەلامی لێ بکات خودا ڕوحی دەگێڕێتەوە سەر زەوی تا وەڵامی سەلامی بداتەوە .

لە (الصحیحین) لە زۆر ڕێگاوە هاتووە پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم ) فەرمانی کرد کوژراوەکانی بەدر بخرێنە بیری (قلیب)ەوە ، پاشان هاتە سەریان و بەناوی خۆیەوە بانگی کردن (یا فلان ابن فلان ، یا فلان ابن فلان ، هل وجدتم ما وعد ربکم حقا ، فاني وجدت ماوعدني ربي حقا؟) ، واتە : ئەی فلانی کوڕی فیسار ، ئەی فلانی کوڕی فیسار ، ئایا ئەوەی خوا بەڵێنی پێدا بوون بینیتان ، من ئەو بەڵێنەی خوام پێی دابووم بینیم . عومەر (ڕەزای خوای لێبوو) وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ قسە لەگەڵ کەسانێ دا دەکەی بونە لاشە ، فەرمووی ﷺ : (والله بعثني

بالحق ما انتم باسمع لما اقول منهم) ، واته : سوێند بەوەی منی بەڕاست ناردووە ئێوە لە ئەوان باشتر گوێتان لێ نیە.

دیسان بە دەقی قورئان مردووان کاتێ مردن سەردانی یەکتری دەکەن ، (ابن جریر) لە (مسروق) گێڕاویەوە ، یارانی محمد ﷺ وتیان : لەدونیادا ئێمە پێویستە لێت دابڕێین ، بەڵام گەر تۆ وەفاتت کرد بەرز دەبیەوە بۆ سەرووی خۆمان ئێمە ناتبینین؟ خوای گەورە ئایەتی نارد : ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ ﴾ النساء: ٦٩ ، واتە : کێ گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر ﷺ بکات داهاتوو ئەو کەسە لەگەڵ ئەوانەدایە کە خوا بەهرەی پێداون لە پێغەمبەران و صدیقینەکان و شەهیدان و چاکەکاران ، ئەوان باشترین هاوڕێن.

دیسان (ابن القیم) ئاماژە دەکات قورئان ئاماژە بە ژوان و سەرانی ڕوحی زیندووان و مردووان دەکات لەکاتی نووستندا ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِى لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَاۖ فَيُمْسِكُ ٱلَّتِى قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾ الزمر: ٤٢ ، واتە : خوایە دەروون دەمرێنێ لەکاتی مردندا ، ئەو دەروونەی لەکاتی نووستندا نەمردووە ، ئەو دەروونەی مردنی بەسەردا هاتووە دەگرێ و ئەوەی تر بۆ کاتەکی دیاری کراو ڕەوانە دەکاتەوە .

(ابن عباس) لە لێکدانەوەی ئەم ئایەتەدا دەڵێ : (گیانی مردووان و زیندووان لەکاتی خەوتندا دیداری یەکتری دەکەن پرسیار لە یەکتری دەکەن ، خوا گیانی مردووان دوای ئەوە دەگرێ و گیانی زیندووان بۆ لاشەیان دەگێڕێتەوە[١٦٦].

[١٦٦] الروح / ل:٤١.

(ابـن منـده) گێڕاویـەوە (عومـەری كـوڕی خـەتتاب) لـە ئیمـام عـەلی (ڕەزای خوایـان لەسەر) دەگێڕێتەوە دەپرسێ : بۆچی پیاو هەیە پیاوێكی خۆش دەوێ هیچ چاكی لێ نەبینیوە ، پیاو هەیە پیاوی خۆش ناوێ هیچی خراپی لێ نەبینیوە؟ فەرمووی : بەڵێ لـە پێغەمبـەری خـوام ﷺ بیستووە : (الارواح جنـود مجنـده ، تلتقـي فـي الهـواء فتشـأم ، فمـا تعـارف منهـا ائتلـف ومـا تنـاكر منهـا اختلـف) متفـق عليـه ، واتـە : ڕوحەكان بە سوپاكراون ، لە هەوادا بەیەكتری دەگەن و خوی یەكتری دەگرن ، ئـەوەی زانی و بەدڵی بوو هۆگری دەبێ ، ئەوەی بەدڵی نەبوو خۆی لێ دوور دەگرێت.

(ابن القـیم) دەڵێ : (ڕوحـی زینـدووواان لەنووسـتندا بەیـەكتری دەگـەن چۆن ڕوحـی زینـدووواان و مـردووواان یـەكتری دەبیـنن ، ڕوحـەكان لـە هـەوادا ژوانـی یـەك دەكـەن هۆگری یەك دەبن ، فریشتەی خـەون بـۆی دێنـێ لـەخێرو شـەڕ كـە پێـی گەیشتووە ، ئەمە قسەی هەندێ لە سەلەفە).

نمونـە : (عبـدالمطلب) لـە خەونـدا زمـزم دەدۆزێتـەوەو ئـەو كـەنزەی لـەوێ دەسـتی دەكەوێ . (عمیر بن وهب) لە خەوندا دەبێ كەسێ دێ پێی دەڵێ : بڕۆ فلان شـوێنە لەماڵی باوكت گەنجینەی باوكت لەوێ یەو بیدۆزەوە ، باوكی ماڵی لـەوێ حەشـاردەداو وەسیەت ناكات..)[167].

لە (فتح الرباني والفيض الرحمانى) دا غەوسی گەیلانی (قدس سره) فەرموویـەتی : (هاوار بۆ تۆ دەڵێی من سۆفیم كەچی لێڵی ، سۆفی ئـەو كەسـەیە دەرەوەو نـاوەوەی ساف كردووە بە شوێنكەوتنی كتێبی خوای گەورەو سوننەتی پێغەمبەرەكەی ﷺ ، تا زیاتر ساف و بێ گەردی پتر بێ لەدەریای بوونی زیـاتر دەردەچێ و ویسـت لـە دەسـت دەدات لە سەفای دڵیدا ، بناغەی خێرو چاكە شوێن كەوتنی پێغەمبـەر ﷺ لـە قسـەو

[167] الروح / ل: ٥٤-٥٥.

**کرداردا ، تا بەندە دڵی پاکژ ببێتەوە پێغەمبەر ﷺ دێتە خەونی یەوە فەرمانی پێ دەکات بەشتێ و قەدەغەی دەکات لە شتێك)**[168].

**لە (**فتح الباري / ابن الحجر العسقلاني**)دا لە (اسناد صحیح) هاتووە : (ابن** شيبة**) و (البيهقی) بە (اسناد الصحیح) گێڕاویانەوە لە ساڵی (الرمادە) دا (بلال)ی کوڕی (**حارث**) هاتە سەر گۆڕی پێغەمبەر ﷺ وتی : ( ئەی محمد ﷺ داوای باران بکە ئۆمەتت لەناو چوون) شەو چووە خەونی مژدەی بارانی پێ دا .**

**خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ :** ﴿ وَسْـَٔلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلْنَا مِن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ءَالِهَةً يُعْبَدُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾ الزخرف: ٤٥ **، واتە : لەپێغەمبەرانی بەر لەخۆت بپرسە ئایا بێ لەخوای رەحمان هیچ خوایەکی ترمان داناوە بپەرستڕێن؟**

**(میعراج)ی پێغەمبەر ﷺ نموونەیەکی زیندوووی گەورەی ئەو ڕاستی یانەیە کە پێغەمبەر ﷺ سەردانی پێغەمبەران دەکات .**

**دیسان خوداوەند فەرموویەتی :** ﴿ فَنَادَتْهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٌ يُصَلِّى فِى ٱلْمِحْرَابِ ﴾ آل عمران: ٣٩ **، واتە : فریشتەکان بانگی زەکەریایان کرد، نوێژی لەمیحرابدا دەکرد.**

﴿ وَإِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰكِ ﴾ آل عمران: **٤٢، واتە : کاتێ فریشتەکان بە مەریەمیان گوت : خوا تۆی هەڵبژاردووە .**

﴿ ۞ وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾ الأنعام: ١١١ **، گەر ئێمە فریشتەیان دابەزێنینە سەر و ڕوحی مردوووان قسەیان لەگەڵدا بکەن ...**

**کەواتە : خواپەرستی و نوێژو یادی خوا گەورەترین میکانیزمن بۆ پەیوەندی کردن بە ڕوحە پاکەکانەوە ، لەفەرموودەدا هاتووە : (عمارە بن حزم) دەڵێ : پێغەمبەر**

---

[168] الفتح الرباني / سيدي عبدالقادر الكيلاني / ل:٢٠٠.

ﷺ منی بینی لەسەر گۆڕێ دانیشتووم ، فەرمووی : (یا صاحب القبر ، انزل من علی القبر، لا تؤذي صاحب القبر فیؤذیك) رواه الطبراني ووثقة الهیمثي ورواه الحاكم / صحیح، واتە : ئەی ئەو كەسەی لەسەر گۆڕی وەرە دابەزە لەسەر ئەم گۆڕە ، خاوەنی ئازارمەدە ، با ئەویش تووشی ئازارت نەكات .

(د.شتاینر) لەوتارێكی دا بەناوی (مردووان لەگەڵ ئێمەدا ئامادەن) دەڵێ : (ئەو ساتەی دەچینە سەر جێگای نووستن گونجاوە بۆ ڕووكردنە مردووان ، پرسیاریان لێ بكەین ، ئەو كاتە لەبارە بۆ پرسیار لێ كردونیان دیسان كاتێ خەریكە بێداربینەوە گرنگە بۆ پەیوەندی كردنی مردووان بە ئێمەوە)[١٦٩].

ئارامی و بێ خەمی و ڕامان و سووكە خەو (النعاس) وەكو باسمان كرد زۆر گرنگە بۆ پەیوەندی كردن بە ڕوحەكانەوە ، كە دەكەوێتە نێوان خەو و بێدارییەوە : ﴿ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْ﴾ آل عمران: ١٥٤ ، واتە : پاشان دامانبەزاندە سەرتان دوای خەم ئارامی سووكە خەو گرووپێ لە ئێوەی داپۆشی (كە ئامادەیی ڕوحی یان هەیە) .

لە رووی هیپنۆتیزمەوە چۆن پەیوەندی بە ڕوحەكانەوە دەكرێت؟ (السفیر عزت علی البحیري) سەرۆكی كۆمەڵەی زانستی میسری بۆ تاوتوێیە ڕوحانیەكان دەڵێ : (پەیوەندی گیانی لە ڕێگای ناوەندەوە (الوسیط) ئەنجام دەدرێ ، گرووپێ لەو كەسانەی گرنگی بە كاروباری ڕوحانی و سۆراغی حەقیقەت دەدەن یارمەتی دەدەن ، دەتوانرێ بگوترێ خواپەرستی و ڕامان (التأمل) بناغەی پێشكەوتن لەم بوارەدا ، دانیشتن كۆڕی پەیوەندی ڕوحانی ڕێكخستنێكی زەمانی و زەمانی و شوێنی یە لەنێوان جیهانی زەمینی و جیهانی گیانی دا ، واتە : دیاری كردنی شوێن و كات كە كۆڕەكەی تێدا دەگیرێ ، بەگشتی لە دانیشتنی پەیوەندی ڕوحانی دا ئەم هۆكارانە چاودێرییان دەكرێ :

---

[١٦٩] ما بعد الحیاة ، كولن ولسن / ل:١٦٦.

(١) دەبێ لە تەواوی دانیشتنەکەدا کش و ماتی و بێ دەنگی ڕەچاو بکرێت و دانیشتن لە هەمان شوێنی لێ بوون و جووڵە نەکرێ بەبێ خواستی سەرۆك کۆڕەکە .

(٢) نابێ قاچەکانی بخرێنە سەر یەك یان دەستەکان ، چونکە کارناکاتە سەر ڕۆیشتنی (ئۆتۆپلازم) لە لەشی ئەوانەی توانای ناوەندی یان هەیە .

(٣) بەردەوامی کردن لە دانیشتنی ڕوحی دا ، چونکە ئەمە ئاستی پەیوەندی ڕوحی یان بەرزتر دەکاتەوە .

(٤) دەبێ خواردنی سووك بخورێ نەك قورس وەکو گۆشت و ماسی یان پاقلەکان و خواردنە قورسەکانی تر. دەبێ ڕەوشتە جوانەکان ڕەچاوبکرێن ، نابێ مادده سەرخۆشکەرەکان بخورێتەوە .

(٥) نارامی ، چونکە تورەیی و دڵەڕاوکێ و خەم و ترس کار لە پەیوەندییەکە دەکەن ، واتە : کار دەکەنە سەر (هالەی موگناتیسی ئەتیری) هالە لەو دۆخانە تیشك و لەرەی زیان بەخش ڕەوانە دەکات ، دەبێ بە کۆسپ بۆ پەیوەنییە وەك ناوەندەکانی ڕۆشن بینی (الجلاء البصري) باسیان کردووە.

(٦) دانیشتنەکە لەکاتی خۆی دا بکرێ و پێش و پاش نەخرێت.

(٧) جددیيەت و هۆشیاری لەکاتی کۆڕی ڕوحی دا بۆ سەر خستنی و پارێزکردن لەڕوحی ناوەندەکان (خەوێنراوەکان) .

(٨) لەکاتی دانیشتنەکەدا نابێ بخەوی ، باش نیە لە پەیوەندی ڕوحی دا ، نابێ جلی ڕەش بکرێتە بەر ، ڕەنگی ڕەش شەپۆلی زیان بەخش دەنێرێ ، کاری خراپ لە پەیوەندییەکە دەکات .

(٩) پێویستە نامادەبووان بەر لە دانیشتنەکە پشووێ بدەن.

(١٠) دەبێ داڵغەو خەیاڵی دونیای لەمێشکی ناوەندەکان و نامادەبووان ببرێتە دەرەوە .

(١١) نابێ هەوڵی گرتنی ئەو ڕووناکیانە بدرێ دەردەکەون و بەشوێنەکەدا دەڕۆن لەکاتی دانیشتنەکەدا ، یان دەستیان لێ بدرێ ، چونکە مەترسی کوشندە بۆ

سەر ناوەندەکان پەیدا دەکات ، لە پێك هاتنی (ئۆکتۆپلازم) پێك دێ ، کە لە ناوەندەگانەوە دەردەچێ و هەوڵدان بۆ گرتنی زیانی زۆریان لێ دەدات .

(١٢) پەیوەندییە ڕوحییە لەتاریکی دا یان لە ڕووناکی سووردا ڕوودەدات ، ڕووناکی سوور سەرەتای دانیشتنەکە یان لەکاتی ئەودا ئەنجام دەدرێ . چونکە (ئۆکتۆپلازم) کاری تێ دەکرێ و بە ڕووناکی پەرت دەبێت .

(١٣) نابێ ژنانی ئامادە خشڵیان پێوە بێ ، تا ئۆکتۆپلازمەکە بڵاو نەبێ و پەیوەندییە سەرنەکەوێت.

(١٤) دەبێ سۆزو پەیوەندی لە نێوان دانیشتواندا هەبێت.

(١٥) لە (میسر) دا دانیشتنی ڕوحی بە خوێندنی قورئان و لە خۆرئاوادا بە مۆسیقا دەست پێ دەکات ، یان بە سروودی ئایینی و زیکری دینی ، چونکە هەمووو شتێ لەرەلەری هەیە ڕەوانەیان دەکات و کار لە دەوروبەر دەکات[١٧٠] .

باشترین باری ڕوح ئامادەکردن لە ڕێگای تەریقەت و کۆڕی زیکرو نوێژی حاجەت و ئیستیخارەوە دەبێت ، چونکە لەم دانیشتنانەدا ڕوحی پاکژ نەك شەیاتینی ئامادە دەبێت .

(الرؤيا ثلاث : رؤيا من الله ، ورؤيا من الملك ، ورؤيا من الشيطان) رواه البخاري.

لە فەرموودەی (متفق عليه)دا گەڕاوەتەوە : (ان لله تعالى ملائكة يطوفون في الطريق يلتمسون اهل الذكر ، وان وجد واقوما يذكروون الله عزوجل تنادوا هلموا الى حاجتكم فيحفونهم باجنحتم الى السماء الدونيا) ، واتە : خودای گەورە فریشتەی هەیە لە ڕێگادا دەسوڕێنەوە پەیوەندی بە خەڵکی کۆڕی زیکرەوە دەکەن ، گەر کۆڕێکی زیکریان بینی یادی خوای گەورە دەکەن ، هاوار دەکەن بۆ یەکتری وەرن بۆ پێویستی خۆتان ، تا ئاسمانی دونیا بە باڵیان دەوریان دەدەن.

[١٧٠] دراسات في العالم الروح / : ٤٨.

له فه‌رمووده‌ی (موسلیم)دا هاتووه : (لا یقعد قوما یذکروون الله الا حفتهم الملائکة و غشیتهم الرحمة ونزلت علیهم السکینة) واته : گه‌ر که‌سانێ بۆ کۆڕی زیکر دانیشتن فریشته ده‌وریان ده‌ده‌ن و سۆزو به‌زه‌یی دایان ده‌گرێ و ئارامی دایان ده‌پۆشێ.

**ئیعجازی ( ٢٢ ) خه‌واندنی موگناتیسی :**

﴿ وَتَحۡسَبُهُمۡ أَيۡقَاظٗا وَهُمۡ رُقُودٞۚ وَنُقَلِّبُهُمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِۖ وَكَلۡبُهُم بَٰسِطٞ ذِرَاعَيۡهِ بِٱلۡوَصِيدِ ﴾الكهف:١٨ .

(خه‌واندنی موگناتیسی ) بریتییه له خه‌واندنی ناوه‌ندیێ (الوسیط) که ئاماده‌یی ڕوحی هه‌یه ، له‌لایه‌ن خوێنه‌رێکه‌وه یان مورشیدێکه وه بۆ باری سووکه خه‌و و قۆناغه‌کانی تری نووستن بۆ خسته ناو حاڵه‌تی (نه‌ست – اللاشعور) و په‌یوه‌ندی ڕوحانی و تله‌پاتی و دیارده‌ی تری ڕوحی ، وه‌کوو چاره‌سه‌ری ده‌روونی یان چاره‌سه‌ری جه‌سته‌یی .

(محمود سعید) کتێبه‌کی باشی له‌م باره‌وه هه‌یه به‌ناوی (التنویم المغناتیسی) ، که زۆر به سووده بۆ خولیایانی ئه‌م زانسته ، خه‌واندنی موگناتیسی زانسته‌و هونه‌ره ، به‌شێکه له ده‌روونزانی و به‌شێکه له زانستی ڕوحانی و میتافیزیك ، به‌هۆی (هاله‌ی موگناتیسی) و ئیحا و پێ گوتنی ڕوحانی (تێفروسماندن – الایحاء) و موسیقاو قورئان خوێندن و یادی خوا ده‌توانرێ خۆت یان به‌رامبه‌ره‌که‌ت بخه‌وێنی ، به مه‌به‌ستی ڕواندنی ڕه‌وشتی جوان و ئیحای ئیجابی له (نه‌ست) داو فڕێ دانی ئیحای به‌دو وه‌سوه‌سه‌و خه‌م و دڵه‌ڕاوکێ و ترس و نه‌خۆشی ترو لابردنی ئازاره‌کانی ، ڕواندنی بڕواو متمانه‌و پشت به خوا به‌ستن له‌ناوی دا .

(محمود سعيد) دەنووسێ : (خەواندنی موگناتیسی دیاردەیەکی کۆنە ، لەگەڵ کۆنی مرۆڤ هاتۆتە کایەوە ، بەجۆرەها شێوەو هۆکار بەکارهاتووە ، یەکەم جار کەسانی زاهیدو تەقوا کارو فەیلەسوف خاوەن و ویست بەکاریان هێناوە ، وەکوو خواپەرستان و کاهینەکان و پادشایان و سەرۆك هۆزەکان ، ئەم دیاردەیە تا ڕاددەیێ بە نووستنی ئاسایی دەچێت ، کە ماندوو بوون و شەکەتی لەش پەیدای دەکات و مرۆڤ بۆ پشوودان و حەسانەوە پێویستی پێ دەبێ ، بۆ گێڕانەوەی ئەو وزەیەی لەدەستی داوە ، ماندووکردن و شەکەت کردنی دەست کردیش هەمان دۆخ پەیدا دەکات و ئارەزووی نووستن پەیدا دەکات بۆ ڕزگاربوون لەم هۆیانەی ماندووبون پەیدا دەکەن ، وەکوو ڕووناکی بریسکاوە ، دەنگ و زرینگەی لەسەر یەك ژێ و تەنی بریسکاوە لەبەردەم چاودا .

(چاوی تیژی موگناتیسی) هەمان ماندووبوون و واق وڕمان پەیدا دەکات و مرۆڤ دەخاتە سووکە حەو و وەنەوزە هاتن ، تا گیاندارانیش تووش دەبن و دەیخەنە خەو و سڕبوونێکی قووڵەوەو بەرەو نووستن رایدەکێشێ وەکو چۆن ئاسن بەهۆی بەردی موگناتیس ڕادەکێشرێ ، هزری هۆشیار (العقل الواعی) بە گواستنەوەی دەنگەکان و ئیحاکان هەڵدەستێ بۆ چەقی هەستیاری (مێشك) و کاردانەوەی دەبێ بۆ سەر نەست (اللاشعور) کە چەقی دەروونی یە لەژێر مێشکەوە ، تەواوی کارە خۆ ویست و خۆنە ویستەکان خەزن دەکات و بۆ کرداری زیندەگی (الحیوی) یان دەگۆڕێت و یان ڕەمزێکیان دەگۆڕێ کار لە ڕەفتاری تاك دەکات .

یەك لەم ئایەتە قورئانیە پیرۆزانەی ئامازە بە کۆنی دەکات : ﴿ فَضَرَبْنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمْ فِي ٱلْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا ﴿١١﴾ ﴾ الكهف: ١١ ، یان : ﴿ وَتَحْسَبُهُمْ أَيْقَاظًا وَهُمْ رُقُودٌ ﴾ الكهف: ١٨ .

﴿ وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِ ﴾ الكهف: ١٨.

(دواتر باسی دەکەین)

کاری هیپنۆتیزم لەسەر زاڵ کردنی (ویست) ی بەهێز بەسەر کەسێکی ویست نزمدا ، لەش لاوازدا ، دەروون ناسکدادا دەمەزرێ ، بە (ئیحا) و (پێ گوتن) کاری تێ دەکرێ ، ئەم قسانە کەسێکی بەدەسەلات و شکۆدارو بەسام رەوانەی دەکات و کار لە بیستەرەکەی دەکات نائاسایی یانە ، خەواندن سیحرو جادوو نیە ، بەڵکو پێشەکی موگناتیسی کەسێتی (هالە) بەکاردێنێ و دەتوانێ بەکاری بێنێت (دواتر باسی هالە دەکەین).

خەواندنەکە ئاوا دەبێ : خەوێنەر ناوەندەکەی کەدەیەوێ بیخەوێنی و کاری تێ بکات فەرمانی پێ دەکات هەستەکانی خاو ببنەوە بە تەواوی خۆی تەسلیم بە ویستی ئەو بکات ، تەواوی خەیاڵ و داڵغەکان رابگرێ و لەیادی خۆیان بباتەوە ، بکەوێتە دۆخێکی هزرییەوە بتوانێ پێ گوتنەکانی ئەو (الایجاءات) وەربگرێت.

ناوەندەکە سەیری چاوەکانی خەوێنەر دەکات ، یاخود سەیری شتێکی بریسکاوە دەکات ، وەکوو میلی کاتژمێر کار لە چاوەکان دەکات و بەدەمارەکانی کاریگەرییەکان بەرەو مێشك دەگوازرێنەوە ، لەشەکە ماندوو دەبێ و چاوەکان بەرەو داخران دەچن ، چاوەکان فرمێسك دەکەن ، خەوێکی خۆش روودەدات.

(ئەنتوان سمر) دامەزرێنەری لێکۆڵینەوە بوو لەم دیاردانە ، کە بەهۆی (هالەی موگناتیسی) روودەدەن ، هەروەها لەو کارە نائاساییە سەیرانەی کۆڵییەوە بەدەستی زانایانی ئایینی و پیاوانی روودەدات ، دووپاتی کردەوە دەرچوونی رووناکی و (هالەیەکی موگناتیسی) لەو کەسەی ئامادەیە دەردەچێ تووشی ئەو کەسەی دێ وەری دەگرێ و بڕوای بەمەسەلەکە هەیە ، ئەم مەسەلەیەش (جادوو) نییە ، بەڵکو ئەو کەسەی راهێنان بکات بۆ دەرچواندنی لەچاو و دەستەوە دەتوانێ بە دەسەڵاتی روحی ئەوە بکات و ئیحاو پێ گوتنەکان لەبارێکی گونجاودا یارمەتی دەردەبێ بۆ وەرگرتنی فەرمانەکان ، دوایی لە نەستی خوێنراوە کە مۆرك وەردەگرن ، ئەوەیانە

فەرمان بە تەواوی ئەندامانی لەش[171]. هەندێ لەودیاردە نائاساییانەی بەهیپنۆتیزم ڕوو دەدەن .

**ئیعجازی ( ٢٣ ) : بەکارهێنانی هیپنۆتیزم لەجیاتی ( بەنج ):**

**ئیعجازی ( ٢٤ ) مردن و ( بەنج ) :**

﴿ وَجَآءَتۡ سَكۡرَةُ ٱلۡمَوۡتِ بِٱلۡحَقِّ ﴾ ق: ١٩ ، واتە : سڕبوون و بەنج بوونی مردن بە حەق هات.

﴿ وَجَعَلۡنَا نَوۡمَكُمۡ سُبَاتٗا ﴾ النبأ: ٩ ، (سباتا) حەسانەوەو سڕبونە .

(د.عبدالرزاق نوفل) دەنووسێ : (لە گۆڤاری (بنسلفانیای پزیشکی) دا هاتووە : مردن ناخۆش نییە ، وەکوو سووکە خەوێکە بەسەرماندا هاتووە سەدان جار ، بەسیەتی بزانی نووستن بێ ئازارە وەك نوژداران باسی دەگەن.

(باگوێ لەگەواهی نوژدارێکی هەرە بە توانای ئینگلیزی بدەین (سێر جیمس جودهرت) کاتێ لە نەخۆشخانەیەکی گەورە دەبێ سووردەبێ لەسەرەمەرگی هەمووو نەخۆشێکدا ئامادە بێ ، دوای ئەوە گەیشتە ئەو ڕایە و بڵێ : (مردن هیچ ترسێکی نییە بۆ هاتنە پێش ، بەربەستی نێوان دونیاو ئەو دیو وەکو تەمێکە مرۆڤ بێ هەست پێ کردن دەیبڕێت).

زۆر زانای گەورە ئەم ڕاستی یە پشت ڕاست دەکەنەوە وەکو (سێر بنیامین بروری) و (سێرولیام نوسلەر) و (د.ئەلفەرد دوستر) نوژداری نوێ دەڵێ : سەرە مەرگ دۆخێکی بەنج بوونە ، هەمووو دڵ لێدانی لەهی پێش خۆی نزم تر دەبێتەوە ، توانای ناردنی

---

[171] التنويم المغناطيسي / محمود سعيد / ل:٤٩-٥١/ بەکورت کردنەوە.

خوێنی بۆ لەش هەیە ، گەر شپرزە بوو فشاری خوێن دادەبەزێ ، پشوو مێشک دادەگرێ ، سەرچاوەکەی کۆتایی هاتنی سەرچاوەی چالاکی لەشە ، ئەو کاتە لەش خاو دەبێتەوەو مرۆڤ دووچاری ترسناکترین ڕووداوی ژیان دەبێت ، سەیرە قورئان کام وشانەی بەکارهێناوە بۆ ڕێچواندنی مردن وەکو (نووستن) و (بەنجی مردن) و (مانەوەی ژیان دوای مەرگ) زانایانیش هەمان وشەیان دووبارە کردۆتەوە![١٧٢]

(د.فیلیپ کارت) پسپۆڕی بەنج کردن لە ئینگلترا لە گۆڤاری (تەندروستی گشتی) دا دەنووسێ : (زۆر نەخۆش هەیە پێویستیان بەکرداری نەشتەرگەری هەیە بەهۆی خەواندنی موگناتیسی بەنج کراون و نەشتەرگەرییان بۆ کراوە ، ئەم کردارەش مەترسی کەمترە لە بەنج کردن بەدەرمانی تایبەتی ، دیسان لە خەواندنی موگناتیسی دا ماوەی زیاتر هەیەو دەتوانرێ ئەو ئازارانەی نەخۆشەکە هەیەتی رابرێن)[١٧٣].

(کابوك) لە کتێبی (خود هینمرتیزم) دا دەگێڕێتەوە چۆن ئیمام عەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) کاتێ تیرێك بەرقاچی دەکەوێ و دکتۆرەکەی بۆ نەشتەرگەری داوای لێ دەکات دەرمانی بەنج بخوات تا بەرگەی ئەم نەشتەرگەری یە بگرێ ، بەلام ئەو ڕەتی دەکاتەوەو (نوێژ) هەڵدەبژێرێ بۆ خود بەنج کردن و خۆخستنە ناو حاڵەتی سڕکردنەوە.

بێگومان هەمووو کەس ناتوانێ بخرێتە باری هیپنۆتیزمەوەو حاڵەتی (نەست) پەسەند بکات ، ﴿ ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْ ﴾ آل عمران: ١٥٤ ، قورئان لێرەدا ئاماژە دەکات دۆخی ڕوحانی هەموو کەسێك ئامادەیی نیە ، بۆ ئەم سووکە خەو و ئارامی یە ڕوحی بەشێکی هاوەڵەکان دەگرێتەوە .

(د.لندال دافیدوف) دەنووسێ : ناوەڕاستی (١٩٦٠) دەروون زان (ئەرنست هلجارد) چۆنیەتی پەسەندی حاڵەتی خەواندنی بەسەر (٥٢٣) قوتابی دا پیادە کرد ، تا بزانی

---

[١٧٢] الله وعلم الحديث / عبدالرزاق نوفل / ١٨٦ بەكورت كردنەوە .
[١٧٣] اصول الفقائد في الاسلام / فجتبي الموسوي اللاري / ج٣ / ل٩٣.

ڕادەی ئەوانـەی کاریـان تـێ دەکـات چـەندەیە ، بینـی (٢٥٪) ی ئەوانـە بـە تـەواوی خەواندن کاری تێ کردن ، لە (٥٪-١٠٪) وەڵامیان نەدایەوە ، ئـەوانی تـر وەڵامیـان مـام ناوەند بوو)[١٧٤].

**ئیعجازی ( ٢٥ ) چەند موعجیزەیەکی ڕوحی و پزیشـکی لەداسـتانی یـارانی ئەشـکەوت و مانەوەی مەسیحدا :**

**ئیعجازی ( ٢٦ ) بەستەڵەك کردنی ژیان ( تجمید الحیاة ) :**

(محمود سعید) دەبینـێ: (یـارانی ئەشـکەوت) دوای مانـدووبون لـە ڕێگاداو ئەشـکەوت وەکـو شـوێنەکی ئـارام ، ئامـادەیی ئـەو ڕوحانـە بـۆ ئـەو خـەوە موعجیزەیـە ، ئیحـای خـوداو دانـی بـە گوێچـکەیاندا هـەمووو ئەوانـە ئامادەسـازی دروسـت دەکـەن بکەونـە خەوێکی قـووڵی درێـژی مـوعجیزەیی یـەوە ، کـە کـەس نـەتوانێ دووبـارەی بکاتـەوە ، وەکوو کەسێکی بەهۆش دەربکەون.

﴿ فَضَرَبْنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمْ فِى ٱلْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا ﴾ الکهف: ١١ ، واتە : دامـان بـە **گوێچکەیاندا (ئیحا) لە ئەشکەوتدا چەندان ساڵ .**

﴿ وَتَحْسَبُهُمْ أَيْقَاظًا وَهُمْ رُقُودٌ ﴾ الکهـف: ١٨ ، واتــە : وات دەزانــی بەخەبــەرن ، **کەچی ئەوان خەوتبوون.**

ئەم دۆخانەش لە هیپنۆتیزمدا بەدیار دەکەون .

(د.مردان الرفاعي) لە نامیلکە بەنرخەکەیدا (الاعجاز الطبي في قصـة اصـحاب الکهـف) دا دەنووسـێ : (ئیعجـازی پزیشـکی لـەم ڕوداوە دەگمەنــەدا دەردەکـەوێ ،

---

[١٧٤] مدخل علم النفس / لندال دافیدوف /ل:٣١٣.

لەبارێکـدا خـودا بـۆ ڕوونکردنـەوەی ئـەم مـوعجیزەی دەیرەخسـێنێت، ئـەم لاوە بڕوادارانە لە بارێکی سڕبوون و بەنج بووندا ژیـان بەسـەر دەبـەن ، چۆن گیانـدارانی وەکو ورچ (هەرس) لەوەرزی زستاندا دەکەونە سڕبوونەوە (السبات)، بۆ ڕوودانـی ئـەم دۆخـە دەبـێ هـەل و مـەرجی سروشـتی نـەگۆڕ هـەبێت ، لەنەشـکەوتدا ئـەم هـەل و مەرجە هەیە ، پلەی گەرمی و شێ نەگۆڕە ، دوورە لـە کاریگەرییـە دەرەکیـەکان وەکـو هۆکـاری سروشـتی و کـارتێ کـەری بەرجەسـتەیی : ﴿ وَتَرَى ٱلشَّمْسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهْفِهِمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقْرِضُهُمْ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ وَهُمْ فِى فَجْوَةٍ مِّنْهُ ۚ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ﴾ الكهف: ١٧ ، واتە : (دەتبینـی گـەر خـۆر هەڵـدێ لـە ئەشکەوت لایـدەدا بـەلای ڕاست ، گەر خۆرئاوا دەبوو بەرەو باکوور لادەدات ، ئەوان لـە کەللە بەڕێکدان ، ئـەوە بەشێکە بەڵگەکانی خودا) .

لێرەدا تیشکی خۆر کاریگەری گەرمی و ڕووناکی یە لەلای ڕاستەوە لادەدات ، گەر ئـاوا بوو بەلای چەپدا لێیان تێ دەپەڕێ ، ئەشکەوتەکە لەسەر سروشتی خۆی دەمێنێتـەوە گەرمی ناگۆڕێ ، تیشك بەرچاویان ناکەوێ لە سڕبوونە کە وریایـان بکاتـەوە ، هەسـت کـردن بـە کاریگەریـە دەرەکیـەکان لەدەست دەدەن و هەسـتی (بیـنین و بیسـتن) یـان پەکی کەوتووە .

﴿ فَضَرَبْنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمْ فِى ٱلْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا ﴿١١﴾ ﴾ الكهف: ١١ ، واتە : خـودا دای بەگوێچکەکەیاندا لە ئەشکەوتەکەدا چەند ساڵێك . واتە : (ئیحای پێ دان تا کاتی دیاری کراو بێ هەست و خوست بن و هەڵنەستنەوە).

پێـنج هەسـتەکانیان لـەکار دەکـەون ، دووردەکەونـەوە لـە هـەمووو کاریگەرییـەکی دەرەکی ، ئەوان لە کەللە بەرێکدان لە ئەشکەوتەکەدا ، چۆن (ورچ) بەدرێژایی زسـتان لە سڕی و بەنجی دایە تا هەوا گەرم دەبێ و گۆڕینی گەرمی هۆشیاری دەکاتەوە .

﴿ وَتَحۡسَبُهُمۡ أَيۡقَاظٗا وَهُمۡ رُقُودٞۚ وَنُقَلِّبُهُمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِۖ وَكَلۡبُهُم بَٰسِطٞ ذِرَاعَيۡهِ بِٱلۡوَصِيدِۚ لَوِ ٱطَّلَعۡتَ عَلَيۡهِمۡ لَوَلَّيۡتَ مِنۡهُمۡ فِرَارٗا وَلَمُلِئۡتَ مِنۡهُمۡ رُعۡبٗا ﴾ الكهف: ١٨ ، واته : تۆ پێت وا دەبوو نەنووستن و هۆشیارن ، ئێمە ڕاست و چەپە وەرمان دەگێڕان و کەلە گۆڕیمان بۆ دەکردن ، سەگیان باسکی لەزارکی ئەشکەوتدا پان ڕاخستبوون ، گەر چاوت پێ کەوتبان لەبەرت ڕادەکردن و بە تەواوی لێیان دەترسایت

ئەوان (٣٠٠) ساڵ زیندووو بوون و نوستون ، واتە : کارلێکەرە زیندەگی یە کانی لەشیان و پیشەی ئەندامانیان چالاك بووە وەکو کارکردنی (دڵ) و (مێشك) و (جگەر) و (گورچیلە) و ئەندامانی تر ئەو گەنجانە کە لە گۆڕییان پێ دەکرا ، واتە : دەبێ چاوگی وزەیان هەبێ تا کۆئەندامانیان بتوانن لە ژیاندا بمێننەوە ، نەبێ کرداری میتابۆلیزم (الایض) لە لەشیاندا دەوام بکات و کرداری خۆراکی خەزن کراویان بەکاربێنن وەکو چۆن ورچ بەر لە سڕ بوون خۆراکی داکراو کۆدەکاتەوە ، بۆ هێشتنەوەی زیندە چالاکیەکان لە لەشدا)[١٧٥].

دیسان قورئان ئاماژە دەکات مەسیح (علیه السلام) لەشی هەڵگیراوە وەکو یارانی ئەشکەوت و نەمردووە ﴿ وَإِن مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤۡمِنَنَّ بِهِۦ قَبۡلَ مَوۡتِهِۦۖ ﴾ النساء: ١٥٩ ، واتە : ئەهلی کیتاب بەر لە مردنی عیسا بڕوای پێ دێنن .

دیسان لە (صحیح البخاري) و (صحیح مسلم) و (حر التواتر) ی فەرموودەکاندا هاتووە لەگەڵ مەهدی بنەماڵەی پێغەمبەردا ﷺ دەبێت : (کیف انتم اذا نزل ابن مریم فیکم وامامکم منکم) متفق علیه ، واتە : ئێوە چۆن دەبن کاتێ کوڕێ مەریەم دادەبەزێتە ناوتان ئیمامی خۆتان (مەهدی) لە خۆتانە .

---

[١٧٥] بۆ زانستی پتر بڕوانە نامیلکەی (الاعجاز الطبي في قصة اصحاب الکهف : د.مردان الرفاعي / ط١/٢٠٠٦ / سوریة.

هەردووکیان لەخۆر هەلاَت دا دێن بۆ (عێراق) : (یجئ المسیح قبل المشرق فیقتل الرجال) رواه الطبراني.

(ثم تطلع الرایات السوود من قبل المشرق...) رواه ابن ماجة .

لە گۆڤاری (الف باء) دا هاتووە ئێستا زانستی نوژداری خەریکی پاراستن و هەلگرتنی جەستەکانە بەهێواشی کردنەوەی پلەی گەرمی یان بۆ کاتێکی درێژ ، وەکوو (د.محمد عبدالستار) لە زانکۆی زانستی بەغداد باس دەکات ، بۆ نمونە لەشی پرۆفیسۆر (بدفورد) (٧٣) ساڵە ، تووشی شێر پەنجە دەبێ تا ئێستا لەشی هەلگیراوە ، بۆ ئەم لەش هەلگرتنە چەند ڕێگایێك بەکاردێ وەکو : لێدانی دەرزی (هیپارین) بۆ ڕێگری لە جەڵتەی خوێن ، سنگ دەکرێتەوە دڵ دەشێلرێ بۆ زامن کردنی خۆراك بە خوێن بۆ مێشك ، دوایی بە مەکینەکەوە دەبەسترێتەوە تا کار دڵ و سی یەکان بکات ، پلەی گەرمی بە بەفر بۆ (٨) پلەی سەدی دادەبەزێنرێ ، خوێنەکە هەموووی ڕادەکێشرێ بەشلەیەکی تر دەگۆڕدرێ بەناوی (دمو) ڕێگا نادات گەردی ئاوی بۆ کریستاڵی بەفری بگۆڕێن ، پاراستنی گەرمی دەوام دەکات بۆ (٧٩) پلە لەژێر سفردا ، بۆ حاوییەی تایبەتی دەگوازرێتەوە بە نایترۆجینی شل بە پلەی گەرمی (١٩٥) لەژێر سفردا هەڵدەگیرێت ، زۆر کەس بەو ڕێگایە لەشیان هەلگیراوە.

بێگومان ئەمانە چەند ئیعجازێکی ڕوحی و پزیشکین ، قورئان بەر لە مرۆڤایەتی هاوچەرخ ئاماژەی بۆ بوونیان کردووە ، ئەویش بەنج کردن و سڕکردنی مرۆڤە بە ئیحاو خەواندن بۆ کاتێکی دیاری کراو ، یان بەهۆی دەرمانی تایبەتی یەوە ، بەمەبەستی تێ پەڕاندنی کات ، بەلاَم ئەوەی قورئان باسی کردووە ناوێزەیەو قەت مرۆڤ ناتوانێ لە ڕێگای زانستی یەوە دووبارەی بکاتەوە ، چونکە موعجیزە لوتکەی زانستەکانە.

**ئیعجازی ( ٢٧ ) هیپنۆتیزم و شیتەڵی دەروونی ( التحلیل النفسی ) :**

**ئیعجازی ( ٢٨ ) نوێژو داوای لێ بوردن لە خودا ( الاستغفار ) گەورەترین شیکاری دەروونین**

ئیمڕۆ دەروونزانان بۆ نەخۆشییە دەروونییەکان پەنا دەبەنە بەر شیکاری دەروونی لە ڕێگای خەواندنی موگناتیسی یەوە ، چونکە نەخۆشیە دەروونییەکان و لادانەکان و خەیاڵە سەلبی یەکان و بیرکردنەوە خراپەکان و ترس و دڵەڕاوکێ و یاداشتە دڵ تەزێنەکان زۆر جار دەڕۆنە ناو نەست (اللاشعور)ەوە لەوێ دا کپ دەبن ، نەخۆشەکە باسیان ناکات ، بەلام لەکاتی خەواندندا نەخۆش ڕازی دڵی خۆی دەکاتەوەو سینەی خۆی هەڵدەڕێژێ و دەگێڕدرێتەوە بۆ ئەو کاتەی تێ ی دا تووشی ڕووداوەکە بوو ، ئەم هەڵڕشتنەی ڕازانە لە فشاری دەروونی کەم دەکاتەوە ، ئیجا ئیجابیەکان و دوعاو پاڕانەوەو یادی خواو داواکردنی لێبوردن لەخوا، ئەو ئیجا سەلبی یانە ڕەش دەکەنەوە ، میمۆری و زاکیرەی فۆرمات دەکەنەوە ، نەخۆشەکە بەویستی خوا چاك دەبێتەوە ، ویژدانی کە دەروونی سەر زنشتەکەرە (النفس اللوامة) ئاشت دەبێتەوە لەگەڵیدا ، چونکە پێی لە گوناهەکانی ناوەو ناخی هەڵڕشتووە .

زانایانی دەروونی شیتاڵ کار لەوانە (فرۆید) پێیان وایە نەخۆشییە دەروونییەکان بەهۆی کپ کردنی لە نەستدا پەیدا دەبن و (گرێی دەروونی – العقد النفسیة) پەیدا دەکەن . چارەسەر تەنیا شیکاری دەروونییە ، کە نەخۆش لەباری خەواندنداو لەخاوبوونەوەیەکی تەواودا لە عیادەی نوژداردا دابنیشێ و چیرۆکی ژیانی خۆی بگێڕێتەوە و ناخی خۆی ئاوەڵە بکاتەوە ، ئەمەش دان هێنانە بە گوناهەکاندا ، وەکوو لە (الاستغفار) و (نوێژی بڕوادار) دا دەیبینین ، یان لەنوێژی تۆبەدا ، مرۆڤ لەم کاتەدا دان بە گوناهدا دێنێ لە کپ کردن ڕزگاری دەکات و هەست کردنی بە تاوانی (الشعور بالذنب) ی کە کاریگەری خراپی لەسەر دروست کردووە لە توانای کەم دەکاتەوە و ویژدان باڵی ڕەحمەتی بەسەردا دەکێشێت و ئارامی دەکاتەوە .

بێگومـان ئـەم تیۆرانـەی دەربـارەی هۆکـاری سـەرهەڵدانی نەخۆشـییە دەروونییـەکان ڕاڤەیان کـردووە زۆرە، هەیـە پێـی وایـە هۆکارەکـان بـۆ مـاوەیین هەڵەیـەك لـە توانـای بایۆلۆجی دا پەیدا دەبێ و بە بۆ ماوە بۆ تاك دەگوازرێنەوە .

لای (بافلۆف) کاردانەوەیەکی ڕەفتاری بەتوانا پەیدای دەکات ، داهاتوو گۆڕینی قـوڕس بێت ، هەیە پێی وایـە تێکچوونێکە لـە دەزگای پەیوەنـدی مێشکدا دروسـتی دەکات ، تیـۆر هەیـە پێـی وایـە هـۆی نەخۆشـی دەروونـی بـۆ تێـك چـونی پەیوەنـدی تـاك بـە کۆمەڵگاوە دروست دەبێت .

تیۆری دەروونی پێـی وایـە ڕەگ و ریشـەی ئـەم هەڵەیـە لـە ئەزموونـەکانی منـداڵی دا خۆی حەشاردەدات ، دەبێتە هۆی کێشەی دەروونی و کپ کردن و دڵە ڕاوکێ[١٧٦].

الدکتور (خیر الدین شریف العمري) دەڵێ : (دڵەڕاوکێ – القلق) لاوازی بڕوا پەیـدای دەکات ، کەواتە تۆبەکردن چارەسەرە ، پێتان بڵێم : باشـتر لـە چارەسـەر چییە ؟ خـۆ پاراستن لە چارەسەر چییە ، خۆپاراستن ئارام گرتنە[١٧٧].

بێگومان بە دەقی قورئان ڕەگ و ریشەی نەخۆشییە دەروونییەکان قـەیرانی ئیمانـە ، گوناه و تاوانە دەروونییەکانە ، وەکوو خوا فەرموویـەتی : ﴿ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ﴾ البقرة: ١٠ ، واتە : لە دڵیان نەخۆشی هەیە ، خوا نەخۆشیەکەیان زیـاد دەکات ، ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا ﴾ طـه: ١٢٤ ، واتـە : کـێ پشت لەیادی من بکات ژیانەکی پڕ لە ئەشکەنجەی دەبێـت .﴿أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴾ الرعد: ٢٨ ، واتە : بێگومان بەیادی خوا دڵان ئارام دەبن.

---

[١٧٦] بڕوانە (القلق / مصطفی عبدالسلام الهیتي / ل: ٥٤-٥٥.
[١٧٧] القلق / د.خیر الدین شریف العمودي / ل:٨٥.

گەر بڕوانینە کتێبی (دع القلق وابدأ الحياة / دیل کارنجی) زۆر بە ڕوونی دەری خستووە ، کە قەیرانی ئیمان چاوگی نەخۆشییە دەروونییەکانە لە ترس و دڵە ڕاوکێ و ڕوخان و ...هتد ، باشترین پارێزو چارە بڕوایە.

(کاریل یونگ) ی دەروونزان لە کتێبی (الرجل الحديث يبحث عن الروح) دەڵێ : (نەخۆشێکی زۆرم لە هەمووو دونیاوە هاتە لا لە گەلانی شارستانی و دواکەوتوو . زۆرم لەوانە چارەکرد ، بینیم ئەوانەی تەمەنیان مامناوەندە ، واتە (٣٥) ساڵە کێشەیان تەنیا قەیرانی بڕوایە و دەرچوونە لە پڕەنسیپە ئایینییەکان ، واتە : هۆی دوورکەوتنەوەیانە لە پشووی گیانی و دەروونی کە بڕوا دەیهێنێ ، هیچ کام لەوانە چاك نەبۆوە تا بۆ بڕوا گەڕایەوە ، پشتی بە ئایین بەست لە فەرمان و قەدەغەدا بۆ ململانێ لەگەڵ ژیاندا.

(دیل کارنگی) دەڵێ : نوێترین زانست کە مژدە بە زانیارییە ئایینی یەکان بدات پزیشکی دەروونی یە ، بۆچی ؟ چونکە بڕوای بەهێز بە ئایین و نوێژو پاڕانەوە هەمووو ئەوانە بەسیانە بۆ دەرکردنی دڵە ڕاوکێ و لەناو بردنیان ، دەروون بۆ هێمنی و ئارامی بگێڕنەوە)[١٧٨].

(د.ئەلیکسس کاریل) دەڵێ : نوێژ گەورەترین سەرچاوەی گەرمی یە بۆ مرۆڤ ، وەکوو کانزای رادیۆم ، کە چاوگی تیشکدانەوەیەو چالاکی پەیدا کەرێکی زاتی یە ، مرۆڤ بە نوێژ داوای یارمەتی دەکات بۆ زیادکردنی چالاکی یان ، لەکاتێ دا بەلالآنەوە قسە لەگەڵ ئەو هێزەی دەکەن یارمەتی یان دەدات ، لەژیانمدا نەم بینیوە کەسێ لە خوا بپاڕێتەوە ئاکامێکی باشی بە دەست نەهێنا بێت)[١٧٩].

قورئانی پیرۆز فەرموویەتی : ﴿ وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ﴾ البقرة: ٤٥ ، واتە : بە ئارام گرتن و نوێژ داوای یارمەتی بکەن .

---

[١٧٨] دع القلق وابدء الحياة / دايل كارنجى / ل: ١٦٦-١٦٧.
[١٧٩] دع القلق وابدء الحياة / دايل كارنجى / ل: ١٧٤.

له قورئاندا دهیان ئایهت ههیه داوای (الاستغفار) مان لێ دهکهن له خودا دهربارهی گوناههکانماندا ﴿ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ ﴾ غافر: ٥٥ ، پێغهمبهر ﷺ فهرموویهتی : ( من لزم الاستغفار جعل الله له من كل ضيق مخرجا ، ومن قل هم فرجا) رواه ابو داود ، واته : كێ پهیوهست بێ به داواكردنی لێبووردن له خودا له ههموو تهنگاوییهك ڕێگای دهرچوونی بۆ دهكاتهوه ، بۆ ههموو خهمێك دهرووی لێ دهكاتهوه ، بۆ زانستی پتر لهبارهی ئهزكارهكان بڕوانه (الاذكار النووي) و (تحفة الذاكرين الشوكاني).

به ویستی خوا له كتێبی (دهروونزانی) دا زانستی زیاتر بهم بواره دهدهین ، كۆتایی بهم چهند ئامۆژگارییانهی (دایل كارنگی) دێنین كه دهڵێ : بۆ ئهی مرۆڤ نوێژ بۆ پهروهردگارت بكه ، سێ كارت بۆ دێنێته جێ :

(١) نوێژ مێشكت لهو دڵه ڕاوكێ یه دووردهخاته كه دێته سهرت ، كێشه نادیارهكان به نوێژو بڕوابوون بهخوا دوور دهكهویهوه ، نوێژ بهو كتێبه دهچێ بابای ئهدیب خهم و پهژارهكانی خۆی تێدا دهردهخات.
(٢) نوێژ وات لێ دهكات ههست به تهنیایی نهكهی له ژیاندا ، كاتێ مرۆڤ تووشی كێشهی گهوره دهبێ دڵی تهنگ دهكات ، بهڵام بڕوادار به بڕواكهی مهیدانداری دهكات ، لهبهرامبهر ئهوهشدا بڕوادار لای نوژدارهكهی باسی كێشهكهی ناكات ، بهڵام دهتوانێ ڕاست و ڕهوان لای كردگاری باسی بكات ، باس كردنی كێشه بهڕاست و ڕهوانی بۆ لابردنی پێویسته ، نوژدارانی دهروونی ئهوهمان پێ دهڵێن .
(٣) نوێژ هاندهدات بۆ كاركردن ههر چهنده دژوار بێ ، توانای له ڕادهبهدهری پێ دهدات ، نوێژ یهكهم ههنگاوه بۆ كاركردن.[١٨٠]

---

[١٨٠] دع القلق وابدء الحياة / دايل كارنجى / ل: ١٧٦.

## ئیعجازی ( ٢٩ ) هیپنۆتیزم و چارەکردنی نەخۆشان بە ( ئیحاکانی )
## ئیعجازی ( ٣٠ ) چارەسەر بە قورئان

بێگومان وەکو باسمان کرد هیچ شتێ وەکو پێ گوتن (الایحاء) کاریگەری نییە بۆ سەر مرۆڤ و کەسایەتی یەکەی ، بە تایبەتی لە کاتی نوێژو پاڕانەوەو هیپنۆتیزمدا ، کە (نەست) چالاکەو بێدارە .

ئیحا دوو جۆرە : (ئیحا بەخۆدان) یان (ئیحا بەکەسانی تردان) گەر سەیری قورئان بکەین هەردوو لای تێدایە ، وەکوو ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَـٰهِ ٱلنَّاسِ ﴿٣﴾ مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ ﴿٤﴾ ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴿٦﴾ ﴾ الناس: ١ – ٦ ، ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴿١﴾ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴿٣﴾ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّـٰثَـٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ ﴿٤﴾ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴿٥﴾ ﴾ الفلق: ١ – ٥ .

لە (طب النبوي) دا (ابن القیم الجوزیة) کە بەزمانی کوردی کراوە ، دەبینین پێغەمبەر ﷺ هەر دوو لای کردووە ، (نوێژ) خۆی ئیحای زاتی یە ، کاتێ بە کۆمەڵ ئەنجام دەدرێ هەردوو لای تێدا دێتە دی .

﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ ﴾ الإسراء: ٨٢ ، بێگومان قورئان گەورەترین ئیحایە بۆ خود و خەڵکی شیفایە .

(د.میلان ریزل) دەنووسێ : ڕاستە ئیحا زاتییەکان لە کاتی بێداریشدا دەتوانرێ پێیان هەڵسین ، بەلام لە هیپنۆتیزمدا کاریگەری یان پترە ، لێرەدا زۆر شێوەی تر هەیە وەکو نوێژی بە ڕامان و ڕاهێنانی ناوەندی ڕوحی و ڕامان)[١٨١]

---

[١٨١] تدریب الادراك الحسي الفائق / ل:٦٣.

کتێبی (الشفاء بالقران الكريم/ د.محمد الهادى/ نـوبلس) زۆر بـه گرنگی یـەوە باسـی ئەم راستییانەی کردووە .

ساڵی (١٨٣٩) (هنری ولیام دوف) دۆزییەوە کاتێ مێشك دەنگەکانی بەردەکەون کاری چاك و خراپی تێ دەکەن و خانـەکانی مێشك وەڵامی ئەو لەرەلەرانـە دەدەنـەوە ، پاشان زانایان دۆزییانەوە خانـەکانی مێشـك لـەباری لەرەلـەری هەمیشـەیی دان ، هەر خانەیە بە سیستەمێکی دیاری کراو دەلەرێتەوەو خانـەی دەوری کاری تێ دەکەن ، ئەو ڕووداوانەی بەسەر مرۆڤدا دێ کار لە خانەی مێشکی دەکەن و ڕووداوی ناخۆش نارێکی لە سیستەمی لەرەلـەری خانەیدا پەیدا دەکەن ، میکانیزمی کاری خانـەکان لەچارەکردنی زانستەکاندا لەرەلەرەکان و ناردنی بارگەی کارەبایی یە ، کە جووڵەو کارلێکردن لەگەڵ ئەوانی تردا پەیدا دەکات .

بێگومـان باشـترین ئیحـاو لـەرەکان ئیحـاو لـەرەکانی قورئانـە ، بـۆ چـاك کردنـەوەی نۆتـەکانی مێشـك و خانـەکانی لـەش ، بـە خوێنـدن و گـوێ گـرتن بـۆ قورئـان ئـەم چارەسـەرە مەزنـە دێتـە دی ، لـەرەکانی خانـەکان ڕێـك دەخاتـەوە و چالاکی یـان پـێ دەداتەوە .

ڕابردوو بینیمان (د.میلان ریزل) پسپۆڕ لەبواری کیمیا و فیزیا لە ئەمریکاداو پسپۆڕ لە هیپنۆتیزم دا چۆن سەلماندوویەتی پاڕانەوەو هیپنۆتیزم بـە ئیحاکانیـان کاریگـەری فسیۆلۆجی و دەروونی پەیدا دەکەن ، گۆڕانی بابەتی لە لەشدا پەیـدا دەکـەن ، مێشـك هاندەدەن کار لە تەواوی لەش بکات ، ئیحاکـان لـەم کاتانـەدا فشاری خـوێن دەگـۆڕن ، لێدانەکانی دڵ و پێك هاتەی خوێن و شیلاوەکانی لەش گۆڕان تێ دا پەیدا دەکەن .

ئیحاکـان چـۆن کەسـایەتی دەگـۆڕن و نەخۆشـی دەروونـی دەسـڕنەوە لـە تێـك چـوونی دەروونی و ترس و ئازارو سەر ئێشەو نەریتی خراپ ... هتد.[١٨٢]

---

[١٨٢] بروانة (تدريب الادراك الحسي الفائق / ل:٦٤-٦٥.

(د.بـول ئیرنسـت ئـەدۆلف) دەڵـێ : (مـن دڵنیـا بـووم لـە ڕێگـای ئەزموونەکانمـەوە چارەسەری ڕاستەقینە پێویستە ڕوح و لاشە هەردووکیان بگرێتـەوە) . دەڵێ : (سـەر ژمێرەکـان پیشـانیان داوە (٨٠٪)ی نەخۆشـییەکان لـە تـەواوی شـارە گـەورەکانی ئەمریکادا بەشی هەرە زۆری بۆ هۆکاری دەروونـی دەگەڕێتـەوە ، نیوەی ئەوانـە هـیچ نەخۆشی یەکی ئەندامییان نییە) ، دەڵێ : ( گەر لەشی مرۆڤ لەگەڵ کردگاری دا ڕێـك بێ ئەوە لە باشترین دۆخدا دەبێ ، گەر نا تووشی تێك چوون و نەخۆشی دەبین)[١٨٣].

ئاشکرایە نەخۆشییە دەروونییـەکان کـە قوڕئـان بـە (امراض القلب) ناویـان دەبـات چەند جۆرێکن :

١-نەخۆشـییە دەمارییـەکان (العصـابات) وەکـو (دڵـە ڕاوکـێ و خـەمۆکی و تـرس و وەسوەسەو مەراق و هستریا).

نەخۆشییە زەینی یەکان (الذهانات) وەکو شێتی و گومان و هەوەس.

(تێك چوونە کەسایەتیەکان) هـەروەها (نەخۆشـی یـە جەسـتەیی –دەروونـی یـەکان) وەك (د.بـول ئرنسـت ئـەدۆلف) ئامـاژەی پێـدان ، بڕوانـە (المرشـد فـي الامـراض النفسية / د.مأمون المبيض).

(د.خيرالـدين شـريف العمـري) لـەکتێبی (القلـق) دا ئامـاژەی کـردووە نەخۆشـییە دەروونییەکان کار دەکەنە سەر ئەندامەکانی لەش و نەخۆشییان دەکەن ، کار دەکەنـە سەر کۆئەندامی هەناسەو میزو سوڕی خوێن و هەرس ، (بڕینی گەدە ، فشاری خـوێن ، شەکرە ، گلاندی دەرەقی ، تێك چوونی سێکسی ، شەقیقە ، ڕەبـوو ، جیـوبی لـووت ، نەخۆش پێست و چرکە میزە ...هتد) پەیدا دەکەن ، بۆیە لە کۆتایی کتێبەکەدا دەڵێ : دڵەڕاوکێ بەهۆی لاوازی بڕوا ڕوودەدات ، چارەسەر گەڕانەوەیە بـۆ بـڕوا ، خـۆڕاگری و ئـارام (الصـبر) باشـترین چارەسـەرو پـارێزەرە ، خـوا فەرموویـەتی : ﴿ ٱلَّذِينَ إِذَآ

---

[١٨٣] الله يتجلى في عصر العلم / جون كلوفر مونسا / ل:١٣٧-١٣٨.

صَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ﴿١٥٧﴾ ﴾ البقرة: ١٥٦ ــ ١٥٧ .

**(انا لله وانا اليه راجعون) گەورەترین ئیحای ڕوحی زاتی و غەیری یە لەکاتی کارەساتەکاندا بۆ پەنادانی مرۆڤ لە نەخۆشییەکان ، پاشان مرۆڤی بڕوا لاواز شەیتان ئیحای ترس و دڵە ڕاوکێ و نائومێدی و وەسوەسەی پێ دەدات :**﴿ ٱلَّذِي يُوَسۡوِسُ فِي صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴿٦﴾ ﴾ الناس: ٥ ــ ٦ ، **بەلام ئەو کەسانەی بڕوایان بەهێزە فریشتەکان و ڕوحە پاکەکان ئیحای ئیجابی پێ دەدەن** : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ ﴾ فصلت: ٣٠ .

**فریشتەکان و ڕوحە پاکەکان و ڕوحە چەپەڵەکان (تلە پاتی) و (سایکۆکینیزیا) بەکار دێنن بۆ کارکردنە سەر دەروون و هزری مرۆڤ و هێنانی گۆڕان بەسەریاندا ، ڕوحە پاکەکان ئیحای ئیجابی و باش دەنێرن ، ڕوحە پیسەکان ترس و دڵەڕاوکێ دەنێرن .**

**(ڕکس نایت) باس دەکات بە هیپنۆتیزم دەتوانرێ بە (ئیحاکان دیاردەکان لە نەخۆشدا لابیرێن ، بۆ نمونە : کاتێ کەسێ بەهۆی (هستریا) تووشی ئیفلیجی بووە گەر لەکاتی خەواندنی دا پێی بگوترێ ئەو دەتوانێ دەستی ئیفلیجی بجوڵێنێ بەزۆری ئەوە دەتوانێت.**

**دیسان هیپنۆتیزم یاداشتە کۆنە شارەکان زیندووو دەکاتەوە ، کە دیاردەی نەخۆشی دەماریان پەیدا کردووە و ئێستا لەیاد کراون ، بە هیپنۆتیزم یادی دەخرێتەوە ، بەزۆری بەم هۆیە دیاردە دەمارییە کە لادەبرێت[١٨٤].**

---

[١٨٤] بروانة (مدخل علم النفس / ركس نايت / ٣٤٨.

له قورئاندا نمونه زۆره (دوعا) گەورەترین چەکی بڕواداره ، کار دەکاتە سەر هەست و نەستی مرۆڤ و بوونەوەر و گۆڕانی تێدا دروست دەکات .

(نوح) (علیه السلام) به دوعا لافاو دروست دەکات ، یوسف بە هالاوی کراسی باوکی چاك دەکاتەوه ، ئەییوب بە دوعا چاك دەبێتەوه ، زەکەریا و ئیبراهیم (علیهما السلام) به دوعا خودا منداڵیان پێ دەدات و لە نەزۆرکی چاکیان دەکاتەوه ، عیسا (علیه السلام) به دوعا کوێری سکماگ و بەڵەکی چاك دەکاتەوه .

له (صحاح) و (مسند)ەکان و (سنن)ەکاندا نمونە زۆره لەسەر دوعای پێغەمبەر ﷺ ئال و بەیت و هاوەڵانی (سەلامی خوایان لێ بێت) بۆ چارەسەری نەخۆش و باران باراندن و ....هتد.

بڕوانه کتێبی (اسرار الاثار النبوية / الشيخ ابي الفضل عمادالدين جميل حليم الحسبيني/ شركة دار المشاريع /ط١/٢٠٠٧) نمونەی زۆری تێدایه .

(الترمذی) به (سند الصحيح) گێڕاویەوه چۆن بە دوعای (التوسل)چاوی کوێرێك چاك دەکاتەوه .

(الطبراني) له عائیشەی (رضي الله عنها) گێڕاوەتەوه : چۆن خودا دایك و باوك بۆ پێغەمبەر ﷺ زیندووو دەکاتەوەو بڕوای پێ دێنن و دەمرنەوه .

له خەیبەردا دوعا بۆ ئیمام عەلی (رضى الله عنه) دەکات چاوەکانی چاك ببنەوه لەچاو ئێشه چاك دەبنەوه . (ابو یعلی) گێڕاویەوه (ابو ذر) چاوی بریندار دەبێ لە ئوحودا پێغەمبەر ﷺ تفی دەمی موبارەکی تێ دەکات چاك دەبێتەوه .

(البيهقي) له (محمد بن ابراهيم) گێڕاویه کەسێ دێننه لای پێغەمبەر ﷺ برینی پیسی دەبێ بە پزیشکان چارەی ناگرێ ، پێغەمبەر ﷺ تفی پێدا دەکاو دوعای بۆ دەکات چاك دەبێتەوە ... هتد[185].

(ئەلیکسس کارل) دەنووسێ : (فکرەی نێستامان دەربارەی کاری گەری نوێژ بۆ سەرنەخۆشییەکانی باتۆلۆجی لەسەر بینینی ئەو نەخۆشانە دادەمەزرێ گورج لە نەخۆشییە جیاجیاکان چاك بوونەوە ، وەکوو سیلی بریتون و دومەڵی ساردو هەوی ئێسقان و برینی بۆنگەن و سیلی ئەتەمەکان و شێر پەنجە[186].

خوای گەورە فەرموویەتی : (وذروا ظاهرا الاثم وباطنه) ، لێرەدا خوداوەند فەرمان بە ئێمە دەکات دەست لە گوناهی دەرەکی و دەروونی هەڵگرین .

نوژداری نوێ دەڵێ : (تا کۆ ئەندامی ساغ و لەشێکی دروست بەدەست بێنین ، پێویستە هزرمان لەسەر بیری باشی دور لە گوناه ڕابێنین ، چونکە بیری پیس و چەپەڵ هزر لاواز دەکات و بەرەو شێتی دەبات و تێکی دەدات)[187].

لە فەرموودەی (متفق علیه) دا هاتووە (ابو هریرە) سکی ئازاری دەبێ ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ : (قم فصل فان الصلاة شفاء) ، واتە : هەڵسە نوێژ بکە ، نوێژ شیفایە.

بێگومان ڕۆژانە دەکەوێتە بەر لێشاوی دەیان ئیحاو پێ گوتن لە وەسوەسەوە قسەو ئاخاوتن و پڕو پاگەندە و خوێندنەوەو بیرو دالغەی خراپ و گوناهی جۆراو جۆر کار لە ناخ و لەشمان دەکەن ، چارەسەریش تەنیا بڕواو تۆبەو یادی خواو نوێژو چاکەیە ، کە فۆرماتی دڵمان دەکاتەوەو بیرە خراپەکان لادەبات و بەبیری ئیجابی پڕی دەکاتەوە ، ساغی و هاوسەنگی بۆ دەروونمان دەگێڕێتەوە.

---

[185] بروانة (حجة الله على الالعالمين / النبهانى / ل:٣٠٤-٣١٠.
[186] الانسان ذلك المجهول : د.الكسيس كارل /ل:١٧٢.
[187] المرشد الطبي الحديث / د.ماهر بشاي/ ل:٤٤.

**ئیعجازی ( ٢١ ) بەرێ کردنی وزەی رِوحی ( هاڵە ) لەکاتی هیپنۆتیزمدا**

**ئیعجازی ( ٢٢ ) نوێژو دوعا گەورەترین هاڵەی رِوحی بەرێ دەکەن**

**مرۆڤ لە دووبەشی سەرەکی پێك دێ ، ماددەو گیان ، مادده لە گەردیلەی تایبەتی پێك دێ ، ئیمرۆ گەردەکان (٥) ملیۆن هەندەی خۆی بەمیکرۆسکۆبی ئایۆنی گەورە دەکرێ تاببینرێتس گەردیلەش بە میکرۆسکۆبی ئانۆمەتری دەبینرێ هەروەك باسکرا ، هەرچی رِوحە لە گەردیلەی وردتر پێك دێت ، بەچاوی ئەتیری نەبێت نابینرێت . لەکاتی نووستندا یان هیپنۆتیزمدا ، یان دوای مەرگ کە بەیەکجاری مرۆڤ بۆ ئەو دونیایە دەرِوات ، پەی پێ دەبات.**

﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَا تُبۡصِرُونَ ۝٣٨ وَمَا لَا تُبۡصِرُونَ ۝٣٩ ﴾ الحاقة: ٣٨ – ٣٩ .

﴿ فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٞ ۝٢٢ ﴾ ق: ٢٢ .

**کاتێ (ئەنشتاین) هات چاکسازی لەتیۆری برِێتی (الكم)ی وزەیی (پلانك) دا کردو رِای گەیاند (ماددەو وزە دوو شتی جیاواز نین بەڵکو دوورِووی یەك کردارن) (وزە = بارستایی × دووجای خێرایی) ، ئەم یاسایە تەنۆلکە وزەیی یەکان و ماددەش دەگرێتەوە ، خێرایی تیشك لە بۆشایی دا بۆ دۆخی تەنۆلکەی وزەیی وەکو (فۆتۆنەکان) بەکار دێنرێت [١٨٩].**

**(د.عبدالباسط محمد السید) پسپۆرِ لەبواری شیکاری نەخۆشی دا دەنووسێ : چارەسەرکردن بە وزە چیە ؟**

**بریتییە : لە چارەکردن و دەرمان کردن بە هاندانی خاڵەکانی وزە لەلەشی مرۆڤدا ، بەزاراوەی زانستی پێی دەگوترێ (ACUPUCNCTVRE) ، هاندانی ناوچە پەرچە**

---

[١٨٨] المادة والطاقة / د.خالد فائق العبيدي / ل:١٦.

[١٨٩] المادة و الطاقة / د.خالد فائق العبيدي / ل:١٦.

کرداره دەمارییەکان بە ناوی (REFEEXOLOGY) خاڵدا بەسەر نەخشەی لەشی مرۆڤدا دابەش دەبن .

چارەکردن بە وزەی (تاکیون) ڕێگایەکە لە ئەمریکادا ، بۆ بەکاردێنرێ ، پشت بە وزەی گەردوونی دەرەکی و وزەی شاراوەی ناخی نەخۆش دەبەستێ ، لە ڕێگای هاندانی وەرگرە وزەییەکان (chkrat) کە بە چالاکی لەش و ئەندامانی هەڵدەستێت ، لەشی مرۆڤ لە حەوت (وەرگرەوزە) پێك دێ دەرژێتە (١٢) ڕێڕەوی وزەوە ، بۆ (٨٠٠) خاڵ لقی لێ دەبێتەوە .

چارەکردن بەوزە چارەسەرێکی تەواوکەرە بۆ خێرایی چارەکردن و ساغی دەماری ، چارەکردنە کە بە تاکیۆن دەناسرێت .

ئەم هۆکارانەی وەکو وزە بەخش کار دەکەنە سەر زیندە وزەی لەش و لەبواری پزیشکی ماددی دا بەکاردەهێنرێت:

(١) خەواندنی موگناتیس.
(٢) چارەکردنی ریکی .
(٣) چارەکردن بە زیندەوزە.
(٤) چارەکردن بە ڕووناکی.
(٥) چارەکردن بە خۆر.
(٦) پزیشکی تیشك دەری (الاشعاعی) .
(٧) پزیشکی وزەی هەڕەمی.
(٨) چارەکردن بە کارەبا.
(٩) چارەکردن بە بواری موگناتیسی.
(١٠) چارەکردن بەفیزیا.
(١١) چارەکردن بە لێزەر.

(١٢) چارەکردن بەدەست لێدان.[١٩٠].

بێگومان مرۆڤ کانگای وزەیەکی ماددی و ڕوحی یە ، کە قورئان بە (النور) ناوی دەبات و لەزاراوەی زانستی دا بە (هالەی موگناتیسی) ناو دەبرێت ، هەمووو کارە نائاسی یەکانی مرۆڤ بەو هێزەیە ڕوودەدت .

﴿ ۞ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ النور: ٣٥ ، واتە : خودا سەرچاوەی ڕووناکی ئاسمانەکان و زەوییە.

(ا.د.عبدالباسط) ئاماژە دەکات هۆیەکانی ڕەوانە کردنی وزە بە (چاو و دەم و دەست و قاچ ) دەبێت هەمان ئەندامیش دەتوانن وەری بگرن[١٩١].

بێگومان قورئان ئاماژە بەدەست دەکات کە هالە دەهاوێژێت : ﴿ وَٱضۡمُمۡ يَدَكَ إِلَىٰ جَنَاحِكَ تَخۡرُجۡ بَيۡضَآءَ ﴾ طه: ٢٢ ، واتە : دەستت بخە باڵتەوە بەسپی دەردەچێت، واتە ڕووناکی دەدات کەڕەنگی سپییە.

دیسان ئاماژە بە تیشکی چاو دەکات کاتێ ڕەوانە دەکرێت و چۆن کاریگەری دروست دەکات وەك لە چاو و زاردا : ﴿ وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَيُزۡلِقُونَكَ بِأَبۡصَٰرِهِمۡ ﴾ القلم: ٥١ ، واتە : خەریکە ئەوانەی بێ بڕوان بە چاوەکانیان بتکوژن .

لەبارەی ڕەوانەکردنی (وزە) بە دەم قورئان فەرموویەتی : ﴿ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِي ٱلۡعُقَدِ ﴾ الفلق: ٤ ، واتە : لەشەڕوزیانی ئەوانەی فوبەگرێ دا دەکەن.

[١٩٠] بروانە کتێبی (الادویة النبویة/أ.د: عبدالباسط محمد السید / بەشی طب الطاقة) .
[١٩١] ادویة نبویة / ل٣٤٠.

**دیسان قورئان ئاماژە دەکات شەیتان بەدەست هالەی شێواو و دەنێرێ بۆ شێت کردنی مرۆڤ و تێك دانی سیستەمی دەمارەکانی** ﴿كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ﴾ البقرة: ٢٧٥ .

**هەروەها پێغەمبەر ﷺ بۆ چارەگردن و شیفاو دوعای خۆ پاراستن دەستی بەکارهێنا بەسەر خۆی و نەخۆشاندا ، یان فووکردن ، یان تف ، یان جل و بەرگ و کەل و پەل ، یان پاشماوەی لەشی وەکو قژو شتی تر .**

(عائیشة) (رضي الله عنها) **دەفەرموێ** : (ان رسول الله ﷺ كان اذا اشتكى يقرء على نفسه بالمعوذتين وينفث ، فلما اشتد وجعه كنت اقرأ عليه بالمعوذات و امسح بيده عليها رجاء بركتها) رواه مالك ، **واتە : کاتێ پێغەمبەر ﷺ ئازاری پەیدا دەبوو هەردوو (قل اعوذ)ی دەخوێندو فوی بە خۆیدا دەکرد ، کاتێ ئازاری زۆر بوو من بەسەرمدا دەخوێندن ، دەستی ئەوم دەهێنا بەسەری دا بەمەبەستی بەرەکەت و فەڕ.**

**لە (صحیحین) و (مسند احمد) دا هاتووە پێغەمبەر ﷺ قژو موی خۆی و نینۆکی خۆی بەسەر یارانی دا دابەش کردووە بۆ وەرگرتنی بەرەکەت .**

**لە (صحیح مسلم) دا هاتووە : کە پێغەمبەر ﷺ پۆشاکێکی کیسرای دەبێ دەیکاتە بەر ، دوای وەفاتی بۆ نەخۆشان دەیبەن دەیشۆن بۆ وەرگرتنی شیفا ، نمونەی ئەمەش لە قورئاندا (کراسی یوسفە) ، بێگومان پێغەمبەران و صدیقەکان وێستگەی وزەی ماددی و ڕوحی بوون ، ئەولیایان و بڕواداران بە پلەی جیا جیا هەیانە ، نوێژو خوا پەرستنی و وەرزشی دەروونی ئەم وزەیە زیاد دەکەن و گوناه و تاوان و کزو لاوازی دەکەن.**

(دجودنا دافید شیلی) کتێبێك دەنووسێ بەناوی (إصغی الی أصابعي) ، ئەم کتێبە بە ئەزموون و وێنە پیشانی دەدات چۆن نەخۆشەکانی بە ڕەوانەکردنی وزەی زیندەگی لە لەشیەوە لە ڕێگای دەستەکانیەوە چاك دەکاتەوە .

(أ.ن مندلیا نۆفسکی) دکتۆرا لە زانستی پزیشکی و پسپۆڕ گەواهی بۆ دەدات ، چۆن نەخۆشێکی ئەو چاك دەکاتەوە کە تووشی هەوی پێستی دەماری دەبێ ، ئێسکی شالەی هەردوو دەستەکانی تووشی هەلامسان دەبن ، نوژداران لە چارەکردنی نا ئومێد دەبن ، داهاتوو زیاتر باسی ئەم هالەیە دەکەین.

بێگومان ئەو هالەیە لەکاتی نوێژو یادی خواو دوعاو قورئان خوێندن و سەلەواتدا پڕتەو دەبێ ، بۆیە دوعاو پاڕانەوە لەو کاتە چالاکترە ، نەخۆش دەتوانن سوودی زیاتری لێ ببینین ، ئەم هالەیە دەتوانرێ بە دەست و فو پێ کردن و هۆکاری تر بۆبۆ نەخۆش بگوازرێتەوە ، ئەو هالەیەی بە نەخۆشی لەدەستی داوە پڕتەوی بکاتەوەو ساغی بۆ نەخۆشەکە بگەڕێتەوە ، لەکاتی هیپنۆتیزمدا چالاکەو نەخۆش لەکاتی خەوا چاکتر وەری دەگرێت ، چونکە نەستی چالاکە .

## ئیعجازی ( ٣٣ ) هالەی مرۆیی ( Aura ) چی یە؟

ڕابردوو باسکرا هالە وشەیەکی یۆنانی یە واتە (دەروون) ، لەڕووی زانستی یەوە (السفیر عزت علی البحیری)لە پێناسەی دا دەڵێ : (هالەی مرۆیی شەبەنگێکە یان ڕووناکی و وزەیەکی تیشکاوەری یە لە مەڵبەندی بایۆلۆجی مرۆڤەوە پەیدا دەبێ و لە هەمووو لایەکەوە دەوری داوە ، کاریگەری لەناخەوە بۆ دەرەوە درێژ دەبێتەوە ، ناوی تریشی بێ دەگوترێ وەکو (کایەو وێستگەی وزە) ، بریتییە لە چوار چێوەیەك بۆ بەرگی نەتیری هەمووو زیندەوەران ، هەر مرۆڤ ناگرێتەوە بەڵکو گیانداران و ڕووەك و مێروو و و باڵندە دەگرێتەوە ، شێوەیەکی هێلکەیی هەڵدەکەوێ ، بەشێوەی جیا جیا کزو بەهێزو هەڵبەزین و دابەزین دەکات لە پارچەکانی لەشدا ، بەشێ نییە لە لەشی و سیفەتەکانی ، بەڵکو لەرەی زیاترەو (٥-١٠) سم لە چوارچێوەی لەش دوورە ،

وەکـوو کۆلکـە زێڕینـە ڕەنگـاو ڕەنگـە ، بـەلاّم بـەپێی مـرۆڤ زالّ بـوونی ڕەنگـە کـە دەگۆڕێت.

زانستی نوێ دەری خستووە هەمووو زینـدەوەرێ هەناسـەی هەیـە ، وشـەی (هالـە) لای ڕوحانییەکان هەوایەکی ڕوحی یە دەوری کەسان و شتەکانی داوە ، یـەکێ لـەکارەکانی پاراستنی هزرە لە هەندێ کاریگەری خراپ کە لە دەرەوە وەریان دەگـرێ ، بـە شـێوەی دڵتەنگی و دڵەڕاوکێ و نائارامی دەردەکەوێت.

بە حوکم کردنی ئیرادی لەناوی دا دەتوانرێ باشـتر بـەکار بێنرێـت ، کـزی و نـەبوونی ڕووناکی یارمەتی دەری باشتر دەبێ بۆ چاکتر دەرکەوتنی (هالە) ، لـە تـاریکی تـەواودا هالە ڕەنگاو ڕەنگ دەردەکەوێ لەناویەك دان و وەك یەك دەردەکەون .

ئەوانـەی بەسـاڵدا چـوون ڕەنگـی هالـەیان ڕەنگـی یـان ئامێتـەترە ، **ئەوانـەی هەسـتی شەشەمیان بەهێزە دەتوانن هالەی کۆرپەلـە لـە منداڵدانـدا ببیـنن بـە (٦) مـانگ بـەر لەدایك بوونی .**

(د.جوردن تیر نر) دەڵێ : چەند جارێ بۆی هەڵسوڕاوە هالەی مرۆڤ لەکاتی مردنـی دا ببینـێ وەکـو ڕوونـاکی یـەك وردە وردە لـە لەشـی مـرۆڤ دەردەچـێ ، دوا جـار دەدرەوشێتەوە ، لەگـەڵ مردنـدا هالەکە ڕەنگی خۆڵەمێشی تاریـك دەبـێ ، لـە دەوری لەشدا چەند سەنتیمێ مەتر لە دەوری مرۆڤدا دەبێ و وەکو لەش وایە قـەبارەی بـڕێ زیاترەو چەند مەترێ بەسەری دا دەخولێتەوە .

دوایی ئەم ڕەنگە دەگۆڕێ بۆ شین ، وردە وردە دەکشێ تاکو لەشی ئەتیر بگرێتـە خـۆی ، کە لەسەر لەشی مادديیەوە بەرز بۆتەوە ، کت و پڕ ژوورەکە پـڕ لـە ڕوونـاکی وەکـو کولکـە زێڕینـەی لێ دێ ، کـاتێ پـەرت بـوو ژوورەکـە پـڕ لـە ڕوونـاکی وەکـو کولکـە زێڕینەی لێ دێ ، کاتێ پەرت بوو ژوورەکە هالەو لەشی ئـەتیری لـەناودا بـزر دەبێـت ،

گیاندارانیش شێوەی هالەی خۆیان وەرگرتووە ، بەڵام لە پێك هاتندا كەمترەو لە هالەی منداڵی بچووك دەچێت .

(جوردن تیر نر) باس دەكات چۆن سۆراخی هالە دەكات لە شانە مێرووێكدا بۆ چەند كات ژمێرێ ، سەرەتا وەكو سەرە وزەیەك دەردەكەوێ ، دوایی لە شێوەی ڕەنگی قەنەفڵێ شانەكەدا دەگرێت ، زانایان لە ڕێگای كامێرای (كیرلیان) سەلماندوویانە دەنكە گەنم كاتێ گەشە دەكات و چەكەرە دەردەكات هالەیەك دەوری دەدات .

لەكۆنەوە مرۆڤ ئاشنایەتی لەگەڵ هالەدا هەبووە ، (میسرییەكان) بەر لە سەردەمی فیرعەونی ناسیویانە و بینیویانە دەوری مرۆڤی داوە .

هالە پەیوەندی هەیە بە چارەسەری ڕوحی یەوە ، لای زانایانی ڕوحانی جێگای گرنگە ، چونكە پەیوەستە بە دۆخی دروستی لەش و دەروونمانەوە ، بەهۆی شپرزەبوونی هالە لەكاتی هەندێ نەخۆشی دا، بابای شارەزا لە بواری ڕوحانی دەتوانێ بە بەكارهێنانی ڕۆشن بینی (الجلاء البصري) نەخۆشییەكە دەست نیشان بكات . چونكە هەندێ نەخۆشی لە لەشی ئەتیری دا دەست پێ دەكەن نەك لە لەشی ماددی دا .

(د.شقیقة كارا جولا) پسپۆری دەمارەكان لە ئەمریكادا چەند تاقی كردنەوەیەكی ئەنجامدا بینی هەندێ لەوانەی ڕۆشن بینی یان (الجلاء البصري) هەیە دەتوانن دۆخی تەندروستی نەخۆش دەست نیشان بكەن ، بەهۆی ئەو تیشكە وزەیەی چارەبەخش لە دەوری لەشی نەخۆشدا دەیبینێت.

(نوژدار جون بییراكوس) لە كیشوەری ئەمریكادا چەند بەراوردكارییەكی كرد لەنێوان دیاری كردنی پزیشكی خۆی و ئەكادیمیی و نێوان ئاماژە هزرییە لە ئاسانی بەدەرەكاندا ، كە مەشقی لەسەر دەكرد ، بینی برێ ڕۆشن بینی دەست كەوتووە دەتوانێ فرە چینەكانی هالە ببینێ لە دەوری لەشدا ، كە دۆخی جەستەیی و

سۆزایەتی و هزری نەخۆش دەداتەوە ، ئەم هالەیە لە دەوری لەشدا تیشکی ڕەنگاو ڕەنگ دەبەخشێ ، ئاماژە بە ناهاوسەنگی دەکات لەلەشدا.

(د.رائول فلیر) لە پەیمانگای نێودەوڵەتی میتافیزیك دا لە پاریس لە (٩-٥-١٩٢٦) دا ڕایگەیاند (هالە) لە یەك کاتدا ماددەیەو ماددەش نییە ، ڕووناکی و گەرمی و لەرزینی کەم و تەزووی کارەبایی و موگناتیسی هەیە ، هەندێ جار بۆنی خۆشی هەیە !.

(د.والتەر لیلسەر) کتێبەکی نووسیوە بەناوی (هالەی مرۆڤ – Human Aura) ئەو پزیشکی تیشکە، دەیسەلمێنێ تیشکی ڕوحی مرۆڤ ڕاستی یەکەو شێوەی کۆلکە زێڕینە وەردەگرێت ، دیسان (هاری بودنجتون) جێگری سەرۆکی یەکێتی زانایانی ڕوحی ئەهلی لە لەندەن دەزگایێ دروست دەکات بۆ دۆزینەوەی هالەو ڕەنگەکانی .

زانای روسی (سیمون کرلیان) لە شەستەکاندا لەگەڵ هاوڕێکەی دا (ڤالنتینا) دەزگایێ دروست دەکات وەکو کامێرا وێنەی هالە بگرێ ، ئێستا لە ڕوسیادا بۆ دیاری کردنی زۆرێ لە نەخۆشییەکانی دەروونی و ئەندامی بەکاردێت.

(د.فرانك پارانوسکی) زانای دەرکەوتووی زانکۆی ئەریزونا لە حەفتاکاندا گەیشتە ئەو زانیارییە، هالە دەوری لەشی ئەتیری داوەو تیشکدەرە ، سیفای مرۆڤ ڕەوشت و بیرکردەوەکانی دەخاتە ڕو ، بەشی کردنەوەی ڕەنگەکانی هالەکەو ئەستوورییەکەی .

وە ڕەنگی هالە نەك هەر نەخۆشی دەردەخات بەڵکو هەمووو ئەو ڕووداوانەی بەسەری دا هاتووە لەناوی دا تۆمار کراون و شوێن پەنجەی خۆیان بەجێ هێشتووە .

بێگومان پێغەمبەران و صدیقینەکان وێستگەی ئەو وزەیە بوون ، خۆرێك بوون لە جیهاندا ، خوداوەند پێغەمبەر ﷺ بەچرای درەخشان و خۆر ناوزەد دەکات ﴿ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴿٤٦﴾ ﴾ الأحزاب: ٤٦ ، خوداوەند دەری دەخات

بڕواداران له پەسڵاندا (ڕۆژی زیندووبوونەوە ) بەو ڕووناکی یە دەناسرێن : ﴿ يَوْمَ تَرَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَـٰنِهِم ﴾ الحديد: ١٢ .

**وە هالەی ڕوحی چەندان ئاستی هەیە :**

**ئاستی یەکەم** : ئاستی فیزیای ماددی یە ڕەنگی سوورە.

**ئاستی دووەم** : ئاستی ئەتیرە ڕەنگی شینە.

**ئاستی سێ یەم** : ئاستی سۆزەو هەندێ بە (النجمي) ناوی دەبەن ڕەنگی سەوزە .

**ئاستی چوارەم** : ئاستی هزرییە ڕەنگی زەردە.

ئاستی پێنجەم : ڕوحی یە ڕەنگی سپی یە یان بنەوشەیی یە.

**زۆر لە زانای تری ڕوحانی پێیان وایە (٧) ئاستە وەکو ژمارەی (chekras) ، کە پەیوەستن بە لەشی ئەتیرەوە وەك باسکرا ئەم حەوت وزانە لای سۆفییەکان بە حەوت لەتیفەکان ناسراون لە لەشدا: (ڕوح، سرِ، هالە ڕەنگەکانی جەوهەری مرۆڤ ئاشکرا دەکەن :**

**(١) هالەی سپی نیشانەی هاوسەنگی و دروستی یە .**

**(٢) هالەی ڕەش نیشانەی نەخۆشی و ئازارو کینەو ڕق و بێزارییە.**

**(٣) هالەی خۆڵەمێشی نیشانەی سەرەتای نەخۆشییە لە شوێنەکەدا و نیشانەی ئێرەیی و خودپەسندنی نەتوانینی بیرکردنەوەیە .**

**(٤) هالەی سور نیشانەی وزەی ئیجابی زیندەگی یە .**

**(٥) ڕەنگی شین ئاماژەیە بۆ ڕوحانی یەتی بەرزو زیندەگی .**

(٦) ڕەنگی وەنەوشەیی یە مامەڵەیە لەگەڵ ڕوحانی یەت و چارەی ڕوحی و غەیبی یەکان .

(٧) ڕەنگی پرتەقاڵی پرشنگدار نیشانەی ساغی و جنسی ساغە .

(٨) ڕەنگی زەرد ڕوحانی یەو مەردی و بیر پەیتی و زیرەکی یە .

(٩) ڕەنگی سەوز نیشانەی هزر و لەشی ساغە.

(١٠)ڕەنگی قەلەفنەیی ڕەوشتی بەرزەو تەقواو لەخوا ترسانە[١٩٢].

بێگومان خواپەرستی و بڕواو نوێژو تەقواو قورئان خوێندن و سەلەوات و پاڕانەوە و بیرکۆکردنەوە ئەم هالەیە بەهێزو پڕتەو دەکەن ، بەلاَم بێ بڕوایی و گوناە ڕەش و کزی دەکەن وەکو لە چەند ئایەت و فەرموودە باسکراوەو ، زانایانی ڕوحانیش پەییان بەمە بردووە : پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (الدعاء سلاح المؤمن ، وعماد الدين ونور السماوات والارض) رواه الحاكم / صحيح، واتە : دوعا چەکی بڕوادارە ، ستونی ئایینە ، ڕووناکی ئاسمانەکان و زەوییە.

(الصلاة نور المؤمن) رواه ابن عساكر ، واتە : نوێژ ڕووناکی بڕوادارە . (الصلاة على نور) رواه الدار قطني في الامزاد ، واتە : سەلەوات دان لەمن ڕووناکی یە .

قورئانی پیرۆز فەرموویەتی : ﴿رَبَّنَآ أَتۡمِمۡ لَنَا نُورَنَا﴾ التحريم: ٨ ، واتە : پەروەردگارمان ڕووناکی ئێمە تەواو بکە بۆمان.

﴿ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾ البقرة: ٢٥٧ ، واتە : خودا سەرپەرشتی بڕوادارانە لە تاریکییەکانەوە بەرەو ڕووناکی یان دەبات .

(السفير على عزت البحيرى) باسی زۆرێ لەو خاڵانەی کردووە کە هالە کزو لاواز دەکەن وەکو سیستەمی خۆراکی نادروست ، تەمبەڵی و سستی ، جگارە کێشان و

---

[١٩٢] بڕوانە (دراسات في العالم الروح / ل: ١٤٥-١٦٨/ بەکورت کردنەوە.

**خواردنـەوەی مـاددە کەهولییـەکان و سـرکەرەکان و هۆشـبەرەکان ، خـەم و خەفـەت و نەریتی خراپ ....[192]**

**(نورمان فنست بیل) دەڵێ : نوێـژ بـە سـاغی وزەیـەکی نائاسـایی بـەڕێ دەکـات ، ئێـوە وزەیـەکتان تێدایـە شـاری نیویـۆرك دەتـوانێ بکاتـە خۆڵـەمێش ، فیزیـای پێشـکەوتوو ئەوەمان پێ دەڵێت [194].**

**بێگومان هەمووو کارە نائاسیی یەکان بەهۆی هالە ڕوودەدات ، کە وزەو توانـای ڕوحـە لە مرۆڤدا .**

**میسرییەکان زۆر گرنگـی یـان بـە کـاری نائاسـایی و سـیحرو هالـە و تەڵـەسمات داوە . بۆیە خوداوەنـد چـەندان مـوعجیزە یـان پیشـان دەدات ، لەوانـە موسـا (علیـه السـلام) دەستی هالاوی خۆی دەردەخات ، تـا دەری بخـات ئـەو پێغەمبـەرەو نۆقیانووسـی وزەی ڕوحی یـە هالە بە سپی دەردەخات کە نیشانەی هاوسـەنگییە** ﴿ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ الأعراف: ١٠٨ **، موسا (علیـه السلام) هـەمووو موعجیزەکـانی بـە وزەی لە بن نەهاتووی ڕوحی دەکات ، کە لە قوڕئانـدا باسکراون .**

**لە کاتێکدا ئیمام عەلی (سەلامی خوای لەسەر) دەروازەی خەیبەر تـاو دەداتـێ ، کـە بـە حەوت کەس ناجولێ ، فەرمووی : (**والله ما قلعت باب خيبر بقوة جسدانية ، ولكن قلعتـه بقـوة ملكوتيـة ، ونفـس مضـيئة بنـور ربهـا**)[195]. ، واتـە : سـوێند بـە خـوا دەروازەی قـەڵای خەیبـەرم بـەهێزێکی جەسـتەیی دەرنـەهێنا ، بـەڵکو بـە توانایـەکی مەلەکوتی و دەروونێکی ڕووناك بە ڕووناکی پەروەردگار دەرم هێنا .**

[193] بروانة (دراسات في العالم الروح) / ل: ١٦٨.
[194] حروب العقل / روونالدم ماكري /ل:١٣٠.
[195] تفسير ابن عربى / ج١ ل:٣٠٧ /.

(ج.اج . رایـز) دەڵـێ : (پلازمـای لـەش : جیهـانی ڕواڵەتـەکان بەشـێکە لـە دیـاردەی هەڵوێستێکی حەقیقی ، ئەمەش بەسەر لەشی ماددی دا پیادە دەبێ ، بـەپێی سروشـت و پێك هاتەی ڕاستەقینەی ، ئاشکرایە ڕێکی تەواوی هێزەکان و کـار تـێ کـەرەکان کـە بۆ دروست کردنی وزە کار دەکەن ، چەند کاریگەرێکن بە تەواوی لەشدا بلاودەبنەوە ، هەندێ لەو کاریگەرییانە چەند دیاردەیەکی ئاسایی لە دونیای ماددەدا پەیدا دەکەن

لێرەدا دیاردەی تر هەیە زیندەو وزەی تری هەیە ، بـەجۆری تـرە بـە هەسـتە ئاسـایی یەکان پەی پێ نابرەرێ ، لەش وەکو قوزاغـە (شـرنقە) یـەك وایـە بـەردەوام کۆمـەڵێ وزە بـەڕەلا دەکـات ، ئـەو وزەیـەی لـە قوزاغەکـەوە دەردەچـێ دەکـرێ پێـی بگـوترێ (پلازمای لەش) ، کە زاراوەیەکی زانستی یە بۆ ئەو ماددەیە بەکاردێ پێك نەهاتووە .

ئەو وزەیەی لـەناو سیسـتەمی مـاددە دایـە دەکـرێ بـە هەسـتەکانی مـاددی بزانـرێن و بدۆزرێتەوە ، بەلام ئەو وزەیە نائاسـایی یـە بـەرزە بـە هەسـتە لـە ئاسـایی بـەدەرەکان (الخارقة) نەبێ ناتوانین هیچی لێ بزانین.

بینراوە لەش وێستگەیەکی کارەبایی موگناتیسی دەوری داوە ، لـەنزیك لەشـەوەیەو لێ ی دوورناکەوێتـەوە ، دەوری لەشـی هـەمووو زینـدەوەرانی داوە ، ئەوانـەی هەسـتی شەشەمیان هەیە توانیویانە هالـە لـە دەوری (٦) ئینـج لـە دەوری مرۆڤـدا ببینـن ، لـە تاقیگەکاندا هەندێ لەو هالانە دۆزراونەوە لە دەوری تاکەکاندا وەکو (والتـەر کیلتـەر) زانـای ئینگلیـز ، لـەماوەی چـەند ساڵێکدا بینـی سـەیر کـردن لەشاشـەی ڕەنگـەوە لـە مرۆڤـەکان پیشـانی دەدات هالەیـەکی ڕوونـاك دەوری داون ، دوایـی (ئوسـکار باکنـل) پسپۆڕ لە زیندەوەرزانی دا هەمان شتی بەدەست هێنا ، دوایی (سیمون کیرلیـان) بینـی وزەیەکی کارەبایی ڤۆڵتی یە بەرز دەوری زیندەوەرانی داوەو بـاری دەروونـی کەسـەکە کاردەکاتە سەر ڕەنگی هالەکە .

ئەزموونە زانستییەکانی گیریلیان دوای پشکنینی سەیریان پشکنی ، بینیان ئێش و ئازارەکان پەڵەی تۆخی ناساف لەدەوری لەشدا پەیدا دەکەن ، بە نەمانی ئازار پەڵەکان نامێنن ، هەر کەسێ تووشی نەخۆشی دەبێ هالەکەی نارێك دەبێت[196].

لە کۆنەوە چینییەکان دەرزی ئاژنینیان (ئوکینجر) یان بۆ نەخۆش بەکارهێناوە ، کە لەڕێگایەوە وزەی زیندەگی دەگوازرێتەوە بە جووڵەی یەکبینە لەگەڵ پلازمای لەشدا بەکرداری ئاڵۆز تێکەڵ دەبێ ، لەو ڕێگایەوە وزە بۆ لەش بڵاودەبێتەوە ، لە ڕێگای چەند خاڵێکی دیاری کراو لە لەشەوە ، نزیك لە پێستەوە .

ئیمام عەلی (ڕەزای خوای لێ بێ ) فەرموویەتی : (تعلموا القرآن فانه ربيع القلوب ، واستشفوا بنوره فانه شفاء الصدور)[197]. واتە : فێری قورئان ببن بەهاری دڵانە ، بە ڕووناکی و وزەی ئەو خۆتان چارە بکەن ئەو چارەی سینەکانە

## ئیعجازی ( ٣٤ ) مەسەلەی دەست وەشاندنی جنۆکەکان و شەیاتیینەکان بە هالەیان

بێگومان هێشتاش زۆربەی زانایان نکۆڵی لە دەست وەشاندنی جنۆکەکان دەکەن کە دەستی لە شێت کردن و بوورانەوەو فێداری مرۆڤدا هەبێت ، کەچی ئەم ڕاستییانە دەقیان لەسەرەو زانستی نوێش ئاماژەی بۆ هەبوونی کردووە .

ڤێ داری (الصرع) چی یە ؟

لە کتێبی (medicine) دا دەنووسێ : (ڤێ) تێك چوونێکی خولییە لە پیشەی دەماریدا ، لەگەڵ گۆڕان لە هۆشدا ، بە زۆری بەهۆی بە تاڵ بوونەوەی زۆری کارەبایی دەگمەن پەیدا دەبێت لە مێشکدا[198].

[196] عصر الخوارق /ل: ٨٣-٨٤.
[197] (١٠٠٠) حكمة لامام على (ع) / محمد علي دخيل / ل:١٧٩.

لێرەدا نۆژداری بێ ئاگایە لەوە کە ئەو کارەبایە زۆرەی لە مێشکدا پەیدا دەبێ هالەی موگناتیسی جنۆکەکان لەکاتی دەست بە وەشاندن بەدەستیان بۆ لەشی تووش هاتووەکە دەیگوازنەوەو سیستەمی دەمار تێك دەدەن و هالەکەی دەشێوێنن.

گەر بڕوانینە کتێبی (انشطار الذهن / بتر ماكير) زۆر پێناسە بۆ (دوانە کەسێتی) و (فرە کەسێتی) کراوە ، کە هەندێ جار بە ناوی تر ناوی دەبرێت ،وەکو کەرتەژیری ، یان شێتی ، یان شیزۆفرینیا ، کە لە هەمووو نەخۆشییە شێتییەکانی تر بەناوبانگترو بلاوترە ، (١٪) ی خەڵکی تووش دەبن ، وشەی شیزوفرینیا لەزمانی عەرەبی پێی دەگوترێ : (إنفصام الشخصية) [199].

ئەو کەسەی تووشی فرەکەسێتی دەبێ لە دوو کەس یان پتر خۆی دەبینێتەوە ، جار هەیە وەکو ناپلیۆنە لەماڵەوە کەچی لەسەر کار وەکو خزمەتکارێ مامەڵە دەکات .

(بیتر مالكير) دەنووسێ : (فرە کەسێتی دۆخێکی تازەنییە ، زۆر کۆنە ، هەر لەگەڵ بوونی بڕوابوون بە زاڵ بوونی ڕوحی شەیتانی بە سەر مرۆڤە کانداو نەخۆشی دەستکەوتن بە گورگ (الاستذاب) هەیە کە جۆرە شێتییەکە ، نەخۆش پێی وایە دەستی لە گورگێ داوە (lycanthripy) هەروەها لەگەڵ بوونی (شێتی کاتی دانایان) و ڕووداوە نائاساییەکان کە ئەو کەسەی تووشی فێ داری بووە بانگێشەی بۆ دەکات .

(زەردەشت) لە پەیامی خۆیدا دەڵێ : لێرەدا ململانێی بەردەوام هەیە لەنێوان هێزی چاکەو هێزی خراپدا ، هێزی چاکە لە ڕووناکی (هورمزدا) خۆی دەنوێنێ کە خوایە ، هێزی خراپ لە (ئەهریمەن) دا خۆی دەنوێنێ کە شەیتانەو پەیڕەوانیەتی ، دوعاو پاڕانەوەو یاد ، کە ئاوی پیرۆزی تێدا بەکاردێ بۆ شووشتنی ئەندامەکان ، کە بڕوا

---

[198] الدليل في الطب الباطني / د.عامر مطر/ د. عبدالرزاق السباعي / ل:١٦٠.

[199] هەیە پێی وایە (فرەکەسێتی) لە شیزوفرینیا جیایە پەیوەستە بە هستریاوە ، یان نەخۆشی دەمارییەوە (الامراض النفسية / د.مؤمن مبيض).

وایە هێزی شەڕ دەردەکات کە لە لەشدایە لە شانی ڕاستەوە بۆ شانی چەپ لەوێوە بۆ بن هەنگڵ و سنگ ، دوایی بەیەکجاری لە پەنجەکانی پێیەکانەوە دەردەکرێ .

(سلیطمان) ساڵی (١٩٤٨) لە کتێبی (مێژووی جادوو)دا (History of magic) دەڵێ: ئەم نەریتە لە زەردەشتیەتەوە بۆ مەسیحی یەت گوازراوەتەوە ، نمونە بە سەدەی (١٧) دێنێتەوە لە کۆشکی شادی فەرەنسیدا ، کە (بیلزبب) ڕوحی چەپەڵ لە ڕێگای دەمەوە لە ژنێك دەردەکات کە دەسەڵاتی بەسەر ڕوحی ئەودا گرتووە . دوعایەکی بەسەردا دەخوێنێ لە شێوەی مێشێك دەردەچێ ، بوونی شەیتان و رووحی شەیتانی گریمانەیەکی زۆر کۆنە ، چوونە ناو لەش لەلایەن ڕوحە چەپەڵەکانەوەو خوێندنی دوعا لە زۆربەی ئایینە بلاوەکاندا هەیە ، دەبینین چۆن شەیتان توانیویەتی (ئوزیریس) لە میسری کۆندا لەناو ببات ، لە کەلەپووری (بوذی) د دەبینین چۆن لەلایەن (مارا) وە هەوڵ دەدرێ لە خشتە ببرێ ، لە مەسیحی یەت دەبینین چۆن شەیتان (satan) هەوڵ دەدات مەسیح فریو بدات ، چۆن هەوڵ دەدەن بە دوعای ڕوحی پیس دەربکەن ، لە قورئاندا باس لە (ئیبلیس) کراوەو دەیخوێنینەوە ، کە هەمان کۆپی یە لە ئایینی ئیسلامدا .

(ئێکلمان) (Eickleman) ساڵی (١٩٦٨) بلاوی کردەوە ئیسلام نکوڵی لە ڕوودانی شتی نائاسایی ناکات ، مەسیحیەتیش دان بەمەدا دێنێ ، مەسیحی کاتولیك و بروتیستانت بڕوایان بە بوونی ئەرواحی چەپەڵ هەیە لەناو لاشەکاندا)[٢٠٠].

بێگومان تەواوی ئایینە ئاسمانییەکان لە زەردەشتی و جولەکەو مەسیحی و ئیسلام بڕوایان بە ڕوحی چەپەڵ هەیە ، کە وەسوەسەو زیان بۆ سەر مرۆڤ ڕەوانە دەکات ﴿ ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ۝٥ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ۝٦ ﴾ الناس: ٥ ـ ٦ ﴿كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ﴾ البقرة: ٢٧٥ .

---

[٢٠٠] انشطار الذهن / بيتر مالكير /ت:د.حلمي نجم /ل:٧١-٧٢.

بۆ نمونـه : ڕوحـی چەپەڵ زیـان بـۆ (ئـەیـیوب) دروست دەکـات ﴿ وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَآ أَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِنُصۡبٖ وَعَذَابٍ ﴿٤١﴾ ﴾ ص: ٤١ ، واتــه : یــادی بەنــدەی خۆمان ئەیـیوب بکە کاتێ لەپەروەردگاری پاڕایەوە من شەیتان تووشی مانـدووبوون و ئازاری کردووم.

خوای گەورە وەڵامی دوعای داوە بۆ چارەسەرکردنی ئەم ئـازارو زیانـە شـەیتانی یـە و فەرمووی : ﴿ ٱرۡكُضۡ بِرِجۡلِكَۖ هَٰذَا مُغۡتَسَلُۢ بَارِدٞ وَشَرَابٞ ﴿٤٢﴾ ﴾ ص: ٤٢ ، واتە : پـێ بـدە بـە زەویدا ئەوە کانیاوێکی ساردو کەللە تەزێنە بۆ خۆ شووشتن و خواردنەوە .

بەم شێوەیە ژیان دوو سیستەمی هەیە وەکو دکتۆر (جاکس) لە کتێبی (ماهی الحیـاة) دا دەنووسێ : ژیان دوو سیستەمی هەیە ، ئەو سیستەمەی لە شی ماددی پێك دێنێت ، ئـەو سیسـتەمەی لەشـی ڕوحـی پێـك دێنـێ ، یـان نـاخی (الـذري) ، توخمـەکانی سیستەمی دووەم کۆ ئەکاتەوە کۆپی ییەکی لەشی نـا مـاددی پێك دێنێ ، کە لەگەڵ لەشی ئەتیر دا گونجاو بێت)[201].

گەر بڕوانینە کتێبی (الطب البدیل / بیل غوتلیب) بـاس لـە چارەکردن دەکـات بـە (ئـاو) کـە قورئـان پێشـنیازی (ئـەیـیوب) ی دەکـات بـۆ چـارەکردنی نەخۆشـی خـۆی ، سـەرباری ئـەوەی لـە ئیسلامدا (غوسل) و (دەست نوێـژ) بەشـێکن لەچارەسـەرو خـۆ پاراستن لە میکرۆب و پیسی و ئیحای شەیتان و ئازاری دەروونی و جەستەیی .

(د.بیل) دەڵێ : (ئاو کە هێمای کیمیـایی ($H_2O$) یـە ، خـوای گـەورە هـەمووو شـتێکی زینـدوووی لـەو دروسـت کـردووە ، گـەردەکانی بەشـداری هـەمووو لایەنـەکانی ژیـانی کردووە ، تا دژوارە بە لامانەوە وەکو دەرمانێکی ئیعجازی سەیری بکـەین ، کـە توانـای خوای گەورەی تێدا دەردەکـەوێت ، بـەڵام لـە زۆر بـاری نەخۆشـی و ئـازاردا پـەنای بـۆ دەبەین ، یەکەم وەڵامی غـەریزەیی کـە پـەنای بـۆ دەبـەین بـۆ چـارەکردن ، ئاوە ، تـۆ

[201] الارواح والاشباح / ل:٤٩.

هەمووو جارێ بە نەرم کردنەوەی مەچەکت هەڵدەستی کە تووشی خواربوونەوە دەبێ پەنا بۆ ئاو کوت (کمادة) دەبەیت لە بەفر، یان کاتێ دەستت دەسوتێ پەنا بۆ ئەوە دەبەی پەنا ببەیە بەر تەزووی ئاوی سارد ، تۆ بەم هۆیە پەنا بۆ چارەکردن بە ئاو دەبەی ، کە هونەرێکی چارەسەری کۆنەو بێ ترسەو ئازاری نییەو پەنا بۆ شتێکی نائاسایی نابەی ، جگە لەو ئاوەی لە بۆڕی گەرماوەکەت دێتە دەرەوە .

چارەکردن بە ئاو (ئەبقرات) بەکاری هێناوە لە سەدەی چواری زاینی دا ، کە بەشێك بووە لە نەریتی چارەکردن لە تەواوی شارستانییەکاندا ، لە میسری کۆنەوە تا یۆنانی کۆن و ڕۆمای دێرین ، کە بە زۆری نوژداری لە گەرماوە گشتییەکاندا بەکارهاتووە .

لە چاخی نوێ لە ئەمسادا لە سەدەی (١٩) دا ئاو بۆ چارەکردن لەلایەن (فینسنت بریستنز) دا بەکار هات ، بە باوکی بزوتنەوەی چارەکردن بەئاودا دادەنرێ . دەنووسێ : (لە کۆتایی سەدەی (١٩) دا (د.جون هارفی کیلوج) یەکێ بوو لە ناودارترین نوژدارانی ئەو سەردەمە لە (باتك كريك) لە ویلایەتی (میضیضان) هەڵسا بە بەکارهێنانی ئاو لە نەخۆش خانەی خۆی دا بۆ لابردنی ئازارو دۆخی تەنینەوە (العدوی) ی ترسناك وەکو هەوی سی ، لەو چاخەدا چارەکردنی (تیفۆئید) و هەوی سی (الالتهاب الرئوي) بە ئاو باو بووە ، لە سەدەی بیستەمدا نەخۆشخانە دێرینەکان لە (ئەمریکا)دا ئاو بۆ چارەکردنی نەخۆشی هزری و باری پزیشکی و برینسازی گشتی بەکاردێت).

(ئێستاش لە ئەمریکادا لە زانکۆی (نوچی باینز)دا کە مەڵبەندی چارەکردنی سروشتی یە لە شاری (سیل) لە ویلایەتی (ئەلاباما) دا چارەسەری بە ئاو بەکاردێنرێت ، ئەم پەیمانگایە (١٩٧٠) لەسەر دەستی (د.ئەجاتا تراش/پسپۆڕ لەباتولوجیای پزیشکی) و ژنەکەی (نوژداری هەناو) دا دەمەزرێ ، یارمەتی نەخۆش دەدەن بە بەکارهێنانی چارەسەری ئاو و وەرزش و ڕاست کردنەوەی خۆراك و چارەسەری تری ئاسان لەش ساغی بۆ نەخۆشانیان بگێڕنەوە).

دیسان دەڵێ : ئاو گرنگە بۆ یارمەتی دانی هەرس ...)٢٠٢.

بێگومان جنۆکە کە لە (بڵێسەی ئاگر) ی ئـەتیر دروست کـراون ﴿ وَٱلۡجَآنَّ خَلَقۡنَٰهُ مِن قَبۡلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ ﴾ الحجر: ٢٧ ، وەکوو تیشکی ئـێکس دەتـوانن بڕۆنـە نـاو لەشـی مرۆڤە فێدارەوە (المصروع)، (عبدالله) کوڕی (احمد) دەڵـێ : بـە بـاوکم گـوت : هەنـدێ کـەس پێیـان وایـە جنۆکـە ناچـنە نـاو لەشـی مرۆڤـەوە ؟ وتـی : کـوڕم ڕاسـت ناکـەن ، ئەوەتا فلان لەسەر زمانی ئەو قسە دەکات .

(الدار قطنـي) لە (ابن عباس) گێڕاویەوە چۆن ژنی کوڕی دێنێتە خزمـەت پێغەمبـەر ﷺ پێـی دەڵـێ : شـێتی هەیـەو لـەکاتی نـان خـواردنی بـەیانی و ئێـوارە دەیگـرێ ، پێغەمبەر ﷺ دەستی لەسەر سەر دادەنێ و دوعای بۆ دەکات و ئەویش لەلەشی دێتـە دەر وەکو توتکە سەگی ڕەش)٢٠٣.

دیسان زۆرێ لە نوژدارانی خۆرئاوا فێداری جنۆکەیی و دەرکردنی جنۆکـەیان قبوڵە ، کتێبـی (موقـف الاسـلام مـن تنشـئة الطفـل/ سـعد ابـراهيم طـايل الـديهي) نمونـەی زۆری تێدایە ، وەکوو (کـار نجـۆن) ئەنـدامی کۆمەڵـەی دەروونـی ئـەمریکی لـە کتێبـی (المس) دا دەڵێ : (باری دەست وەشاندن واقیعی یـە زانسـت پشـتگوێ ی ناخـات ، مـادام زۆر ڕاستی سەیر هەبێ پاڵپشتی بکات).

(بـل) لـە کتێبـی (تحليـل الحـالات غيـر العاديـة فـي عـلاج العقـول المريضـة)دا دەنووسێ : (زۆر بەڵگەمان لایە پێویستە دەمامکی لەسەر لابرێ ، بەتایبەتی شـێتی و دەست وەشاندنی ڕوحی (المس الروحی) کە هۆکارێکە بـۆ نـەخۆشـییە دەروونییـەکان و دەمارییەکان).

---

٢٠٢ بڕوانە (الطب البديل/ د.بيل غوتليب/ل:٨٠).

٢٠٣ (الشفاء بالقران الكريم / د:محمد مهدي/ج٣) سەیر بکە.

(د.جیمس هایسلوب) لە کتێبی (المس) دا دەڵێ : (ئەو کاریگەرییەکی نائاسایی یە کەسایەتی یەکی هۆشیاری دەرەکی کاری پێ دەکاتە سەر هزری کەسێك و جەستەکەی ناتوانرێ نکۆڵی دەست وەشاندن (المس) بکرێت).

(کارل دیکلاند) دەڵێ : (شێتی دروست دەبێ لە زاڵ بوونی ڕوحی پیس بەسەر کەسی نەخۆشدا، تێك چوون لە (لەرەلەرەکانی – الاهتزازات) دا پەیدا دەکات بەکارەبای ئیستاتیکی لەرەکانی ڕێك دەخرێن ، کەسایەتی یە چەپەڵەکە دەردەکرێ کە خۆی زاڵ کردووە ، پاشان هزر بۆ باری ئاسایی دەگەڕێتەوە).

(د.باورز) مامۆستای نەخۆشییە دەمارییەکان لە زانکۆی (مینابولیس) لە ئەمریکا باس دەکات لەسەردەمی لاوی دا گاڵتەی بەو شتانە هاتووە کە ڕوحی شاراوە دەڕواتە لەشەوە ، بەلأم ئیمڕۆ لەم ڕاستی یە گومانی نییە .

برینسازی گەورە (توماز دیلیز) پێی وایە چارەکردن بە ئازاردانی نەخۆش و زنجیر کردنی دەبێ ، (ریل) دکتۆرو پسپۆڕی ئەڵمانی لە نەخۆشی هزری دا باس دەکات چارە کردن ئازار دانە بەبێ زیان گەیاندن)[٢٠٤].

بێگومان قورئان و دوعاو پاڕانەوە باشترین چارەیە بۆ نەخۆشی و وەسوەسەی ڕوحی چەپەڵ و دەرکردنی و لابردنی نیحاکانی و گێڕانەوەی (هالە) بۆ دۆخی خۆی و بارگە کردنەوەی .

**ئیعجازی ٣٥ : ( چاوی موگناتیسی و چاوەزار ) :**

﴿ وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَٰرِهِمْ ﴾ القلم: ٥١ ، واتە : نزیکە ئەوانەی بێ بڕوان بەچاوەکانیان لەناوت بەرن.

---

[٢٠٤] موقف الاسلام من تنشئة الطفل / سعد ابراهيم طايل الديهي / ل:٢٨٠.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (العين حق ، ولو كان شيء سابق القدر سبقته العين ، واذا استغسلتم فاغسلوا) رواه مسلم . واتە : چاوەزار ڕاستە ، گەر شتێ پێش چارەنووس و قەدەر کەوتبایە چاوەزار پێشی دەکەوت ، گەر داوای خۆ شوشتن لێتان کرا خۆتان بشۆن .

(العين تدخل الرجل القبر ، وتدخل الجمل القدر) رواه السعيدى في الكامل ، واتە : چاوەزار پیاو دەخاتە ناو گۆڕ وشتر دەخاتە ناو مەنجەڵ.

یەك لەو ئەندامانەی (هالەی موگناتیسی) لێوە دەردەچێ چاوە ، هەندێ کەس بە سروشتی ئەو هێزەیان زۆرە، هەندێ کەس بە ڕاهێنانی چاوی موگناتیسی بەدەستی دێنن و دەتوانن کاربکەنە سەر خەڵکی .

(ولیەم فالکیر ئەتکینسون) دەڵێ : (سەیر کردن بە یەك کەرەت باشترین هۆکارە بۆ کار کردنە سەر کەسانی تر ، ئەوە تەنیا بۆ ئاگادار کردنەوە بەکار ناهێنی بۆ دوان لەگەڵ قسە کەراندا لەگەڵتدا کە بەوە بە ئاسانی ئیحا بۆ کەسی تر بنێری ، بەڵکو هاوکات ویستی خۆت بەسەر ویستی کەسی تردا زاڵ دەکەیت .

ئەو کەسەی تێ گەیشتووەو پێشەسەری ڕەسەدی ڕوحی بەدەستە (بەسەیرکردنی) چەکێکی بەهێز پێك دێنێت ، ئەو لەرەی بەهێز بۆ بیری هاوڕێیەکەی ڕەوانە دەکات ، کە لە بەرامبەریەتی و لێ ی نزیکە ، گومانی تێدا نیە ئێوە گوێ بیستی چاوی پیس بوون ، کە کار دەکاتە سەر مرۆڤ و دڕندەکان ، زۆر لەوە دوور نییە کە سانێکتان بینیبێ بە یەك سەیر کردن کەسانی تریان تووشی بەلآ کردووە ، یان چاوی تیژی بەرگە گرتنی نەکراوە)[205] .

بێگومان ئەو کەسەی دەیەوێ فێری وەرزشی (یۆگا) ببێ یان ڕامان (التأمل) ، یان (هیپۆتیز) ، یان نوێژو یادی بە ڕامانەوە دەبێ ڕاهێنانی چاوی موگناتیسی بکات ، تا

[205] قوة الفكر في الحياة العملية / ل:٤٥.

بتوانێ کار بکاتە سەر کەسانی تر ، (وتاربێژ) گەر چاوی موگناتیسی بەهێز بێ چاکتر دەتوانێ کار بکاتە سەر خەڵك ، سەرکردە بەهەمان شێوە ، ئەوانەی تیشکی هالەیان بەهێزە لە جیاتی (چاوەزار) و زیان گەیاندن لە خەڵکی دەتوانرێ بۆ چاك کردنەوەی نەخۆشان سوود لە تیشکەکەی وەربگیرێت ، بەدەست هێنان و سەیر کردنی ئەو ئەندامانەی ئازاریان هەیە لە کەسانی تر دا یان لەشی خۆیاندا ئەو ئازارانە لا ببەن ، چونکە چاو و دەست (هالە) بۆ شوێنەکە دەگوازنەوە ، کە تووشی ئازار بووەو بارگاوی دەکەنەوە چالاکی بۆ دەگێڕنەوە .

(هنری کرایس) نمونەی زۆر لەسەر شیفا بەخشانی ڕوسی دێنێتەوە ، کە چاو پێ کەوتنی لەگەڵدا کردوون و بەو هێزە ڕوحییە ، چۆن توانیویانە نەخۆشی و ئازاری زۆر لا ببەن . نمونە : (بوریس ئەرمولاجیف) بەهەوادا بەو هالەیە مەلە دەکات و دەتوانێ مرۆڤ و تەنی تر بەرز بکاتەوە .

(پرۆفیسۆر بوشکین) بڕوای وایە ئەو هێزەی ئەو کە دەستی ئەرمولاجیف دروستی دەکات کارەبای ئیستاتیکی نییە ، بەڵکو کاریگەرییەکی لە ئاسایی بەدەرە .

(نینل سیرجیفنا) بە چاوی تیژی سەر ئێشەو گورچیلەی هەوکردوو چاك دەکاتەوە ، دواتر نمونەی زۆرتر دەبینین لەباسی خۆیاندا وەکو (تلەپاتی) و (چارەبەخشی) و (سایکۆکینیز) ...هتد . (دواتر زیاتر باسی دەکەین).

**٣٦- پرسيارت لێ دەکەن دەربارەی ڕوح؟**

**٣٧- بەرگە ئەتيرييەکان لەدەوری ڕوحدا؟**

**٣٨- ناوچەکانی وزەی ڕوحی لە مرۆڤدا؟**

**٣٩- هەڵچوونی ڕوح و گەيشتن بە مەقامی کەماڵی و فەنابوون؟**

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى ﴾ الإسراء: ٨٥ ، واتە : لەبارەی ڕوح پرسيارت لێ دەکەن ؟ بڵێ : ڕوح فەرمانێکی کردگاری منە .

(العلامة الراغب) لە (المفردات)دا دەڵێ : (من أمره) (أي : من ابداعه) ، واتە : يەکێکە لە داهێنراوەکانی پەروەردگاری من .

ديسان قورئان ئاماژە بەزۆر پێك هاتەی ڕوحی تر دەکات وەکو (دڵ – القلب) و دەروون (النفس) و هزر (عەقڵ) وە دەروون دەکات بە سێ بەشەوە (النفس المطمئنة) و (النفس السوء) و (النفس اللوامة) ، ديسان لە قورئاندا جياوازی کراوە لە نێوان لەش و گيان و دەروون و دڵ و هزر (العقل) دا .

هەمی سان لە ڕوانگەی عيرفانيەوە مرۆڤ (٥-٧) لە تيفەی ڕوحی هەيەو شوێنەکانيان دياری کراون لە لەشدا ، لە تەريقەتی (نەقشی) لەتيفەکان پێنج دانەيە (السر ، الخفي ، القلب ، الروح ، الاخفى ، النفس) ، بەڵام لای (ابن عربی) (٧) دانەيە ،لای (يۆگايی يەکان) ناوچەکانی وزەی بايۆلۆجی لە مرۆڤدا بە (٧) مەڵبەند دياری کراون ، ڕەنگەکانی هالە (٧) ڕەنگە ، وەکوو باسکرا .

(السفير عزت على البحيري) دەنووسێ : (زانايان گەيشتوونە ئەم ئاستەی مرۆڤ لە ڕوح و هزرو لەش پێك دێت ، ڕوح زاڵە بەسەر هزردا ، هزريش زاڵە بەسەر لەشدا ، ڕوح ڕاستەوخۆ پەيوەندی بە کردگاری بوونەوەردوە دەکات ، دەزگای وەرگرە

(الاستقبال) و زانیاری و دووربینی له خوای گەورە وەردەگرێ ، دیسان دۆزیویانەوە (گیان) وەکو (ڕووناکی) لەناو لەشدایە.

کاتێ ئەو ڕووناکییە دەدرەوشێتەوە ئەوە ئاماژەیە بۆ لێوان لێوی بڕواو خۆشەویستی ، ئەوە ئەو وزەیە ژیان و توانست دەدات ، کاتێ گیان بە کردەوە بەدەکانی مرۆڤ لاواز دەبێت ئەو ڕووناکی یە کزو بێ شەوق دەبێت ، ئینجا مرۆڤ دووچاری نەخۆشی و دەرد دەبێ ، بەکاری باش و یارمەتی دانی خەڵکی دەگەڕێتەوە ، دیسان زانایانی ڕوحی سەلماندوویانە ڕوح توانای لە ئاسایی بەدەری هەیە ، ڕوح هەستی شەشەمی پەی پێ بردنی هەیە ، کە خوای گەورە دەیبەخشێ بەوانەی توانای تایبەتییان هەیە و دەتوانن سنووری زەمان و شوێن ببەزێنن ، ئەوانە بە خاوەن توانای ڕۆشن بینی (الجلاء البصري) و ڕۆشن بیستن (الجلاء السمعي) و ڕۆشن بۆنی (الجلاء الشمي) و توانای تر دەناسرێن.

جووڵەی (ڕوح) ی سەرکەوتوو مل بۆ چەند سنوورێکی دیاری کراو کەچ ناکات ، چونکە لە دونیای ڕوحدا سنووری نییە بۆ کات ، کە دەتوانرێ بە خێرایی بیر کردنەوە کوێ ی دونیای زەوی مەبەست بێ بۆی بگەڕێ ، بەلام ڕوحی تر ئەم توانایەیان نییە .

حەقیقەتی مرۆڤ گیانە ، کە نامرێ ، لە زەویدا لەشی ماددی بەکاردێنێ بۆ بەدەست هێنانی ئەزموون و توێشوو پەیدا کردن بۆ ژیانی ئەبەدی باشتر لە دونیای گیاندا .

هەندێ پێیان وایە (ڕوح) کێشەکەی (١٤-١٠٠ گم) ، بەلام (کرۆکس) دوای چەند ئەزموونێ لەسەر مرۆڤ و گیانداران بۆی دەرکەوت کێشەکەی (١٧٪) ی میللیگرامە.

(د.علی عبدالجلیل الراضي) لە کتێبی (جیهانی نادیار – الالعالم غیر المنظور) دا دەنووسێ : ڕای نوێ ی زانایانی خۆرئاوا لەسەر ئەوەی دا دەمەزرێ مرۆڤ زۆر لەوەی ئاڵۆزترە ڕابردوو بۆی چوون ، مرۆڤ لە ڕوح پێك دێ ، کە دەروونی هەیە ، ئەو

دەروونە چەند پەیکەرێکی هەیە دەیکاتە بەر تا لەسەر شێوەیان خۆی دەربخات ، ئەو پەیکەرو پێك هاتانە لە چڕی دا چوون یەك نین و لەرەیان جیاوازە ، لەشی زەمینی زۆرترین چڕی و کەمترین لەرەی هەیە ، یەکێکە لە (٧) لەشەکان هەر کام لەوانە لە ئاستی وەکو خۆی دا نەبێت ناتوانێ هەڵ بکات ، واتە : دەبێ ئاستی ئەتیری خۆی هەبێ هاوشێوەی خۆی بێ ، ڕوح یەکێکە لەو حەوت بەرگانە ، بەشێکە لە ڕووناکی پیرۆن لەناو چرایەکدا دانراوە ، ئەو چرایە حەوت شوشە دەوری داوە ، هەریەکەیان بەشە ڕووناکی خۆی وەردەگرێ ، ئەمە فەلسەفەی سۆفیەکان و یوگایی یەکانە .

دیسان پێی وایە : مرۆڤ حەوت بەرگی هەیە لەناو یەکدان ڕوحی بنەڕەتی دادەپۆشن ، تا مرۆڤ هەڵبچێ لە ئاستی نزمەوە بۆ ئاستی بەرزتر دەڕوات ، ئەو (٧) ئاستە لە فەلسەفەی یۆگایی دا ، کە خاوەنەکەی (یوگی راما کاراکا) یە ئەوانەن :

(١) لەشی زەمینی (فیزیایی) .
(٢) لەشی ئەتیری.
(٣) توانای زیندەگی (الحیویە) .
(٤) هزری غەریزی (العقل).
(٥) ئیلهام و ئیحا.
(٦) هزر (عەقڵ) ی ڕوحی .
(٧) ڕوح (گیان) .[٢٠٦]

بێگومان هەندێ لە ڕۆحانیەکان پێ یان وایە بەهەشت (٧) ئاستە ، یان حەوت ئاسمانەکان کە (٧) بە هەشتیان لەناودایە هەر کاتێ مرۆڤی خواناس یەکێکیان دەبڕێ یەکێ لەو بەرگانە فڕێ دەدات تا لەدوا قۆناغدا ڕوح دەهێنێتەوەو دەگاتە مەقامی فەنابوون لە ئەوینی خوادا .

---

[٢٠٦] دراسات في العالم الروح / ل: (٤٨-٥٠).

**لەشی ئەتیری چییە ؟**

لە فەرموودەدا بە (طير خضر) ناوی هاتووە وەکو باسکرا ، دیسان لە قورئاندا مردن بە لابردنی بەرگی ماددی لە بەرگی ئەتیر ناوزەد کراوە : ، (غطاء) وشەیەکی زانستی یە ئاماژەیە بۆ بەرگی ماددی .

پێغەمبەر ﷺ ئاماژە بەم لەشەیە دەکات کە دوای مردن جیا دەبێتەوەو لەکاتی خەوتندا دەتوانین ببینین ، کەوەکو شێوەی لەشی فیزیایی خۆمانە : (من رانـي فقـ راني) رواه البخاري ، واتە : کێ منی لە خەوندا بینی ئەوە خۆمم.

بێگومان مرۆڤ هەبوونی لە ژیاندا بێ مەبەست نیە ، مرۆڤ بۆ ژیانی ئەبەدی و جاویدانی دروست کراوە ، مردن لەو دونیایەدا لەدایك بوونێکی ترە لە دونیای ئەو دیودا .

بوونی مرۆڤ ئامانجێکی دیاری کراوی هەیە ، چونکە مرۆڤ بێ ئەوەی پرسی پێ بکرێ دێتە دونیاوە ، بێ ئەوەی پرسی پێ بکرێت دەمرێت ، ناچێتە عەقڵەوە هەمووو خانەو ئەندامەکانی مرۆڤ ئەرکێکی تایبەتیان پێ سپێردراوە ، کۆئەندامی هەرس و کۆئەندامی هەناسەو کۆئەندامی دەمارو کۆئەندامی ئێسقان و ماسولکەکان و کۆئەندامی هەستەکان و کۆئەندامی سوڕی خوێن ، هەموو ئەوانە ئامانجێکی دیاری کراویان هەیە ، چۆن لۆژیکی دەبێ لە پشت پەردەی بوونی مرۆڤەوە ئامانج و فەلسەفەیێکی ژیرانە نەبێت ، لۆژیکی نییە لەم هێنان و بردنەی مرۆڤ ئامانجێ نەبێ و ڕێکەوتێکی هەڕەمەکی و ناژیرانە بێت .

ئیسلام و زانستی ئەزموونی ڕوحانی سەلماندوویانە ئامانج لەو هێنان و بردنەی مرۆڤ بەرەو ژوور بردنی مرۆڤە بەرەو کەماڵ وەکو قورئان دەفەرمووێ : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ ٦ ﴾ الانشقاق: ٦ ، بەلام پێ هەلاچوون بەرەو کەماڵ و هەراش بوون لەژێر زەبرو تۆبزی کاری دا نایێتە دی ، بەلکو بە هۆی

(ویستی کاریگەر) دەبێ ، ئەوسا مرۆڤ دەبێ لە جوولەی دا بەرەو سەر بڕوات دەبێ هەڵکشێ و پێ هەڵا بچێ (لا اكراه في الدين قد تبين الرشد من الغي) ، بەڵام ئەو کەسەی قایل نەبێ پێ هەڵا بچێ ، بە پێچەوانەوە ڕۆددکەوێ و دادەبەزێ و پێچەوانەی ئاراستەی پێ هەڵاچوون دەڕوات و لەشی ئەتیری ڕەش دەبێ و بەرەو ئاستەکانی دۆزەخ لە دەوری زەوی فیزیایی دا دەڕوات (ان الله لا يغير ما بقوم حتى يغيروا ما بانفسهم) ، بێگومان مرۆڤ پێویستە شۆڕش بەسەر خۆیدا بکات وەکو نووسەری مەزن (د.علی شەریعەتی) لە کتێبی (گەڕانەوە بۆ خود) باسی کردووە .

ئیمام عەلی (سەلامی خوای لەسەر بێ) فەرموویەتی : (تۆ پێت وایە تۆ تەنێکی بچووکی کەچی جیهانی گەورە لە تۆدایە) ، ئاساییە ئەو کەسەی لە سروشتدا خودویستی (حب الذات) زاتی خۆی بناسێ و بە کەماڵەکانی خۆی ئاشنا ببێ ڕێگای دۆزینەوەی پێ هەڵابردونیان پەی پێ ببات ، لە ڕێگای قورئان و سوننەت و عیرفان و فەلسەفەو زانستی ڕوحییەوە ، تەواوی ئایینە ئاسمانییەکان کاریان بۆ ئەوە کردووە مرۆڤ خۆی و گەردوون و کردگاریان بناسێ ، قورئان فەرموویەتی : ﴿ وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِي أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الذاريات: ٢٠ – ٢١ ، لە کتێبی (غرر الحكم) دا هاتووە (معرفه النفس انفع المعارف) واتە : خودناسی بەسوودترینی زانستەکانە.

کتێبی (معارج القدس/ ابي حامد الغزالي) زۆر بەسوودە بۆ خود ناسی ، مرۆڤ لەدیدەگای خوێندنەوەی کتێبە عیرفانیەکان و ڕوحانیەکانەوە تێ دەگات (کە چاوگیان لە قورئان و سوننەتەوەیە) مرۆڤ کۆمەڵێ ئامادەباشی و توانای تێدا هەیە زەمینە بۆ بەرەو کەماڵ بردنی مرۆڤ خۆش دەکەن ، پێویستە مرۆڤ سوود لەو تواناو وزانە وەربگرێ و بزانێ چۆن بەکاریان دێنێ بۆ گەیشتن بە کەماڵ و خۆ دەربازکردن لە پەستی و گەڕانەوە بۆ خوارەوە .

﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ ثُمَّ رَدَدْنَٰهُ أَسْفَلَ سَٰفِلِينَ ﴿٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٦﴾ ﴾ التين: ٤ – ٦ ، واته : مرۆڤمان له جوانترین شێوەدا دروست کردووه ، پاشان بەرەو نزمترین شێوەمان بردووه ، ئەوانه نەبێ بڕوایان هێناوەو کاری باشیان کردووه ، ئەوانه پاداشتێکی نەبڕاوەیان هەیه .

بێگومان یەکێ له بەرگه نامادییەکان لەشی ئەتیره ، کە مرۆڤ دوای مردن هەڵی گرتووه .

(السفير علي عزت البحيري) دەڵێ : (ئەم لەشه ، لەشێکی ناسکەو جیرە ، تا ئاستێ هزرمان بڕی ناکات ، ئەم لەشه ئەتیرە دەوری لەشی ماددی داوه ، چوار دوری هەیەو سەر بە دونیای ڕوحی یه ، پاشان له توانای دایه خۆی دەربخات و خۆی ون بکات بەپێی باری (زاکیرە) ئەمه ڕوودەدات ، تاو و توێ کردنی (لەشی ئەتیری نەبینراو) بەردی بناغەی زانستی ڕوحی تازەیەو گرنگترینی باسەکانیەتی ، ئەو لەشه له (هالەی موگناتیسی) جیایه ، کە باسمان کردو وتمان بریتییه له کۆمەڵێ تیشکێ لە وێستگەیەکی بایۆلۆجی مرۆڤەوە بەردەوام دەردەچێت .

(لەشی ئەتیر) کە بەشی ڕوحی هەیه وەك باسکرا ناتوانرێ بە هەستی ماددی ببینرێ ، چونکه لەرەی له لەرەی جیهانی ماددی پتره ، کە (٣٠٠.٠٠٠) کم/چ ، ئەم ناوچەیه گەردن کەچی هەستەکانمانە ، دیسان ئەو نەمرەو لەناو ناچێت .

وە لەشی ئەتیری هاوتای لەشی ماددییە ، هەمووو شتێ لەشی ئەتیری هەیە وەك بالای خۆیەتی ، گیانداران و ڕووەك دەگرێتەوە وەکو گوڵ و درەخت و مێرووەکان ، بەڵکو تەنانەت بێ گیانەکانیش ، زانای فیزیایی بەریتانی گەورە (سێر ئولیفەر لودج) ئەو ڕاستی یەی دۆزییەوەو ڕای گەیاند تەنی ڕەق هاوتای ئەتیری هەیە گەردیلەکانی پێکەوە دەبەستێتەوە .

لەشــی ئــەتیری لەگــەڵ لەشــی مــاددی دا گەشــە دەکــات ، هــەر لەگــەڵ گەشــەکردنی کۆرپەلەدا لەسکی دایکی دا [٢٠٧].

(لەشی ئەتیر وەکو بوونی ئاوی تەڕ لە قەدی درەختدا، بوونی هەیە و هەمان بۆشایی پڕ دەکات لەسەر بناغەی جیاوازی لەرەلەری نێوانیان و جیاوازی شەپۆلی لەرەکانیان .

لەشی ئەتیری ئامرازی پێك گەیانـدنی لەشـی مـاددی و ڕوحـە ، ئـەو بلێـسە پیرۆزەیـە سیفەت و شێوەی مرۆییمان پێ دەدات ، پەتێکی ئەتیری زیوی ڕوحـی لەشـی مـاددی و ئەتیری پێکەوە گرێ دەدات ، لەکاتی نووستندا کە لەشی ئەتیری گەشـتی خـۆی دەکـات بە دونیای خۆی دا و لەشی ماددی بەجێ هێشتووە بـێ ئـازار پـێ گەیشـتن ئـەو پەتـە نەپچڕاوە ، لەشی ئەتیری بەو گەشتەی مەلەی تێدا دەکات لـە دونیـای ڕوحـدا چـالاکی بۆ خۆی دەگێڕێتەوە .

مامۆستا (ماکنزی) بەڕێوبەری زانکۆی ڕوحی بەریتانی لە کتێبی (الاتصال بـالروح) دا باس دەکات ، ئەو پەتەی هـەردوو لـەش پێکـەوە دەبەستێتەوە لـە چـەند دەزوویـەکی ورد پێك دێ لەسەری لەشی ڕوحی و سی یەکانی و دڵی هەڵدەقووڵێ بەرەو بەشەکانی بەرامبەری دەڕوات لە لەشی فیزیایی دا .

کاتێ ڕوح لەش بەجێ دەهێڵێ لەکاتی مردندا ڕوحـی لـە ئێسقانەکانی کەللە سـەرەوە دەردەچـێ ، بـەڵام لـەکاتی نووسـتن و بـێ ئاگـایی و دەرچـوونی ڕوحـی دا لەناوچـەی

---

[٢٠٧] (ئارتەر فندلای) دەڵێ : (کاتێ مندالّ دەمرێ لەدونیای ئەودیو گەشە دەکات تا قۆناغی کوڕێتی و کچێتی تەواو دەکات) ، علی حافة العالم الاثیری / ل (١٣١) لە فەرموودەشدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ بە (مارییە) دەفەرمووێ ، وەکواتێ ئیبراهیم وەفات دەکات و بۆی خەمبار دەبێ : (انە لە المرضعا فی الجنة) واتة : نەو دایكی شیر دەری هەیە لە بەهەشتدا ، رواه المسلم وابن ماجة وغیرهم .

هەندێ دەڵێن : ڕوح لە مانگی چوارەم دەڕواتە بەر کۆرپەلەو لە ژیانی خانەیی جیایە ، هەندێ دەڵێن ، ژیانی خانەیی و ڕوح یەك لەو شتە و بەبێ ڕوح یەك شتەو بەبێ ڕوح (خانة) زیندووو نابێت ، سپێرم و هێلکۆکە هەردووکیان خانەی زیندووون و ڕوح لەبەرن.

قەفەزی سنگی یەوە دەردەچێ ، بەو هۆیە بە چەند دەزوویەکی ڕوحی یەوە بە ئەندامەکانی لەشەوە دەبەسترێتەوە .

لە ساتێکی کەمدا لەشی ئەتیری بۆ لاشە دەگەڕێتەوە ، وەکوو باری لە نووستن دا . مرۆڤ وریا دەبێتەوە ، گەر بە هێوری بێداربینەوە لەشی ئەتیری دەڕواتە ناو لەش و دەمارەکان ئارام دەبنەوەو دۆخی دەروونی پشوودەدات ، بەلام گەر بە دەنگی بێزار کەرو هاوار هەلسینەوە لەشی ئەتیری بەپەلە دێتەوە ناو لەش و سەر ئێشە پەیدا دەکات .

(کارل یونگ) دەلێ : لەشی ئەتیری لەشی ئاسمانی یە ، هەلگری مانەوەیەو هەلگری ئەو بلێسەیەیە لە فەلسەفەی سۆفیگەری دا بەلەشی ئەستێرەیی ناو دەبرێت)[٢٠٨].

بێگومان ئەم لەشە ئەتیرە لەزۆر واتا ناوی هاتووە وەکو (لەشی زیندەگی corps vital) و لەشی (هیولی) و لەشی ئەستێرەیی و لەشی شەبەح (fantome) دیسان وەکو (د.علی عبدالجلیل) لە کتێبی (اعرف ڕوحك)دا باسی کردووە پێی دەگوترێ : (لەشی دەماری – لەشی هۆشیار ، لەشی خەون بینین ، لەشی ڕووناکی ، کۆپی دووەم ...) ، بەلام لە فەرموودەدا بە (لەشی بالدار) هاتووە : (عبدالله بن احمد بن حنبل) دەلێ : لە باوکم پرسی ئایا ڕوحی مردووان لە گۆڕدایە یان لەلەشی بالداردا ، یان وەك لەش دەمرێ ؟ فەرمووی : پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (نسمة المؤمن اذا مات طائر يعلق في شجر الجنة حتى يرجعه الله في جسده فيبعثه الله)[٢٠٩] رواه ابن ماجة و النسائي ، والترمذي وصححه الالباني ، واتە : گیانی بڕوادار گەر مرد بالدارێکە بە درەختی بەهەشتەوە دەنووسێ تا خوا بۆ لەشی دەگێڕێتەوە و خوا زیندوووی دەکاتەوە .

---

[٢٠٨] دراسات في العالم الروح / ل:١٢٧ -١٣٠ بە کەمێ کورت کردنەوە.

[٢٠٩] اهوال القبور / الحافظ ابي الفرج.

بێگومان قورئان ژیانی دوای مەرگ بەزیندووو دا دەنێ وەکو فەرموویەتی :﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾ آل عمران: ١٦٩ .

ڕوحی شەهیدانیش وەکو بڕواداران لە لەشی باڵداری سەوزدایە (ارواح الشهداء في طير خضر) اخرجه الترمذی وصححه.

لەشی ئەتیر چەند سیفەتێکی تایبەتی هەیە ، وەکوو :

١- لەشی ئەتیری لاواز نابێ و پیر نابێ و نابڕێ.
٢- لەشی ئەتیر لاستیکی یە بۆ دوور گەشت دەکات .
٣- لەشی ئەتیری سەرچاوەی هەست کردنە ، زانای ئەڵمانی ئۆتۆفرانك ( otto Frank) دۆزییەوە مرۆڤ بە لەشی ئەتیری هەستەکانی چالاکە .
٤- کاتێ مرۆڤ دەمرێ لەشی ئەتیری تەواوی هەستەکانی هەیە کە لە ڕوحی وەردەگرێت.
٥- لەشی ئەتیر بەستەرەوەی لەشی ماددی و ڕوحە .
٦- (د.سوتمان) لە زانکۆی (جوتبنرج / ئەڵمانیا) دا کە خاوەنی توانایەکی ڕوحی بەهێزە لە منداڵی یەوە ، بە لەشی ئەتیری کار لە تەواوی ئەندامانی لەش دەکات و کار لە زیندە چالاکی (میتا بولی) دەکات ،لأمی هەموو بیرو هەستەکانی مرۆڤ دەداتەوە .[٢١٠]

کاتێ مرۆڤ نەخۆش دەبێ لەشی ئەتیری و هالەی دەشێوێ ، بەڵام لە ڕێگای چاك کردنەوەی هالەکە و لەشی ئەتیر دەتوانرێ شیفا بگێڕدرێتەوە ، ئەویش بە ناردنی وزە .

---

[٢١٠] اهوال القبور / الحافظ ابي الفرج / ل: ١٣٤-١٣٥/ بە کورت کردنەوە .

(د.بدرالدين منصور) دەنووسێ : لەکاتێ دا (شیخ العلامە البوصیری) تووشی ئیفلیجی دێ ، ئەم (قصیدە البردیە) بۆ ستایشی پێغەمبەر ﷺ دەنووسێ ، پێغەمبەر ﷺ لە خەون دەبینێ ، زۆر خۆشحاڵ دەبێ بەو هاڵبەستەیەو عەبای پیرۆزی دەدات بەسەرداو کاتێ بێدار دەبێتەوە چاك بۆتەوە)[٢١١].

بەو شێوەیە نوێژ و صەلاوات و پاڕانەوە لە خوا شیفا بەخشی یە بۆ ڕوح و جەستەکان .

دیسان وەکو (السفیر عزت) باسی کردووە زانایان پێیان وایە مرۆڤ (٧) لەشی هەیە لەناویەکدا ، وەکوو بوونی حەوت ڕەنگ لە ڕووناکی بینراودا :

(١) لەشی ئەندامی (somatic) لە ماددەی چڕ پێك دێت.
(٢) لەشی ئەتیری (Etheric) بەرجەستەیەو لەژێر باڵی هەستەکاندا نییە.
(٣) لەشی ئەستێرەیی (الکوکبی) (Astaral) لە ئاستی دونیای ئەستێرەیی دایەو لە ماددەی ئەستێرەیی پێك دێ.
(٤) لەشی هزری (العقلي) کە هەڵگری هۆشە.
(٥) لەشی سەلبی (causal) کە لە ئاستی ناوچە بەرزەکانی دونیای ئەستێرەیی کار دەکات.
(٦) لەشی ڕوحی (spiritual) .
(٧) لەشی گشتی (universal).

هەندێ زانای تر بە زاراوەی تر ناویان دەبەن : (لەشی زەمینی ، لەشی ئەستێرەیی ، هێزی زیندەگی ، هزری غەریزەیی ، زیرەکی ، هزری گیانی ، گیان).

لە زانایانی خۆرئاوا (دەروونزان w.r.Bousfield) دەڵێ : بوونی لەشی ئەتیری تەنیا ژیان و ڕواڵەتی ڕوحی ڕاڤە ناکات ، بەڵکو (یادو زاکیر)ەی مرۆڤیش ڕاڤە دەکات

---

[٢١١] بردة المديح / شرح مفرداتها : د.بدرالدين منصور / ل:٤.

، زانایانی هاوچەرخ پێیان وایە (هـزری ئـەتیر) لـە پشتەوەی مێشکەوە کار دەکات و چالاکی زاکیرە مانا دەکات ، بناغەی زاکیرە ماددی نییە بەڵکو لـە پێك هاتـەی ئـەتیری پێك دێ و مێشکی ڕوحی مرۆڤ پێك دێنێت)[٢١٢].

قورئـانیش ئامـاژە دەکـات ، کـاتێ مـرۆڤ دەمـرێ (دەروون و هـزرو دڵ و یـادو مێشکی ئەتیری) لەگەڵ ڕوحدا دەڕۆن.

﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ﴿٢٨﴾ ﴾ الفجر: ٢٧ ـ ٢٨

﴿ يَوۡمَ لَا يَنفَعُ مَالٞ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ ﴾ الشعراء: ٨٨

﴿ يَوۡمَ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ مَا سَعَىٰ ﴿٣٥﴾ ﴾ النازعات: ٣٥

﴿ لَّقَدۡ كُنتَ فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٞ ﴿٢٢﴾ ﴾ ق: ٢٢ .

(ئارتەر فندلای) دەنووسێ : وەك لـە پـەیامێکی ڕوحـی دا هـاتووە : (لەشـی ئـەتیرمان پێکاو پێکی لەشی فیزیایی یە لە هەمووو شتێکدا ... لەشـی ئـەتیری لەشـی ڕاسـتی یـە لـە زەوی دا ، لـە سـاتی دوو گیـانی دا مـاددەی فیزیـایی لێ دەهـاڵێ ، لـەرەکانی هێـواش دەکاتـەوە ، گـەر ئـاوا نەبوایـە لەبـەر لـەرەی زۆری نەیـدەتوانی لـەدونیای فیزیـایی دا بحاوێتـەوە ، لەشـی فیزیـایی تـەنیا بـەرگێکی پـارێزەرە بـۆ لەشـی ئـەتیری لـەماوەی ڕابردنی بە ژیانی زەمینی دا)[٢١٣].

قورئـانی مـەزن ئامـاژە دەکـات لەشـی مـاددی بـەرگێکی هێـواش کەرەوەیـە بـۆ ڕوح ، بەمردن بەو بەرگە ماددی فیزیایی یە جیـا دەبێتـەوەو هەسـتەکان ئـازادو بـێ سـنوور دەبن ﴿ فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٞ ﴿٢٢﴾ ﴾ ق: ٢٢ .

---

[٢١٢] دارسات في العالم الروح / ل:١٤٠.
[٢١٣] دراسات في العالم الروح / ل:١٤٠.

دیسان شایەنی باسە گیاندارە سوودبەخشەکان لە بەهەشتی تایبەتی خۆیاندان و زیان بەخشەکانیش لە دۆزەخدان و ئازاری تاوانباران دەدەن ، لە فەرموودەدا هاتووە : (کل مؤذي في النار) رواه الخطیب ، (الذباب کله في النار الا النحل) رواه ابو یعلي.

**بەندی دووەم : دیاردە ڕوحی یەکان لە تاقیگەدا :**

**ئیعجازی (٤٠) ئاستی ڕوحەکان : (ڕوحی بەرز ، ڕوحی ناوەند ، ڕوحی پەست و نزم).**

**ئیعجازی (٤١) : ڕوحی پێغەمبەران و صدیقینەکان و شەهیدان و ئەولیایان .**

**ئیعجازی (٤٢) : موعجیزە ، کەرامەت ، جادوو ، تەنجیم ، دیاردە ڕوحی یەکان لە ڕێگای نوێژو پاڕانەوە ، یان لەڕێگەی هیپنۆتیزم و ڕامانەوە :**

لە قورئانی پیرۆزدا دا ڕوحی فریشتەکان کە ڕوحە پاکەکانن ئاستیان جیایە ، ڕوحی جنۆکەکان بەرزو نزمی یان هەیە ، بەڵام ڕوحی شەیاتینەکان نزمە ، دیسان لە قورئاندا ڕوحی مردووان لە زەوی دا ئاستیان دەبێ بە سێ بەشەوە : یەکەم ڕوحی نزیکەکانی بارەگای خوا (المقربین) : وەکو پێغەمبەران و صدیقینەکان و شەهیدان و ئەولیایان ، کە ئەوانیش بەش بەشن لەبەرزی دا .

بەشی دووەم : ڕوحی ناوەندە ، کە بەیارانی دەستە ڕاست ناویان هاتووە (أصحاب الیمین).

ڕوحی پەست و نزم ، وەکوو ڕوحی گوناهباران و شەیاتینەکان و جنۆکە خراپە کارەکان ، کە بە (اصحاب الشمال) ناویان هاتووەو لە سوڕەتی (الواقعة) دا باسکراوە .

خوای گەورە لەبارەی ئاستی فریشتەکان فەرموویەتی : ﴿ وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٌ مَّعۡلُومٌ ١٦٤ ﴾ الصافات: ١٦٤ ، واتە : هەر کام لە ئێمە مەقامێکی ئاشکرای هەیە .

بەرزترین ڕوحی بالاّ لە فریشتەکاندا (جبریل و میکائیل و فریشتەی مردن)ە ﴿ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ ﴾ البقرة: ٩٧ ، واتە : کێ دوژمنی جبریل بێ ئەوە خوا دایبەزاندۆتە سەر دڵی تۆ .

﴿ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَىٰلَ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٩٨﴾ ﴾ البقرة: ٩٨ ، واتە : کێ دوژمنانی خواو فریشتەکان و پێغەمبەران و جبریل و میکائیل بێ ، ئەوە خواش دوژمنی بێ بڕوایانە .

﴿ ۞ قُلْ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ٱلَّذِى وُكِّلَ بِكُمْ ﴾ السجدة: ١١ ، واتە : بڵێ : فریشتەی مردن دەتان مرێنێ کە کراوە بە بەرپرسیاری ئێوە بۆ ئەوە .

لای خەڵکی ئەم فریشتەیە بە (عزرائیل) ناسراوە .

ڕوحی پێغەمبەران لە ڕوحی فریشتەکان و جنۆکەکان بالاّترە : ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ ﴿٣٤﴾ ﴾ البقرة: ٣٤ ، واتە : کاتێ بە فریشتەکانمان وت کوڕنوش بۆ ئادەم ببەن ، هەمووو کڕنوشیان برد ئیبلیس نەبێ یاخی بوو.

دیسان هەندێ بۆ چوون هەیە ، کە (الروح) لە قورئاندا وەکو : ﴿ تَنَزَّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ ﴾ القدر: ٤ ، بە (جبریل) ناناسێنن و دەڵێن : فریشتەیەکی ترە ، لە جبریل گەورەترە ، هەیە پێی وایە مەبەست لە ڕوحی چاکەکارانە دێنە لای خزمانیان و سەردانیان دەکەن[٢١٤].

لە سوڕەتی واقیعەدا ڕوحی مردووان لەسەر زەوی دەکات بەسێ پلەوە :

[٢١٤] روح المعاني / الالوسي / ج١٥ / ل:٤١٨.

(١) ﴿ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ﴿١٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿١١﴾ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿١٢﴾ ثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ وَقَلِيلٌ مِّنَ ٱلْءَاخِرِينَ ﴿١٤﴾ ﴾ الواقعة: ١٠ - ١٤ ، واتـه : پێشینەی پێشینەکان ئەوانــە نزیکـەکانی بارەگـای خــودا لــە بەهەشــتەکانی نــەعیم و بــەهرەدان ، کۆمەڵێکی زۆرن لە پێشینەکان و کۆمەڵێکی کەمن لە پاشینەکان (٢) . ﴿ وَأَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ ﴿٢٧﴾ فِي سِدْرٍ مَّخْضُودٍ ﴿٢٨﴾ وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ ﴿٢٩﴾ وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ ﴿٣٠﴾ وَمَآءٍ مَّسْكُوبٍ ﴿٣١﴾ ﴾ الواقعة: ٢٧ — ٣١ ، واته : یارانی دەستە ڕاست ، کێن یـارانی دەستە ڕاست ، لەناو مۆردی بێ دڕکدان ، مۆزی هێشوو کەوتووە سەر یەك و ئاوی هەڵڕژاو وەکو تاڤگە.

(٣)﴿ وَأَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴿٤١﴾ فِي سَمُومٍ وَحَمِيمٍ ﴿٤٢﴾ وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ ﴿٤٣﴾ ﴾ الواقعة: ٤١ — ٤٣ ، واته : یارانی دەستە چەپ ، کێن یارانی دەستە چەپ ، لـە گـڕو ئاگرو ئاوی گەرمدان ، سێبەری گڕدارو گەرم.

دیسان جنۆکەکان ڕوحی بـەرزو بـاڵاو ناوەنـدو نزمیـان هەیـە :﴿ وَأَنَّا مِنَّا ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَۖ كُنَّا طَرَآئِقَ قِدَدًا ﴿١١﴾ ﴾ الجـن: ١١ ، ئێمـەش چـاکەکارو غـەیری ئـەوەشمان هەیە ، ئێمە مەزهەبی جیاجیامان هەیە .

دیسان قورئان مەقامی چاکەکارانی مـرۆڤ دەکات بـە چـوار بەشـەوە : ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ ﴾ النساء: ٦٩ ، واته کـێ بـەگوێی خـواو پێغەمبـەر ﷺ بکـات ئەوانــە لەگـەڵ ئەوانــەدا دەبــن خــوا بــەهرەی پــێ داون لــە پێغەمبــەران و صدیقینەکان و شەهیدان و چاکەکارانی ئەولیا ، ئەوانە باشترین هاوڕێن.

لەناو پێغەمبەراندا پلەی جیا جیا هەیە ، وەکوو (اولو العزم) کە پێنج پێغەمبەرن : ﴿ فَٱصۡبِرۡ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ ﴾ الأحقاف: ٣٥ ، پێغەمبەری ئێمە ﷺ بەرزترین مەقامی هەیە : ﴿ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا ﴾ الإسراء: ٧٩ ، واتە : شایەد خودا ڕەوانەی مەقامی مەحمودت بکات .

دیسان پێغەمبەر ﷺ دەربارەی مەقامی مەعنەوی و ڕوحی خۆی فەرموویەتی : (كنت اول الناس في الخلق واخرهم في البعث) رواه ابن سعد / صحيح في الجامع الصغير / للسيوطي، واتە : من یەکەم کەسم خوا ڕوحی دروست کردم ، بەلاّم دوا پێغەمبەرم ڕەوانەی کردم.

(كنت نبيا وادم بين الروح والجسد) رواه الطبراني صحيح في الجامع الصغير، واتە : من پێغەمبەر بووم ئادەم لەنێوان ڕوح و جەستەدا بوو.

(انا سيد ولد آدم يوم القيامة) رواه المسلم ، واتە: من سەرداری کوڕانی ئادەمم لە ڕۆژی دوایی .

(نحن ولد عبدالمطلب سادة اهل الجنة : انا وحمزة وعلى وجعفر والحسن والحسين والمهدي) رواه ابن ماجة ، واتە : ئێمە جگەر گۆشەی (عبدالمطلب)ین سەرداری خەڵکی بەهەشتین ، من و حەمزەو عەلی و جەعفەرو حەسەن و حوسەین و مەهدی.

بێگومان ئەولیایان زۆرن ، زۆر بەشیان هەیە .

دیسان لە قورئاندا باس لە مەقامی ژنانی پێغەمبەر ﷺ کراوە ، ﴿ وَأَزۡوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمۡ ﴾ الأحزاب: ٦ .

له فەرموودەدا هاتووە صەدیقینە ژنە پایە بەرزەکان چوارن : (خير نساء الالعالمين اربع : مريم بنت عمران ، وخديجة بنت خويلد ، وفاطمة بنت محمد ﷺ ، وآسية امرأة فرعون) رواه الحاكم والطبراني / صحيح في الجامع الصغير.

دیسان لە قورئاندا باس لە مەقامی موهاجیرو ئەنصارە بڕوادارەکان کراوە لە پێشینەکان : ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾﴾ التوبة: ١٠٠

خودا (مريم) بە (صديقه) ناو دەبات : ﴿وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٌ﴾ المائدة: ٧٥ .

یان لە فەرموودەدا هاتووە (الصديقون ثلاثة) رواه ابو نعيم ، کە بە (حزنيل و حەبيبى و نەجارو عەلى) ناوى داون.

خودا باس لە مەقامی بەرزی وەجاخی پێغەمبەر ﷺ دەکات : ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴿٣٣﴾﴾ الأحزاب: ٣٣ ، واتە : بەڕاستی خودا ئەوەندەی دەوێ ئەی وەجاخی پێغەمبەر ﷺ لە گوناه و چڵك پاکژتان بکاتەوەو خاوێنتان بکاتەوە چۆن خاوێن کردنەوەیێك.

لەباسی مەقامی (١٢) پێشەوایانی ئال و بەیت زانایانی ئەهلی سوننە زۆر کتێبیان نوسیوە وەکو (الفصول المهمة / ابن صباغ المالكي) و (الصواعق المحرقة/ ابن حجر) و (نور الابصار / الشبلنجى) و (احياء الميت بفضائل اهل البيت / السيوطي).

(مسلم) لە (صحيح) دا گێڕاویەوە : (انا تارك منكم الثقلين اولهما كتاب الله فيه الهدى والنور ، فخذوا بكتاب الله واستمسكوا به ...... واهل بيتي) رواه مسلم .

لێرەدا پێغەمبەر ﷺ قورئان و ئال و بەیت بە (الثقلين) ناو دەبات ، دیسان لە فەرموودەی (الکساء)دا (مسلم) گێڕاویەوە : پێغەمبەر ﷺبەیانیەکە دەردەچێ عەبایەکی بەسەردایە لە موی ڕەش ، حەسەن هات خستی یە ناوی ، پاشان حوسێن هات خستی یە ناوییەوە ، ئەنجا فاطمە هات خستی یە ناویەوە ، ئەنجا (عەلی) هات خستییە ناوییەوە ، پاشان فەرمووی : ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ﴾ الأحزاب: ٣٣ .

وەکو (الجرجاني) لە (التعريفات) دا باسی کردووە مەقامی ئەولیایانی دابەش کردووە بەسەر چەندان بەشدا (جەمسەر -قوتب-) و دوو یاوەرانی ڕاست و چەپی و ، نەجیبەکان و بودەلاو ... هتد).

گەر سەیرێکی پەیامی ڕوحی ئەو ڕوحانە بکەین لە تاقیگەدا ئامادەکراون ، ئەوانیش شاهیدییان لەسەر ڕاستی پەیامی ئاسمانی و پێغەمبەران و بەرزی و نزمی ڕوحەکان داوە .

(ئالن کاردك) بە نمونە دەهێنینەوە کە دەڵێ : (ڕوحەکان لەتواناو زیرەکی و زانیاری و ڕەوشتدا یەکسان نین ، ڕوحەکانی پلە یەکەم ئەوانەن سیفاتی کەماڵ و زانیاری زۆریان هەیەو نزیکی بارەگای خوان ، ئەوان سۆزو هەستیان بۆ چاکە هەیە ، ئەوانە فریشتەکان و ڕوحی پاکن ، پلەکانی تر وردە وردە دوور دەکەونەوەو لە کەماڵ دادەبەزن ، هەرە نزمەکانیان وەکو خۆمان ئارەزووەکانی وەکو کینەو ئێرەیی و خودپەرستی و خۆبەزلزانی هەڵدەگرن ، دڵخۆشن لەناو ئەوانەدا ڕوح هەیە نەزۆر باشن نە زۆر خراپن...)[٢١٥]

(پەیوەندی ڕوحەکان لەگەڵ خەڵکیدا بەردەوامە ، ڕوحە چاکەکان هەوڵ دەدەن بەرەو خێرو چاکە ڕێنومامان بکەن و لە ئەزموونی ژیاندا بەهێزمان بکەن ، ڕوحی

---

[٢١٥] کتاب الارواح / الن کاردك/ ل:٢٤/ت:جورج حداد.

**چەپەڵ وەسوەسەی خراپمان دەکەن و فریومان دەدەن بە بەدشانسی ئێمە خۆشحاڵ دەبن)**[٢١٦].

**قورئانی پیرۆز دەربارەی ئیلهامی ڕوحی پاك بۆ مرۆڤ دەفەرمووێ :** ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُوا۟ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾﴾ فصلت: ٣٠ ، **دەربارەی وەسوەسەی خراپی ڕوحی پیس دەفەرمووێ :** ﴿ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴿٦﴾﴾ الناس: ٥ ــ ٦ .

**خوداوەند دەربارەی فریشتەکان و ڕوحی پاك فەرموویەتی :** ﴿لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ التحريم: ٦ ، **واتە : ئەوەی خوا فەرمانیان پێ دەکات سەرپێچی نەکەن ، چییان پێ ڕابگەیەنرێ ئەنجامی دەدەن.**

**دەربارەی ڕوحی چەپەك فەرموویەتی :** ﴿تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ﴿٢٢٢﴾﴾ الشعراء: ٢٢١ - ٢٢٢ ، **واتە : بڵێ : ئایا پێتان بڵێم شەیاتینەکان دادەبەزنە سەر کێ ؟ دادەبەزنە سەر هەمووو درۆ هەڵبەستەرێکی تاوانبار.**

**بەو پێیە ڕوحی پاك دادەبەزنە سەر چاکەکاران و ڕوحی خراپەکاران دادەبەزنە سەر خراپەکاران ، ئەم دابەزینەش لە حاڵەتی خەون و ئیلهام و نامادەکردنی ڕوحەکاندا ڕوودەدات .**

**(ئالن کاردك) دەنووسێ : قسەکردنی ڕوحەکان لەگەڵ مرۆڤدا بە ئاشکرایی دەبێ یان بە پەنهانی یەوە ، قسەی پەنهانی ڕوحەکان بەهۆی کاریگەری ڕوحەکان دەبێ بەسەر مانەوە ، کە بەرەو خێر یان شەڕ ڕامان دەکێشن ، پێویستە ئیلهامی چاك و خراپ**

---

[٢١٦] كتاب الارواح / الن كاردك/ ل:٢٩/ت:جورج حداد.

لێك جیا بکەینەوە ، قسەی ئاشکرای ڕوحەکان لەگەڵماندا بەهۆی نوسین و قسەو دەرکەوتنی بەرجەستەی تر دەبێ ، بەزۆری لە ڕێگای ناوەندەکانەوە دەبێ ، کە خۆیان بە ئامرازی ڕوح دەناسێنن.

لێك جیاکردنەوەی ئیلهامی خێرو شەڕ زۆر ئاسانە ، ڕوحە بەرزەکان هەمیشە قسەی جوان و بەجێ و شکۆدار دەکەن ، دوورە لە هەوا پەرستی ، لە ڕێنوماکانیاندا زانستی بەرز دەردەکەوێ و هەمیشە بەرەو خێری مرۆیی دەمان بەن ، بەڵام ڕوحی پەست پێچەوانەی ئەوەمان ئیلهام دەکەن[217].

هەروەها گەر سەیری پەیامی ڕوحی زانایانی خۆرئاوا بکەین ، لەوانە (ئارتەر فندلای) لە بارەی ئایینی ئیسلام و پێغەمبەر ﷺ گەواهی ، دەدات و دەنووسێ ، کە وەڵامێکە بۆ وەرگێڕی کتێبەی بۆ عەرەبی (فهمي ابو الخير) : (هەمووو ئایینەکان بنەمایەکی ڕوحی یان هەیە ، ئەوەی تۆ لەبارەی ئیسلام نوسی بووت بەگرنگی یەوە خوێندمەوە ، من پێم وایە موحەممەد ﷺوەکو عیسا پیاوێکی ڕوحانی بووە ، کە ئیمڕۆ بە ناوەندی باڵا دەناسرێت[218].

(شيخ الاسلام محمد بن عبدالحي الكتاني) دەنووسێ : (ئیلهام لای ئەهلی حەق و هەندێ زانایانی وەکو (فخر الرازي) لە (التفسير)داو (ابن صلاح) لە (فتاوى)دا دەبێتە بەڵگە ، نیشانەی ڕاستی یەکەی ئەوەیە سنگی بۆ گوشاد دەبێ و پێچەوانەی نییە .

---

[217] كتاب الارواح / ل:٢٩.

[218] على حافة العالم الاثيري / ل:١٣.

دەڵێ : ئیلهام قسەی حەقە لە حەقەوە ، هەندێ سۆفی ئەم ئایەتە دەکەنە بەڵگە : ﴿ یَٰٓأَیُّهَا ٱلَّذِینَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ یَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانٗا ﴾ الأنفال: ٢٩ ، دیسان دەنووسێ : (ابن السمعانی) دەڵێ : نکۆڵی کردنی دروست نییە)[٢١٩].

(غەزالی) لە (المنقذ من الضلال) دا دەڵێ : (سەرەتای تەریقەت بە موشاهەدەو موکاشەفە دەست پێ دەکات ، ڕوحی فریشتەکان و پێغەمبەران دەبینن ، گوێیان لە قسەکانیان دەبێ و سوودیان لێ وەردەگرن).

دیسان فەرمووده هاتووه : (الرؤیا الصالحة من الله والحلم من الشیطان) متفق علیه ، واتە : خەونی باش لە خواوەیە ، خەونی خراپ لە شەیتانەوەیە.

نمونەی (صددیقینەکان) و ئەولیایان کە لەلایەن خواوە کاری نا ئاسایی یان پێ دەدرێت﴿ وَإِذۡ قَالَتِ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ یَٰمَرۡیَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰكِ ﴾ آل عمران: ٤٢ ، واتە : کاتێ فریشتەکان وتیان : ئەی مەریەم خوداوەند هەڵی بژاردوویت.

﴿ وَأَوۡحَیۡنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَرۡضِعِیهِ ﴾ القصص: ٧ ، واتە : سروش و ئیلهامان بۆ دایکی موسا کرد شیری پێ بدات .

﴿ وَإِذۡ أَوۡحَیۡتُ إِلَى ٱلۡحَوَارِیِّـۧنَ أَنۡ ءَامِنُواْ بِی وَبِرَسُولِی ﴾ المائدة: ١١١ ، واتە : کاتێ سروش و ئیلهامان بۆ حەوارییەکان کرد بڕوا بە من و پێغەمبەرەکەم بکەن.

دیسان ئەم کەسانە کاری نائاسایی یان بۆ لواوە ، وەکوو مەریەم کە دار خورما دەهەژێنێ ، یان خواردنی هەیە وەرزی لا پەیدا دەبێت : ﴿وَهُزِّیٓ إِلَیۡكِ بِجِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ ﴾ مریم: ٢٥ ، ﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَیۡهَا زَكَرِیَّا ٱلۡمِحۡرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزۡقٗا ﴾ آل عمران: ٣٧ .

---

[٢١٩] السر الحق الامتناني / الكتاني / ل:١٥٢.

یـان ئـەم زانـا ڕوحیـەی لای سـولەیمانە لـەماوەی کـەمتر لـە چـاوتروکاندنێ تـەختی بەلقێسا دەگوازێتەوە لە سەبەئەوە بۆ قـودس : ﴿ قَالَ ٱلَّذِى عِندَهُۥ عِلْمٌ مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ ﴾ النمل: ٤٠ ، یـان (زولقەرنـەین) : ﴿ قُلْنَا يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا ﴾ الكهف: ٨٦ ﴿ وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا ﴿٨٨﴾ ﴾ الكهف: ٨٨ ، واتـە : گوتمـان (بەزولقەرنـەین) ئـەی زولقەرنەین یان سزایان دەدەی یان چاکەیان لەرگەڵ دەکەیت.

بێگومان هەموو ئەوانە نمونەیەکن لە پەیوەندی ئاسمانی لەگەڵ زەمینـدا ، مشتێکن لە خەرمانێك .

**لوانی موعجیزەو کارە نائاساییەکان لە ڕوانگەی قورئان و زانستی ڕوحی نوێوە :**

﴿ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِىَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾ الرعـد: ٣٨ ، واتـە : هـیچ ڕەوانەکراوێکی خوایی بۆی نییە موعجیزەیێ بێنێ بە ویستی خودای نەبێت .

﴿ وَجَعَلْنَا ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥٓ ءَايَةً ﴿٥٠﴾ ﴾ المؤمنون: ٥٠ ، واتـە : کوڕی مەریـەم و دایکی کردمانن بە موعجیزەییێك.

(التفتازانی) لـە (شـرح المقاصـد) دا دەنووسێ : (المعجـزة) لـە (العجـزة)ەوە هـاتووە ، واتە : (نەتوانین) ، (کەڕامەت) لەسەر دەستی وەلی ڕوودەدات .

بۆ زانستی پتر بڕوانە (شرح المقاصد / التفتازاني).

(الجرجـانی) دەڵـێ : (مـوعجیزە کـارێکی نائاسـایی یـە داوای خێـرو خۆشـی دەکـات ، پێغەمبەرایەتی هەڵگرتووە ، مەبەستی دەرکردنی ڕاستی پێغەمبەرایەتی یـە) ، بـەڵام (کەڕامەت) (دەرکردنی کارێکی نائاسایی یە لەلایەن کەسێکەوە داوای پێغەمبەرایـەتی

ناكات ، گەر بڕواو کاری چاکی هەڵنەگرتبوو (ئیستیدراجە) ، گەر پێغەمبەرایەتی لەگەڵدا بوو موعجیزەیە)[220].

لە زانایانی خۆرئاوا فەیلەسوفی روسی (ئوسپینسکی) دەڵێ : (موعجیزە دیاردەیەکە لەم جیهانەدا ڕوودەدات ، بەڵام مل بۆ یاساکانی جیهانێکی تر کەچ دەکات ).

(عصر الخوارق / ج.اج.رایز/ ل:١٣)

کاری نائاسایی گەورە لەسەر دەستی پێغەمبەران وەکو موعجیزە ڕوودەدات . صددیقینەکان بەشداری تێ دا دەکەن ، ئەولیاکان وەکو کەرامەت دەتوانن هاوبەشی بکەن.

(شیخ الاسلام ابن تیمیە) (رحمە الله) لە کتێبی (النبوات)دا دەڵێ : (خوای گەورە هەمووو کارێکی نائاسایی بۆ هۆکارو کارزانییەك داناوە ، کە هاوشانی ئەوە بێ . نمونەی شەق بوونی دەریا بۆ موسا ، ئەوە لەبەر پێغەمبەرایەتی موسا (علیە السلام) بۆ ڕزگاربوونی گەلەکەی بوو ، لەبەر ئەوە بوو گەلی فیرعەون بەدرۆیان خستەوە .

دەڵێ : (دیسان کەرامەتی ئەولیا ، ئەوانیش بەشداری دەکەن لەکاری نائاسایی دا)[221].

نمونەی موعجیزەی پێغەمبەران لە قوڕئاندا لافاوی نوحە (علیە السلام) بۆ سەر زەوی بە دوعا، نمونەی زیندووو کردنەوەی مردووەوانە بۆ ئیبراهیم (علیە السلام) لە تاقیگەدا ، نمونەی زیندووو کردنەوەی مردووەوان و شەق کردنی دەریایە بۆ موسا (علیە السلام)، نمونەی زیندووو کردنەوەی مردووەوان و چاك کردنەوەی نەخۆشانە بۆ عیسا (علیە السلام) ، نمونەی شەق بوونی مانگە بۆ پێغەمبەر ﷺ .

---

[220] التعریفات / للجرجانی / ل: ١٥٠ ـ ١٧٨.

[221] النبوات / ل: (٢٢٠-٢١٨) سەیر بکە.

نمونـەی كـاری نائاسـایی بـۆ صـدديقينەكان ، گواسـتنەوەی تـەختی بەلقيسايە بـۆ سـولەيمان، جولاندنـەوەی دارخورمايـە بەدەسـت لەلايـەن مەريەمـەوە ، نمونـەی ئامادەبوونی خۆراكە لە غەيبەوە لەبەردەمی دا ، سەلامی خوا لە هەموويان بێت.

(موعجيزە) بۆ سەلماندنی دياردە ڕوحی يەكانە لە تاقيگەدا ، بە مەبەستی بڕوابوون بـە جيهـانی سـەروی مـاددی و ژيـانی دوای مـەرگ و پێغەمبەرايـەتی ، كەرامـەت سەلمێنەری موعجيزەيە ، بێگومان زانستی ڕوحی هاوچەرخ توانی لە ڕێگای ئەزموونـە ڕوحی يەكانەوە و هيپنۆتيزمەوە زۆرێ لە موعجيزەی پێغەمبـەران بسـەلمێنن و ببنـە پاڵپشت بۆ راستی ڕوح و ژيانی دوای مـەرگ و جيهانی ناديـار ، وەكوو چۆن زانستی فيزيـايی و كيميـايی و بـايۆلۆجی و پزيشكی و زانسـتەكانی تـر توانيـان بـوونی ئـەم دياردە ماددييانە بسەلمێنن لە تاقيگەدا ، كە لە قورئاندا هاتووە .

بێگومان تەواوی دياردە فەلسەفييەكان و زانستی يـەكان و عيرفـانی يـەكان و دياردە ئايينی ييەكان و قووڵ بوونەوە لە ناوياندا مرۆڤ بەرەو ئايين و خواناسی دەبەن .

لـەكتێبی (الله يتجلى في عصر العلم)دا هاتووە : (فـرانس بيكـون) دەڵێ : (كـەمی فەلسەفە مرۆڤ لـە بـێ بڕوايـی نزيـك دەخاتـەوە ، بـەڵام قـووڵ بوونـەوە لـە فەلسـەفە بەرەو ئايينی دەگێڕێتەوە).

ئەنشتاين دەڵێ : بڕواو ئيمان بەهێزترين و نايابترين ئاكامی توێژينەوەی زانستی يە.

(د.ئەلبەرت مـاكوب و نشـتر) دەڵـێ : (زانسـت مـرۆڤ چـاو ڕۆشـن تـر دەكـات دەربـارەی تواناو شكۆی خوادا ، تا مرۆڤ شتی تـازەتر بدۆزێتـەوە لەبازنـەی تـو و تـوێ ی خۆيـدا بڕوابوونی بە خوا پتر دەبێت)[٢٢٢].

ئيمـام عـەلی (سـەلامی خـوای لەسـەر) فەرموويـەتی : (العلم نهر والحكمة بحر ، والعلماء حول النهر يطوفون ، والحكماء وسط البحر يغوصون ، والعارفون

---

[٢٢٢] روح الدين الاسلامي / عفيف عبدالفتاح طبارة / ل:١٨٧.

في سفن النجاة يسيروون)[٢٢٣] ، واتە : زانست ڕووبارێکە ، فەلسەفەو حیکمەت دەریاییێکە ، زانایان بەدەوری دەریادا خول دەدەن، فەیلەسوفان و حەکیمان بەناو دەریادا دەڕۆن ، خواناسان و عاریفان بەکەشتی ڕزگاری دەڕۆن.

(فريد وجدي) دەربارەی (المعجزة) دەنووسێ : (موعجیزە بریتییە : لە کارێکی لە ئاسایی بەدەر لەسەر دەستی ڕەوانەکراوێکی خوایی ڕوودەدات بەمەبەستی سەلماندنی پەیامەکەی ، یاسای خوایی ئاوا هاتووە ڕەوانە کراوانی خوایی هەڵگری موعجیزات بوون بۆ ناو خەڵکی ، تا ملیان بۆ کەچ بکەن و بەگوێ یان بکەن ، ئەوانە هەستیان ڕەق بووە پێویستی یان بەو شتانە بووە کە خەیاڵیان بجولێنێت.

بۆ نمونە : (موسا –علیه السلام-) دار گۆچانی فڕێ دا بوو بە ئەژدیها و دەڕۆیشت . دەستی دەخستە با خەڵ و ڕەنگی سپی دەبوو بێ زیان بەرکەوتن .

عیسای (علیه السلام) نارد کەڕو کوێری زگماکی چاك دەکردەوە ، مردووی زیندووو دەکردەوە بە ویستی خوا، لە چەرخی پێغەمبەر ﷺ دلآن و هزرەکان گەشەیان کردبوو ، خودا پێغەمبەری ﷺ بەکاری نائاسایی یەوە نەنارد ، موعجیزەی ئەو کارزانی و هێنانەدی ڕاستی و پوچەڵ کردنەوەی ناڕاستی بوو ، موعجیزەی ئەو زاڵ بون بوو بەسەر هزرەکاندا بە بانگەوازی کردن و ژیاننامەی باش ، موعجیزەکانی بەرزترین موعجیزات بوون ، گەر خەڵکی گومان لە هەمووو موعجیزەکانی ڕابردوو بکەن گومان لەوە ناکەن و ناتوانن دوو دڵی بکەن ، کە موحەممەد ﷺ بە تەنیا بەبێ سامان و دەسەڵات ڕەوانە کراوە ، ئایدۆلۆجیای میللەتانی گۆڕی و هۆزەکانی یەك خست ، دەوڵەتی بنیاتنا بۆیان ، بەدەستوورەکی پیرۆز پەرژینی کردن ، ڕێگای پێدان پلە پلە پێ هەلا بچن بۆ کەماڵی ، ڕوحی بەبەردا کردن و گەیاندنە چڵە پۆپەی تەواوێتی و شکۆ ، چەند ساڵەکی کەمی برد ، ئەو گۆڕانکارییانە بەسیانە وەکو موعجیزە بۆ کەسانی ڕابردوو ئێستاو داهاتوو تا پەسڵان (قیامەت).

---

[٢٢٣] جواهر البلاغة / السيد احمد الهاشمي / ل:٢٢٤.

زۆر لە گەورە فەیلەسوفانی خۆرئاوا موسڵمان بوون ، وەکوو مێژوو نووسی فەیلەسوف (کاریل)ی ئینگلیزی و (باڕوون هنری دوکاستری) فرەنسی و (لورد هاولی) و کەسانی تر .

گەورە مێژوو ناسان بە ویژدانەوە مێژووی ئەو ڕەنگاندووە و بەکارەکانی واق و ڕمانی خۆیان دەرخستووە ، ئەو ڕوحەی بەبەر میللەتی دا دەکات سەری سوڕماندووون ، نمونەی (سدیو) و (گوستاف لولون) و (دوبرسفال) و (رینان) و (دروی) و کەسانی تر ، موعجیزەکانی ئەو باشترین موعجیزە بوون و درێژترین تەمەنیان هەبووە لە چاخەکاندا ، بەڵام نابێ خوێنەر ئەوە تێ بگات پێغەمبەر ﷺ هەرگیز موعجیزەی لەسەر دەستی ڕوونەداوە ، بەڵکو موعجیزەی زۆرتر لە عیساو موسای لەسەر دەستی ڕوودەدات ، بەڵام نەك بیانکات بە بناغە بۆ بانگەوازی ئیمان[٢٢٤].

دەگێڕنەوە : گەر سوپاکەی تینو دەبێ دەست دەخاتە ناو قاپێکی بچووکەوە ئاو لەناو ئەنگوستەکانیەوە هەڵدەکوڵێ و سوپاکەی دەیخواتەوە و بەشێکیش بۆ سەفەرەکە عەمبار دەکەن ، کاتێ سوپایەکەی برسییان دەبێ داوا دەکات پاشماوەی خواردونیان کۆ بکەنەوە ، دەستی پیرۆزی دەخاتە ناوییەوە ، سوپاکەی لێی تێر دەخۆن و بەشێکیش وەکو توێشوو هەڵدەگرن، زۆر شتی تر دەگێڕنەوە تا زیندووکردنەوەی مردووان ، کەس نیە لەم چاخەدا نکۆڵی لە ڕوودانی موعجیزەکان بکات، جگە لە ماتریالستەکان ، کە لەسەر سروشتناسی وەستاون، لەگەڵ ئەو زانستانەی سەد و پەنجاساڵێکە دۆزراونەتەوە.

گەر بەرهەمی ئەو ڕێنومایانەی هەزاران زاناو لێکۆڵەری دەروونزانی دەستیان پێ گەیشتووە لە خۆرئاواو خۆرهەڵاتدا وەکو : (مامۆستا ولیەم کروکس و روسل و لاس و لورد ئەمبزی و اکسون و تندل و بارکس و لودج و مورگان لە ئینگلترا ، (کامیل فلا

---

[٢٢٤] بروانە کتێبی (موعجیزاتی ئەحمەدی/ بدیع الزمان النورسی) و (حجة الله علی الالعالمین / العلامة النبهاني) و (الشفا / قاضي العياض) و هتد.

مریون و دکتۆر داریس دکتۆر جیبه و مامۆستا شارل ریسه) له زانایانی فه‌ره‌نسی . سه‌رباری ژماره‌یێکی زۆر له زانایانی که نایه‌نه سه‌ر ده‌فته‌ر ، له زانایانی ئیتالی و فه‌ره‌نسی و روسی و هی تر ، گه‌ر به‌رهه‌می ئه‌زموونی ئه‌وان ده‌رباره‌ی توانسته ده‌روونییه‌کان تا ئه‌و یاسایانه له یاسا حوکم به‌ده‌سته‌کان بۆ سه‌ر مادده به تواناترن و پیشانی ئه‌و ماددیانه بدرێن ، که ئه‌و یاسایانه ده‌توانن ئه‌و یاسایه ئاساییانه ببه‌زێنن و کاری ئه‌وان به‌تاڵ بکه‌نه‌وه‌و دیارده‌ی نوێ ی تر بێننه ئاراوه ، یاسای سروشتی ببه‌زێنن ، ئه‌و موعجیزانه له‌به‌ر چاو دونیادا ڕێتێ چوو ده‌بن و ده‌زانن ئه‌و موعجیزانه به‌پێی یاسای تایبه‌تی خۆیان ده‌ڕۆن.

(ئه‌لیکس کاریل) ده‌نووسێ : (سۆفیگه‌ری له به‌رزترین ئاستی دا له هونه‌رێکی ئه‌و ئه‌و په‌ر ورد پێك دێ ، سیسته‌مێکی وردی توندی هه‌یه ، یه‌که‌م شت به زوهد ده‌ست پێ ده‌کات ، که‌واته : ئه‌گه‌رینیه مرۆڤ بڕواته ناو نیشتیمانی سۆفیگه‌رییه‌وه به‌بێ زوهد کردن له خۆشییه‌کانی دونیا ، وه‌کوو چۆن مرۆڤ به‌بێ وه‌رزشێکی جه‌سته‌یی نابێته وه‌رزشه‌وان) الانسان ذلك المجهول /ل:١٥٨.

(مامۆستا بیو) ده‌نووسێ ، وه‌کو له کتێبی (المخاطبات على المغناتيس الحيوي) دا هاتووه : (خه‌واندنی موگناتیسی بوونی ڕوح ده‌سه‌لمێنێ ، هه‌روه‌ها نه‌مری ڕوح . سه‌لماندی ده‌کرێ ڕوحه ڕووته‌کان تێکه‌ڵ به‌مادده بکرێن ، که هێشتا به مادد پۆشراون)[٢٢٥]، جادو کاری و ته‌ڵه‌سمات و کاریگه‌ری ئیحاکان و خه‌واندنی موگناتیسی لای بابلییه‌کان و میسریه‌کان سه‌لماوه ، وه‌کو له ده‌قی قورئاندا هاتووه : ﴿ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ﴾ البقـــــــرة: ١٠٢ ﴿ سَحَرُوٓاْ أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ ﴾ الأعراف: ١١٦

﴿ فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ ﴿٦٦﴾ ﴾ طه: ٦٦

---

[٢٢٥] دائرة معارف قرن العشرين / ج١٠/ل:٤١١.

لێرەدا قورئان دەری دەخات جادو مرۆڤەکان هیپنۆتیزم دەکەن ، چۆن ئیحا بۆ نەستەکان بکەن ئەوە دەبێتە خەیاڵ لەبەر چاویانداو دەیبینن ، بێ ئەوەی واقیع بێت ، وەکو پیشاندانی پەت لەبەر چاویاندا وەکو مارو حەزیا، کە ئەمە فێڵی چاوە.

لە گۆڤاری فرەنسی دا (مجلە المجلات / ١٨٩٦)دا هاتووە : پیاوێ زنجی یەك (ڕەشپێستێك) دەخەوێنێ ئیحای پێ دەدات ئەو گورگێکی دڕندەیە ، بۆیە سیفاتی گورگی تێدا پەیدا دەبێ ، ڕوو لە بازاڕ دەکات و (٨) کەس دەکوژێ و هەوڵ دەدا لێکیان هەڵوەشێنێت ، بەکورتی خەوێنراو لەژێر دەسەڵاتی خەوێنەر دایە شەبەح و دەنگی دەخاتە بەرچاو و گوێ کە بوونێکیان نییە ، تەنیا لە ئەندێشەی ئەودا نەبێت)[٢٢٦].

**دیسان خەواندنی موگناتیسی (هیپنۆتیزم) یاساکانی فسیۆلۆجی تێك دەشکێنێ و هەستەکان لەدەست دەدات ، (مسیو دولن) دەڵێ : (گەر ئامۆنیا (نەوشارد) ی پەیت بخرێتە بەر دەمی خەوێنراو بۆنی بکات هەستی پێ ناکات ، کەچی لەباری ئاسایی دا گەر بۆنی بکات دەیکوژێت).**

(جون بوا) دەڵێ : (ئەو شیفاو چارەسەریانەی بەهیپنۆتیزم ڕوو دەدەن خەریکە وەکو موعجیزەیێك وابن ، هەروەها ئەو سوودانەی بە تەلقین پێ دان ڕوو دەدەن ، هەروەها ئەوەی دەبینرێ لە ڕەوشتەکانی بڕوا بوون و ویستی پۆڵایین و گفتوگۆ بەهۆی تلەپاتیاوەو پێشبینی کردن و بیرخوێندنەوەو دەرکەوتنی شەبەحەکان و تارمایی یەکان لەشوێنێك ، کەچی ئەو لەشوێنی خۆیەتی ، دەرچوواندنی هێزی زیندەگی لە لەشداو وێنەگرتنی و پێواندنی ، هەروەها ئەو شتە پەنهان و نادیارانەی خەوێنراو دەیانبینێ ، هەروەها هەواڵ دان بەکاری سەربەخۆ ، یان ئەو کارە نائاسایی یانەی

---

[٢٢٦] دائرة معارف قرن العشرين / ج١٠/ل: ٤١٠.

ناوەنـدەكان و هیندییـە هـەژارەكان دەینـوێنن بـەزۆری دروسـتە ، هـەمووو ئەوانـە كۆمەڵە ڕووداوێك دروست دەكەن، لەوانەیە مرۆڤ بە سووكی سەیریان بكات)[227].

(اكز كوف) ی روسی دەڵێ كە مامۆستاییَكە ، خێزانی مامۆستای ئینگلیزی (دومرجان) ژنێك دەخەوێنێ ڕوحەكەی دەنێرێتە ئەو شوێنەی بۆی دیاری كردووە[228].

لە ساڵی ١٨٣٠ دا لەسەر دەستی (جێمس برید) كە نوژدارێكی ئینگلیزی بـوو مـۆركێكی زانستی وەرگرت وەكو باسكرا. ئەم ئەزموونانە دەری دەخەن بە مـوعجیزەو كەرامـەت و هیپنۆتیزم و سیحرەوە مرۆڤ و گەردوون تـەنیا مـاددەیێكی ڕووت نییـە ، بـەڵكو لـە ڕوح و مادده پێك دێن ، ژیان دوای مەرگ بەردەوامەو لەناو ناچێت.

## جادوو چییە ؟ كەرامەت چییە؟

(د.اج.رایز) دەنووسێ : هەر لە كۆنەوە خەڵكانێ جادوویان كردووە بە پیشە ، بینـراوە كۆمەڵە ژن و پیاوێك كاری نا ئاسایی یان لەدەست دێ ، لای خەڵكی ڕێزیـان لێ نـراوەو لێیان ترساون ، بەڵام لە چەرخی نوێ دا دوای زانستی ماددی هەندێ گومان لە توانای ئەوانەدا پەیدا بوو ، تا هەندێكیان گەیشـتنە ئـەم بڕوایـە، ئـەم تواناییانـە لـە ئەفسانە زیاتر هیچ پەیوەندییان بە ڕاستی یەوە نیە .

لەسایەی ئەو گۆڕانكارییانەی بەسەر ئاسانكاری پەیوەنـدییەكاندا هات لەم سـەردەمەدا دەركـەوت هەنـدێ ئـەزموونی نائاسـایی هەیـە كاردەكاتـە سـەر دەمـاخی زانایـان ، ئـەم ئەزموونانە لای خەڵكی ئاسایی گەڵاڵە دەكرێت ، لێرەدا زۆر پرسیار دەكرێ لـە بـارەی ئەو جـۆرە كـارە نائاسـاییانە ، ئایـا چـەند دیاردەیـەكی ڕەسـەنن یـان خـەیاڵێكن ، یـان چەند چاوبەستەیەكە؟

---

[227] دائرة معارف قرن العشرين / ج١٠/ل: ٤١٤ – ٤١٥ سەیر بكە.

[228] دائرة معارف قرن العشرين / ج١٠/ل: ٤١٤-٤١٥.

کاریگەری جادوویی لە زۆر بواردا لە ڕێگای خەیاڵ و نەندێشەی دەستکردەوە پەیدا دەبن ، لێرەدا چەند هونەرێ هەیە بە هۆی بەکارهێنانی دەست ڕوودەدەن ، لە چەرخی نوێ دا کەسانێ هەیە توانای تەکنیکی پێشکەوتوویان هەیە خەیاڵ بخەنە مێشکی خەڵکەوە و کاربکە نە سەرگەوران ، بەلام کار ناکاتە سەر منداڵان ، چونکە کاری ئەوان سەرنجیان ڕاناکێشێ ، بەر لە پەنجا ساڵ پیاوێ هەبوو دەستی دەخستە ناو سەندوقێکی بچووکەوە دەنگی مۆسیقی لێوە دەهات ، بۆیە خەڵکی بە ساحیریان دادەنا دوای ئەوەی زۆرێ لە یاسا شاراوەکانی ڕابردوو دۆزرانەوە، ئەم فێڵە ئاشکرا بوو.

(کلارك ماکسویل) ئەو زانایە بوو لە ناوەڕاستی سەدەی (١٩)دا زۆرێك لەو یاسایانەی دۆزییەوە ، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە لەسەردەمێکدا دەژین چاخی شتە سەیرە زانستی یەکانە ، بەلام زانست بە دژوارییەوە نەبێ زۆرێ لەو شتە سەیرانە پەسەند ناکات ، بەهەرحاڵ لێرەدا زۆر دیاردەی سەیر هەیە دەبێ ناوڕیان لێ بدرێتەوە ، وەکوو دیاردەو نمونەی نەگۆڕ جەختیان لەسەر کراوە ، لەڕیزی پێشەوەی هەمووویانەوە (چارەسەری ڕوحانی) و (تلەپاتی –التخاطر الفراسة) و چالاکی تر ، کە زانستی ئاسایی ناتوانێ ڕافەیان لەبارەوە بکات و بۆ زانست دژوارن.

ئەو یاسا فیزیایی و زانستانەی پەیوەستن بەو بوارەوە لە تێبینی یە ئەزموونە ئاساییەکانەوە هەڵی یان گواستووە ، کە بە هەستە ماددەکان دەسەلمێن ، دەکەونە نێوان کاریگەرییە هەتسییەکان، کە مرۆڤ هەیەتی و نێوان هزری لۆژیکی یەوە ، دیسان ڕایەکی تر هەیە دەری دەخات ئەو زانستانەی هەستەکان وەری دەگرن سروشتێکی سنووردرایان هەیە ، بۆ نمونە : هەستەکان وەلامی زنجیرەیەکی جیاواز لە (لەرەلەرەکان –الذبذبات) دەدەنەوە ، ئەگەر ئەوە ڕووبدات ئەوە بێگومان واقیع هەمووی بە وەهمێ دادەنرێت .

لێرەدا پێویستە دیاردەی نائاسایی بەو واتایە پێناسە بکەین کە لە جۆرێکی هەرە بەرزە ، هەستەکانی مرۆڤ ناتوانن هەموووویان وەربگرن بەشێکی زۆر کەم نەبێ.

لە سییەکانی سەدەی بیستەمدا (جی . بی . راین) لە زانکۆی (دیوك) لە (نورت کارولاین) بە دۆزینەوەی ئەو بنەمایە زانستیانە هەڵسا ئەو دیاردە نائاسایی یانەیان لەسەر دادەمەزرێ ، ئەو زانایایە سەلماندی ئەو کاریگەرییانە گەر بەرهەمی هەستی سەروی ماددەبێ ، ئەوە دەتوانرێ ئەو کاریگەرییانە لە تاقیگەدا تاقی بکرێنەوە . چەند ئەزموونەکی دژواری ئەنجامدا ، کۆمەڵێ پلیتی هەڵبژارد (٢٥) دانە دەبوو . بەناوی (زنیر) ئەوانە کۆمەڵە نیشانەیەکی سادەیان لەسەر بوو (٥) دانە دەبوو . وەکوو (بازنە ، خاچ ، ئەستێرە ، هیڵی خوار و چەماوە...هتد) ، داوای لە پیاوێك کرد کە لە ژوورەکەی تەنیشتی دا دابنابوو ئەو کۆمەڵە پلیتە بخەملێنێ تا بزانێ تا چەندە ئەو خەملاندنە ڕاست دەردەچێ ، بینی لە کۆی (٢٥) قل (٥) دانەی ڕاست دەرچوو ، بەلام ئەو چاودێرەی دانابوو ، توانی ژمارەیێکی زیاتر لەو خەملاندنانە بەدروستی بێنێتەدی ، هەندێ لەو چاودێرانەی لە ژوورەکانی دراوسێ ی دا دانابوون توانیان لە ئاستێکی بالادا خەملاندنەکان (التخمينات) بە ڕاستی بپێکن ، لە کۆی (٢٥) دانە (٢٠) دانەیان هەڵبژاردنەکەیان ڕاست دەرچوو .

(گرنگی ئەو ئەزموونانە لەو بنەمایانە خۆی شاردۆتەوە کە زانستی پاراسایکۆلۆژیا لەسەریان دادەمەزرێ ، بەو مانایەی زانستێکە ڕێزی گشتی بەدەست هێناوە) ، بەلام ئەوەی لێرەدا پێویستە باسی بکەین مەسەلەی ئەو هێزە نادیارە زۆرە لەوە زیاترە کە بە خەملاندنێ دابنرێ بۆ هەڵبژاردنی ئەو و ئەم پلیتانە ، چونکە لەسەر خەملاندنێکی ڕووت دانا مەزرێ ، بەڵکو هێزێکی ترە کەباس دەکرێت.

لەکاتێکدا زانست لەکاروباری ماددی و ماددەی کۆڵیەوە ، پێی وابوو دەتوانێ هەموو ئەو دیاردانە لە بازنەیەکی زانستی ماددی دا ڕوون بکاتەوە ، بەلام دوایی دەرکەوت

ئەمە تەنیا خەیاڵێکە ، دیاردە نائاساییەکان مل بۆ چەند یاسایەك کەچ دەکەن لە بنەڕەتدا لەگەڵ ئەو سروشتەدا جیان زانست ڕاڤەی دەکات .

(ئێمە دیاردە نادیارەکان بەو مانایە وەسف دەکەین کە چەند ڕواڵەتێکی دیارن لە جۆرێکی زۆر بەرزن ، هەستەکانی مرۆڤ ناتوانێ بە تەواوی وەریان بگرن ، تەنیا بەشێکی کەم نەبێت).

لە سی یەکانی سەدەی بیستەمدا (جی – بی – راین) لە زانکۆی دیوك لە (نورت کارولاینا) بە دۆزینەوەی بنەما زانستی یەکانی ئەو دیاردە نائاسایی یانە هەڵسا ، دەری خست مادام ئەو کاریگەریانە بەرهەمی هەستی پەی پێ بردنی هەستی باڵان . ئەوە دەتوانرێ ئەو کاریگەریانە مل بۆ توێژینەوەی تاقیگەیی کەچ بکەن.[229]

عەللامە (حمید الازری) ڕاگری یەکێتی گەردووناسی جیهانی دەنووسێ : (سیحرو جادوو دوو بەشە : سیحری ڕەش و سیحری سپی ، سیحری ڕەش بۆ زیان گەیاندنە بە کەسانی تر ، وەکوو شێتی و بەدشانسی و سوتان و زیان دان لە ئەندامانی لەش و ماڵ و منداڵان ، بەزۆری ئەم سیحرە ئاکامەکانی هێواشە ، سیحری ئامانجی خێرو سوود گەیاندن).

کاتێ پێغەمبەر ﷺ لەلایەن (لبید)ی جولەکە سیحری لێ کرا تا حەوت ڕۆژ لەسەر جێگا نەخۆش کەوت ، لە خوا پاڕایەوە ، خوا سورەتی (الفلق)ی نارد بەویسی خوا چاك بووەوە.

یان موسا (علیه السلام) ساحیران پێیان وت : ﴿ قَالَ بَلْ أَلْقُوا فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ ﴿٦٦﴾ ﴾ طه: ٦٦ ، واتە : ئەی موسا یان ئێمە شتەکانی خۆمان فڕێ دەدەین یان تۆ یەکەم کەڕەت شتی خۆت دەهاوێژی ، فەرمووی ئێوە شتەکانی خۆتان یەکەم جار فڕێ بدەن ، کاتێ فڕێیان دان پەت و دار دەستەکانیان گۆڕان،

[229] عصر الخوارق / ل: (١٠-١١).

لەبەر چاوی ئەودا ئەو خەیاڵە پەیدا بوو کە بەهۆی سیحریانەوە دەجوڵێن ، موسا (علیه السلام) ترسی لە دڵدا پەیدا بوو ﴿ وَأَلْقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوٓاْ إِنَّمَا صَنَعُواْ كَيْدُ سَٰحِرٖۖ وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ ﴿٦٩﴾ فَأُلْقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدٗا قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ هَٰرُونَ وَمُوسَىٰ ﴿٧٠﴾ ﴾ طـه: ٦٩ ــ ٧٠ ، واتە : وتمان : ئەی موسا مەترسە ! تۆ سەر دەکەوی ، ئەوەی لەبەر دەستت دایە فڕێ ی بدە، ئەو فرت و فێڵەی ئەوان و چاوبەستەکی ئەوان هەڵدەلوشێ ، ئەوە فێڵی جاودووکار دروستی کردووە ، ساحیر لە هەرکوێ هاتبێ سەر ناکەوێ ، ئینجا ساحیران کڕنوشیان برد وتیان : بڕوامان بە خوای هاڕوون و موسا هێنا)[٢٣٠].

بەو پێیە سیحری ساحیران لێرەدا تەنیا فێڵ لەچاو و چاوبەستەکی بووە ، ئەوان توانیویانە بە ئیحای ڕۆحی خەڵکی هیپنۆتیزم بکەن ، بەخەیاڵ پێدان بە نەستیان واقیعی شتەکان بگۆڕن بە شتەکی تر ، بێ ئەوەی ڕاستییەکەی وابێ ، وەکو لە خەواندنی موگناتیسیدا دەیبینین ، بەڵام موعجیزە ڕاستییەو بە چەند یاسایەکی سەرووی سروشتی ڕوودەدات .

فەیلەوفی ڕوسی (ئۆسپینسکی) دەنووسێ : (موعجیزە دیاردەیەکە لەم دونیایەدا ڕوودەدات مل بۆ چەند یاسایەکی دونیای تر کەچ دەکات )[٢٣١].

بێگومان پێغەمبەران موعجیزەکانیان ڕۆشن بووە لە چاککردنەوەی نەخۆشی و زیندووو کردنەوەی مردووان و ڕاگرتنی خۆرو شەق کردنی مانگ و ...هتد . پێچەوانەی سیحر کە بەشێکی فێڵی چاوەو بەشێکی تر لە ئاستێکی نزمدا دەتوانێ کارە نائاسایی یەکان ئەنجام بدات ، بۆ نمونە : هیپنۆتیزم دەتوانێ تلەپاتی و سایکۆکینیزیاو قسە کردن لەگەڵ مردووان ئەنجام بدات ، بەڵام لە ئاستێکی نزمدا . بەڵام لە توانایدا نیە مردووو زیندووو بکاتەوە ، یان کوێری زگماك چاك بکاتەوە .

[٢٣٠] الابراج / حميد الازري / ل:١٦-١٧.
[٢٣١] عصر الخوارق /١٣.

یان مانگ شەق بکات و بگاتە ئاستی موعجیزەی پێغەمبەران ، لەبەر ئەوەش بوو ساحیرانی کۆشکی فیرعەون دوای بینینی ئەم موعجیزانە دوای بەر ڕەسی کردونیان لەگەڵ سیحری خۆیاندا بڕوا دەهێنن ، چونکە جیاوازی موعجیزەو سیحریان بۆ ئاشکرا دەبێت.

بێگومان سیحر جۆری هەیە ، سیحر هەیە فێڵی چاوە کە بە ئیحا لە دۆخی نەستدا وەکو خەیاڵێ لەبەرامبەر خەوێنراودا دروست دەکرێت ، وەکوو قورئان فەرموویەتی ﴿سَحَرُوٓاْ أَعۡيُنَ ٱلنَّاسِ﴾ الأعراف: ١١٦ .

جادوو هەیە (تەڵسمە) ، یان سیحر هەیە ترسە ، سیحری ڕەش هەیە بۆ جیاکردنەوەی ژن و مێردو کاری تری زیان گەیاندن :﴿فَيَتَعَلَّمُونَ مِنۡهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَزَوۡجِهِۦ﴾ البقرة: ١٠٢ .

سیحر هەیە مەجازییە هونەری دەستەو هیچی تر ، بۆ نمونە : جار هەیە ئەو کەسانە داردەستەکی بچووکیان بە دەستەوەیە ڕەشە ، پاشان هەندێ جووڵە دەکات و ورتە ورت دەکات دار دەستەکە دەگۆڕێ بە مار ، لەبەر چاوی خەڵکی وەکو واقیع دەردەکەوێ ، کەچی ڕاستییەکەی ئەوە نییە ، بەڵکو ئەم دارو دەستە بە وردەکاری دروست دەکرێت و ناوی بۆش دەکرێ ، ئەو مارەی دەخرێتە ناو ، قۆپچەیەکی بچووك بەلایەکی داردەستەکە وەیە دەکەوێتە دواوە ، کاتێ دەست دەگرێ بە قۆپچەکە ئەم داردەستە دەڕواتە ناو یەك و بە ئەندازەی گاو لە شقارتەیێکی لێ دێتەوە لەناو دەستی داو خەڵکی نابینن و خەڵکی تەنیا سەرقاڵی مارەکەن کە لەبەر چاویاندا دەردەکەوێ ، ئەم یارییە هونەرەکەی تەنیا ئەوەندەیە ، بڕوانە (الابراج / حمید الازری).

بەلاَم ئەم دیاردانەی بۆ غەیری پێغەمبەران و صددیقینەکان دەلوێ پێی دەگوترێ کەرامەت بۆ ئەولیاکان و خواناسان ، نمونەی ئەو دیاردانە زۆر لە سەرچاوەکانی عاریفاندا وەکو (طبقات الصوفیة / المناوی) و (حلیة الاولیاء / ابو نعیم) و (نور

الابصار / الشبلخي) و (طبقات الكبرى / الشعرانى) و (روضة الرياحين في حكايات الصالحين ، اليافعى).

(كلاباذي) له كتێبی (التعرف المذهب اهل التصوف)داو (القشيرى) لە (رسالة القشرية) دا پێناسەی کەرامەتیان کردووە کە چەند کارێکی نائاساییین لەسەر دەستی ئەولیایان ڕوو دەدات وەکو ڕۆیشتن بەسەر ئاودا و قسە کردن لەگەڵ گیاندارانداو زەوی نزيك بوونەوە بۆیان (طي الارض) و دەرکەوتنی شت لەبەرچاویاندا کەچی لە کاتی خۆی دا نییە ، (النووى) لە (بستان العارفين)دا دەڵێ: مەزهەبی ئەهلی حەق بڕوای بە کەرامەتی ئەولیا هەیە و لە هەمووو چاخەکاندا ئیسپاتی دەکەن ، بەشێکی جوزئی یە لە موعجیزەی پێغەمبەران ، بۆ نمونە خەونی ڕاست بەشێکە لە (٤٦) بەشی وەحی پێغەمبەرایەتی ، وەکو لە فەرموودە صەحیحەکاندا هاتووە : (الرؤيا الصالحة جزء من ستة واربعين جزءا من النبوة) رواه البخاري.

## گەشەدان بە وزەو توانستە ڕوحیەکان و ڕاهێنانەکان بۆ گەیشتن بە گەردوونی نادیار و کردگار :

### ئیعجازی (٤٤) : مەبەست لە چالاکی یە پەی پێ بردنەکان (المهارات الادراکیە) و چالاکی یە دەرکردنەکان(المهارات الابرازيه ):

پرۆفیسۆر (ئەنایید هۆفمان) دەنووسێ : (بەزۆری سوختەکان و فوتابیان و مریدان ئامۆژگاری دەکرێن ، کە توانا ڕوحیەکان و دەروونییەکان بەهۆی شوێنی کەوتنی هەستی سەرەتایی یان پەرە پێ بدەن ، بۆچی؟ چونکە هەستی سەرەتایی تۆ لە مێشکی بنەڕەتی یەوە (primary brian) هوە دێ ، واتە : نیوە مێشکی ڕاستە ، کە شوێنی هێزی تێگەیشتن (القوى الحدسية) ، کە کەم کەس هەیە بەکاری بێنێت . هەرچی تیۆرەکان و کردارە هزریەکان و خەملاندنەکانە (التخمينات) سەر بە (نیوە

مێشکی چەپەن) ، بە مێشکی لاوەکی (الثانوي) ناو دەبرێ ، بەرپرسیاری باری ئاسایی هۆش و تەواوی کردارەکانی ژیانە .

لەگەڵ گەشەپێ دا لامێشکی ڕاستداو هەستە سروشتی یەکاندا کە لەگەڵیاندا لەدایك بووی دەروازەی تازەت بۆ دەبنەوە بۆ پەیوەندی کردن لەگەڵ خەڵکی دا هەست بە ناخ و ناو دڵیان دەکەی ، هەست بە وزەی بنەڕەتی بیری خەڵکی و هەستەکانیان دەکەی ، دەتوانێ ئەم هێزە ڕوحی یە بەکاربێنی کە بە هێزی سەرو (الوعي المتفوق) ناسراوە ، دەکەوێتە لای ڕاستەوە ، واتە دواوەی هەستی سروشتی (الوعي الطبيعي) یەوە.

دیسان دەنووسێ : (ئەم دوو چالاکیەی پێویستە پەرەیان پێ بدرێ (چالاکی پەی پێ بردن و چالاکی دەرکردن و بلاوکردنەوە)یە ، **نمونەی سەرەکیمان بۆیان تلەپاتی** (التخاطر العقلي Mental telepathy) **بۆ ئەنجام دانی ئەم ئەزموونە پێویستی به دوو کەسە ، یەکەم شەپۆل ڕەوانە بکات و دووەم شەپۆلەکان وەربگرێ ، بەم پێ یە ئەم دوو دیاردەیە لێك جیان ، دەتوانرێ نامەکان ڕەوانە بکرێن یان وەربگیرێن ، بەلام لەیەك کاتدا هەردووکیان ناتوانرێن .**

**تەواوی چالاکییە ڕوحییەکان و دەروونییەکان لەم پۆلین و پۆلێنی تردا دا دەنرێت ، واتە : یان شەپۆل و دیاردەیێ دەنێری یان وەری دەگریت.**

**چالاکی دەرکردن (الابرازية) و بەرێ کردن یارمەتیت دەدات بۆ زاڵ بوون بەسەر تیشکە تایبەتی یەکانی لەرەلەرەکان (الذبذبات)ت ، کاتێ ژوانی دوو کەسایەتی دەرەکی و ناوەکی دێتە ئاراوە ، لەیەك کرداردا توانای دەرکردن (الابرازيه) ڕوودەدات ، ئەتوانین بەم چالاکیە بگوترێ : (هزر بەسەر ماددە زاڵ دەبێت) نمونەی ئەم چالاکیە ڕوحیانە بریتییە لە (تلەپاتی –التخاطر- telepathy) و جولاندنی تەنەکان لە دوورەوە (سایکۆکینیزیا) و شوێن گۆڕین (teleportation) و ئامادەکردنی گیانی مردووان (mater ializtion) و برینسازی دەروونی**

(psychicsurgery) و چارەســـــــــەری دەروونـــــــــی (psychichealing) و بەرزبوونـــەوەو فـــڕین و دەرچـــوون لـــەهێزی کـــێش کردنـــی زەوی (Levitation) و وێنەگرتنی دەروونی (psychicphotography) ، بـەڵام کارامەییـەکانی پـەی پـێ بـردن (الادراكیـة) یارمـەتیمان دەدات بـۆ وەرگرتنـی زانیارییـەکان و وزەو شـارەزایی هۆشیاری پێك دێنێ ، لەوانە پەی پێ بردنی هەستی سـەرو (الادراك الحسـي الفـائق – ESP) و ڕۆشـــن بینـــی (الاستبصـــار) (الفراســـة) (clairvoyance) و تلـــەپاتی (التخـــاطر – telepathy) و پـــێش وەخـــت زانـــی (المعرفـــة المســـبقة – precognition) و دەروون خوێندنـــەوە (psychic reading) و دەســـت نیشانکردنی دەروونی (التشخیص النفسي) .

زۆر کەس بوونە خاوەنی ئەم کارە نائاسایی چالاکیانە و تـێ یـدا قـووڵ بوونـەوە ، بـۆ نمونە (د.ریچارد ئەلبەرت) کە لە بەشی توێژینەوەی دەروونی دا لە زانکۆی (هارڤارد) کـار دەکـات ، ئـەم زانایـە لـە ژێـر نـاو و نیشـانی (ram dass) دا ناوبـانگێکی بـاش بەدەست دێنێت ، لەکاتێ دا بە مامۆسـتایەکی (یـۆگی) دەگـات لـە هیندسـتاندا بـەناوی (نـیم کـارولی بابـا) پێـی دەڵـێ کـە بـەر لـە هـاتنی ئەلبـەرت دا سـەیری ئەسـتێرەکانی کردووە بیری لە دایکی کردۆتەوە ، کە بەر لەساڵێ مردوووە ، پاش ئـەوەی یـۆگی یـە کە لە وەسفی مردنی دایکی ئەودا قووڵ دەبێتەوە ، کە بە خەمۆکی (الکابە) دەمـرێ . گومانی لەلا نـامێنێ کـە ئـەو یـۆگی یـە توانـای ڕوحـی بـەرزە ، بۆیـە دەسـت بـەگریان دەکـات بـەبێ وەسـتان ، لـەو کاتـەوە ئـەو بـوو بـە مامۆسـتا ئەلبـەرت و نازنـاوی (رام داس)ی وەرگرت ، دەست دەکات بە گەشەپێ دانی توانا ڕوحیەکانی تا دەبێتە مامۆستا بۆ چەند کەسانێك.

(عەمانوئیل سوید نبرگ) یەکێکە لە زانایانی سـەدەی هـەژدەم ، بێـوەژنێ ڕاوێـژی پـێ دەکات لە مەسەلەی بزر کردنی شتێ و داوای لێ کرد یارمەتی بـدات بـۆ دۆزینـەوەی و توانا ڕوحیەکەی بەکار بێنێ ، دوای سێ ڕۆژ ئەم زانایە سـەردانی دەکـات تـا پێـی بڵـێ

ئەم شتە ون بووە لە ژووری سەرەوەدا لە یەکێ لە چەکمەجەکانی مەکتەبەکەدایە لە لای چەپەوە ، کە چەکمەجەیەکی نهێنی دەبێ ...)[232].

**ئیعجازی ( ٤٥ ) : ( ئامادەسازییەکان ) بۆ گـۆڕان بەمریـدو صـۆفی و کەسێکی ڕوحـانی و پاراسایکۆلۆجی :**

**( بیرکۆکردنەوە ) یان ڕامان و چاوچڕکردنەوە ( التأمل )"**

بێگومان بیرکۆکردنەوەو ڕامان (ترکیز الانتباء) وەکو (ئەنایە هۆفمان) باسی کردووە ، لە تەواوی چالاکی یە ڕوحیەکان لەپێشترە بۆ گەشە پێدانی توانا ڕوحی یەکان ، کاتێ بیرمان لەسەر گفتوگۆو کرداریێ بۆ دەکەینەوەو چەق دەبەستێ ، ئەو کات بەشداریمان (١٠٠٪) بەڵام زۆربەمان ئەم کارە ناکات ، ڕاهێنانەکان بۆ گەشەدان بەم توانا ڕوحی یانە بە تاکی (solo) دەبێ یان بە کۆمەڵ (group) دەبێت.

گەر سەیری کتێبە ڕوحانییەکانی ئیسلام بکەین وەکو (الفتح الرباني والفیض الرحماني) / الشیخ عبدالقادر الكیلاني) و (الرسالة القشیریة) و (مكتوبات الرباني) و (اللطائف الاعلام / القاشاني) و (التعرف لمذهب اهل التصوف/الكلاباذي) ... هتد ، دەبینی بیرکۆکردنەوە یەکەم خاڵی سەرەکی یە بۆ دەست کردن بە خواپەرستی و سۆفیگەری .

قورئان و سوننەت زۆر بەڵگەیان لەم بارەوە پیشان داوە ، کە پێویستە بابای خواپەرست و مریدو عاریف بۆ سەر خستنی خواپەرستی یە کانیان بیریان کۆبکەنەوە ، بەڵام ئەم بیر کۆکردنەوەیە ئەرکێکی ئیمانی یەو دەبێ لەسەر (خودا) بێت ، (الذكر) واتە : یادەوەری ، کە دەبێ لەسەر زاتی خودا چەق ببەستێت و هەمووو شتێکی تری دونیای لە یاد بکرێت.

---

[232] تطوير المهارات النفسية / انايد هوفمان / ل: (٥-٢٨) .

﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ﴿١٤﴾ ﴾ طه: ١٤ ، **واته : نوێژ بۆ یادی من بکە.**

﴿ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾ الرعد: ٢٨ ، **واته : بێگومان بەیادی خوا دڵان ئارام دەبن.**

﴿ وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا ﴾ طـه: ١٢٤ ، **واتـه : كـێ پشـت لەیادی من بكات ژیانەكی پڕ لە ئازارو ئەشكەنجەی دەبێت.**

﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ ٱسۡمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾ بَلۡ تُؤۡثِرُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ﴿١٦﴾ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ ﴿١٧﴾ ﴾ الأعلى: ١٤ – ١٧ ، **واته : بەڕاستی ئەو كەسەی خۆی پاكژ كـردەوە سەركەوت ناوی پەروەردگاری هاورد و یادی كردو نوێـژی كـرد ، بـەڵكو ئەوانـە ژیـانی دونیا هەڵدەبژێرن ، كەچی ژیانی پەسلان باشترە بۆ هەڵبژاردن و دەمێنێتەوە .**

﴿ فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ﴾ المـــاعون: ٤ – ٥ . **واته : هاوار بۆ ئەو نوێژ كەرانەی لەنوێژیاندا بێ ئاگان (و تەركیزیان نییە).**

**بێگومان نوێژی هۆشیارانە ، كە یادی خوای تێدا دەكرێ و بیری تێـدا چـەق دەبەسـتێ چاوی تێدا چڕدەكرێتەوە لەسەر زاتی خواو پێغەمبەر ﷺ و پەسلان دڵ و دەروون و هەست و نەست پاكژ دەكاتـەوە لـە هـەمووو بیرێكـی سـەلبی و وزە ڕوونـاكی یـان پـێ دەدات . لـە فـەرموودەدا هـاتووە :** (الصـلاة النـور) رواه القضـاعي ، **واتـە : نوێـژ ڕووناكی بڕواداره.**

(الدعاء سلاح المؤمن ، وعماد الدين ، ونور السماوات والارض) رواه الحاكم / صحيح ، **واته : پاڕانەوە چەكی بڕواداره ، ستوونی ئایینـه ، ڕوونـاكی ئاسمانـەكان و زەوییە** ، (الصلاة علي نور على الصراط) رواه الدار قطني ، **واته : سەلاوات دان لە دیداری من ڕووناكی لەسەر پردی سیراتدا.**

(ڕوونالد . م .ماکری) دەڵێ : (نورمان فنست بیل) نووسەری کلتوری ناسراو لەم بارەوە دەنووسێ : (بە ڕێگای دروست فێری نوێژ ببن و خۆتان لەنوێژی بێ ئاگا بپارێزن) بیری ساغ وزەو ڕووناکی یەکی نائاسایی گوڕ دەدات ، (بیل) دەڵێ : ئێوە وزەو ڕووناکی یەکتان لەناخدایە دەتوانێ شاری نیورك گڕبدات و بیکاتە خۆڵەمێش . فیزیای پێشکەوتوو ئەوەمان پێ دەڵێت.[٢٣٣]

(ولیەم جێمس) مامۆستای فەلسەفە لە زانکۆی (هارفارد) دەڵێ : (گەورەترین چارەی دڵەڕاوکێ بێ گومان ئیمان و بڕوایە) ، (بڕوا لەو هێزانەیە پێویستە هەبێ بەمەبەستی یارمەتی دانی مرۆڤ لەژیاندا ، نەبونی بڕوا واتە پەك خستنی مرۆڤ لە دژوارییەکانی ژیاندا)[٢٣٤].

ئەوە تا قورئان بەر لە (ولیەم جێمس) فەرموویەتی : (قد افلح من تزکی) وەکو باسکرا .

ئیمام عەلی (سەلامی خوای لەسەر) لە (غرر الحکم) دا فەرموویەتی : (تعلموا القرآن فانه ربیع القلوب ، واستشفوا بنوره فانه شفاء الصدور).

(د.ئەلیکس کاریل) لە کتێبی (الانسان ذلك المجهول) دا دەنووسێ : (نوێژ گەورەترین سەرچاوەی گەرمی و وزەو ڕووناکییە بۆ مرۆڤ ، وەکوو کانزای ڕادیۆم لە سەرچاوەی تیشکاوەری و چالاکی یە ، خەڵکی بۆ نوێژ پەنا دەبەن تا چالاکی یان تیژ بکەنەوە ، لە ژیانمدا نەم بینیوە کەسێ لە خوا پاڕابێتەوە ناکامی باشی دەست نەکەوتبێت)[٢٣٥].

(ولیەم فالکیر ئەتکینسون) دەنووسێ : (ئەرکی هزری و گرنگی دان کە مرۆڤ لەکاتی کاردا ئەنجامی دەدات تەنیا کۆکردنەوەی بیرەکی بە مەبەستانە ، هەر کەسێ لە ژیانی

---

[٢٣٣] حروب العقل / روونالد م .ماكري / ل:١٣٠.
[٢٣٤] دع القلق وابدء الحياة / دايل كارنجى / ل:١٧٠.
[٢٣٥] دع القلق وابدء الحياة / دايل كارنجى / ل :١٧٤.

**ڕۆژانەی بیری کۆ بکاتەوە بە کرداری و هەموو دالْغەو خەیالّێکی دەرەکی شێوێنەر دووربخاتەوەو ڕۆژانە توانای هزری بەکاربێنێ هەمیشە لەم کارەی باشترە کە بیر کۆکردنەوەو سەلیقەیی تێدا بەکارنەهاتووە) .**

**(ئەو مرۆڤەی توانای کۆکردنەوەو سەلیقەیی هەیە چەکێکی بەدەستەوەیە دژ بە هەرەسهێنانی ڕوحی ، چۆن و بۆچی؟ بە کورتی چونکە هەمووو بیرە بێزار کەرەکان لەدلّدا فڕێ دەدات و بیر لەسەر وێنەیەکی باش کۆ دەکاتەوە).**

**(بیر کۆکردنەوەو گرنگی دان بە بابەت و چالاکی یەك وەکو تیشکۆ (البؤرة) وایە . هەمووو ڕاهێنانی بە ئامانجی بیر کۆکردنەوە (تەرکیزی فکری) بۆ لابردنی بیری لاوەکی لە ڕێگای ویست ئیرادەوە بەهایەکی گەورەی هەیە)**[٢٣٦].

**لە فەرموودەدا هاتووە :** (تفكر ساعة خير من عبادة سنة) مكاشفة القلوب / **غەزالی ، واتە : ڕامان و بیر کۆکردنەوەی سەعاتێك باشترە لە خواپەرستی سالّێك .**

**ڕامان و بیر کۆکردنەوە (ویست) بەهێز دەکات ، تواناو هالە موگناتیسی ڕوحی بەهێز دەکات ، هەستە ڕوحیەکان دەکاتەوە ، بیرو دالْغە سەلبی یەکان ڕەش دەکاتەوە .**

**(نور) مەبەست (هالەی موگناتیسی) یە کە ڕابردوو باسکراوە ،** (د. وهبة الزحيلي) **لە کتێبی** (الفقه الاسلامي وادلته) **دا ئاماژە دەکات ، کە پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی د سەیری خالّی سوژدەی کردووە ، بەم پێیە بیری لەسەر خالّی سوژدەدا کۆکردۆتەوەو ڕاماوە لەنوێژدا .**

**لە (خود هیپنۆتیزم / کابوك) ئاماژە دەکات ئیمام عەلی (ڕەزای خوای لەسەر بێت) لە نوێژی ڕاماندا کە بەنج دەبێ نەشتەرگەری بۆ دەکرێت.**

**چەقی سۆفیگەری و ڕامانی یۆگایی لەسەر بیر کۆکردنەوە دادەمەزرێت.**

---

[٢٣٦] قوة الفكر في الحياة العملية / وليم فالكير تكينسون / ل:١٠١-١٠٥.

شێخی گەیلانی (قدس سره) فەرموویەتی : (هاوار بۆ تۆ بەخۆت دەڵێی سۆفی، تۆ لێڵ و تلْخنی ، سۆفی ئەو کەسەیە ڕواڵەت و ناخی پاکژ کردۆتەوە بەشوێن کەوتنی کتێبی خوای گەورەو سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ ، تا زیاتر دڵ پاکژ بکاتەوە لە دەریای بوونی خۆی دەردەچێ ویست و ئیرادەی لە سەفای دڵدا وازی لێ دێنێ ، بناغەی چاکە پەیرەو کردنە لە پێغەمبەر ﷺ لە گوفتارو کرداردا ، تا بەندە دڵ پاکژ بکاتەوە پێغەمبەر ﷺ لە خەونی دا دەبینێ فەرمانی پێ دەکات بە شتێ قەدەغەی دەکات لە شتێك ، هەموووی دەبێ بەدڵ و بوونیشی نامێنێت...)[٢٣٧].

دیسان شێخ دەفەرموێ: وشەی (التصوف) لە (صفا)وە وەرگیراوە نەك لە پۆشینی خوری (صوف) ، سۆفی ڕاستگۆ ئەو کەسەیە دڵی پاکژ دەکاتەوەو گسکی لێدەدات دەدات تەنیا جێگای کردگاری مەزنی تێدا دەکاتەوە[٢٣٨].

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (ان هذا القلوب لتصدأ ، وان جلاءها قراءة القرآن وذكر الموت وحضور المجالس)[٢٣٩] ، واتە : ئەم دڵانە ژەنگ دەگرن ، بە قورئان خوێندن و بیری مردن و کۆڕی زیکر پاکژ دەبێتەوە ، بێگومان مریدەکان بە قورئان خوێندن و کۆڕی زیکر دەتوانن ببنە سۆفی و بیری خۆیان لەسەر (الله)ی شکۆدار کۆ بکەنەوەو لە هەست و نەستیاندا بیروێنن بۆ گۆڕان بۆ کەسێکی ڕوحانی بەهێزو بڕینی حاڵەتەکانی سۆفیگەری مەقامە یەك لە دوای یەکەکانی لەژێر یارمەتی شێخی کامل و تەواوکەردا .

لە داهاتوو کتێبەکمان هەیە لەسەر سۆفیگەری بەناوی ( چەند ڕاستییەك لەسەر سۆفیگەری/عبدالقادر عیسی/ و: محمد سەرگەینێڵی).

---

[٢٣٧] الفتح الرباني / السيد القطب عبدالقادر الكيلاني / ل:٢٠٠.
[٢٣٨] الفتح الرباني / السيد القطب عبدالقادر الكيلاني / ل: ٩٥.
[٢٣٩] الفتح الرباني / السيد القطب عبدالقادر الكيلاني / ل: ٨٩.

**( ڕاهێنان )**

**(ئەنایدهۆفمان) باس دەکات بۆ ڕاهێنانی بیر کۆکردنەوەی تاکە کەسی پێویستە ئەم ڕاهێنانە بەردەوام لەساتی دیاری کراودا ئەنجام بدەیت : (بە حەسانەوە پاڵ بکەوەو هێور ببەوەو چاوەکان دابخەو بڵێ (یەك) لە دووبارەکردنەوەی ئەم وشەیە دەوام بکە تەواوی داڵغەکانی ناو مێشکت دەسڕییەوە ، پاشان بڵێ (دوو) ، دووبارەی بکەوەو پاشماوەی داڵغەکانی ترت دەسڕێتەوە ، پاشان برۆ ژمارە (سێ) ...هتد ، ئەم ئەزموونە تاقی بکەوە بەهۆشیارانەو ئاگات لە پچڕانەکان بێ ، ئامێرێکی کات دیاری کردن لەپشت سەرت دا دابنێ و سێ خولەك دابنێ بۆ دووبارەکردنەوەی هەمان مەشق)[240].**

**لە دۆخی سۆفیگەری دا ڕامان لەسەر وشەی (الله) و پێغەمبەر ﷺ و مردن و پەسلانە ، لە کۆڕی زیکردا یان زیکری تەنیایی دا .**

**ئیعجازی ( ٤٦ ) : دۆخی خۆخاوکردنەوە ( الاسترخاء ) Relaxation و ڕاهێنان :**

**لەباری خۆ خاوکردنەوە** (النفي والاثبات) **دەوترێ، واتە** (لا اله الا الله) **و ناوە جوانەکانی خوداو لە تیفە ڕوحیەکان زیندووو دەکرێنەوەو دەخرێنە چالاکی یەوە . کە قورئان زیندووو دەکرێنەوەو دەخرێنە چالاکی یەوە ، کە قورئان بە (اللین) ناوی بردووە** ﴿ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ اللَّهِ ﴾ الزمر: ٢٣ **، واتە : پاشان پێست و دڵتان نەرم دەبێتەوەو خاو دەبێتەوە بۆ یادی خوا .**

**مەبەست لە پێست لەشە ، دڵ هزر و نەستە .**

**(ئەنایدهۆفمان) دەنووسێ : (گەر بتەوێ ئاخت وەڵامت بداتەوە دەبێ لەش و هزرت لەباری خاوبونەوەدا بێ ، چونکە ڕۆشن بیریمان لە سەر گرژی دادەمەزرێ ، دژوارد**

[240] تطوير المهارات النفسية / ل:٣٣.

بچینه دۆخـی  خاوبونـەوە ، بـەڵام گـەر هونـەری خـۆ خـاو کردنـەوە نـەزانی نـاتوانی چالاکیە ڕوحییەکان بەدەست بێنیت.

**( ڕاهێنان )**

ڕاست بوەستەو دەست بە ئاڕاستەی سەقف و بان بەرز بکەوە ، هەوڵ بدە بەپێی توانا ماسولکەکانت تونـد بکـەو دوایـی هێـواش و خاویـان بکـەوەو بەهێواشـی بەکاربێنـەو وردە وردە دەست بێنە خوارەوە بۆ باری ئاسایی خۆی بگێڕەوە ، دوایی سـەیر کـە کـام ماسولکەیەت گـرژە ، ئـەم ڕاهێنانـەی بەسـەردا پیـادە بکـە تـا هەسـت دەکـەی تـەواوی ماسولکەکانت لەباری نەرمی و خاوبوونەوەدایە.

**ئیعجازی ( ٤٧ ) هەناسەدانی قووڵ ( التنفس ) Breathing و ڕاهێنان :**

ئیمام عەلی (سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی : (تفكر قبل ان تعزم) ، واتـە : بەر لە بڕیار دان ڕابمێنە ، (من فكر قبل العمل كثر صـوابه) واتە : کێ بـەر لـە کـار بیربکاتەوە ڕاستی پێکانی زۆر دەبێت .

(ئەناید هوفمان) دەنووسێ : هەناسەدانی لەبار بە بناغەی خۆ خاوکردنـەوە دادەنـرێ ، زانـراوە خـەڵکی بـارگرژ بەشـێوەی ڕۆتینـی هەناسـە دەدەن ، بـەڵام ئەوانـەی لـەباری خاوکردنەوەدان بەقووڵی هەناسە دەدەن ، ئـەو ئۆکسـجینەی هـەڵی دەمـژین (وزە) بـۆ تـەواوی لـەش دەگوازێتـەوە ، بـەڵام هەناسـە دانـەوە دووەم ئۆکسـیدی کـاربۆن فـڕێ دەداتەوە ، گرژی و شڵەژان لە کەڵە بوونی پاشماوەکانی هەناسە دانەوە پەیدا دەبێت.

هەناسـەدانی گونجـاو لـەناو پەنچـك (الحجـاب الحـاجز)ەوە ، دەسـت پـێ دەکـات ، کـە ماسولکەیێکە لەژێر سی یەکانەوە ، بە کرداری گرژبوون هەڵدەستێ بۆ ڕاکێشانی هەوا

بۆ دەردووەو کشان بۆ ڕێدان بە چوونە ناوی هەوا ، هەوڵ بدە چۆن ناو پەنچك بەشێوەیەکی لەبار بەکاردێنی تاوەکو یارمەتی تۆ بدات بۆ هەناسەدانی باش لە هێنانەدی دۆخی خۆخاوکردنەوە (الاسترخاء).

**( ڕاهێنان )**

هەردوو دەستت لەسەر کەلەکەکان دابنێ ، ئاڕاستەی پەنجەکانت بەرەو پێش بێ جگە لە پەنجەی گەورە با بەرەو دواوە بێ ، فشار بخە سەر کەلەکەو ناو بەژنت ، بەقووڵی هەناسە هەڵمژە . لەگەڵ جووڵەی ناو پەنچکدا هەوڵبدە دەستەکانت لەیەکتریان بکێشەوە ، ناو پەنچك شێوەیەکی چەماوەیی وەردەگرێ بۆ سەرەوە ، کۆتایی یەکەی نزمە ، کە دەکەوێتە کەلەکەتەوە ، بەشی سەرەوەی لەژێر سییەکانتدایە لەکاتی فراوان بونی کۆتایی یەکان بەشی سەرەوەی تەخت دەبێ ، لەبەرئەوە ئەوە ڕوو دەدات سی یەکان لەکاتی فراوان بوون بۆ ژێرەوە دەکێشن ، لەکاتێ دا هەناسەوە دەیەوە دەبینی ناو بەژنت تەنگ بۆتەوە ، **بەم خەیاڵە ئەم ڕاهێنانە دووبارە دەکەیەوە ، کە تۆ وزەیێکی حەسێنەرەوە هەڵدەمژی** ، کە وزەی خاوبوونەوەیەو گرژی دەماری **(التوتر للعصبي) فڕێ دەدەیت**[241].

## **ئیعجازی ( ٤٨ ) دڵنیایی یەکان ( التوكيدات )** ( Affirmation )

**دڵنیایی و متمانە** بە خود بریتییە لە ڕاگەیاندنێکی ڕوون و بێ پێچ و پەناو دوودڵی ، **کاتێ دەڵێ** ی من دەروون زانم یان دەروون زان نیم ، ئەمە جەخت کردنە ، دڵنیایی یەکان بارێکی دەروونی نەستە (اللاشعور) هزری بەرنامەکراو (المبرمج) دڵنیایی یەکان بەرنامەڕێژی بۆ دەکەن ، هەر شتێ بە قەناعەتی وەی بڵێن ، یان بە توانای سۆزەوە

---

[241] تطوير المهارات النفسية / ل:٣٧.

دێته ئاماده ، بەرنامە کردنەوەی دەروونی ناخ (نەست – النفس الداخلی) پێویستی بەجەخت کردنی ئیجابی هەیە ، بە تایبەتی چەند ساڵێکە لەسەر جەخت کردنی سەلبی ڕاهاتوی ، کەبە دووبارەو سووربوونەوە بووە .

کاتێ دەست بەدیار بوونەوە دەکەی دەربارەی ئەو قسانەی دەیکەی یان بیر یان لێ دەکەیەوە ، لەبارەی ئەو قسانەوە سەرت سوڕ دەمێنێ کە لەبارەی خۆت و دونیات دەیلێ ی ، هەوڵ بدە گرنگی زۆر بەو قسانە بدەی دەیانڵێی یان بیریان لێ دەکەیەوە ، هەر کەبیرەکی سەلبی دەبینی بە بیرەکی ئیجابی ئیحای خۆت بکەو لای ببە ، بۆ نمونە : ڕستەی (ئەمە گەوجی یە)

ڕستەی (داهاتوو لە ئەزمونی تازەوەم فێر دەبم) ی پێدا بکێشە شتە دڵنیایەکانی خۆت بنوسەوە ، هونەری نوسینەوەی بیروبڕوا دڵنیاکانت یارمەتیت دەدات بۆ کۆکردنەوەی بیری لە هزری بەرنامەکراوت دا ... **نەست هەر بیرو ڕایەکی بیری لە هزری بەرنامە کراوتادا ... نەست هەر بیروڕایەکی ئیحای بکەی نابێتە لەمبەر هەمووو شتێ قبوڵ دەکات** .[٢٤٢]

بێگومان وەکو ڕابردوو باسکرا مرۆڤ هەمیشە لەژێر کاریگەری ئیحاو پێ گوتنەکاندایە ، بەتایبەتی ئەو بیرو بڕوایانەی دڵنیای لێیان، قورئان فەرموویەتی: ﴿ لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَـٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ ۖ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۚ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ حِزْبُ ٱللَّهِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾ المجادلة: ٢٢

---

[٢٤٢] تطوير المهارات النفسية / ل: ٣٨.

﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ﴾ الأنفال: ٢

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُوا۟ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ فصلت: ٣٠

﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾ الرعد: ٢٨

**لێرەدا دەبینی بڕوای ڕاستەقینەو یادی خواو قورئان خوێندن و پشت بەخوا بەستن (التوكل على الله) و پاڕانەوەو دوعاو داواكردنی لێ بوردن لە خوا (الاستغفار) گەورەترین دڵنیایی مرۆڤی بڕوادارن ، دیسان قسەی باش و بیركردنەوەی باش بەشێكی گەورەن لە ئیحا ئیجابیەكان ، كە پێویستە دەروونی بەرنامە كراویان پێ بەرنامە بكرێت ، پێویستە دڵ و دەروون و هزر لەبیركردنەوە خراپەكان و داڵغەو وەسوەسە سەلبی یەكان بپارێزرێت ، وەكوو باسكرا، ﴿ دیسان لەم كاتەدا توانای ڕوحی و پەیوەندیت بەهێز دەبێت لەگەڵ دونیای ناوەوە و دەرەوەدا ﴾.**

**لە فەرموودەدا هاتووە :** (الايمان الاقرار باللسان ، وتصديق بالقلب ، وعمل بالاركان) رواه الشيرازي في الالقاب ، **واتە : بڕوا بڕیار دانە بە زمان ، بە ڕاست دانانە بەدڵ ، كردارە بە ڕوكنەكان.**

**ئیمام عەلی (ڕەزای خوای لەسەر) فەرموویەتی :** (تعلموا القران فانه ربيع القلوب ، واستشفوا بنوره فانه شفاء الصدور) . (غرر الحكم) ، **واتە : فێری قورئان ببن بەهاری دڵانە ، بە ڕووناكی قورئان خۆتان چارە بكەن ، ئەو شیفای سینەكانە .**

(ان الله سبحانه وتعالى جعل الذكر جلاء للقلوب) (نهج البلاغة) ، واته : خوای گەورە و بێ گەرد یادو زیکری کردۆتە پاکژ کەرو خاوێن کەرەوەی دڵان.

(انما قلب الحدث كالارض الخالية ما القي من شيء قبلته) ، واته : دڵی منداڵ وەکو زەوییەکی خاڵی یە چی بخەیە ناو قبوڵی دەکات .

بەو پێیە بڕواو دڵنیایی و ئارەزومەندی کلیلی سەرکەوتنن، گەورە پیاوان بەو بڕواو دڵنیایی بە یارمەتی یان وەرگرتووە بۆ سەرکەوتن لەکاروبارەکانیاندا .

**( ڕاهێنان )**

لیستێ بنوسە (١٠) کرداری ئیحای تێدایە لەبارەی تواناو ڕاهێنانی ڕوحی خۆت ، پاشان لەبەر دەم ئاوێنەدا بە دەنگی بەرز بیانخوێنەوە ، کاتەکی باش ببە سەر بۆ دووبارە کردنەوەی وشەکان تا وشەکان لە دڵتدا دا دەمەزرێن یان سێ کێشەی خۆت باس بکە کە دەتەوێ لە ژیانتدا بیانگۆڕی ، بەر لە نووستن و دوای نووستن دووبارەیان بکەوە ، ئیمام عەلی (سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی : (صيام القلب عن الفكر في الاثام افضل من صيام البطن عن الطعام) (غرر الحكم) ، واتە : بەڕۆژوو بوونی دڵ لەبیر کردنەوە لە گوناه باشترە لە ڕۆژوی سك لە خۆراك ، بۆ نمونە : من واز لە جگەرە کێشان دەهێنم ، من دەست بە نوێژ کردن دەکەم ، من ئازام ، من درۆ ناکەم ، یان دەتوانی بەشێوەی پاڕانەوە لەخوا دەریان ببڕی وەکو : خوا یارمەتی من بدە بۆ واز هێنان لەم کارە ، یان یارمەتی من بدە بۆ یارمەتی دانم لە کردنی ئەم کارەدا ، خوایە ئەم ئازارەم لەسەر لاببەیت. دوعا قورئانی و فەرموودەکان باشترین ئیحان بۆ دڵنیایی دان و پەیوەندی بەهێزی سەروو و داواکردنی پێویستیەکان وەکو ( الأذكار النووي ) و ( التحفة التذاكرين/الشوكاني )...هتد.

(د. میلان ریزل) دەنووسێ : ( ڕاستە لە بێداریدا دەتوانین ئیحا بە خۆمان بدەین . بەلأم لەباری هیپنۆتیزم دا ئیحاکان کاریگەرییان زیاترە ، بۆیە پێویستە خود هیپنۆتیزم (التنویم الذاتي) فێر ببی ، لێرەدا زۆر ڕێگا هەیە بۆ خود هیپنۆتیزم وەکو لە دانیشتنی خەواندنی موگناتیسی ئاسایی و نوێژدا کە تەرکیزو ڕامانی تێدایە ، یان ناوەندی ڕوحی ، یان رامان و یۆگا).

(گەڕانەوەیەکی ترمان هەیە بۆ نوێژ لەکاتی منداڵی دا کاتێ نوێژ فێر بووی و پێت گوتراوە (گەر ئارەزوویێکی دیاری کراوت هەیە لە نوێژدا داوای بکە بەر لە نووستن[243] ، لەماوەی ئیحاکانتدا دەتوانی کەسایەتیت بگۆڕی ، واتە لە ڕێگای تەلقین بەخود ئەو دۆخانەی لەگەڵ باری ماندووبوونی دەماری و تێك چوونی دەروونی سادەد ڕوودەدەن لاببەیت، دیسان دەتوانی ئازارەکان و سەر ئێشەو گرژی دەماری و ترس و نەریتی خراپ و خەوزڕان لاببەیت ... هتد).

(پێ گوتن و ئیحاکان گۆڕانی بابەتی لە لەشدا دروست دەکەن ، هاندانی کۆ ئەندامی دەمار دەتوانێ کار لە تەواوی لەش بکات ئیحای نەگۆڕ لە هیپنۆتیزمدا دەتوانێ کار لە تەواوی لەش بکات ، ئیحای نەگۆڕ لە هیپنۆتیزمدا دەتوانێ فشاری خوێن و لێدانی دڵ و پێك هاتەی خوێن و شیلاوگی لەش بگۆڕێت).

(نەخۆشیە دەروونییە جەستەیی یەکان لە ڕێگای ئیحاو گۆڕینی شێوازی ژیان چاك دەبنەوە و باشتر دەبن).

ئێمە دەزانین نوێژ لەکاریگەری سایکۆلۆژی دا ئیحای زاتی دروست دەکات ، چونکە بڕوادار لەکاتی نوێژو دوعادا دڵنیایە خوای گەورە ئاواتی دێنێتەدی.

---

[243] ئەم نوێژە لە ئیسلامدا نوێژی (الحاجة) و (الاستخارة)یە کە پێغەمبەر (صلی الله علیة وسلم) فێری یارانی کردوون بۆ داواکردنی دا خوازی و پێویستی یەکانیان لەخودا.

بێگومان کوڕی زیکر بەشێکی گرنگی ئیحای زاتی و کۆمەڵی یە ، ئەم ئیحا زاتی و کۆمەڵی یانە دەروێش لەناوی دا دەتوانێ هەندێ کاری نائاسایی نمایش بکات ، وەکوو شمشێر لە خۆدان و چوونە ناو ئاگرو ...هتد.

نمونەی موعجیزە لە قورئاندا : ﴿ قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ ﴾ الأنبياء: ٦٩ ، وتمان : ئەی ئاگر ببە ساردی و سەلامەتی بۆ ئیبراهیم (علیه السلام) .

﴿ فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ ﴾ یوسف: ٣١ ، واتە : ژنەکان یوسفیان بینی بە گەورەیان زانی و دەستی خۆیان بڕی ، یوسف بە ئیحای ڕوحی، ئەوان دەخاتە باری نەستەوەو ئەم موعجیزەیە نمایش دەکات و دەستی خۆیان دەبڕن.

## ئیعجازی ( ٤٩ ) بەهێزکردنی چاوی موگناتیسی :

﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ ﴾ الحجر: ٧٥ ، واتە : لەوەدا چەند بەڵگەیێ هەیە بۆ ئەوانەی دوربینن و خاوەن فیراسەن.

﴿ وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَٰرِهِمْ ﴾ القلم: ٥١ ، واتە : نزیکە ئەوانەی بێ بڕوان بە چاوەکانیان بتکوژن.

لێرەدا قورئان ئاماژە بە (هالەی موگناتیسی) دەکات لە مرۆڤدا ، مرۆڤ بە گشتی بە ئاستی جیا جیا ئەم ڕووناکییە موگناتیسی یەیان هەیەو وەکو فۆسفۆر دەدرەوشێتەوە ، کیمیایی هزر پەیدا دەکات ، یان وەکو تەزووی کارەبای ماسی کارەبایی (الرعاد)ە لە دەریاکاندا نێچیر لەناو دەبات ، بەڵام هەندێ کەس بەشی شێری بەر دەکەوێ لەم بەهرەیەدا پێغەمبەران و صددیقینەکان وێستگەی ئەم بەهرەیە بوون ، دواتر ئەولیایان ، پاشان بلیمەتان و هەندێ لە دەسەڵاتداران و فەیلەسوفان و زانایان ،

هەندێ کەسی تر هەیە لە خەڵکی ئەم موگناتیسی یەیان بەهێزە بۆ شیفا بەخشی بە کاری دێنن ، هەیانە بۆ خراپە بەکاری دێنن وەکو (چاوەزار) .

یان (خەوێنەر)ی موگناتیسی و پزیشکی دەروونی بەم موگناتیسە دەتوانێ نەخۆشی بخەوێنێ ، یان بەنج بکات ، وتاربێژ گەر ئەم موگناتیسەی بەهێز بێ چاکتر دەتوانێ کاربکاتە سەر ناخی خەڵك و وتارەکەی چالاکتر بکا بۆ چونە ناو هەست و نەستەکانی جەماوەرەوە .

ئەم هالەیە بە چاو یان دەست لێدان یان فووپێداکردن یان ئیجا پێ دان تەلقین کردن و قسەو ئامۆژگاری دەگوازرێتەوە ، وەکوو (الراغب) ئاماژەی بۆ کردووە (المتوسمین) واتە : ئەوانەی خاوەن فیراسەن و دووربینن ، وەکوو لە فەرموودەدا هاتووە : (اتقو فراسة المؤمن فانه ينظر بنور الله) (رواه الطبراني) ، (مفردات الراغب).

(نور) مەبەست لە هالەی موگناتیسی یە ، کە بڕوادار بۆ کەرامەت بەکاری دێنن ، ﴿ وَإِن يَكَادُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَارِهِمْ ﴾ القلم: ٥١ ، مەبەست لەبێ بڕوایانە ، کە ئەم تیشکە بۆ خراپەکاری بەکاردێنن.

ئیمڕۆ بەم دیاردە دەگوترێ بینین لە دوورەوە (الاستبصار) کە لەلایەن ئەمریکاو ڕوسیاوە لەلایەن پاراسایکۆلۆژییەکانەوە بۆ مەبەستی هەواڵگری و سیخوڕی و تیرۆر بەکاردێنرێت.

(باراسلساس) دەنووسێ : (مرۆڤ لە توانایدایە هاوڕێیان و بارودۆخیان ببینێ با (١٠٠٠ میلیش لێوەیان دوور بێت)

(بتهوف تارك) دەڵێ : هەمووو کەسێ دەتوانێ دووربینی ئەنجام بدات)[٢٤٤].

[٢٤٤] حروب العقل / ل:٥١.

هالەی موگناتیسی بەشداری دەکات لە هەمووو چالاکی یە ڕوحییەکان وکارە نائاسایی یەکان ، بۆ سوودو زیان گەیاندن سوودی لێ دەبینرێت.

خەوێنەری موگناتیسی و پزیشکی خەوێنەر دەبێ چاوی موگناتیسی بەهێز بێ بۆ خەواندنی نەخۆش و کارتێ کردن لەناخی و شیفادانی .

(دجونا) لە کتێبی (اصغي الى اصابعي) دا ، کە (د.ناهدة البدري) وەری گێراوە بۆ سەر زمانی عەرەبی دەنووسێ : (شێوازی چارە بەخشی ڕوحی من لە پەنجەکانمدا خۆیان مەڵاس داوە ، کە هەڵگری وزەیی بایۆلۆجی ناو لەشی منن) لەڕاست ئەم وزەیە دەڵێ : (تەزووی بایۆلۆجی لە لەشی هەمووو کەسێکدا هەیەو زیادو کەم دەکات ، وەکوو شەحنی پاتری بارگەکەی زیادو کەم دەکات).

(یونگ) لە کتێبی (نظرية علم الارواح) دا دەنووسێ : (**موگناتیسی مرۆڤ بێ دوو دڵی سەلماوە ، ئێمە لە ناخماندا دەروونێ هەیە بڵێسەیێك ڕووناکی پیرۆزە ، ڕوحی نەمرە ، خاوەن هزرو ویست و لەشێکی پڕشنگدارە ، ناشێ لێی جیا بکرێتەوە**).

ڕووناکی و کارەباو موگناتیسی یەت و ئەتیر هەمووویان یەك شتی هاوبەشن گۆڕان وەردەگرن ، ماددەی ڕووناکی یان ئەتیر ئەو توخمەیە لەش و دەروون و جیهانی ڕوحی و ماددی پێکەوە دەبەستێتەوە[٢٤٥].

(د.ولنر کلنر) لەکتێبی (المحيط الانساني) دا دەنووسێ : (تیشکاوەرییەکانی ڕوحی مرۆڤ و ئەو تیشکانەی وەکو شەپۆل لێوەی دەردەچن ، حەقیقەتێکی واقیعین ، ڕەنگی جۆراو جۆر لەناو یەکتری دا هەڵدەگرن و شێوەی کۆلکە زێڕەن و ڕێڕەوێکی دەروونی دیاری کراو لای خاوەنیان پێك دێنن)[٢٤٦].

---

[٢٤٥] العالم الارواح والاشباح / ل:٤٦.
[٢٤٦] العالم الارواح والاشباح / ل: ٥٥.

ڕابردوو باسمان کرد ، کە مرۆڤ (هالەی موگناتیسی) وەکو خەرمانەیێك لە دەورە . هالە سەرچاوەی کارە نائاساییەکانە لە مرۆڤدا.

لە ڕۆژنامەی (weekender) ی ئینگلیزی دا ، کە لە (١٩٨٥/١/٢٧) لە ئاژانسی (رۆیتەر)ی وەرگرتووە هاتووە : هەندێ لە دەوڵەتان کرێگرتەیان هەیە توانای نائاسایی یان هەیە دەتوانن لە ڕێگای هالەی موگناتیسی کە بە مێشکەوە دەردەچێ سەرکردەکانی دوژمنانیان تووشی جەڵتە بکەن و ئەو تیشکە لەناو بەرە بەکاربێنن. بێگومان لای کوردەواری ئەم جۆرە تیشکە لەناو بەرە بە (چاوەزار) ناوبراوە ، لە قورئاندا هاتووە : ﴿ وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَيُزۡلِقُونَكَ بِأَبۡصَٰرِهِمۡ ﴾ القلم: ٥١ ، واتە : خەریکە ئەوانەی بێ بڕوان بە چاوەکانیان بتکوژن.

مەبەست لە تەماشاکردنی موگناتیسی بە مەبەستی خزمەت کردن بە زانستی ڕوحی و پێ هەڵابردنی ئاستی دەروونی ئەومیە ، کە (ولیەم فالکیر) باس دەکات و دەڵێ (چاوی موگناتیسی داخوازییەکی ڕوحی یە لە ڕێگای چاوەکانەوە ، دەمارەکان . ماسولکەکان بۆ وێنەی ئەو تەماشا کردنە لە بارن، چاو بەو پێ یە لەبارە بۆ سەیر کردنێکی تیژی حەتمی ... لێرەدا گرنگی بە خودی چاو دەدەین ، ئەم ڕاهێنانانەی ژێرەوە بۆ ئەوە گرنگن ، بۆیە هیوادارم قوتابی و مریدەکان ئەنجامی بدەن ، لە ڕێگای ئەو ڕاهێنانانە دا هەمووو قوتابیان دەتوانن لە ماوەیێکی کەمدا خەڵکی هەست بەسەیر کردنە وردەکەی بکەن ، گەر دەوام لەسەر ڕاهێنانەکە بکەن ئەم توانایە وایان لێ دەکات کەم کەس بەرگەی تەماشاکردنی ئەوان بگرێت ، ئەم ڕاهێنانانە جوانن ، زۆ هەست بە دەسەڵاتی چاوەکانتان دەکەن بەسەر ڕەفتاری خەڵکی دا ، دەبینن خەڵکی لەبەرچاوتان هەست بە شێوان و ترس دەکەن ، هەر چەند چرکەیێ سەیریان بکەن ئەم دۆخە دەکەوێتە بەر چاوانیان ، گەر ئەم بەهرە خوایەت پێ بڕا تاوان و زیادەڕەوی پێ مەکەو بەسەرکەوتویی چاوی موگناتیسی بەکاربێنە .

(ڕاهێنان)

پارچە کاغەزێکی سپی بێنە خاڵەکی ڕەش لەنێوە ڕاستی دا دروست بکە ، ئەندازەی سەد فلسی یەك بێ ، دوایی بە دەبوسێ یان بزمارێ ، یان سمغێ هەڵی واسە بەدیواردا ، بەرامبەر ئاستی دانیشتنی تۆ بێ لەسەر کورسیەکەتدا ، دوایی لە ژورەکەتدا لەسەر کورسی بە ئاراستەی خاڵەکە دابنیشە بۆ سەیرکردنی خاڵەکە دوایی یەك دەقیقە سەیری خاڵە ڕەشەکە بکەو رابمێنە بێ چاوتروکاندن ، کاتێ پشووت دا ئەم ڕاهێنانە (٥) جاران دووبارە بکەوە ، سێ ڕۆژ ڕاهێنانەکە بکە بە سێ خولەك ، دوای ئەوە بیکە (سێ) خولەك ، دوای سێ ڕۆژی تر (٣) خولەکی تر زیاد بکە ، ئاوا هەرسێ ڕۆژێ ماوەکە زیاد بکە .

هەندێ کەس هەیە (٢٠-٣٠) خولەك دەتوانن سەیری خاڵێ بکەن بێ چاوتروکاندن ، بەلاّم من ئامۆژگاریتان دەکەم ، کەسێ چارەکێ بتوانێ نیوکاتژمێریش ئەوە دەتوانێت ، ئەم ڕاهێنانە زۆر گرنگە ، دەتوانی بە چاوی تیژ بڕوانیە ئەو کەسانەی قسەیان لەگەڵدا دەکەیت و کاریان تێ بکەی و بەرگەت نەگرن ، تا ئاژەلاّن گەر چاویان بەچاوی تۆ بکەوێ رادەکەن ، دەتوانی تاقیکردنەوە لەگەڵ برادەرانتدا بکەی و لە سەر ئاژەلاّن ئەم تاقی کردنەوەیە بکەیت ، گەر چاوەکانت ماندوو بوون بە ئاوی سارد بیانشۆ هەست بە حەسانەوە دەکەیت ، بەلاّم دوای چەند ڕۆژێ ڕاهێنان، دوورە هەست بە ماندووبون و فرمێسکی چاو بکەیت.[٢٤٧]

لە ڕاهێنانی دووەمدا بۆ کارکردنە سەر هزری خەڵك و ئیرادەیان ئەم ڕێنومایە ئەنجام بدە : کاتێ بە شەقامدا ڕەت دەبی ، یان لەناو ترومبێلدای ، سەیری پشتە سەری

---

[٢٤٧] بروانة : (تدريب الادراك الحس الفائق / ل:٥٢-٥٤.

کەسێك بکە (٢-٣-٤) م لێت دوورە یان پتر ، لەدڵی خۆتدا ئیحای بدەیە پێی بڵێ : ئاور بداتەوە ، بێگومان زۆر نابات دوای تەرکیزو ڕامان و ئیحای هزری ئاوڕ بۆ تۆ دەداتەوە ، ژنـان و منـداڵان زیـاتر دەکەونـە ژێـر کاریگـەری ئـەم کاریگەرییـە ڕوحـی یانـە . سـەیرکردنی تیـژو بیرکـۆو ئـیرادەی بـەهێز گـەورەترین ئـەم کاریگەریانـە دروسـت دەکەن[٢٤٨].

لـە زاراوەی عیرفـانی دا ئـەم ڕاسـتی یـە بـە (التوجـه) ی ڕوحـی و سـەیر کـردن نـاو دەبرێـت ، شـێخ لـە کـۆڕی موریدەکانیـدا (التوجـه) و سـەیر کـردن و ئیحـای ڕوحـی بەکاردێنێ بۆ زیندووکردنەوەی لەتیفەی مریـدەکان و کار تـێ کردونیان و گـۆڕینی هزریان دا و پێ هەڵبردونیان بۆ جیهانی باڵاو پەروەردەی ڕوحییان.

لـە تەریقـەتی (نەقشـبەندی) دا لەتیفـەکان (٥) دانەیـە ، بـەڵام لای (ابـن عربـی) (٧ دانەیە وەکو ڕەنگەکانی کۆلکە زێڕینـە وانـە ، ئـەم لەتیفانـە لای زانایـانی ڕوحـی بـە ناستەکانی (هالەی موگناتیسی) ناسراوە .

لای ڕێبازی نەقشی لەتیفەکان (٥) دانەیە :

(١) لەتیفەی (دڵ) لەژێر پێی ئادەم دایە ڕەنگی ڕووناکییەکەی زەردە .
(٢) لەتیفەی گیان سوورەو لەژێر پێی نوح و ئیبراهیم دایە (علیهما السلام).
(٣) لەتیفەی سرِ سپی یەو لەژێر پێی موسا (علیه السلام) دایە .
(٤) لەتیفەی خەفی ڕەشە لەژێر پێی عیسا (علیه السلام) دایە .
(٥) لەتیفەی (ئەخفا) سەوزە لەژێر پێی حەزرەتی موحەممەد ﷺ دایە .

شێخی مورشید ئەم لەتیفانەی مرید دەگوازێتـەوەو دەجوڵێنێ و ڕوونـاك دەکاتـەوە ئەم ڕووناکییە لەدەم و چاوی مریـددا دەدرەوشـێتەوەو خـۆی شـێخەکەی هەسـتی پـێ دەکـات ، لەتیفـەکان وەکـو (٥) هەسـتە ماددییەکانـە ، ئەوانـە لـەجیهانی ڕوحـی د

---

[٢٤٨] بروانە : (تدريب الادراك الحس الفائق / ل: ٦٨ ) بەکورت کردنەوە.

دەوردەبیـنن ، دوای پاکـژ کردنـەوەی لەتیفـەکان پاکژکردنـەوەی دەروون دەسـت پـێ دەکات)[249].

لە توێژینەوەی ڕوحی دا ئەم لەتیفانە ئەبونیان سەلماوەو دەکرێن بـە (٥) دانـەوەو بـە ئاستەکانی هالەی موگناتیسی ناسراون :

(١) ئاستی یەکەم سوورە و ئاستی فیزیکی یە .
(٢) ئاستی ئەتیر ڕەنگی شینە .
(٣) ئاستی سۆزی ، ڕەنگی سەوزەو بە ئەجمی ناودەبرێت.
(٤) ئاستی هزری (عەقلانی) زەردە .
(٥) ئاستی ڕوحی ، سپی یە یان وەنەوشەیی یە.

هەندێ زانای تـر بـە (٧) ئاستی دادەنـێن وەکو ژمـارەی (شـەکەرا – chekras) یـان چەقەکانی وزە ، هەر ئاستێ پەیوەستە بە لەشی ئەتیرەوە[250].

گرنگترینی لەتیفەکان دڵە ، کە لە قورئانـدا بـە (القلب) هـاتووە ، (مامۆسـتا چواکوك سوی) دەنووسێ : (لەش چەند شاکیرەیەکی هەیـە ، چەقی وزەن ، چـەند پیشـەیێکی دەروونـی و ڕوحـی یـان هەیـە ، گـرنگترین لەوانـە چەقی (دڵە) بـە شـاکرا (ئـەناهاتا) ناسراوە ، پەیوەستە بە خۆشەویستی و سۆزو تـەقواوە ، شـاکرای دڵ (دڵـی سـۆزی یـە) کاتێ تۆ هاوسەرت یـان باوانـت یـان منـداڵانت یـان خزمانـت خـۆش دەوێ شـاکرای دڵ دەدرەوشێتەوە .

دیسان (دڵی خوایی – قەلبی ئیلاهی) هەیـە لـە لوتکەی تاجەوەیـە و بـە چـەقی تـاج دەناسـرێ ، لـە (سـنکریتی) دا بـە (شـاکرا) و (ساهاسـرارا) دەناسـرێ چـەقی تاجـەو مەڵبەندی خۆشەویستی خوایـە ، لای یوگا چـەقی پەیوەنـدی گرتنـە بـە خوداوە ، تـا

[249] ما هو التصوف ، الشيخ امين علاء الدين نقشبندي / ت: د.محمد شريف احمد / ل:١٩٨.
[250] دراسات في العالم الروح / ل:١٦٤.

چەقی تاج چالاك نەبێ پەی بەڕوح و پەیوەندی خوایی لەگەڵ ڕوحی باڵا نابەی بە ئەزمون ، بەر لەوە دەبێ (دڵ) چالاك بکەیت[251].

قورئـــان فەرموویـــەتی : ﴿ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ ﴾ التغــابن: ١١ ، ﴿ وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَـٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ ﴾ الحجرات: ١٤ ، ﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا ﴾ آل عمران: ٨ .

لە فەرموودەدا هاتووە (دڵ) عەرشی خوایە ، مەڵبەندی بڕوایە ، دەوری ئەو دەوری ژیانە ، دەوری ئەو دەوری ئاوێنەیە، دڵ پادشایە و پایتەختە (القلب ملك) رواه البيهقي.

خوا فەرموویەتی : (يوم لا ينفع مال ولا بنون الا من اتى الله بقلب سليم) ، بەو پێیە لە ڕۆژی دوایی دڵی ساغ و زیندووو خاوێن سوودی دەبێت نەك سەروەت و سامان و منداڵ ، بۆیە (زیندووو کردنی دڵ) بە میکانیزمی سەرەکی دادەنرێ بۆ جڵەو ڕاگرتنی مرۆڤ و پەیوەندی کردنی بەدونیای ڕوحی یەوەو نواندنی کارە نائاسایی یەکان.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (الشيطان يلتقم قلب ابن ادم فاذا ذكر الله خنس عنده ، واذا نسي الله التقم قلبه) رواه الحكيم ، واتە : شەیتان دڵی مرۆڤ هەڵدەلوشێ ، گەر یادی خوای کرد لای بزر دەبێ ، گەر لە یادی کرد دڵی قوت دەدات .

مرۆڤ وزەیەکی شاراوەی لەبن نەهاتووی لەناخدا حەشارداوە و پەی پێ نابات ، ئەم هێزە لەناخدایە ، کە بە (دڵ) یان نەست (اللاشعور) ناسراوە ، هەمووو مرۆڤێ ئەم هێزەی هەیە ، بەڵام پەرەی پێ نادات و نازانێ بەکاری بێنێ ، وەکو ئەو کەسە وایە بڕە پارەیێکی زۆری هەیەو دای کردووە نازانێ چۆن بەکاری بێنێ و چۆن بەهرەمەندی لێ وەربگرێت.

---

[251] تأملات لا دراك الروح / ل:٢٣.

(جورجیف) دەڵێ : (لەناخی هەمووو مرۆڤێکدا وزەیێ هەیە وەکو یەدەگی لەبن نەهاتووە ، لەناخی هەمووو مرۆڤێکدا وزەیێکی عەمبار کراو هەیە ، نامەکەم ئەوەیە یارمەتی خەڵکی بدەم ، کە وزەیان بەکاربێنن ، لە گەردووندا وزەیەکی بێ شومار هەیە ، مرۆڤ بە گشتی ئەو توانایەی نییە بەپێی پێویست ئەو وزەیە دەست بخات) ، ئەو پێی وایە : (ئەو یەکێکە لەو کەسە کەمانەی لە توانای دایە سوود لەوزە گەردوونی یە یەدەگەکە وەربگرێ و بۆ کەسانی تری بگوازێتەوە[٢٥٢].

بێگومان ئەو کەسانەی ئەم هالەیان بەهێزەو چاوی موگناتیسی یان تیژە، توانایان هەیە کاربکەنە سەر خەڵك و دەیانەوێ بیانخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە ، تواناو ژێر دەستەکردنی مرۆڤەکان ئامانجێکی جەوهەری یە لە مرۆڤدا ، کەس نییە نەیەوێ بەهێزترین کەس بێ ، تا ئاژەڵان کامیان بەهێزە ئەو کار دەکاتە سەر ئەویتر و حوکمیان دەکات .

خاڵێکی تری گرنگ هەیە ئەویش وێنا کردنە (التصور – visualization) " بێگومان خاڵە دڵنیاییەکانی مرۆڤ (التوکیدات) کە باشکران کاتێ نمایشی (نەست – اللاواعي) دەکرێن وەکو وێنەیێك کاریگەری و توانایان زیاتر دەبێت ، دەتوانی لە ڕێگای وێنەی ماددی زیندووەوە ئەمە بکەیت بەو پێیە (وێنا کردن) بریتییە لە کێشانی وێنە لە هزرتدا .

## ئیعجازی ( ٥٠ ) پاراستنی کەسێتی بەوزەی ڕوحی ( personal protection )

ئەم دیاردەیە بریتییە لە خۆپاراستن لە وزەو شەبەح (ghost) و ڕوحە زیانبەخشەکان ، کە لە ئیسلامدا بە دوعاو نوشتەو قورئان خوێندن و ویرد ئەنجام دەدرێت ، زرێیەکی پۆڵایین لەدەوری لەشدا پەیدا دەکەن ، بۆ پاراستنی مرۆڤ لەو

[٢٥٢] القوى الخفية / انيس منصور / ل:٢٣.

دیارده زیانبەخشانه ، کە وەسوەسەو ترس و زیان دروست دەکەن ، ﴿ إِن كُلُّ نَفۡسٖ لَّمَّا عَلَيۡهَا حَافِظٞ ﴾ الطارق: ٤ .

دوعاو پاڕانەوەو ویردو قورئان خوێندن لەوانە (آیة الکرسي) و (قل اعوذ)ەکان و دوعای (الجوشن الکبیر) -کە کردوومانە بە کوردی- باشترین هۆکارن بۆ بەهێز کردنی هالەی موگناتیسی و ڕووناکی و وزەی خوایی لە دەوری لەش و ڕوحدا ، کە دەبێتە زرێیەکی پارێزەر بە دەورماندا لە چەکی ئاشکراو شاراوەی دوژمنان چەپاڵە مان دەدات ، بۆ نمونە : موسا (علیه السلام) ساحیران ویستیان بەکۆی نەست ئیحای ترس بۆ موسا (علیه السلام) بکەن تا بیکوژن ، بەڵام خوای گەورە ئیحای پێی مەترسە . پاشان فەرمانی دایە دەستی هالاوی لەسەر سنگ و دڵی دابنێ تا ئەم هالە ڕوحی یە ڕووناکی یە ببێ بەزرێیەك لەو وەسوەسانە چەپاڵەی بدات ، ﴿ وَٱضۡمُمۡ إِلَيۡكَ جَنَاحَكَ مِنَ ٱلرَّهۡبِۖ ﴾ القصص: ٣٢ ، یان پێغەمبەر ﷺ بۆ ڕزگاربوون لە سیحری جولەکەیێ (قل اعوذ)ەکان دەخوێنێ ، پاشان بەردەوام شەوانەو دوای نوێژان خوێندنی ، وەکو باسکرا.

بێگومان خوێندنی (قل اعوذ)ەکان پارێزەرە لە چاوزارو سیحرو هەمووو زیانێکی ماددی و مەعنەوی ، زیانی سروشتی و دەست کرد .

نووسەری سویسرِی (ئیسترند برنج) لەکتێبی (السحر الاسود)دا باس دەکات ڕوحی چەپەڵ بەکار دێنێ بۆ خۆزاڵ کردن بەسەر کەسانی تردا ، باس دەکەن هەر ئەو ڕوحانە دەیکوژن ، باس دەکات بە سەیری خۆی لە ئاوێنەوە خۆی دەکوژێ ، ئەو قسەیەی دوایی هاتە دی .

(ابن خلدون) سیحر دەکاتە سێ بەش :

(١) ساحیر بێ پشت بەستن بە فریشتەو شەیاتین بە ویستی خۆی کاربکاتە سەر خەڵکی .

(٢) ساحیر دەتوانێ پشت بە کەلووەکان ببەستێ بۆ کار کردنە سەر خەڵکی .

(٣) ساحیر هەیە خەیاڵ بۆ خەڵکی دروست دەکات و ئیحایان پێ دەدات بەشتانێ بوونی یان نەبێت.[٢٥٣]

(حمید الازري) دەڵێ : (گەر بچیە هیندستان سیحری ڕاستەقینە دەبینی ، وەکو دەبینی ساحیر پەتێکی بە دەستەوەیە منداڵێکی ناسراوی لایە ، سەرباری چەقۆو سەبەتێك کە لەشی منداڵەکەی دەڕواتە ناوەوە ، پەتەکە بۆ ئاسمان فڕێ دەدات ، پەتەکە بە ڕێکی دەوەستێ لە ئاسمانداو سەری دیار نییە ، پاشان فەرمان بە منداڵەکە دەکات پێی دا سەر بکەوێ ، دوای سەرکەوتن منداڵەکە لەبەر بەرزی پەتەکە ون دەبێ ، دوایی بانگی دەکاتەوە وەڵامی نییە ، ساحیرەکە پەتەکە دەبڕێ و لەگەڵ منداڵەکە دەڕواو ون دەبێ ، دوایی منداڵەکە لەبەردەم ساحیر بەر دەبێتەوەو خوێنی لەبەر دەڕوات ، پاشان دەیخاتە ناو سەبەتەکەوەو دوای ماوەیێ منداڵەکە بە ساغی دێتە دەر وەك هیچ نەبووبێت) ٢٥٤.

(دبلیۆنی کانون) دۆزەرەوەی (دیاردەی هاوسەنگی لەش) دەڵێ : بەچاوی خۆم بینیم چۆن ساحیرێ نەفەرێ تیرۆر دەکات ، زانایان ئەم قسەیان گوێ پێ نەدا تا زانایانی بایۆلۆجی دەریان خست کەرەستەی کیمیایی کە لەش دروستی دەکات بۆ وەڵامی ترس مشك لە تاقیگەدا دەکوژێت٢٥٥.

گەر بڕوانینە ئەم دوو سوڕەتە هەموو زیانە سروشتییەکان و ڕوحی یەکان و دەستکردەکانی کۆکردۆتەوە ، کە زیانی ماددی و مەعنەوییان هەیە ، بە خوێندنی

---

[٢٥٣] القوي الخفية / ل:٥٢

[٢٥٤] الابراج / حميد الازري / ل:٤٥.

[٢٥٥] حروب العقل / ل:١٠٠.

ئەم سورەتانە خودا چەپاڵەمان دەدات: قورئان فەرموویەتی :﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴿١﴾ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴿٣﴾ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ ﴿٤﴾ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴿٥﴾ ﴾ الفلق: ١ – ٥ ، واتە : بڵێ خۆمان پەنا دەدەین بە پەروەردگاری سپێدە ، لەو زیانەی دروستی کردووە ، لەزیانی شەو کاتێ تاریك دەبێ ، زیانی ئەو جادوگەرانەی فو دەکەن بە گرێ دا ، لە زیانی حەسوود کاتێ حەسوودی دەبات .

﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ﴿٣﴾ مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ ﴿٤﴾ ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴿٦﴾ ﴾ الناس: ١ – ٦ ، واتە : بڵێ : خۆم دەپارێزم بە پەروەردگاری خەڵك ، پادشای خەڵك ، خوای خەڵك ، لە زیانی وەسوەسەکاری خۆ پەنهانکار ، کە وەسوەسە دەخاتە سینەی خەڵکەوە ، لە جنۆکەو مرۆڤ.

بێگومان ئەم ئایەتانە پارێزەری مرۆڤن ، قەڵغان و زرێیەکی ڕوحی و هزرین لە دەوری مرۆڤدا ، بوار نادەن ئیحا و شەپۆلی بەد بڕواتە ناو هۆش و نەستەوە ڕوحت و میمۆری هزرت لە شەپۆلە بەدەکان چەپاڵە دەپارێزێت و زاڵ دەبێ بەسەر چەکی ونی دوژمنانتدا ، ڕێگا نادەی سنوورەکانت ببەزێنن و بێنە دەرگای ماڵەکەتەوە دەتوانی بەرگری لەخۆت بکەیت ، باشترین زرێ پشت بەخوا بەستنە .

(ئەناید هۆفمان) ڕافەی زانستی ئەمە دەکات و دەڵێ : (چۆن دەتوانی خۆت بڕیار بدەی کێ بێتە ناو ماڵەکەتەوە ، ئاوا دەتوانی بڕیار بدەی چی بێتە ناو (هۆش)تەوە . پێویستە لە یادت بێت بەدرێژایی کات زاڵ بیت.

زۆر جار خەڵكی دەڵێ شەبەح و خێو و تارمایی لەماڵیاندایەو نازانم چی دەربارەیدا بكەم ،لأمی ئاسایی من ئەوەیە : ئایا پرسیارت كردووە كێ یەو چی دەكات ؟ دەڵێن : نەء ، دەپرسم بۆچی ؟ تۆ دەتوانی بپرسی مادام ئەو كەسەیە خۆی بەلەش كردبێ .

دەنووسێ : لەجیاتی ئەوەی ببینە ئامانجی وزە زیانبەخشەكان باشترە خۆت بپارێزی و شێوازی بەرگری لە خۆكردن بە ڕێگایەكی دەروونی و ڕوحی فێر ببیت.

( **ڕاهێنان** )

شێوەیەك لە شێوەكانی خۆ پاراستن و دانانی زرێی ڕوحی لە دەوری خۆدا ئاڕاستەكردنی پرسیارێكە بەرەو هزر ، ئاڕاستەكردنی وشەی دڵنیا خۆی لەخۆیدا پارێزەكی باشە ، وەكوو بەخود دەڵێی: (من بۆ هەرچی كاری باشە كراوەم و هەرچی ناپەسەندە داخراوم بە ڕوویدا) یان (من لەژێر سایەی خوادام) ، ئەم بیرۆكە دڵنیا بەخشانە كاریگەرییان هەیە بۆ سەر پاراستنی تۆ ، پێویستە بیرۆكەی باش نیحای دڵمان بكەین تا هەست بە ئارامی و خۆشی بكەین .

نمونەی دووەم : چاو دابخە خۆت تەلقین بكە بارگەیەكی وزەیی لە هەر چوار لاوە دەوری داوی و پەرژینی كردوویت ، وەكوو بروسكەیەكی سپی وایە ، چونكە بروسكەی سپی توانای هەیە بیرۆكەی سەلبی و خراپ لا ببات[256].

ئێمەش بە (ئەنايد هۆفمان) دەڵێین : قورئانی ئێمە بەر لە زانستی ڕوحی نوێ ی ئەزموونی ئاماژەی بە ﴿ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾ الرعد: ٢٨ ، واتە : بێگومان بەیادی خوا دلأن ئارام دەبن ، ﴿ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴾ الزخرف: ٣٦ ، واتە : كێ پشت لەیادی خوای بە زەیی بكات شەیتانەكی بۆ بڕیار دەدەین دەبێتە هاوڕێ ی ئەو .

---

[256] تطوير المهارات النفسية / ل:٤٣-٤٤.

کەواتە : یادی خوا وەکو ئیحایەکی زیندووو هالەو ڕووناکی سپی لە دەوری مرۆڤدا دروست دەکات و دەبێتە پەرژینێك لەبەردەم ئیحای سەلبی و وەسوەسەو ڕوحی چەپەڵ و خێو و شەبەحەکان .

﴿ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِيَ بَيۡضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴾ الأعراف: ١٠٨ ، واتە : موسا (علیە السلام) دەستی دەرهێنا ڕووناکی سپی بوو لەبەردەم سەیرکەراندا .

(موسا) (علیە السلام) بەدەستی هالەی سپی خۆی پاراست لەسیحرو جادووی ساحیران و وەسوەسەکانیان و موعجیزەی نواندو سحیری ئەو ساحیرانەی بەتاڵ کردەوە .

﴿ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓ ﴾ الطلاق: ٣ ، واتە : کێ پشت بە خوا ببەستێ ئەوە بەسیەتی .

دیسان یادی خواو پشت بەخوا بەستن مێشك هاندەدات بۆ دەردانی هۆڕمۆنی (ئەندرو فێنەکان) کە ئارامی بە کۆئەندامی دەمار دەدات و ئازارەکانی لادەبات ، دیسان توانای چێژ وەرگرتن پتر دەکات وەکو خواردن و خواردنەوەو سێکس[٢٥٧].

## ئیعجازی ( ٥١ ) ڕاهێنان بۆ چالاکییەکانی ( پەی پێ بردنی ڕۆحی ( تدريب المهارات الادراكية ) :

(ئەناید هۆفمان) دەنووسێ : (چۆن پەی پێ دەبەین و دەزانین و چی پەی پێ دەبەین ؟) :

لە چالاکی ڕووحی دا سێ شێواز بۆ زانین و پەی پێ بردن هەیە ( lairvoyance - clairaudience – clairsentience) هەمووو ئەوانە لە گرنگی دا جیاوازییان

[٢٥٧] نفحات علمية من القرآن والسنة / د.دلاور / ل:٩٥ سەیر بکە.

نیه ، هەمووو ئەو سێ شێوازە بۆ پەی پێ بردنی هەستی سەدو (ESP) دەگەڕێنەوە ، پەی پێ بردنی هەستی سەروو دووره لە پێنج هەستەکان وەکو (بینین و بیستن و چێژکردن و بۆن کردن و بەرکەوتن).

وشەی (الفائق – سەروو Extra) لەو ناواخنەدایەو شتی تری ناخرێتە سەر ، هەستی ماددی و ڕوحی چەند ئامرازێکن هەمووو کەس هەیەتی .

(clairsentience) لە هەر سێ بەشەکانی تر بلاْوتره ، ئەم وشەیە وشەیەکی فرەنسی یە ، واتە : (الرؤيا الواضحة) واتە : خەونی ئاشکرا ، بریتییە لە هەست کردن بە شتێ بەر لە ڕوودانی ، بۆ نمونە : چەند ڕۆژێکە گفتوگۆت لەگەڵ هاوڕێکەت نەکردووە ، کاتێ قسەی لەگەڵدا دەکەی هەمووو شتێ وەك پێویستە ، بەلاْم لە هیکرا هەست دەکەی لێرەدا هەڵەیێك هەیە ، **چۆن ڕووی داو چۆن زانیت بە (ESP)** ، **واتە :** بە توانای بینینی کەسەکان و **شوێنەکان و شتەکان و پەی پێ بردونیان ، یان بینینی** ئەو ڕووداوانەی بە چاوی سەر نابینرێن.

نمونەی تر : جار هەیە دایکێك نیوە شەو ڕاست دەبێتەوە دەبینی کوڕەکەی لە مەیدانی جەنگدا کوژراوە ، کەچی کوڕەکەی لە گۆشەیەکی تری دونیایە ، دوایش خەونەکەی وەکو دوخێ دێتە دی ، جار هەیە کەسێك لە شوێنێك دێتە بەرچاوی قەت لەوێ نەبووە .

دیسان (clairsentience) هەیە ، واتە : بیستنی گیانی ، جار هەیە دایك گوێی لە هاوارو ناڵەی جگەر گۆشە برینداره‌کەیە لە مەیدانی شەڕدا ، گوێی لە دەنگی تۆپ و منداڵەکەیەتی هاوار دەکات یارمەتی بدەن ، ئەو کاتە ئەزموونە لە بازنەی (clairaudient) دا ڕوودەدات نەك لە بازنەی (clairvoyant) دا [٢٥٨].

---

[٢٥٨] تطوير المهارات النفسية /ل:٦٥-٦٧.

ئەم دیاردەیە لە ئیسلامدا بە (ئیلهام) و (خەونی خوایی – الرؤیا الصالحة) ناسراوە ، وەکوو ڕابردوو باسکرا ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (اتقوا فراسة المؤمن فانه ینظر بنور الله) واتە : خۆتان لە دووربینی بڕوادار بپارێزن ئەو بە ڕووناکی خوا دەبینێت .

(نور الله) مەبەست شەپۆلی ڕوحی و ئەتیرە ، مەبەست هالەیە (لولا تمریغ قلوبکم لسمعتم ما اسمع) رواه احمد، واتە : ئەگەر چڵکی دڵتان نەبوایە من چیم دەبیست لەدونیای نادیار ئێوەش دەتان بیست.

هەمووو ئەم فەرموودانە ئاماژە بە پەی پێ بردنی ڕوحی دەکەن بە بینین و بیستن . مادام مرۆڤ خۆی ڕابێنێ بۆ پاکژ کردنەوەیان لە تەریقەتدا وەکو (غەزالی) باسی کردووە سەرەتای ڕاهێنانەکان بە (المکاشفة) و (المشاهدة) دەست پێ دەکات ، مرید ڕوحی پێغەمبەران و فریشتەکان دەبینێ و سوود لە قسەکانیان وەردەگرێت[٢٥٩] ، ئەم هەستە بە هالە (نور) دەبێتەوە لە مرۆڤدا .

دیسان لە ڕێگای هالەوە هەست بە زانیاری و ڕووداوەکان دەکرێت لەڕێگای شوێنەکانەوە ، بابای عاریف و ڕوحانی دەتوانێ هەواڵی کەسانێ لەڕابردوودا ژیاون لە شوێنێ یان لە خانوێکدا بخوێنێتەوە وەك بە نوسین لەبەردەمیدا نووسرابێتەوە . چۆن ؟ (ئەناید هۆفمان) دەنووسێ : (گەر کەسانێ لە ژوورێکدا مانەوە ژورەکەو کەل و پەلەکانی ناوی لەرەلەری ئەو کەسانەی لەناوی دان و وزەیان هەڵدەمژن).

بێگومان مرۆڤ لە شوێنە پیرۆزەکان و مەزارگاکان هەست بە فەیزو ئارام دەکات . بەڵام لەشوێنە پیسەکان هەست بە خەم و بێزاری دەکات .

---

[٢٥٩] المنقذ من الضلال / سەرچاوەی ڕابردوو.

(د .جونا دافيد) لەگەشتەکەی دا بۆ وڵاتانی خۆرهەڵات وەکو (سەمەرقەند) ئاماژە دەکات چۆن بە هالەی دەستەکانی گۆڕی (تەیموری لەنگ) دەدۆزێتەوە لە قوڵایی زەوییەکەدا نێژراوە .

(د .جونا) دەڵێ : چەند ئاماژەیێکی هالەیی بەمن گەیشت کە ئەم پیاوە شەل بووە ، بە دوای دا من زانیم شەل بووەو لەنگیوە ، بۆ زانستی پتر بڕوانە (اصغي الى اصابعي / د جونا دافيد شفيلي / ت : د.ناهدة البدري).

بە کورتی لە عیرفانی ئیسلامیدا بە سینە پاکژ کردنەوە مرۆڤ هەستە ڕوحانیەکانی دەبنەوە ، باشترین ڕێگاش بۆ گەیشتن بەم مرازە تەریقەتە .

وەکو عەللامە (الشيخ عبدالرزاق القاشاني) باسی کردووە شێخی ڕوحانی ، وەکوو پزیشکی بە تەماشاکردنی سینەی مریدەکانیان نەخۆشیەکانیان و کەم و کوڕییەکانیان دەبینن ، ئاگاداری حاڵ و مەقامیانن ، ئەوان دەتوانن ئەم سینەیان پاکژ بکەنەوە لە وەسوەسەی شەیتانی و نەخۆشی دەروونی وەکو (ڕژدی و ئێرەیی بردن و سوربوون لەسەر دونیاو کینەو ڕق ...هتد) دەتوانن لەژێر دەستی شێخدا بیرو بڕواو ڕەوشتیان ڕاست بکرێتەوەو سینەیان پاکژ بکرێتەوەو ببنە مریدەکی ڕاستەقینەی پەیوەست بە خوداوە ، کەرامەتی زۆر دڵنیایی یان پێ بدات ، بۆ زانستی پتر بڕوانە (لطائف الاعلام في اشارات اهل الالهام) لاپەڕە ١٨٢.

ڕاهێنان بۆ چالاکییەکانی پەی پێ بردن :

پێویستە ڕاهێنانەکان لەکاتی حەسانەوەدا ئەنجام بدرێن ، نابێ هەست بە ماندووبوون و بێ تاقەتی بکرێت ، چونکە هەستی ڕوحی دەکوژن ، هەست کردن بە بێزاری لە ڕاهێنانی هەستی ڕوحی دا (ESP) وەڵامی هەڵەت پێ دەدات.

## ئیعجازی ( ٥٢ ) ڕاهێنـان بۆ وەرگرتنی هەواڵی تلە پاتی ( الاستلام التخاطري )

ئەم دیاردەیە بەشێوەیەکی ئاسایی لەنێوان ئەو کەسانەدا گەشە دەکات ، پەیوەندی سۆزو خۆشەویستییان لەناو یەکتری دا هەیە ، واتە : هەست دەکەی بیر لەچی دەکاتەوەو چی لەدڵدایە ، بەبێ باسکردنی ، بە مەشق کردن دەتوانی بیری هەمووو کەسێك بخوێنییەوە[٢٦٠].

پزیشکو کیمیا گەری سویسری (باراسلساس) دەڵێ : (هزری مرۆڤ وێنەیێکی بچووك کراوەی هزری گەردوونی یە ، مرۆڤ دەتوانێ بیری خۆی بۆ هەر کەسێ ڕەوانە بکات پەیوەندی و شیرازەی لەگەڵدا هەیە ، نێوان دەور نابینێ ، دەتوانێ چۆنی بوێ کاربکاتە سەر ڕوحەکەی و هەڵی سوڕێنێت[٢٦١]).

خودا بە ئیبراهیم (علیه السلام) دەفەرمووێ : ﴿ وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَجِّ يَأۡتُوكَ رِجَالٗا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٖ يَأۡتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٖ ﴿٢٧﴾ ﴾ الحج: ٢٧ ، واتە : جاڕ بدە بۆ خەڵکی بە حەج کردن خەڵکی دێن بەپیادەو بەسواری وشتر .

بەوپێیە خەڵکی ڕوحانی لە هەمووو ناوچەکان هەیە لە جیهاندا بە فیراسەو تلەپاتی ئەم جاردانە جیهانی یە دەبیستن و بەدەنگ ئیبراهیمەوە (علیه السلام) دەچن.

﴿ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ أَن سَبِّحُواْ بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ﴿١١﴾ ﴾ مریم: ١١ ، واتە : زەکەریا ئیحای بۆ خەڵکی کرد بەیانی و ئێوارە نوێژ بکەن بۆ خودا .

(اوحی) ئاماژەیە بۆ تلەپاتی و ئیحای ڕوحی بە ئامادەبووان ، لەوانەی ئامادەیی وەرگرتنی ئەم نامە ڕوحی یەیان هەیە .

---

[٢٦٠] تطوير المهارات النفسية / ل:٨٤.

[٢٦١] حروب العقل / ل:٤٩.

(ج.اج.رایز) دەنووسیّ : مەسەلەی تلە پاتی زۆر ئەزمونی لەسەر کراوە ، ئەزمونی لەسەر کراوە لەنێوان ژێر دەریای ئەتۆمی (توتیلوس) و ئەو کەسانەی مەشقیان پیّ کراوە بۆ تلەپاتی کە لەسەر کەناری دەریا وەستاون ، سەرچاوە روسیەکان باس دەکەن ئەزموونی لەو جۆرەیان ئەنجام داوە ، هەروەها لەسەر هەندێ گیاندارانی وەکو کەروێشك.

گۆڤاری (سبوتنیك) ی ڕووسی باس دەکات تلەپاتی لەنێوان دوو کەسدا ئەنجام دەدرێت ، نێوانیان (١٨٠٠) میلە ، ئەم گواستنەوەی بیرەش گورج بێ کات خەیاندن ڕوودەدات[٢٦٢].

ڕاهێنان : هاوڕێیەکت بانگ بکە با یەکێ لە میوەکان لەدڵی خۆی بگرێ ، پاشان ڕێگە بدە ئەو هاوڕێیەت بە وێنەی بیری ناوی ئەو وێنەیەت بۆ بنێرێ کە لەدڵی خۆتدا دیاریت کردووە ، پێویستە چەند جارێ ناوی ئەو وێنەیە لە مێشکی خۆیدا دووبارە بکاتەوە و وێنا ( تصور ) بکات و وێنەکەت بە بیر بۆ وەسف بکات ، ئەم ڕاهێنانە نابێ لە (٣٠) چرکە زیاتر بخایەنێ ، گەر سەر نەکەوتی ئەو هەڵەیە لە ڕەوانەکەردایە ، یان لە وەرگر ، یان بۆ ناشارەزایی دەگەڕێتەوە لەو بوارەدا .

یان دەتوانی بۆ ڕاهێنانی تلە پاتی تاك شەخسی ئەم مەشقە ئەنجام بدەیت ، کاتێ تەلەفۆنت بۆ دێ لەدڵی خۆتدا هەڵی سەنگێنە فیسارە کەسەیە ، بە ڕاهێنان ئەم هەستەت باش دەبێت.

ئەم ڕاهێنانە بە کۆمەڵیش دەکرێت ، وەکو (٥-١٠) کەس ڕاسپێری بەدزی تۆوە شتێك لە مێشکی خۆیاندا دیاری بکەن ، تۆش بە خوێندنەوەی بیری ئەوان بیدۆزییەوە و ڕابمێنی بۆ دۆزینەوەکە .

---

[٢٦٢] عصر الخوارق / ل:٣٧.

نـاودارترین کتێـب لەسـەر تلـەپاتی کـە لـە جیهانـدا دەنگـی دایـەوە کتێبـی (جـذور المصـادفة)یە ، کە هیچ گومانێ لەسەر ڕاستی تلەپاتی ناهێڵێتەوەو بەشێوازی زانستی پێشکەوتوو دەیخاتە ڕوو ، نووسراوی (ارثر کویستلر)ە (ت/فوزیە ناجی).

(فاسیلیف) دەنووسێ : ئەو کەسانەی بە خەوانـدنی موگناتیسی خـەوێنراون تـوانراوە لەدووبارەوە بە ئیحای تلەپاتی بێـدار بکرێنـەوە ، فـەرمانیان پـێ دەدرێ دوای ئـەوەی بەپاوە وەستاون ، خۆیان بخەنە سەر دەم و چاویان ، ئەم ئەزموونە لەنێوان شارە لێك دوورەکان کراوە ، وەکوو نێوان (مۆسکۆ و لینینگراد) ، ئەم ئەزمووانە لەسەر هـەزاران کەس کراوە[263].

(نیکولاییف) و (کامینسکی) باشترین کەسن بۆ ئەو ئەزمونە ، تونـدترین ئـەزموونیان لەگەڵدا دەکرێ و سەر دەکەون ، نامەی تلەپاتی بە ئاسانی وەردەگرن.

(ئـارا منکـۆ) دەڵـێ : پەیوەنـدی تلـەپاتی وەکـو (نیوترینـات) لـە ئاسمانـەوە بـۆ زەوی دەردەچن و وەکو بۆمبا بەسـەرماندا دەبـارن ، ئـەو تەنولکانـە نادیـارن هـەمووو شـتێ دەبڕن و دێنە ناو مێشکی مرۆڤەوە[264].

## ئیعجازی (٥٣) ڕاهێنـان بۆ هەست کردن بەشتەکان و کەسان :

وشەی (الحس) واتە : هەست کردن : ﴿ هَلۡ تُحِسُّ مِنۡهُم مِّنۡ أَحَدٍ ﴾ مریم: ٩٨ .

(ئەنایـد هۆفمـان) دەڵـێ : چـۆن مـرۆڤ دەمارەکـانی هەسـت کـردن بـە بەرکـەوتنی لـە سـەرەپەنجەکاندایە ، هالەیـەکی موگناتیسـی وزەیـی دەوری داوە هەسـت بـە هالـەی

---

[263] جذور المصادفة / ارثر كويستلر /ل:١٤.

[264] الباراسايكولوجيا سر من اسرار الدولة / ل: ٤١ سەیر بکە.

کەسانی تر دەکات ، لەگەڵ هەست هەڵخستنی ئەو پەردا دەتوانین شوێنی کەسێ لە خۆمان دیاری بکەین ، بە مەشق و ڕاهێنان دەتوانین بزانین ئەو کەسەیە کێیە.

(ڕاهێنـان) : بـا هاوڕێکـەت پێلاوەکـەی دابنـێ ، دەسـت بـە ڕۆیشـتن بکـات بـەددوری ژوورەکەدا ، چاوەکانت جوان دەبەستی ، بەلام قسە دەکەیت ، کاتێ دەڵێ ی (بوەستە) با هاوڕێکەت بوەستێ ، بەبێ هەستی دەوەستێ ، نابێ دەنگی ببەستێ و هەست بە جووڵەکانی بکات و هەستە مادییەکان سوود لێ وەرنـەگریت ، وەکوو (ڕادار) وزەکـەت ئاراسـتەی ژوورەکـە بکـە ، ئایـا هەسـت بـە لەرەلـەری هاوڕێکـەت دەکـەیت ؟ ئەمـە بەخێرایی و ڕوودانی دێتـە دی ، شـوێنەکەی بخەملێنـە لـەکوێی ژوورەکەیـە ، سـەرەتا زۆر جار لەدیاری کردنی ئاراستەکەدا سەر دەکەوی ، دوایـی دەتـوانی شـوێنەکە دیـاری بکـەیت ، کـاتی ڕاهێنـان برادەرەکـەت لـە ژوورەکـەدا دەڕواتـە دەر ، ئـەو کاتـە بـۆت دەردەکـەوێ دەتـوانی هەسـت بـە نـەبوونی ڕادەی لەرەلـەری برادەرەکەت بکـەی وەکـو چۆن کاتێ لە ژوورەکەدا بو ، هەستت بە لەرەلەرەکانی دەکرد [٢٦٥].

بۆ ڕاهێنانی کۆمەڵ : دەتوانی لەجیاتی دیاری کردنی کەسێك شـوێنی چـەند کەسـێك دیاری بکەی لە ژوورەکەدا و هەمان یاسای ڕاهێنانی پێشوو پراکتیك دەکەیت.

بۆ ڕاهێنان لەسەر دۆزینەوەی شتی بێ گیان دەتوانی داوا بکەی لە کەسێ چەند شـتێ لە هەندێ شوێن بشارێتەوە ، کە فکری نەکات ، نـابێ دوو خولـەك ڕابـبرێ کـە هەسـت بۆ ئەو شتە شاراوانە ڕابگری ، دوایی دیاری دەکەیت .

ڕاهێنان بۆ هەست کردن بە ڕەنگەکان : دەتوانی (٨-١٠) پارچە قوماشی لە یەك ڕەگەز وەکـو خـوری یـان ئاوریشـم ئامـادە بکـەی ، ڕەنگـاو ڕەنـگ بـن ، دوای چـاو بەسـتنی ئەوانەی تـاقی کردنـەوە دەکـەن پێویسـتە بـە دەسـت لێـدان ڕەنگـەکان دیـاری بکـەن ، هەست کردن بەهەر ڕەنگێ جیایە لە ڕەنگەکەی تـر ، بـۆ نمونـە سـور گـەرمـە ، سـەوز

[٢٦٥] تطوير المهارات النفسية / ل:٨٨.

زۆر ساردتره ، دوای ماوەیێ ڕاهێنان هەست کردن بە ڕەنگەکان و جیاکردنەوەیان ئاسان دەبێت.

**ئیعجای ( ٥٤ ) : شاراوەزانی دەروونی ( التكهن النفسى ) ( Psychometry )**

زانین و پێشبینی کردنی و شاراوەزانی دەروونی بریتییە لە توانای چوونە ناو لەرەکانی کەسێکەوە لە ڕێگای کالاو شتێکی ئەو کەسەوە ، هەمووو شتێکی دەوروبەرمان لەرەکانی (الذبذبات) وەردەگرێ لەجل و بەرگ و گەوهەرو کالاو کەل و پەلەکان ، تا سۆزی نێوان ئەو شتەو خاوەنەکەی پتر بێ ، یان تا مانەوەی لای خاوەنەکەی پتر بێ، توانای لەرەکان پتر دەبێت[٢٦٦].

قورئان بەر لە زانستی نوێ ئاماژەی بە بوونی هەست کردن بە شتەکان کردووە لە ڕێگای هالەکانەوە ، واتە : دەست نیشاندنی خاوەنی کەل و پەلەکان لە ڕێگای هالەو وزەی شتەکانیانەوە .

بۆ نمونە : (یەعقوب) (علیه السلام) لە دوورەوە هەستی بە کراسی یوسف دەکات ، کە یوسف کردویە بەرەوەو هالەی ئەوی هەلگرتووە : ﴿ وَلَمَّا فَصَلَتِ ٱلْعِيرُ قَالَ أَبُوهُمْ إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ لَوْلَآ أَن تُفَنِّدُونِ ﴿٩٤﴾ ﴾ یوسف: ٩٤ .

بێگومان ئەم دیاردەیە موعجیزەیەکەو کەس ناتوانێ لەم ئاستەدا دووبارەی بکاتەوە . کە ئاستی هەرە بەرزی هەست کردنی ڕوحی یە بە خاوەنەکان لە ڕێگای کەل و پەلەکان و جل و بەرگەکانیەوە ، موعجیزەی (هەستی بۆن کردنی سەرووی ماددییە) .

**( ڕاهێنان )**

---

[٢٦٦] تطوير المهارات النفسية / ل: ٩٤.

ێ گەڕێ هەر کەسە بە تەنیا پارچە زێڕێ یان گەوهەرێ ، کە ماوەیێك بێ بەکاری هێنا بێ بیخاتە ناو چەند دەفرێکەوە ، پاشان سەریان دادەپۆشرێ ، ئەوە گرنگە پارچە گەوهەرەکان خاوەنەکەیان یەك کەس بێ بەشێوەیەك یەك نمونە هەڵبێ لە (لەرەلەرەکان – الذبذبات) ، چونکە چوونی چەند نمونەیێ لەرەلەر کارەکە دەشێوێنێت ، وەکوو چۆن دۆخی سەرەپەنجەکان دەشێوێت ، دوای ئەوە هەر کەسە پارچە گەوهەرێ هەڵدەگرێ بۆ کار لەسەر کردنی ، دەبێ مێشك خاڵی بکرێتەوە لە هەر داڵغەیێ ، کاتژمێر یان کلیلە یان قەڵەم زۆر باشە، دەتوانرێ لەجیاتی ئەو گەوهەرانە بەکاربێنرێن ، پاشان باس دەکرێ کێ خاوەنی شتەکانە.

**ئیعجازی ( ٥٥ ) بیر خوێندنەوە ( قراءة النفسية ) :**

لە (ڕوسیا)دا کۆمەڵە کەسانێ هەیە لەبیر خوێندنەوەدا کارامەن **دیمانەی لەگەڵدا** کردوون ، دیسان لە هونەری تری هەستی شەشەمدا **بلیمەتییان بە ئاشکرایی** دەبینرێت .

(بوریس ئەرمولاجیف) لە توانای دایە بە توانای ئیرادی زۆر، مرۆڤ یان هەر تەنێکی تر بۆ هەوا بەرز بکاتەوە ، لەگەڵ (سێرجێفدا) توانای نائاسایی خۆی تاقی کردەوەو پیشانی برادەرانی و زانایانی دەدات ، بەچاوەکانی سەیری تەنێکی بەردەمی دەکات و بە موگناتیسی چاوی چەند چرکەیێك بەرزی دەکاتەوە .

پرۆفیسۆر (پوشکین puschin) کۆمەڵێ تاقی کردنەوەی لەگەڵدا دەکات و دەتوانێ کەرستەی بۆ هەوا بەرز بکاتەوە

(پوشکین) لە کۆتایی دا سەلماندی ئەم کارتێکردنەی لەسەر دەستی (ئەرموجیلان) دا ڕوودەدات چاوگی کارەبایی (ئیستاتیکی) نییە بەڵکو توانایەکی نائاسایی یە .

(ئەرموجیلاف) بە تەرکیزو ڕامان چەند چرکەیێك کورسی بۆ هەوا بەرز دەکاتەوە ، پێی وایە ئەم توانایە شتێکی نوێ نییە بۆ ئەو ، بەڵکو سایکۆکینیزیا موعجیزەیێکی عیسا (علیه السلام) بووە .

دیسان (تەوفیق داداجیف) لە روسیادا توانای خوێندنەوەی بیری خەڵکی هەیە ، هەر لە منداڵی ییەوە بیری خەڵکی خوێندۆتەوە ، نەنکی دەگێڕێتەوە چۆن حەلواو شیرنەمەنیمان لێ دەشاردەوە ، بەبێ سەیری ئێمەی نەدەکردو پاشان دەچوو لەو شوێنەی حەلواکەمان لێ شاردۆتەوە دەچو لەوێ دەیدۆزییەوە ، بە وزە ڕوحی یەکەی توانیویەتی نەخۆش چاك بکاتەوە[٢٦٧].

(مەسیح) (علیه السلام) یەکێ لە موعجیزەکانی بیر خوێندنەوە بووە ، یان فیراسە ، ﴿ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمْ ﴾ آل عمران: ٤٩ ، واتە : هەواڵتان دەدەمێ چی دەخۆن چی خەزن دەکەن لە ماڵەکانتاندا.

**( ڕاهێنان )**

**پێویستە بیر خوێنەرەوە بە هێمنی خۆ خاوکردنەوە لەسەر کورسی یەك دابنیشێ بۆ گەیشتن بە قۆناغی بێ ئاگایی و نەست (اللاشعور) ڕێگا بە خەیاڵەکان و بیرەکان بدات بڕۆنە نار هەستەوە یان هزری هۆشیارەوە (العقل الواعی) ، پاشان باباى بیر خوێنەرەوە بەدەم خەیاڵەکان و بیرەکان کە هاتۆتە ناو هۆشییەوە دەیانخوێنێتەوەو باسیان دەکات .**

**(ئیعجازی ٥٦ ) خوێندنەوەی دەروونی لە مەسەلەی ڕوحانی دا و خوێندنەوەی چارەنووس لە ڕێگای بورجەکان و دەست و گۆی کریستاڵی یەوە :**

---

[٢٦٧] بروانە (الباراسایکولوجیا سرمن اسرار الدولة /ل: (٧-٢١) سەیر بکە.

وەکو (ئەنایدە هۆفمان) باس دەکات بریتییە لە مەسەلە ڕوحانیەکانی وەکو (لەپی دەست خوێندنەوە) و ئەستێرە گەری (التنجيم) و (خوێندنەوەی فنجانی قاوە) و (ئای چنك) .

بێگومان زۆر کتێبی گرنگ لەو بارانەوە نووسراوە ، لە کۆن و نوێ دا و لەلایەن زانایانی ڕوحانی ئیسلامی و بیانی جێگای سەرنجدان و ڕامان بووە ، نمونەی (شمس المعارف الكبرى / شيخ العلامة محمد بن على البوني) و (الابراج ابو معشر الفلكي) و (الفراسة / العلامة ابي فخر الرازي) و (الابراج / د.حميد الازري) و (شموس الانوار / ابن حاج المغربي) و (مجموعة ابن سينا في علوم السحر والتنجيم) و (الاوفاق/ الغزالى).

لە قوڕئاندا ئاماژە بە بوونی ئەم زانستانە کراوە ، کە لە کۆندا زیاتر لە لە ئێستا گرنگی یان پێ داوە، زانستی میتافیزیکی و پاراسایکۆلۆجی و نوێش و لە بواری فیزیاش دا لەزۆر بواردا بونیانی سەلماندووە .

لەبواری دەست خوێندنەوە باشترین کتێب کە لەم بارەوە نووسرا بێ (قراءة الكف/ د.احسان حقي) و (الكف مستقبلك / جان ريناك / ت: د.علاء الصباحي)یە .

قوڕئانی پیرۆز لەبارەی بوونی ئەم زانستانە فەرموویەتی لە کۆندا ﴿ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَ ﴾ البقرة: ١٠٢ .

قوڕئانی پیرۆز دەری دەخات ئەستێرەگەری و جادووگەری و هیپنۆتیزم و زانستی ڕوحانی لەسەردەمی بابلیەکاندا بە ئیلهامی فریشتەیی بلاوبۆتەوەو ڕوحانیەکان وەری دەگرن و گەشەی پێ دەدەن.

(كولن) پێی وایه (كەهانەت) بەر لە (٦٠,٠٠٠) ساڵ دەركەوتووه ، هەر لە كۆنەوه زانراوه كلدانییەكان دامەزرێنەری گەردووناسی و هونەری ئەستێرەگەرین ، كە بە (التنجيم) ناسراوه ٢٦٨.

شایانی باسه له (كتاب المقدس / سفر التكوين / ١٠-١١)دا هاتووه (بابل) شەنگاله لە ئەینەوا : (وقد تكونت مملكته او الامر في بابل وارك واكد من ارض شنعار).

دیسان (ب لرخ) پێی وایه كوردەكان نەوەی كلدانیەكانن ئێرانیه جەنگاوەره بەهێزەكانه ، كه لە چیاكان دانیشتوون (میخا ئیلس) و (شلوستر) و (كونیك) و (رینان) پێیان وایه ئێرانیەكان له بناغەدا كلدانین٢٦٩ ، بەلام ڕای ڕاستر ئەوەیه كه دوور نیه كلدانییەكان لقێ بن له كوردەكان ، چونكه (گۆتیەكان) بەر لە كلدانیەكان له كوردستان ژیاون.

(عباس محمود العقاد) نووسەری بە ڕەگەز كورد دەنووسێ : (بەپێی كتێبی (یوبیل) نوح له ساڵی (١٦٥٠ پ.ز) له دایك بووه ، ئیبراهیمی نەوەی له ساڵی (١٨٧٦) لەدایك بووه تارحی باوكی ناوی دەنێ (ئیبراهیم).

بەپێی نووسینەكانی (هالی) (Halley) پادشا (ئەمرافل)، حەموڕابی یه ناودارترین شای بابلی ، وەكوو له توێژینەوەی دۆزراوه ئاسەوارەكانی (برایت) و (كیلی) دا (١٩٢٤) دا هاتووه ڕووداوی (سەدوم) و (عەموره) كه له چاخی ئیبراهیمدا ڕویانداوه له ساڵی (٢٠٠٠ پ.ز)دا هاوكاته لەگەڵ لەناوچوونی شارەكانی ئەوێ . له قورئاندا هاتووه : ﴿ فَنَظَرَ نَظْرَةً فِي ٱلنُّجُومِ ﴿٨٨﴾ فَقَالَ إِنِّي سَقِيمٌ ﴿٨٩﴾ ﴾ الصافات: ٨٨ - ٨٩ .

(زمخشری) له (الكشاف) دا دەنووسێ : (أي في علم النجوم) ، بێگومان پێغەمبەران هەمووو زانستێكی سەردەمیان زانیوه ، بەلام موعجیزەكانیان لەسەروی ئەم

---

٢٦٨ الانسان وقواه الخفية / كولن ولسن / ل:٩٩.

٢٦٩ دراسات حول الكورد الايرانيين واسلافهم الكلدانيين الشماليين / ل:٢٢.

زانستانەوە بووە ، بۆ نمونە : (یوسف) بەپێی قورئان خەونی لێك داودتەوە ، بەکراسی ڕوحانی چاوی باوکی چاك دەکاتەوە .

بەڕای (یوسیفوس) ئیبراهیم زانستی ئەستێرەناسی و ڕوحانی یەت فێری زانایانی میسری کردووەو لەدۆڵی دوزێوە ئەم زانستانە بۆ ئەوێ گوازراوەتەوە [270].

موعجیزەی پێغەمبەران و صدیقینەکان لوتکەی زانستەکانە کەس ناتوانێ خۆی لەقەرەیان بدات ، نمونەمان ململانێی نێوان ساحیران و موسایە (علیه السلام) ، دەبینی چۆن لەم نمایشەدا چۆن ئاستی سیحری ساحیران لە بەرامبەر نمایشی موعجیزەکانی موسا (علیه السلام) دادەبەزێ و چۆن لەکاتی بینینی حەقیقەت و جیاوازی نێوان زانست و موعجیزە و ئاستیان ڕێك موسڵمان دەبن.

ئاستی دووەم دوای موعجیزە کەرامەتی ئەولیاییە وەکو (ابوبکر بن محمد الکلاباذي) باسی کردووە : (زانایان یەك دەنگن لەسەر بوونی کەرامەتی ئەولیا ، هەرچەندە دەڕواتە دەروازەی موعجیزاتەوە ، وەکوو ڕۆیشتن لەسەر ئاو و قسە کردن لەگەڵ گیانداران و فڕین و دەرکەوتن و پەیدا بوونی شت لەناوەختی خۆیدا ، فەرموودەی (صحیح) زۆرەو دەقی قورئان لەسەری هاتووە ، نمونە : ﴿ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن يَرۡتَدَّ إِلَيۡكَ طَرۡفُكَ ﴾ النمل: ٤٠ ، لێرەدا وەزیری سولەیمان دەڵێ : من تەختی بەلقێسات بۆ دەگوازمەوە بەر لەوەی چاو دابخەی .

زەکەریا بە مەریەم (سەلامی خوایان لەسەر بێت) دەفەرمووێ : ﴿ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَاۖ قَالَتۡ هُوَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ ﴾ آل عمران: ٣٧ ، واتە : ئەو خواردنەت لەکوێ بووە ؟ وتی : لە خواوە هاتووە [271].

---

[270] بۆ زانستی پتر : (ابو الانبیاء / عباس محمود العقاد) بخوێنەوە.

[271] التعرف لمذهب اهل التصوف / الکلاباذي / ل:٨٨.

ئاستی سێ یەمی کاری ئاسایی ئەو کارانەیان لە وەزرش و ڕاهێنانی دەروونی و خوێندن و فێرکردن بەدەست دانی ، وەکوو زانستی میتافیزیك و هیپنۆتیزم و یوگا و ...هتد.

هەمووو ئەو دیاردانەش بەڕامان و بیرکۆکردنەوەو چوونە ناو باری نەستەوە دێتەدی

(باتریشا کارنگتون) باس دەکات (ڕامان و بیرکۆکردنەوە – التأمل التمركز) لە نەریتی خۆر هەلآتی و خۆرئاوایی کۆندا بریتییە لە ڕاهێنانی ڕوحانی بۆ گەیشتن بەجۆرێکی تایبەتی هەست ، ئەم ڕاهێنانە بەبەرزترین پلەی هەست دادەنرێ ، زوهدو ڕاهێنانی جەستەیی تایبەتی و ڕیجیم و تەگبیری کۆمەلآیەتی و چەند کاتژمێرێکی درێژ ڕامانی ڕۆژانە، هەموویان بەشێکن لەڕامان .

(ماوین Maupin) دەڵێ : ئەو نوێژەی ڕامان و بیرکۆکردنەوەی تێدایە بۆ ماوەیەکی درێژ تاکە ڕێگایە بۆ ڕامان کە بە فراوانی لەناو کۆمەڵگادا باوە) .

هەروەها خود هیپنۆتیزم فراوانەو ڕامانی تێدایە ، بەلآم لە هیپنۆتیزمدا ئیحا بەخۆدان و ئیحا پێدانی غەیر هەیە ، مرۆڤ تێیدا بەپێی فەرمانەکانی غەیر یان خۆی کار دەکات و بیر دەکاتەوە .

وە لە چەمکی خۆرئاوادا ڕامان بەشێکە لە خود هیپنۆتیزم، هونەری ڕامان پێویستی بە (٢٠) ساڵە تا مرۆڤ تێیدا ورد دەبێتەوە ، هەندێ زانای هاوچەرخ پێیان وایە (ڕامان) دۆخێکی فسیۆلۆجی دەگمەنە لە نووستن و بێداری جیایە، هەر چەندە سیفاتی ئەو دوانە هەڵدەگرێت.

(ڕامان) بریتییه له چەند دۆخێکی سووکه خەو (النعاس) و نیمچە هەستی بەر له نووستن)[272].

قورئان باس لەم سووکه خەوه دەکات کە دیاردەی نائاسایی تێدا ڕوودەدات و مرۆڤ لەنێوان خەو و بێداری دایه وەکو ڕابردوو باسکرا ﴿ ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا ﴾ آل عمران: ١٥٤ .

(تەصەوف) له ئیسلامدا بەشی ڕوحی ئیسلامەو وشەیێکی قورئانی یه له (صفا) وه هاتووه ، (بشر بن حارث) دەڵێ : (الصوفي من صفا قلبه لله) ، واته : سۆفی ئەو کەسەیه دڵی بۆ خوا پاکژ دەکاتەوه .

(جنید) دەڵێ : (التصوف تصفیه القلب) له (عبدالله بن التستري) لەبارەی سۆفی پرسیار کراو وتی : (من صفا وامتلأ من الفكر ، وانتقطع الى الله من البشر ، واستوى عنده الذهب والمدر) ، واته : سۆفی ئەو کەسەیه خۆی ساف کردۆتەوه له لیلی و خۆی پڕکردووه لەبیر ، بۆ خوا لێ بڕاوه لەمرۆڤ ، زێڕو خۆڵی لا وەك یەکه[273])

غەزالی بەر له زانایانی دەروونزان و ڕوحانی خۆرئاوایی ئاماژه به (هەست) و (نەست -اللاشعور) دەکات : (اعلم ان للقلب بابا بين للعوم واحد لك حلام والثاني لالعالم اليقظة وهو باب الظاهر الى الخارج فاذا نام غلق باب الحواس فيفتح له باب الباطن ويكشف له غيب من العالم الملكوت ومن الوح المحفوظ فيكون مثل الضوء)[274]، واته : بزانه دڵ دوو دەرگای هەیه ، یەکێ بۆ خەونەکانه ، دووەم بۆ دونیای بێدارییه ، کە دەرگای ڕواڵەتی یه بۆ دەرەوه ، گەر مرۆڤ نووست دەرگای

[272] التأمل / باتريشا كارنغتون / ت:اقبال ايوب / سمير بكه (ل:١٩-٥٧).
[273] التعرف / الكلاباذي / ل:٢٨-٣٢.
[274] كمياء السعادة / حجة الاسلام الغزالي /ل:٨٦.

هەستەکان دا دەخرێ و دەرگای دەروونی بۆ دەبێتەوە ، جیهانی نادیاری بۆ دەکرێتەوە لە لەوحی مەحفوزەوە و وەکو ڕووناکی دیار دەبێت.

واتە : گەر مریدو قوتابی بەردەوام بێ لەسەر زیکرو خلوەو گۆشەگیری و ڕامان و کەم خۆراکی و کەم نووستن و بەتەواوی ڕوو لەخوا بکات، ئەوە خودا دونیای غەیبی بەڕێژەیی بەڕوودا دەکاتەوەو ئیلهام و کەشف و کەرامەت بەدەست دێنێت ، دەبێتە خاوەن فیراسەو دڵی خەڵکی دەخوێنێتەوە .

ئاشکرایە وەکو (د.علی الوردي) دەربارەی (اللاشعور) باسی کردووە دوو ڕا هەیە (فرۆید) و قوتابخانەکەی پێیان وایە (نەست) بریتییە لە کۆمەڵە ئارەزوێکی کپ کرە مرۆڤ دەتوانێ فێری بکات ، بەڵام گروپی تری زانایانی ئیسلامی و خۆرئاوایی پێیان وایە (نەست) شوێنی دابەزینی وەحی و کەشف و ئیلهامە لە مرۆڤدا ، چاوگی پێغەمبەرایەتی و داهێنانە .

(بینیل) پێی وایە : (هەمووو ماددەیێ لە گەردووندا لەرەو شەپۆل ڕەوانە دەکات . پێنج هەستەکان پەیان پێ نابەن ، بەڵام غودەی سنەوبەری بچووك لەخوار مێشك لەلای دڕکە مۆخەوە بەرپرسە لەمەڕ هەستی شەشەمە کە پەی بەلەرەکان دەبات و هەندێ جار کاری تێ دەکات).

دەڵێ : (تیشکی مرۆڤ وەکو بێ تەل (اللاسکی)یە ، بەڵام بێ تەل لە ماددەی نـ ئەندامی دروست بووە ، لەشێوەی پاتری و تەلدایە ، دووەم لە ماددەی زیندووو پێك دێ لەشێوەی خانەی هەستیارو ئەتەمی دەماری دا ، بەڵام کاری هەردووکیان یەك شتە ، ئەویش ناردنی شەپۆلی نابینراو و نەبیستراو بۆ هەستەکان لەشێوەی شەپۆلی جیاو لێ حاڵی بوون).

(د.دایفس) دەڵێ : (هەمووو تاکێ کۆمەڵە شەپۆلێکی دەماخی تایبەت بەخۆی فڕێ دەدات ، شەپۆلەکانی مێشك وەکو سەرەپەنجەکان هی کەس لەکەس ناچێت).

(جیفز) وێنەی (لوح المحفوظ) ئاوا پێناسە دەکات : (زەمەن لەسەرەتاوە تا کۆتایی لە وێنەیەکدا لەبەردەم ئێمەدا درێژکراوەتەوە ، بەلاّم تەنیا یەك سات هەست پێ دەکەین وەکو چۆن تایەی پایسکلێ یان ماتۆڕێ یەك خالّی زەمینی هەست پێ دەکات ، کەواتە ڕووداوەکان وەکو (ڤایل) باس دەکات ڕوونادەن ، بەلّکو ئێمە بەڕووداوەکاندا ڕەت دەبین ، هۆشی ئێمە لەو کاتەدا وەکو هۆشی مێشێکە بە ئەتلەس و وێنەیەکدا ڕەت دەبێ ، وێنەکە هەمووی لە شوێنی خۆیەتی ، بەلاّم مێشەکە یەك لە ساتەکان کاری تێ دەکات ، هەر چەندە بەشێکی کەمی وێنەکەی یاد دەکەوێتەوە کەچی خۆی فریو دەدات پێی وایە یارمەتی کێشانی بەشەکانی وێنەکەی دەدات کە لەبەردەمی دا درێژ بۆتەوە)[275].

لە (بەریتانیا)دا کۆمەلّەی لێکۆلّینەوەی دەروونی تاقی کردنەوە لەسەر (١٧٠٠) کەس دەکات و لەم بارە پرسیاریان لێ دەکرێ ،لاّمی خەونەکانیان لە (٤٧) بەش دا (١) بەش ڕاست دەردەچێت[276].

بێگومان یەك لە ماناکەی ئەم فەرموودەیە کە دەفەرمووێ (الرؤيا الصالحة جزءمن ستة واربعين جزءا من النبوة) رواه البخاري ومسلم ، واتە : خەونی باش بەشێکە لە (٤٦) بەشی پێغەمبەرایەتی واتە (١) بەشی ڕاستە لە (٤٦) بەش ، یان مانای وایە بەشێکی لە (٤٦) بەشی ڕووداوێکی غەیبی کەشف دەکات.

بەم شێوەیە زانستی غەیبی ڕەها تەنیا خودایە بەشێکی کەم و بەپێی پێویست نەبێ ئیلهامی مرۆڤی ناکات ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ﴾ البقرة: ٢٥٥ .

---

[275] خوارق اللاشعور / د.علي الوردي / ل:١٦٠-١٦١.
[276] خوارق اللاشعور / ل:١٧٢.

پێغەمبەر ﷺ و ئال و بەیت و هاوەڵان و ئەولیایان رمزای خوایان لێ بێ هەمووویان لە جەنگەکانـدا داوای کۆمەکی غەیبی یان کردووە : ﴿ أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَاثَةِ ءَالَافٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ ﴿١٢٤﴾ ﴾ آل عمران: ١٢٤ .

(د.علی الوردی) باس دەکات کە (رومل) ی سەرکردەی ناوداری ئەڵمانی لە جەنگی جیهانی دووەم دا بڕوای بە هەستی شەشەم بووە لە بەڕێوبردنی شەڕدا.

دەگێڕنەوە (هانیپال) سەرکردەی (قرتاجی) کە ڕومانی شکاند لە توانای دابووە بیری دوژمنانی بخوێنێتەوەو پلانیان بزانێ و لەدژیاندا پلان دابمەزرێنێت[٢٧٧].

پێغەمبەر ﷺ گەورەترین سەرکردەی سەربازی و سیاسی بووە ، خوای گەورە کۆمەکی ڕوحی پێداوە ، بۆیە لە هەمووو ڕووداوێکی سەربازی و سیاسی دا گەورەترین سەرکەوتنی بەدەست هێناوە .

(ڕونالد ماکری) دەڵێ : ڕوسیا لە هەمووو ولآتان پتر خەواندنی موگناتیسی قبوڵە . لە ڕاپۆرتی هەواڵگری بەرگری دا هاتووە (خەواندنی موگناتیسی لە ڕوسیادا وەکو بلاوی تیشکی ئێکس بلاوە ، کە لە پزیشکی و فسیۆلۆجیاو دەروونزانی دا بەکاردێ) . بۆ لێکۆڵینەوەی پۆلیسی سوودی لێ وەردەگیرێت)[٢٧٨] ، تا وەزارەتی دادی ویلایەتی کالیفۆرنیا بڕیارێ دەردەکات ئەو کەسانەی هەستی شەشەمیان بەهێزە بەکاربێنرێن لە لێکۆڵینەوەی تاواندا[٢٧٩]

(د.جویل . س. لوسون) لە واشنتۆندا دەڵێ : بیست ساڵە بڕوای وایە پەی پێ بردنی هەستی شەشەم تاکە ڕێگای گونجاوە بۆ شەڕی ژێر دەریاکان[٢٨٠].

---

[٢٧٧] خوارق اللاشعور / ل: ١٥٦.
[٢٧٨] حروب العقل / ل:٣٩.
[٢٧٩] حروب العقل / ل: ٣٥.
[٢٨٠] حروب العقل / ل: ٢٠.

(بڕوا وایە چەکی سایکترۆنی سەرووی مەکانی ژێر دەریایی ئەمریکی تریشەری لە ساڵی (١٩٦٣)دا بەتەرکیزی وزەی هالەی موگناتیسی ئاسایی بۆ سەر وێنە کەی نقومی کردبێت[٢٨١] !

بێگومان لەم خوێندنەوانەدا ئەوە دەردەکەوێ مرۆڤایەتی بەتەواوی قەرزاری قورئانە ، کە هەڵگری گەنجینەی هەمووو زانستەکانە ، لەزانستی ڕوحی و ماددی و هزریدا ، هەر وشەیێکی قورئانی بیگری ئوقیانوسێکە پڕ لە مرواری و مەرجانە ، مەلەوانی شارەزای دەوێ بۆ ڕاوکردونیان.

لەپی دەست و دەست خوێندنەوەو ڕوخسار خوێندنەوە :

عەللامەو فەیلەسوفی گەورەی ئیسلام (فخر الرازی) **لە کتێبی (الفراسة) دا کۆمەڵە** ئایەت و فەرموودەیێ ئاماژە **پێ دەکات کە ئەومیان لێ دەخوێنرێتەوە دەم و چاو** خوێندنەوەو بیرخوێندنەوەو سیما **خوێندنەوە بە گشتی ڕاستی هەبونیان بە دەقەو** نکۆڵی کردونیان ناکرێت.

﴿تَعۡرِفُهُم بِسِيمَٰهُمۡ﴾ البقرة: ٢٧٣ ، واتە : بە سیماو ڕووخساریان دەیانناسیت.

﴿وَلَتَعۡرِفَنَّهُمۡ فِي لَحۡنِ ٱلۡقَوۡلِۚ﴾ محمد: ٣٠ ، بەشێوازی قسە دەیانناسیت.

پاشان باس دەکات شوێن هەڵگری (قیامة الاثر) هەیە ، کە بریتییە لە شوێن هەڵگرتنی پێ یە کان و پێڵاو و نەعلەکان لە ڕێگاکاندا بەهۆی شوێنەوار پەیدا کردن لە خاکدا.

دووەم : سەر ناسی یە (قراءة البشرة) بە خوێندنەوەی پێست و شێوەی پێ یەکان.

---

[٢٨١] حروب العقل / ل: ١٨.

هەروەها ئەم زانایە باس لە خوێندنەوەی سیفەتەکانی مرۆڤ دەکات لە ڕێگای ناوچاوان و برۆو چاو و پێڵو و لوت و دەم و زمان و لێوەوە ، یان لە ڕێگای پێکەنین و گوێی مل و دەنگەوە ... هتد .

بۆ نمونە : دەڵێ : کێ ناوچەوانی بچووك بێ ئەوە نەزانە ، کێ ناوچەوانی زل بێ تەمبەڵ و تورەیە ، کێ برۆی پڕ بێ خاوەنەکەی دڵ پڕ خەمە و قسە ناخۆشە ، کێ لووتی گەورە بێ نەزانە ، کێ لوتی بەرز بێ تورەو کەم هەستە ، کێ لوتی کەوانەیی بێ کەسێکی باشە ، کێ دەمی گەورەبێ زۆر خۆرە ، کێ لیۆ گەورەبێ نەزان و توندە! ...هتد .

لە زانایانی خۆرئاوا (لومبروز) بە ئەزموون سەلماندویەتی شێوەکان کەسایەتی مرۆڤ دەردەخەن ، بۆ نمونە : مرۆڤی بلیمەت یان زۆر درێژە یان کورتە ، بەدەستی چەپ کار دەکات یان بە هەردوو دەستی ... هتد[٢٨٢].

یان لەپی دەست خوێندنەوە : بەر لە هەزاران ساڵ لە هیندستان و میسر هەبووەو بۆ گەلانی تر گوازراوەتەوە ، لەسەر دەستی (جان گاسبار لافاتیر) شاعیرو فەیلەسوفی سویسری (١٧٤١ز) و (١٨٠١ز) نوێ کرایەوە ، خوێندنەوەی شێوەناسی (علم الهیئة – physiognomonic) داهێنا ، لەپێك هاتەی ڕووی مرۆڤی فێڵی ڕێوی و دڕندەیی پڵنگ و نەرمی مەڕی دۆزییەوە ، دوایی نوژداری ئەڵمانی (فرانز جوزیف گال) (١٧٥٨ ز) پەیڕەوی لێ کرد ، (شارل دار بنتینی فرەنسی) دەست خوێندنەوەی داهێنا ، کە سروشت و مەیلی مرۆڤ لە دەست و شێوەی دا دەدۆزێتەوە .

دواتر زانای تر هاتن تاو و توێی دەست خوێندنەوەیان کرد وەکو (روتمان) و (بنتریدج) و (ئەدریان دەبارول) و ئەم زانستەیان تۆکمە کرد .

---

[٢٨٢] الفراسة / فحز الرازی / تحقیق مصطفی عاشور / سمیر بکە.

زانستی دەست خوێندنەوە دوو بەشە : دەست خوێندنەوەو لەپ خوێندنەوە ، ئیمڕۆ لە ئەمریکاو ئەوروپادا زۆر گرنگی پێ دەدرێ و کۆڕی بۆ دەگێڕێ و ئەزموونی لەسەر دەکرێت.

لەم زانستەدا دەست دەکرێ بە (٧) بەشەوە ، هەر بەشە سیفاتی خۆی هەیە وەکو دەستی هونەری قوچەکی و دەستی خرپنی ڕوحانی و دەستی ئالۆزی فەلسەفی ، دەستی چوارگۆشەیی زانستی بەسوود ، دەستی تێکەڵ و دەستی ئاژەڵی سەرەتایی وەپەنجەکان لەریزی پێشەوەن بۆ لێکۆڵینەوە[٢٨٣].

## ئەستێرە گەری ( تە نجیم )

دیسان زانست سەلماندویەتی بورجەکان و خۆرو مانگ و هەسارەکان و جوولەو ڕووناکی و موگناتیسی و ئیقاعەکانی یان کاریگەریان بۆ سەر دەروون و جەستەی مرۆڤ هەیە .

﴿ وَبِٱلنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ ﴿١٦﴾ ﴾ النحل: ١٦ ، واتە : بەهۆی ئەستێرەوە ڕێنوما دەبن .

﴿ فَنَظَرَ نَظْرَةً فِى ٱلنُّجُومِ ﴿٨٨﴾ فَقَالَ إِنِّى سَقِيمٌ ﴿٨٩﴾ ﴾ الصافات: ٨٨ – ٨٩ ، واتە : حەزرەتی ئیبراهیم سەیرێکی ئەستێرەکانی کردو وتی : من نەخۆشم .

---

[٢٨٣] قراءة الكف / (د.احسان حقي) سەیر بکە .

﴿ قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ۝١ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ۝٢ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ۝٣ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّـٰثَـٰتِ فِى ٱلۡعُقَدِ ۝٤ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ۝٥ ﴾ الفلق: ١ ـ ٥ .

**لێرەدا قورئان کۆمەڵە موعجیزەیەکی گەورەی میتافیزیکی ئاماژە پێ دەکات .**

**(الفلق) ئاماژەیە بۆ تەقینەوەی ناوکی و کەرت بوونی ناوکی ، وەکوو لە** (تفسير الطبري) **دا هاتووە** (ابن زيد) **دەڵێ : (الغاسق) کەوتنی کۆمەڵە ئەستێرەی پەروین** (الثريا) **یە ، لەکاتی کەوتنی لای عەرەب نەخۆشی و تاعون (کۆلێرا ) زۆربووە و لەکاتی دەرکەوتنی کەم بۆتەوە .**

**پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (النجم غاسق) ، واتە : مەبەست لە (غاسق) ئەستێرەیە ، دیسان پێغەمبەر ﷺ بەمانگ مانای کردووەو ئاماژەی بۆ مانگ کردووە فەرموویەتی :** (يا عائشة إستعيذي بالله من شر هذا فان هذا الغاسق اذا وقب)[٢٨٤] ، **واتە : ئەی عائیشە داوای خۆ پەنادان لە خوا بکە لە زیانی ئەمەیان، (الغاسق). (النفاپات) ژنانی جادوگەرن کە فو دەکەن بەگرێ دا ، (الحاسد) مەبەست لە ئێرەیی بەرە ، کە چاوەزار دروست دەکات (باسکراوە).**

**(شافیعی) –رحمه الله- و یارانی پێیان وایە** (ولكن الشياطين كفروا يعلمون الناس السحر) (البقرة ...) **ئەم کافر کردنە لەبەر ئەوەیە ئەم جۆرە ساحیرو ئەستێرە گەرانە لەبەر ئەوە کافر بوون کە خوایە تییان داوە تەپاڵ ئەستێرەکان ، نەك لەبەر ئەستێرە گەری**[٢٨٥]**.**

(ابن حجر الهيثمي) **دەڵێ : (کاهین : ئەو کەسەیە هەندێ شتی شاراوە باس دەکات و بەشێکی دەپێکێت و بەشێ ڕاست دەرناچێ و پێی وایە جنۆکەکان حاڵی دەکەن) .**

---

[٢٨٤] تفسير الطبري / الطبري / ج٣٠ /ل:٤٣١.

[٢٨٥] سل الحسام الهندي / محمد امين بن عمر بن عبدالعزيز/ ل:٤٠.

دەڵێ : (دورکەوتنەوەو جوت بونی هەسارەکان و دەرکەوتنیان لە هەندێ کاتدا کە ئەستێرەگەر بڕوای وابێ ئەوانە نیشانەی خوایین بۆ ڕودانی فلاَن ڕوداوە ئەوە گوناهی لەسەر نییە) بڕوانە (الزواجر / ل: ١٥١/ج٢) .

(ابن حزم الظاهري) ڕوونی کردۆتەوە ئەم فەرموودەیە : (اصبح من عبادي كافر بي مؤمن بالكواكب) متفق عليه ، کە دەفەرمووێ : (بەندە هەیە بڕوای بەمن نییە بڕوای بە هەسارەکان هەیە) ئەم فەرمووودەیە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوونی کردۆتەوە ، ئەوانەن دەڵێن : (مطرنا بنوء كذا وكذا) واتە : بەهاتنە خواری فلاَن ئەستێرەو فیسارە بارانمان بۆ باری .

بەلاَم ئەو کەسەی پێی وایە ئەو هەسارەو ئەستێرانە دروست کراون و ژیر نین و خوای گەورە دروستی کردوون و کردوونی بە بەڵگە بەسەر دروست کراوانە ئەوانە کافر نین.

بەو پێیە مەبەستی پێغەمبەر ﷺ لەو ئەستێرە گەڕانەیە کە پێیان وابووە گەردوون ژیرەو توانای جیاکردنەوەی هەیە بێ لەخوا گەردوون ڕادەپەڕێنێ یان لەگەڵ خوادا ، ئەوانە گروپێکی بێ بڕوان و بت پەرستن ...)[٢٨٦].

(ج.اج.رایز) دەنووسێ : (ئێستاکە زۆر کەس بڕوای بە بورجەکان و کاریگەرییان هەیەو پێشبینی یەکان بەباشی وەردەگرن).

پێویستە بزانین کات ژمێرەکانی ڕۆژ بەپێی وەرزەکان جیاوازی یان هەیە ، هەروەها بەپێی هێڵە پانەکان ، ئەم بارە جۆرێ لە کاریگەرییان لەماوەی ئەو ماوە جیا جیانەدا لەکاتی سوڕەکەدا پەیدا دەکات .

---

[٢٨٦] الفصل / ج ٢ / ابن حزم الظاهري/ ل:٣٨٦.

(فرانس هلبرج) ی گەردووونناس بەگوزارشێکی ناوی ناوە ، کە بریتییە لە (ئیقاعی ڕۆژانە) هەندێ زانایان پێیان وایە ئیقاعی ڕۆژانە ڕەفتاری ئەندامی بە گشتی ڕێك دەخات ، بەتایبەتی (نووستن) و (بێداری) و (وزەی بەدەست هاتوو) و وزەی خەرج کراو ... هتد ، کە جوولەی شەو و ڕۆژانە کاریان تێ دەکات ، ئاشکرایە زۆر لە گوڵەکان و ڕووەکەکان لە ڕۆژدا (دووەم ئۆکسیدی کاربۆن) هەڵدەمژن و ئۆکسید دەدەن لەگەڵ خۆرئاوابووندا ، ئەم ئیقاعەش کاریگەرییەکی مسۆگەری هەیە بۆ سەر مرۆڤ و گیانداران ، تەواوی زیندەوەران ، لەوانە زیندەوەرە میکرۆسکۆبی یە تاك خانەکان پێویستی یان بە ئیقاعی ڕۆژانە هەیە ، تا زیندەوەری لاوازی وەکو (یوگلینا) کە لە گۆم و زەلکاوەکاندا دەژی زۆر هەستیارە لە بەرامبەر ڕووناکی دا دەجوڵێ بۆ خۆراك پەیدا کردن و دوای خۆرئاوابوون لە جووڵە دەوەستێت.

کاریگەری ڕووناکی بۆ سەر میوەو میوەجات شاراوە نییە ، هەروەها لە پێگەیاندنیان دا ، هەندێ وەڵامی ڕووەك دەدەنەوە جار هەیە گەڵاکان دەوری دەدەن تا لەبەرامبەر گەرمی خۆر بیپارێزن و ببن بە درگێ لەدەوری دا .

زانایان تێبینی ئیقاعەکانی مانگیان کردووە ، بەهۆی جوولەی مانگ پەیدا دەبن لەگەڵ جووڵەی زەوی دا ، دەربارەی خۆردا خولگەی تەواوی مانگ بەدەوری زەوی دا (٢٧,٣) ڕۆژی پێ دەچێ ، بەو پێیە تەواوی پەڵەکانی زەوی بەکەمێ پتر لە (٢٤) کاتژمێر لە ڕۆژێکدا ڕووناکی خۆریان بەردەکەوێ ، واتە : ڕۆژی هەیڤی (٢٤,٨) کاتژمێر دەخایێنێت.

ئاشکرایە کاریگەری مانگ ئاشکرایە لە ڕووی هێزی کێش کردنی بۆ سەر زەوی ، مانگ جۆرە ئیقاعەکی تری خۆری پەیدا دەکات ، هەڵکشانی ئاوی بالا لەزەوی دا هەر ڕۆژە (٤٨) خولەك دوادەکەوێ ، ئەمەش یەکێکە لە کاریگەرییەکانی مانگی بۆ سەر ژیانی ئەندامی ، (میتابۆلیزم) کە کرداری بنیات نان و پێك هێنانی ناخی زیندەوەرە ئەو ئیقاعە مانگی یە کاری تێ دەکات .

زۆر کەس بڕوای وایە باشترین کات بۆ کشتوکاڵ کردن لەکاتێ دایە مانگ لە نیوەی دووەمدایە و کاریگەری مانگ بۆ سەر زەوی کزە ، هەر لە کۆنەوە زانراوە وشەی (لونایتك) وشەیێکی ئارییە واتە : (مانگ) وەرگیراوە لە لاتینی دا واتە : (شێت) ، چونکە پێیان وابووە ، بەرکەوتنی مانگ بەهەندێ کەس شێتی پەیدا دەکات .

دیسان سوڕی خوێنی مانگانەی ژن (مەهك – حەیز) بە ئەژمارەی مانگی دەژمێردرێت ، زۆر لە گیاندارانی ئەندامی هەڵکشان و داکشانی مانگی کاریان تێ دەکات ، تا هەندێ قرژاڵی دەریایی لە هەڵکشانی بەرزدا سەدەف دەکەونەوەو لەکاتی داکشاندا دایدەخەنەوە .

دیسان تێبینی کراوە ئەو ئیقاعانەی سروشتی نین ، دیسان توێژینەوەکان دوپاتی یان کردەوە لەناو خودی زیندەوەراندا **ئیقاعەکان هەیە لەگەڵ ئیقاعی ڕۆژانە دەگونجێن ، ئەو کاتێنی یە (التزامن) لەماوەی لەباردا ڕوو دەدەن و فەرمان بەسەر کاتێ** کردنەکاندا دەکەن.

دیسان زۆرکەس هەیە بڕوای وایە (هەسارەکان)ی کۆمەڵەی خۆر کە زەوی یەکێکە لەوانە بەردەوام لەرە دەدەن بە گونجاوی ، نمونە : (عەتارد) لە ساڵێکدا چوار جار بە دەوری (خۆر) دا دەخولێتەوە ، بەلام هەسارەی وەکو (پلۆتۆ) بە (٢٤) ساڵ خولێك بەدەوری خۆردا تەواو دەکات ، ئاشکرایە هەر تیشك و کاریگەرییەك دەگاتە زەوی لە هەسارەکانەوە مل بۆ لەرەلەری تایبەتی ئەو کەچ دەکات ، کەواتە چاوەڕێ دەکرێ کاریگەری هەسارەی (زوهرە) بە (حەوت) مانگ بگاتە زەوی .

دیسان هەر لە کۆنەوە ئەستێرە ناسان گومەزی ئاسمانیان بۆ (١٢) بورج دابەش کردووە و بەچەند کۆمەڵە ئەستێرەیێك ناو براون و بۆ ئاسانکاری دیاری کردنی شوێنی ئەستێرەکان ، لەئەستێرەگەریدا بۆ هەر بورجە رەمزێکیان داناوە ، شوێنی ئەستێرەکان بەپێی جووڵەی زەوی دەگۆڕێ ، بینراوە لێرەدا گۆڕانی بەردەوام هەیە، کە بۆ جووڵەی زەوی بە خولگەی دا دەگەڕێتەوە .

کاریگەری جووڵەی زەوی بە خولگەی ئەوەشدا هەسارەکان لەبەر نزیکی یان لەزەوی کاریگەرییان بۆ سەر مرۆڤ و زیندەوەران پترە ، دیسان خۆرو مانگ کاریگەرییان بۆ سەر مرۆڤ و زیندەوەران پترە ، دیسان خۆرو مانگ کاریگەرییان هەیە بە پێوانە لەگەڵ کاریگەرییە ئاسمانییە دوورەکاندا ، ئەو مرۆڤەی لەژێر بورجێکی دیاریکراودا لەدایك دەبێ چەند کاریگەرییەکی دیاری کراو کاری تێ دەکات ، بۆ نموونە : ئەو منداڵەی لەژێر هێمای کارژۆڵە (الجدي) دا لەدایك دەبێ سیفەتی ئەو هەڵدەگرێ و میزاژەکی توندی دەبێ ، ئەو کەسەی لەژێر شوێنی (مەریخ) دا لەدایك دەبێ دوژمنکارانەی دەبێت.

ئەو کەسەی لەژێر هەسارەی (موشتەری - بەرجیس) دا لەدایك دەبێ بەختەوەر دەبێ ، ئەو کەسەی لەگەڵ هەسارەی (زوحەل = کەیوان) دا لەدایك دەبێ ڕێبازی خۆی توند دەگرێت.

ئەو ڕاستی یانەی ئەستێرەناسی کۆن باسی کردووە ، تا ڕادەیێکی زۆر ڕاستی یان سەلماوە ، چونکە ئەو جیهانەی لەناویدا دەژین پڕە لە ئیقاعات و چالاکی مرۆڤ و گیانداران توشی یان دەبێت)[287].

قورئانی پیرۆز فەرموویەتی : ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلۡبُرُوجِ ١﴾ البروج: ١ ، واتە : سوێند بە ئاسمانی خاوەن بورج (کەلو).

بورجەکان (١٢) دانەن :

(١) بورجی کاوڕ (الحمل)

(٢) بورجی گا (الثور) .

(٣) بورجی (الجوزاء).

(٤) بورجی قرژاڵ (السرطان) .

---

[287] بە کورت کردنەوە لە (عصر الخوارق) / ل: ٤٩-٥٤ وەرگیراوە.

(٥) بورجی شێر (الاسد).

(٦) بورجی کەنیشك (العذراء).

(٧) بورجی تەرازوو (المیزان).

(٨) بورجی دووپشك (العقرب).

(٩) بورجی کەوان (القوس).

(١٠)بورجی کارژۆڵە (الجدي).

(١١) بورجی سەتڵ (الدلو).

(١٢)بورجی نەهەنگ (الحوت).

بورجەکان لای ئەستێرە ناسان بە ڕۆژی لە دایك بوون دیاری دەکرێ یان بە پیتی ئەبجەدی ، لای (حمید الازري) و ئەستیرە ناسی کۆن ڕێگای ئەبجەدی بەڕاستر دانراوە ، وەکوو (ابو معشر الفلکي).

خوێندنەوەی گۆی کریستاڵی (بلوری) :

گۆیەکی بلوری یان کریستاڵی پڕ لە ئاوی ساف ئامادەکرێ ، نابێ نەخش لەسەر بنەکەکەی دیاری بکرێ ، گۆیەکە لەسەر پەڕۆیەکی ڕەش دادەنرێ بەمەبەستی ڕوودانی دیاردەکان .

تەکنیکی خاڵ خاوکردنەوەو هەناسەدان بەکاردێنی ، تا هەست بە ئارامی و خاوبوونەوە دەکەیت .

پاشان بیرت لەسەر گۆ بلورییەکە کۆبکەوە ، بڵێ : من دەتوانم لە قوڵایی گۆیەکەدا شتەکان بینم و بخوێنمەوە ، بەمە کارامەیی و چالاکی ڕوحیت فراوانتر دەبێ و هەستی ڕوحیت تیژ تر دەبێت ، ئارام بگرە لەگەڵیدا و برۆ ڕۆژانە تاقی کردنەوە ئەنجام بدە ، تا خۆت بۆ ئەزموونی دووەم ئامادە بکەی : دەردەکەوێ پارچە تەمێ

لەبەردەمتـدا دەردەکـەوێ و دەجـوڵی و دەڕوات ، ئـەو ناوەوەیـەی بـیر دەکـات تـۆ لـە تواناتدا هەیە بیبینیت.

دوای چەند دانیشتنێ تەم و دوکەڵی سەرەتایی دەڕوات ، لەناخدا قووڵ تر دەبێتـەوەو ، بە تەواوی تلّخن دەبێ ، لـە هـەمووو دانیشـتنێکدا ئـەم قۆناغانـە دووبـارە دەبنـەوە : سەر ڕو دەبینێ ، پاشان ناوەوە ، دوایی تەمەکە پێك دێ ، بەلاّم بزر دەبێ تـا زەمینـە بۆ دەرکەوتنی قولاّیی تاریك خۆش بکات .

خوێندنەوەی گۆی بلوری گرنگە بۆ خوێندنـەوەی بـیری خـەڵك ، بـەلاّم لەبـەر ئـەوەی ڕاهێنانەکانی دژوارە زۆر گوێی پێ نادرێت و ئاوڕی لێ نادرێتەوە .

(د.دی) گرنگی بـە گـۆی کریستاڵی داوە ، لـەو سـەردەمەدا گۆیـەکی شوشـەیان هێنـاوە لەبەردەم کەسێکیاندا داناوە ، داوایان کردووە سـەیری گۆیەکە بکات و بیری لـە سـەر کۆبکاتــەوە ، لــەڕێگای تــەرکیزو بــیر کۆکردنــەوەی تــەواودا بــیر خوێنــەردووە جادووگەرەکـە دەتـوانێ بـیری کەسـانی تـر بخوێنێتــەوە ، یـان بـیری خـۆی بۆیـان بگوازێتـەوە ، لـە (میسـر) دا زۆر کـەس گرنگـی بـەم هونـەرە داوە)[٢٨٨]. قورئـان ئامـاژە دەکات کوردسـتان ( بابـل ) و ( میسـر ) جێگایـەکی گرنگـی پاراسـایکۆلۆژیا بـوون.﴿ قَالُوٓاْ أَرۡجِهۡ وَأَخَاهُ وَٱبۡعَثۡ فِي ٱلۡمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٣٦﴾ يَأۡتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٖ ﴿٣٧﴾ ﴾ الشعراء: ٣٦ - ٣٧

**ئیعجازی ( ٥٧ ) ڕاهێنان بۆ ڕەوانەکردنی لەرەلەرو شە پۆلە ڕوحی یەکان ( تدریب المهارات الابرازیة ) :**

---

[٢٨٨] القوى الخفية / ل:٩٩ / انيس منصور.

له قورئانی پیرۆزدا ئاماژه به ڕەوانەکردنی شەپۆلەکان و لەره لەرەکانی کردووه بۆ دەزگای وەرگر لەمێشکدا : ﴿ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُواْ بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴿١١﴾ ﴾ مريم: ١١ ، واته : زەکەریا ئیحای بۆ کردن بەیانی و ئێواران پەروەرگار پاکژ ڕابگرن.

﴿ وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ ﴾ الحج: ٢٧ ، واته : جاڕ بده بۆ خەڵکی به حەج کردن ، دێنه لات بەپیادەو به هەمووو وشترێکەوه .

لێرەدا ئاماژه به موعجیزەی فیراسەو تلەپاتی دەکرێ ، بەناردنی دەنگ و پەیام به ئیحا پێ دان بۆ دڵ و دەروون و مێشکی خەڵکی ، که له توانایاندایه دەزگاکانی وەرگرتنیان وەریان بگرن .

(ئەناید هۆفمان) دەنووسێ : (ناردنی شەپۆل بەپێی پەی پێ بردن پێویستی به لەش و هزرێکی هێورو خاو کراوه دەبێ ، (پەی پێ بردن) ئەومیه کەسێك لەو شته تێ بگات که بۆی دێت ، بەڵام ڕەوانه کردن (الابراز) بریتییه لەحاڵی بوون لەو شتەی کەسەکه ڕەوانەی دەکات ، به کورتی بریتییه له چۆنیەتی پاکژ کردنەوەی شێوەی هزری عەقڵی و بارگه کردنەوەی بەوزەیێکی لەبارو دوایی بەرەڵاکردنی.

سەرکەوتنی توانای بیر ڕەوانه کردن لەسەر دوخاڵ دادەمەزرێت :

(١) پاکژ کردنەوەی هزر ، زانینی ئەو بیرۆکەیەی دەیەوێ به ڕوونی ڕەوانەی بکات ، گەر بیرۆکەکه خاوێن بۆوه به وزه بارگاوی دەبێت ، پێویسته بۆ (ئەست)ی ڕەوانه بکات .

ڕەوانەکردنی بیر لەسەر هەمان پرەنسیپی دانەوە : (الكيد المرتد – boomerang) دا دەمەزرێ ، واتە : بیرەکە ڕەوانە دەکەی دوای ماوەیەکی کورت چاوەڕوانی بۆ لای تۆ دەگەڕێتەوە ، مادام تۆ ڕێگای پێ بدەیت[٢٨٩].

(ولیەم فالکیر ئەتکیسون) دەنووسێ : (جەماوەرێکی زۆر ئێستا قبوڵیانە تلەپاتی (التخاطر – الفراسة) ڕاستی یەکی سەلماوەو لەشێوەی تەلەگرافی (بێ تەل) دایە ، ئێستا بڕوایان وایە بیرەکان پەخش دەبن ، ئەزمونی زانستی نوێش دووپاتی ڕای کۆنی کردۆتەوە .

تەواو بیرەکی تەما بۆ گیراو یان ڕۆتینی لەرەی هزری پەیدا دەکات بە ئاسماندا پەخش دەبێ کاری گەورەیان گچکە دەکات لەسەر خەڵکی .

لەرەی بیرەکان ڕاستە وانە دەڕۆن ، ئەو هێلانە سەرنجیان بۆ لای ئەو کەسە ڕادەکێشرێ لەرە ڕەوانە دەکات.

بێگومان بلاوبوونەوەی ئەم زانستە بۆ گشتی زیان بەخش دەبێ ، چونکە دوور نیە بکەوێ دەستی کەسانی بێ ویژدان ، کە بەلا بەسەر خەڵکی دا بێنن ، دروست نییە هەندێ زانستی نهێنی بۆ هەمووو کەس هەڵڕێژی ، ڕەنگە لە ڕێگای خراپدا ئەوەندە بە فراوانی بەکاربێ بەسمان بێت[٢٩٠].

قورئان ئاماژە بە بەرزبوونەوەی وشەکان دەکات : ﴿ إِلَيۡهِ يَصۡعَدُ ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ ﴾ فاطر: ١٠ ، قورئان ئاماژە دەکات کاتێ زانستی سیحر لە (بابل) بلاوبۆوەو کەوتە بەر دەستی جەماوەر تەنیا سوودیان بۆ خراپە لێ وەرگرت و بۆ لێك ترازانی خێزانەکان سوودیان وەردەگرت ، نەك بۆ قازانج گەیاند ﴿ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡ ﴾ البقرة: ١٠٢ .

---

[٢٨٩] تطوير المهارات النفسية / ل: ١٢٧ سەیر بکە / بەکورت کردنەوە.

[٢٩٠] قوة الفكر في حياة العملية / ل:٧٤.

دیسان (ولیەم فالکیر) دەنووسێ : بیرۆکە تەنیا شێوەی ناسکی ماددەیە ، یان برێ لە ڕوح ڕەقترە ، مادده شێوەی ڕەقی ڕوح و گیانە ، گیان شێوەی ناسکی ماددەیە . لە سروشتدا یەك جۆر مادده هەیە شێوەی جیاواز وەردەگرێت ، لەڕەقەوە دەست پێ دەکات بە ئەتیر کۆتایی دێت .

کاتێ بیر دەکەینەوە لەرەی ئەتیری سەروی ماددی ڕەوانە دەکەین وەکو هەڵم و گاز و تەنی شل و ڕەق بوونی هەیە ، بەلاّم چۆن ناتوانین گاز ببینن ناشتوانین بیرەکان ببینین ، وەکوو هەوای پاکژ ناتوانین بیرۆکە بۆن و تام بکەین ، بەلاّم دەتوانین هەست بە بیرۆکە و فکرە بکەین ، زۆر جار سەلماوە .

(بیر) بریتییە لە کۆمەڵێ لەرەلەر لەسەرووی لەرەی موگناتیسی بەهێزەوەیە ، توانای کێش کردنی ماددەی پۆلاّیی قورسی هەیە ، بەلاّم هەست بەوە ناکەین ...

پرۆفیسۆری ناودار (ئەلیز یەگری) لە نامیلکە بچووکەکەیدا (معجزات الطبیعة) دا دەنووسێ : (بیرەکان کۆمەڵە شەپۆلێکی دەنگین هیچ گوێچکەیەکی مرۆیی ناتوانێ بیان بیستێ ، تا زۆرێ لە بەڵگەکان لە بارەی بیرکردنەوە بدات لە نێوان (٤٠٠٠ – ٤٠٠٠٠٠٠) لەرە لە چرکەیێکدا لە ئاسمانی فراوانی تاریکی بێ هەست و خوستدا لەبەرامبەر هەستە دەرەکیەکانماندا ، ئەم شەپۆلانە بۆ وەرگرتن ڕەوانە دەبن لەکاتی خەونەکانماندا.

دەڵێ : ( بیری چاك بیری چاك ڕادەکێشێ ، بیری خراپ بیری خراپ ڕادەکێشێ ، گەر حەز لە چارەی کەسێ نەکەن و بەبیری خراپ ڕووی تێ بکەن ، تۆش حەز لە چارەنەکردن دەچنیەوەو دونیا بە وێنەیەکی ناشیرین دەبینیت، بیری باش ڕەوانە بکە دووبارە بەسوودەوە بەدەستی دێنیتەوە).

(دوو بیرۆکە هەیە پێویستە لەڕەگەوە هەڵیان کەنیت ، ئەو کاتە باشترین گۆڕان بەدەست دێنیت : ڕق لێ بوونەوەو ترس ، ئەو دوو ڕووەکە ژەهراوییە بیری تری

خراپ پەیدا دەکەن ، ڕق لێ بوونەوە کورە گەورەی ترسە ، ئێرەیی و ڕق و کینە هەموویان یەك خێزانن لە ڕق لێ بوونەوەو پەیدا دەبن ، ئەوانە لەناو ببە دوایی هەست بە ئاسوودەیی دەکەیت)[٢٩١].

لە (نهج البلاغة) ی ئیمام عەلی (عليه السلام) دا هاتووە : (احصد الشر من صدر غيرك بقلعه من صدرك) واتە : بەدەرهێنانی خراپە و زیان لەسینەی خۆت زیان و خراپە لەدڵی کەسانی تر دەربێنە .

دیسان قورئان ئاماژە دەکات کە زانستەکان دادەبەزنە سەر دڵە پاکەکان ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُۗ ﴿٢٨٢﴾ ﴾ البقرة: ٢٨٢

ڕاهێنان بۆ شەپۆل ناردن و (تلەپاتی)

تلەپاتی دوو کەسی دەوێ ، شەپۆل ڕەوانەکەر و شەپۆل وەرگرێك ، بۆ ڕاهێنانی ناردنی لەرەلەری تلەپاتی بۆ کەسێکی دیاری کراو ، سەرەتا کەسێك دەست نیشان بکە ، کە بڕوات وایە بەهەر ڕێگا یێ بێ پەیوەندیت پێوە دەکات .

ناوی کەسەکە لەسەر لاپەڕەیێ تۆمار بکە ، ئێستا چاوەکان دابخە بکەوەو درێژ ببەو خۆت خاو بکەوە ، وێنەیێك لە مێشکی خۆتدا بکێشە ، کە تۆو نەفەرەکەی تێدایە ، بیرت بۆبکەوە بۆ سەر ڕووی کەسەکەو خەیاڵی بخەسەر لە هەر کوێیەك بێ ، سەیری چاوەکانی بکە دەدرەوشێنەوە و چاودێری جووڵەی کەسەکە بکە بەرەو تەلەفۆن کردن بۆت دەڕوات ، سەیری پەنجەکانی بکە تەلەفۆن یان مۆبایلت بۆ دەکات ، هەمووو ئەو قۆناغانە بە وردی و ڕوونی لە خەیاڵتدا بکە واقیع ، باپێت وابێ ئەو هاوڕێیە تەلەفۆنی تاو داوەتێ دەیەوێ تەلەفۆنت بۆ بکات و تۆش تەلەفۆنت

---

[٢٩١] قوة الفكر في الحياة العملية / ل86 سەیر بکە.

هەڵدەگری وەلاَمی دەدەیەوە ، تا (٥) خولەك تەركیز پەیدا بكە ، با لەو ماوەیە زیاتر نەبیّ ، دوایی هەوڵ بدە ئەو ڕوداوە لە هۆشتدا ڕەش بكەیەوە .

گەر ئەو تەلەفۆنی نەكردو ماوەیێ ڕابرد تۆ پەیوەندی پێوە بكەو لێی بپرسە ئایا ئەو تۆی بیر كەوتۆتەوە ، لەكام كاتەدا بووە ، گەر وتی : بەڵیّ و هاوكاتی تۆ بوو ، ئەوە سەركەوتنت بەدەست هێناوە ، گەر نا ڕاهێنانەكە دووبارە بكەوە .

**ئیعجازی ( ٥٨ ) : تلە پاتی نێوان باوان و منداڵ:**

﴿ ۞ وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ ﴾ القصص: ١٢ ، واتە : لە ڕابردوودا شیری هەموو دایەنەكانمان لە موسا قەدەغە كرد.

لێرەدا قورئان ئاماژە بە پەیوەندی ڕوحی نێوان موساو دایكی دەكات ، موسا تەنیا مەمكی دایكی دەمژیّ و شیری دایەنەكان نامژێت و نایخوات ، دیسان قورئان ئاماژە بۆ گرنگی شیری دایك و سۆزی دایك بۆ كۆرپەلە دەكا .

(ئوسفالد كولە) دەنووسیّ : (زانست سەلماندوویەتی ئەو منداڵانەی بەشیری دایك گەورە دەبن گەشەیان زۆر زیاترە لەوانەی شیری دەست كرد دەخۆن ، دیسان دایكی شیردەر زووتر منداڵانی دەڕواتە دۆخی ئاسایی خۆی).

(كەمی سۆزی دایك كە منداڵی پیّ گەورەنە كریّ زیانبەخشە ، لەدەست دانی خۆشەویستی دایك لادانی زۆر ترسناك لەگەشەی منداڵدا پەیدا دەكات) (كۆمەڵناسی ئەڵمانی (هاید لبرگ) و مامۆستا (ئەلكساندەر روستوف) دەڵێن : پێویستە تا منداڵ دەبێتە شەش ساڵ دایكی قەدەغە بكریّ لەكار لەدەرەوەی ماڵدا ، بەمەبەستی چاودێری تەندروستی لەشی و دەروونی منداڵ)!

(منداڵ هەر لە ڕۆژی یەکەمی لەدایك بوونەوە دەبینێ و دەبیستێ بەهەستی چێژ تامەکان جیا دەکاتەوە).

(منداڵ هەر لە ڕۆژانی سەرەتایی دەنگی دایکی دەناسێ و پێی شادمان دەبێ و جیای دەکاتەوە)[٢٩٢].

دیسان دایك تلەپاتی بەهێز دەبێ لەگەڵ کۆرپەلەکەیدا و لە دوورەوە هەست بەگریان و برسێتی و ئازارەکانی دەکات ، کاتێ شیر لە مەمکەکانی دێ دەڵێ: منداڵەکەم لەماڵەوە دەگریێ و برسێتی و بەپەلە دەڕواتەوە لای .

(ئەناید هوفمان) دەڵێ : گەر باوکی یان دایکی دەتوانی نامەی تلەپاتی بۆ منداڵەکەت ڕەوانە بکەی.

لەوانەیە زۆر منداڵ گوێ بە ئامۆژگارییەکانت نەدات ، بەڵام نامەی بێ دەنگ کاریان تێ دەکات ، دەتوانی بە هزر تەلقینی منداڵ بکەی و بە خەیاڵ قسەو ئامۆژگاری بکەی ، وەکوو چۆن بە وشە قسەی لەگەڵ بکەی ، کاتژمێرێکی هێوری ئێواران بەکاربێنە ،ختێ منداڵەکە خەوبردوویەوە ، بەسادەیی نامەی هزری خۆی ئاراستە بکە ، چەند شەوێك نامەکە دووبارە بکەوە).

(د.برزولد سجیوارز) لە (نیو جیرسی) بەتاو و توێ کردنی تلەپاتی نێوان منداڵان و باوانەکان هەڵسا ، لەکتێبی ناوبراوی بە (تلەپاتی لەنێوان منداڵ و باوانی دا – التخاطر بین الطفل و أبویة parent child telpathy) ئاکامەکانی لێکۆڵینەوەکانی باس کرد ، بینی بەزۆری منداڵان ترسی باوکان ڕەنگ دەدەنەوە ، کە هێشتا لێیان نەکۆڵیوەتەوە ، بەهەستی سەروو (ESP) ، دیسان گەیشتە ئەو بڕوایە ئەوەی لە (نەست) ی باواندا هەیە بەڕادەی گواستنەوەی بۆ (هۆش – العقل الواعي) بۆ منداڵ دەگوازرێتەوە ، دیسان دەڵێ : منداڵان لە (٢-٧) ساڵانەدا هەستێکی تایبەتی

[٢٩٢] ولدك هذا الكائن المجهول / اوسفا لدكوله / ت : د.أمين رويحة / ل :٧١ – ١٣٠ – ٤٥) .

یان لەبارەی هەستی شەشەم ، بیری نادیاری باوکییان کۆپی دەکەنەوە سەرباری وشەو پەیوەندی نادیار کە لەوانەوە دەردەچێ لە گرنگی دا لە نامەی وشەیی گرنگترن[٢٩٢].

**ئیعجازی ( ٥٩ ) : چارەی دەروونی و ڕوحی بۆ نەخۆشی یە جەستەیی یەکان و دەروونییەکان :**

لە قورئانی پیرۆزدا لەزۆر جێگادا باسی شیفاو چارەی ڕوحی کراوە ، وەکو چارەسەری ڕوحی (ئەییوب) (علیه السلام) و شیفای بەڵەك و کوێری زگماك لەلایەن مەسیحەوە (علیه السلام) یان شیفای نەخۆشی ئاوی سپی یە ، یعقوب (علیه السلام) بە متفرەکی کراسی یوسف (علیه السلام).

(ئەییوب) لە خوا پاڕایەوە چارەی **نەخۆشییەکەی بکات خودلوەند چارەسەری بە** ئیلهام پێ ڕاگەیاند :

﴿ وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَآ أَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِنُصۡبٖ وَعَذَابٍ ۝٤١ ٱرۡكُضۡ بِرِجۡلِكَۖ هَٰذَا مُغۡتَسَلُۢ بَارِدٞ وَشَرَابٞ ۝٤٢ ﴾ ص: ٤١ — ٤٢ ، واتە : من شەیتان توشی شەکەتی و ئازاری کردوم ، (خوا فەرمووی) بە قاچت بدە زەوی دا ئەو شوێنی خۆ شوشتنی تۆیە ، ساردەو بۆ خواردنەوەیە.

پێویستە لێرە بپرسین ئایا نەخۆشییەکە چییە ؟ هەر تەنیا وەسوەسەو ئازارێکی دەروونی یە یان نەخۆشی ئەندامی یە وەکو ئاوەڵە؟ دوور نیە هەر کامێکیان بوبێت ، بەلام زیاتر پێ دەچێ نەخۆشی وەسوەسەو ئازاری گیانی بوبێ ، چونکە ددبێ پێغەمبەران و ساغ و تەندروست بن . پاشان قورئان (ئاوی سارد) بۆ خۆ شوشتن و ئاو بۆ خواردنەوە بە چارەسەر دادەنێت.

[٢٩٢] تطوير المهارات النفسية / ل:١٣٤.

(بیل گوتلیب) دەنووسێ : (چارەسەرکردن بە ئاو : گەرماوی گەرم بۆ چارەکردنی زۆرێ لە کێشە تەندروستییەکان بەکاردێنرێ ، وەکوو کەم کردنەوەی ئازاری جومگەکان و قەبزی و نەخۆشییەکانی کۆئەندامی هەناسە ، ئاوی سارد (تا) کەم دەکاتەوەو ماندووبوون شەکەتی لا دەبات).

دەڵێ : (ڕازی چارەسەرکردن بە ئاوی سارد بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە سوڕی خوێن و شلەی لیمفی چالاك دەکات) ، (پزیشك و نەخۆش هەردووکیان دەزانن خواردنەوەی ئاوی سازگارو پاکژ بۆ تەندروستیمان پێویستە)[294]. خودا قورئان بە شیفا ناو دەبات : ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾ ﴾ الإسراء: ٨٢.

قورئان ئاو بە پاکژ کەرەوەو لابەری پیسایی و وەسوەسەی شەیتان و میکرۆبەکان ناو دەبات .

﴿ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ ٱلشَّيْطَٰنِ ﴾ الأنفال: ١١ .

(د.کنیب) دەنووسێ : ( چارەسەرکردن بەئاو بەم شێوەیە کورت دەکرێتەوە: (تواندنەوە ، لابردن ، بەهێزکردن ، ئەمانە سیفەتی سەرەکی ئاوە ، دوپاتی دەکەینەوە ئاو توانای چارەسەر کردنی هەمووو نەخۆشییەکی هەیە ، گەر بە چاکی پیادەبکرێ پەلاماری بنکەی زیانەکە دەدات و ئەم ئاکامانە دەست دەکەون :

(١) شیکردنەوەی میکرۆبەکانی ناو خوێن.
(٢) دور خستنەوەی میکرۆبەکان لە کۆئەندامەکانی لەش.
(٣) قەرەبووکردنەوەی خوێن بەپاکژ کردنەوە.

---

[294] الطب البدیل / بیل غوتبیب / ل: ٨١ بۆ کۆتایی سەیر بکە.

**(٤) بەهێز کردنی جەستەی لاواز[٢٩٥].**

﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ١ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ ٢ ﴾ المؤمنون: ١ – ٢ ، **واتە : بڕواداران سەرکەوتوون ، ئەوانەی لەنوێژەکانیاندا گەردن کەچن.**

**(بڕوادار پێی وایە کاتێ خودا فەرمان بە (الخشوع) دەکات تەنیا بۆ نزیك بوونەوەیە لەخودا ، بەڵام توێژینەوە زانستی یەکان دەریان خستووە (ڕامان) و بیر کۆکردنەوە (التأمل) کە بریتییە لە کۆکردنەوەی بیر لەسەر شتێ وەکو چیایەك ، یان مۆمێك یان درەختێك بێ جووڵەو بیرکردنەوە ، سوودێکی زۆری هەیە لەچارەکردنی نەخۆشییەکان و بەهێزکردنی یاد (زاکیرە) و زیادکردنی داهێنان و جوانکاری و خۆڕاگری ...هتد.**

**هاوەڵەکان دەچوونە چۆڵەوانی بۆ ڕامان لە گەورەیی و شکۆی خوا بۆ زیادکردنی بڕوا.**

**قورئانی پیرۆز لەگەڵ ڕاماندا داوا دەکات بیرکردنەوەو وردبوونەوەو پەندو ئامۆژگاری ئەنجام بدرێ و بە (الخشوع) دەناسرێ.**

**(الخشوع) گرنگترین خواپەرستی یە ، چونکە پێویستی بە ڕامانی زۆرە ، (الخشوع) ئەو پەڕی ئاستی ڕامانە ، دیسان قورئان ڕامان (التأمل) بە (النظر) ناو دەبات[٢٩٦].**

﴿ قُلِ ٱنظُرُواْ مَاذَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ یونس: ١٠١ ، **بڵێ سەیری بکەن و ڕابمێنن چی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە .**

﴿ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِي ﴾ الأعراف: ١٤٣ ، **واتە : ئەی موسا سەیری چیایەکە و ڕابمێنە ، گەر لەجێی خۆی ئارامی گرت ئەوە دەمبینیت .**

---

[٢٩٥] کن طبیب نفسك / ت: امیل خلیل بیدس / ل:٩٣.

[٢٩٦] الشفاء بالقرآن الکریم / ج٢ / ل:١١٠ / د.محمد الهادي.

**ئیعجازی (٦٠) ڕامان و چارەکردنی نەخۆشی (دڵ)**

توێژینەرەکان کە لە گۆڤاری (کۆمەڵەی پزیشکانی دڵی ئەمریکی) دەرچووە بلاوی کردەوە ڕامانەکانی درێژ خایەن و ڕێك (دڵ) لە نارێکی دەپارێزێت ، ڕامان چارەی فشاری خوێن (الضغط الدم) دەکات لە پلەی بەرزی دا ، ماندووبوونی دڵ کەم دەکاتەوە ، کە لەوانەیە ئەم ماندووبوونە دڵە کوژێ (الذبحة) پەیدا بکات ، بۆیە خوای گەورە بەبڕوادارانی فەرمووە ﴿ ۞ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ ﴾ الحديد: ١٦ .

توێژینەوەکان دەریان خستووە ڕامان و گەردنکەچی لە ئارامکردنەوەی دڵ لەکارکردندا ڕۆڵی هەیە ، لەم چاخەدا نوژداران باس دەکەن ، (نەخۆشییەکانی دڵ) هۆکاری یەکەمی مردنە لە جیهاندا ، هۆکارەکەشی نارێکی یەتی لە سیستەمی کارکردنی دا ، ئالێرەدا گرنگی گەردوونکەچی هەست پێ دەکەین لە ئارامکردنەوەی دڵدا .

لەم چاخەدا توێژینەوەکان دەریان خستووە : سەلماندوویانە ڕامان چارەی زۆر لە نەخۆشییەکانی (فشاری دەماری) دەکات بەهەمووو بەشەکانەوە .

**ئیعجازی (٦١) : ڕامان و نەخۆشییە دەروونییەکان :**

دیسان چارەسەری خەمۆکی (الكآبة) و دڵەڕاوکێ (القلق) و ڕوخان (الاحباط) دەکات . ئەم نەخۆشییانە زۆر باون لەم چاخەدا ، بەکارهێنانی دەرمانی کیمیایی بۆ چارەکردونیان مەترسی زۆرتر دروست دەکەن .

ئەم ئەزموونانە سەلماندییان ڕامانی ڕێك (متمانە بە خود) زیاتر دەکات و هانی مرۆڤ دەدات (ئارام) بگرێ و بەرگەی پتری کێشەکان و خەمەکانی ژیان بگرێ ، پێویستی بەدەرمانی کیمیایی نەبێ ، کە لەش و دەماری بەتایبەتی لەناو دەبات .

**ئیعجازی ( ٦٢ ) پەیوەندی ڕامان و گەردەن کەچی بەشەپۆلەکانی مێشکەوە :**

لێکۆڵەران (دۆزییانەوە مێشکی مرۆڤ بەردەوام شەپۆلی کەهرۆموگناتیسی بەڕی دەکات ، نرخی ئەم لەرەلەرانەش بەپێی چالاکییەکانی مرۆڤ دەگۆڕێن ، بۆ وشیاری و چالاکی و کارکردن و بیر کۆکردنەوە (الترکیز)دا شەپۆلی (بێتا) بەڕێ دەکات ، لەرەکانی ئەم شەپۆلە لە (١٥-٤٠) لەرەلەردایە لەچرکەیەکدا ، لەکاتی خاو بوونەوەو ڕامانی ئاسایی دا مێشك شەپۆلی (ئەلفا) بەڕێ دەکات ، لەرەیان لەنێوانش (٩-١٤) لەرە (هرتز) دایە لە چرکەیێکدا.

لەدۆخی (خەون) و (ئیلهام) دا ، یان ڕامانی قووڵ (التأمل العمیق) دا شەپۆلی (بێتا) ڕەوانە دەکات ، کە لەرەلەری (٥-٨) لەرە لە چرکەیێکدا لەدۆخی (خەوی قووڵ)دا مێشك شەپۆلی (دەلتا) دەهاوێژێ کە لەرەلەریان کەمتر لە چوار لەرە لەرەدەبێت[٢٩٧]

لەمەدا بۆمان ئاشکرا دەبێ لەباری یادو گەردن کەچی (الخشوع)دا شەپۆلەکانی میشك لەرەلەریان هێواشتر دەبێتەوە ، بەمەش مێشك ئارام دەبێتەوەو قایمتر دەبێ و یارمەتی چاککردنەوەی ئەو ناڕێکییانەی دەدات کە بەهۆی نەخۆشی و تێك چوونی دەروونییەوە توشی هاتووە .

بۆیە هەندێ لێکۆڵەر بڕوایان وایە هەڵچونەکان (الانفعالات) مرۆڤ ماندوو دەکات ، ئینجا تەمەن کورت دەکات ، کەچی ڕامان (التأمل) دەماغ ئارام دەکاتەوە و تەمەن درێژ تر دەکات .

---

[٢٩٧] دیسان (ج.ا.اج. رایز) لە (عصر الخوارق / ل:٣٧ دا ئاماژەی بەم راستی یانە کردووە .

گرنگترین شەپۆل کە (مێشك) پەخشی دەكات لەرەلەرە نزمەكانن ، كە بەهۆكاری چارەسەر دادەنرێ بۆ لەش ، چونكە كار دەكاتە سەر (خانەكانی لەش) و (سیستەمی بەرگری) پاشان (ڕامان) و (گەردەن كەچی) ئەو شەپۆلانە پەیدا دەكەن ، كاریگەری ئیجابی و باش دەكەنە سەر (خانەكانی مێشك) و (بەرنامەی دەكەنەوە) و ئەو ناڕێكی یانە ڕاست دەكەنەوە لەپرۆگرامی مێشكدا پەیدا دەبن .

ڕامان و یادو گەردن كەچی بەڕێكخەرو بەهێزكەری كارەكانی مێشك دادەنرێت[٢٩٨].

عەللامە (الطريحي) لەكتێبی (المجمع)دا بەوری لەسەر وشەی (الخشوع) دەنووسێ : (خشوع) لەنوێژدا واتە : گەردن كەچی و ترسی دڵ ، سەیركردنی شوێنی كوڕنوشە ، لەنوێژدا پێغەمبەر ﷺ سەیری خاڵی كوڕنوش بردنی كرد[٢٩٩].

بەو پێیە یەك لە مەرجەكانی (الخشوع) سەیركردنی خاڵی كوڕنوشە لەنوێژدا بە مەبەستی بیركۆكردنەوەو ڕامان (التأمل – التركيز) ، ﴿أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ﴾ الرعد: ٢٨ ، واتە : بێگومان بەیادی خوا دڵان ئارام دەبن ، واتە : پشوو دەدەن و لەدڵە ڕاوكێ و ترس و ناڕێكی ڕزگاریان دەبێت.

ئیمام علی (سەلامی خوای لەسەر) فەرموویەتی : (الذكر جلاء البصائر ونور السرائر) ، واتە : یاد ڕۆشن كەرەوەی هزرەكانە ، ڕووناكی دڵ و ڕاز و نیازەكانە .

(الذكر هداية العقول وتبصرة النفوس) ، واتە : یاد ڕێنومای ئاوەزە ، پەندە بۆ دەروونەكان.

(التفكر في ملكوت السماوات والارض عبادة المخلصين) ، واتە : بیركردنەوەو ڕامان لە مەلەكوتی ئاسمانەكان و زەوی خواپەرستی دڵسۆزانە .

---

[٢٩٨] الشفاء بالقرآن الكريم / د.محمد الهادي / ل: ١١٣- ١١٤ / ج٢.
[٢٩٩] معجم مجمع البحرين / الطريحي / ٣٧٠.

(العاقل اذا سكت فكر ، واذا نطق ذكر ، واذا نظر اعتبر) ، واتە : هۆشیار ئەو کەسەیە گەر بێدەنگ بوو بیر دەکاتەوەو ڕادەمێنێ ، گەر قسەی کرد یادی خوا دەکات ، گەر ڕوانی پەند وەردەگرێت .

(الذكر نور العقل ، وحياة النفوس ، وجلاء الصدور) واتە : یادو زیکری خوا ڕووناکی و وزەی هزرە ، ژیانی دڵانە ، ڕۆشن کەرەوەی سینەکانە.

(غرر الحكم / عبدالواحدي الاميدي التميمي) سەیر بکە ، ئەم کتێبە ناوداره نووسەرێکی گەورەی ئامێدی نوسیویەتی وتە بەنرخەکانی ئیمام عەلی کۆکردۆتەوە ، وەکوو چۆن عەللامە (الشريف الرضي) بەناوی (نهج البلاغة) کۆی کردونەوە .

ئەم چەند فەرمایشتانە ئاماژە بەگرنگی زیکری خوا دەکەن بە ڕامانەوە بۆ هزرەکان و دڵان و دەروونەکان ، دەری دەخەن وزەی هزری و مێشکی پڕتەو تر دەکەن ، دڵان ڕووناکتر دەکەنەوە بەهالەی ڕوحی و دەروونەکان پاکژتر دەکەنەوە لەشەپۆلە سەلبی یەکان و ئارام بەخش دەبن ، بێگومان ئەم وشانەش تەنیا پسپۆڕانی بواری ئەم زانستە لێ یان حاڵی دەبن .

عەللامە (قوشەیری) گێڕاویەوە : (الخشوع قيام القلب بين **الحق** سبحانه بهم مجموع)٣٠٠.

واتە : (الخشوع) هەڵسانی دڵە بەرامبەر خوای شکۆدارو پاکژ بەکۆکردنەوەی بیرو ویستی تەواوەوە .

**ئیعجازی ( ٦٢ ) پەیوەندی ڕامان و گەردەن کەچی بەشە پۆلەکانی مێشکەوە :**لێکۆڵەرەوان وەکو (william) لە کۆلێژی (هارڤارد)ی پزیشکی تازە بۆ توێژینەوەی کاریگەری

---

[300] الرسالة القشيرية / ل:١٤٥.

ڕامان (التأمل) هەڵسان بە لێکۆڵینەوە بۆ سەر (مێشك) بینییان قەبارەی مێشکی ئەو کەسانەی ڕامان دەکەن لەمێشکی ئەو کەسانە گەورەترە ، ڕامان و یادیان نییە ، واتە : ڕامان قەبارەی مێشك پتر دەکات و توانای مرۆڤ بۆ داهێنان و ژیانێکی ساغ و بەختەوەر زیاتر دەکات ، بینییان توێکڵی مێشك لەچەند بەشێکی دیاری کراودا بەهۆی (ڕامان)ەوە ئەستووری زیاتر بووە ، مەزنی ئەم دیاردەیە کاتێ ئاشکرا دەبێ کە بزانین لەگەڵ بەساڵ چوندا ئەستووری ئەو توێکڵە کەمتر دەبێتەوە ، دیسان دەتوانین بێژین : ڕامان تەمەن زۆرتر دەکات و پیری دوا دەخات و دەبێتە بەربەست لەبەرامبەر خەڵفان (الخرف – زهایمر)دا .

توێژینەوەکان ئاشکرایان کردووە تا ڕامانەکە زیاتر بێ کاریگەری بۆ سەر قەبارەو ئارامگرتنی کرداری مێشك پتر دەبێ ، بەو پێیە لێرەدا پەیوەندییەك لەنێوان ڕامان و قەبارەو ساغی مێشکدا ، لەگەڵ (ڕامان) کاریگەری زیاتر دەکات ، بەڵام بەداخەوە ئەزموونی ئیسلامی لەم ڕوانگانەوە نییە[٣٠١].

بێگومان چۆن لەشی مرۆڤ تووشی ئازارو نەخۆشی دێت ، بەرزو نزمی هەیە ، بەم شێوەیە نەفسی مرۆڤیش توشی ئەم دیاردانە دێ ، چۆن لەش پێویستی بە پاراستن و چارەکردن و بەهێز کردنە ، دەروونیش پێویستی بە خۆپاراستنە بەر لە تووش هاتن بە نەخۆشییەکان ، کە ئەگەر بەرگری لە دەستدانی تواناکانی لەدەست دەدات ، گەر تووشی نەخۆشی هات دەبێ چارەسەر بکرێت ، بیرکردنەوەو وردبوونەوەو یادی هەمیشەیی بە ڕامان و گەردن کەچی یەوە : ﴿ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ آل عمران: ١٩١ ، کە ئیسلام داوای دەکات بڕوادار خوی پێوە بگرێ و کەسایەتی لەسەر دابمەزرێنێ بریتییە لە ڕابونێکی تەواوی وزەو توانستە شاراوە ڕوحی و عەقڵی و مادییەکان لە مرۆڤدا

[٣٠١] الشفاء بالقرآن الكريم / ل:١١٦.

لەپێناو دروست کردنی کیانێکی کۆمەڵایەتی و شارستانی ، بە مەبەستی بەرژەوەندی یە باشەکان و خێرو خۆشی فەراهەم هێنان بۆ مرۆڤایەتی لە هەردوو جیهاندا .

زیکری هەمیشەیی و رامان بڵێسەی خۆشەویستی خوایی لە (نەست)ی بڕواداردا دەڕوێنێ و پەروازەی ڕوحی پێ دەکات بۆ جیهانەکانی ڕوحی جاویدانی و مەیدانەکانی ژوان و فەنا بوون ، بە زیکری هەمیشەیی فەیزی خوا دێتە خوارو هەست بە تواناو جوانی و شکۆی خوایی و بەهرە بێ کۆتاکانی دەکەیت ، هەست بە هەژاری خۆت دەکەی لەچاو دەوڵەمەندی کەماڵی نەمری و بێ کۆتای خوا ، زیکر بەزمان دانامەزرێ بەڵکو دەبێ ڕامان و بیرکۆکردنەوەی تەواوی لەگەڵدا بێت ، تا کاربکاتە سەر کیانی ماددی و مەعنەوی و پەیوەستی بکات بەدونیای مەلەکوتییەوە ، کە دوای مردن مرۆڤ بەیەکجاری بارگەی بۆ دەپێچێتەوە .

ئەزموونی ئەوینی خوایی و بیر کۆکردنەوە لەسەری و ڕامان لەسەر ئەم خاڵە تەوەرەیە ئەزموونێکی مرۆیی جوانە ، تەنیا ئەو کەسانە پەی بەرەهەندەکانی و ناوەڕۆکی دەبەن ، کە لە ئەوینی ئەودا قووڵ بووتەوەو قاڵ بووتەوە و گەیشتە مەقامی فەنا ، دیداری حەقیقەتی ڕەها (یادی خوا ، نوێژ ، بیرکردنەوە لە دروست کراوانی خوا ، ترس لە خواو هەست کردن بە چاودێری خوایی ، داواکردنی لێ خۆشبوون و پاڕانەوە ، سوپاس گوزاری و قورئان خوێندن...) هەمووو ئەوانە دیارترین دیاردەکانی یادو زیکری خودان ، ئەم بابەتە گەنجینەیەکی دەوڵەمەندە ، هەمووو شتێ گەر سنووری هەبێ یادی خوا خاڵی کۆتایی نییە ، کاتێ زیکر هەست و نەستی مرۆڤی داپۆشی دەسەڵات بە مرۆڤدا دەگرێت سۆنگەی دەرچوون لەخاڵی ویستی مرۆڤ بەرەو ویستی کردگارو فەنا بوون لەناویدا دەست پێ دەکات ، هەرگیز ڕووناکی ئەو خۆرە لەدڵدا ناکوژێتەوەو ڕۆژ بە ڕۆژ پڕشنگدار تر دەبێت و دەگاتە کەماڵی زات و کەسایەتی کامڵی مرۆڤایەتی مەلەکوتی ، ئەمەش ئامانجی ڕامان و یادی ئیسلامی یە لە ژیاندا ، بۆ گەیشتن بە ژوانی خوداو جەماڵ و جەلالی پاکی ئەو ،

کەسێ گەیشتە ئەو ئاستە هەرگیز بەرگەی جیابوونەوە لە ئەویندارى ڕاستەقینەی ناگرێت و حەقیقەتەکان تەنیا لەودا دەبینێت.

**ئیعجازی (٦٤) ڕامان و هەست کردن بە ئازارو نەخۆشییەکان :**

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (صوموا تصحوا) رواه ابو نعيم ، واتە : بەڕۆژو بن ساغ دەبن.

یەکێ لە هاوەڵەکان ئازاری سکی دەبێ ، پێغەمبەر ﷺ پێی دەفەرمووێ : (هەڵسە نوێژ بکە ، نوێژ شیفایە) (قم فصل فان الصلاة شفاء ) متفق عليه ، هەروەها دەفەرموێ: (الصلاة نور المؤمن) رواه ابن عساكر ، واتە : نوێژ ڕووناکی و وزەی بڕواداره ، دیسان بەدەق قورئان شیفایە : ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾ الإسراء: ٨٢ . (د.محمد هادی) دەڵێ : دوای سەرنەکەوتنی پزیشکی کیمیایی لە چارەکردنی هەندێ نەخۆی دژواردا ، هەندێ لە توێژەران پەنایان بردە بەر چارەکردن بە ڕامان ، دوای ئەوەی بینیان ڕامان و یا دیاریدەری کەم کردنەوەی هەست کردن بە ئازار دەدات و کۆ ئەندامی بەرگری و مەناعە بەهێزتر دەکات .

لەتوێژینەوەیەکی نوێ دا دەرکەوت ڕامان یارمەتی چارە کردنی نەخۆشی درێژ خایەن دەدات ، هەندێ توێژەر بە توێژینەوەی دەماغی ئەوانە هەڵسان داوایان لێ کراوە دەستیان بخەنە ئاوی زۆر گەرمەوە ، سەیری چالاکی تیشك کرا لە کاتی هەست کردن بە ئازاردا ، دوایی ئەزمونەکە لەگەڵ ئەوانە دا تاقی کرایەوەلەگەڵ ڕاماندا ڕاهاتونە بەرێکی ، بینرا مێشك وەڵامی ئەو ئازارانە ناداتەوە ، ئەم ڕامانە بەرایی دەگرێ لە ورژانی مێشك بۆ هەست کردن بە ئازارەکان[٣٠٢].

---

[٣٠٢] الشفاء بالقرآن الكريم / ل:١١٦.

نمونـەی زینـدوویی مـوعجیزە زۆرە لـە قورئانـدا ، وەکـوو ئـاگری ئیـبراهیم (علیـە السلام) کاتێ لە دۆڵناران لە کوردستاندا مەنجەنیقی بـۆ دادەخـرێ ، خـوای گـەورە بـە ئاگرەکە دەفەرمووێ : ﴿ قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ ﴾ الأنبياء: ٦٩ ، واتە : ئەی ئاگر ساردبە و سەلامەت بە بۆ ئیبراهیم ، واتە : ئازاری مەدەو مەیسوتێنە ، یـان کـاتێ خانمـانی (میسـری) لـەماڵی (زولـەیخا)دا لـەجوانی یوسـف (علیـە السلام) ڕادەبینن و دەکەونە باری (نەستەوە)و یوسف (علیـە السلام) تـەوەجوهی ڕوحیـان بـۆ دەکات دەستی خۆیان دەبڕن و هەست بە ئازار ناکەن ﴿ فَلَمَّا رَأَيْنَهُۥٓ أَكْبَرْنَهُۥ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ ﴾ یوسـف: ٣١ ، بێگومان ئیحا بـە خـوددان کاریگـەری ڕوحـی لەمرۆڤـدا دروست دەکات و کاردەکاتە سەر چالاکی یەکانی مێشك و ئەندامەکان.

لە تاقیگەدا سەلماوە دوعاو ئیحاکان ماددەی (ئینـدروفینات) دەڕێـژن لـە مێشـکدا ، کار دەکەنە سەر لا بردنی ئـازار و دەمارەکـان هێـور دەکەنـەوەو کـار دەکەنـە سـەر چـەقی هەست کردن بەچێژەکان لەمێشکدا[٣٠٣].

## ئیعجازی ( ٦٥ ) : ڕامان و گەردن کەچی و سۆزو عـاتیفە

زانایان تێبینی یان کردووە کـاتێ لەرانـەوەی موگناتیسـی (الـرنین) پیشـەیی ( f nmi) لەسەر ئەو مرۆڤە تـاقی دەکەنـەوە لەسـەر (ڕامـان) دا هـاتووە توانـای جڵەو ڕاگرتنـی سۆزی پتر دەبێ و زیـاتر توانـای دەبـێ بەسـەر چـالاکی و هەڵچونەکانی دا و بەدەست هێنانی بەختدا .

دیسان تێبینیان کردووە (ڕامان) دەسەڵات کردن بەسەر جنس (sex) دا پتر دەکـات ، سۆزی مرۆڤ ڕێك دەخات لـەنێوان کـپ کـردن و زیـادە ڕەوی داو زیـادەڕەوی ناکـات لـە

[٣٠٣] نفحات علمية من القرآن والسنة / د.دلاور محمد صابر / ل:٩٥.

بڕیارەکانی دا ، چونکە ڕامان ئەو بەشانەی مێشك چالاك دەخات کە هەستیارن و پاشماوەکانی سەلبی کەڵە بووی سەری لادەبات و ئەو نارێکییان لەژیاندا تووشی هاتووە زیانی بەو بەشانە گەیاندووە دەیسرێتەوە)[٣٠٤].

قورئانی پیرۆز فەرموویەتی : ﴿ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ﴾ العنكبوت: ٤٥ ، واتە : نوێژ مرۆڤ لە تاوان و کاری نا پەسەند چەپاڵە دەدات .

**ئیعجازی ( ٦٦ ) : ڕامان و گەردن کەچی و دەرمانی نەخۆشییە ئەستەمەکان :**

﴿ وَأُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ وَأُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾ آل عمـــران: ٤٩ : واتـــە : کوێری زگماك و بەڵەك چاك دەکەمەوە و مردوو زیندوودەکەمەوە بە ویستی خودا.

مەسیح نەخۆشیە بۆماوەییەکانی وەکو (کوێری زگماکی) و نەخۆشی پێستی وەکو (بەڵەکی) چاك کردۆتەوە ، بە دوعاو دەست پێداهێنان و توانای ڕوحی و مردووی زیندووو کردۆتەوەو ڕوحی ئەوی ئامادەکردووە بەویستی خودا.

زۆربەی نەخۆشییە بۆ ماوەیی ئەستەمەکان بەهۆی (جینی ناتەواو) و بچووك پەیدا دەبن ، زۆربەی نەخۆشییە بۆ ماوەیی یەکان بەتاك جینەکان یان فرە جینەکان دەگوازرێنەوە بۆ وەچەکان .

وە هەندێ بڕوایان وایە بەڵەکیش (البرص) نەخۆشی یەکی بۆ ماوەیی بێت ، لە فەرهەنگی زانستی (کەمالنامە)دا (بەڵەکی – گولی یە) ، نەخۆشیەکی درمە گرێ

---

[٣٠٤] الشفاء بالقرآن الكريم / ل:١١٧.

لەسەر پێست و دەم و چاو پەیدا دەکات و دوایی دەیکات برین و دەم و چاو ناشیرین دەکات ، بەلاَم لە کتێبی (الطب المحرب / أ. عبدالله سندة) دا دەڵێ : ئەم نەخۆشی بەپەڵەی سپی لەسەر پێست پەیدا دەکات ، ئەم نەخۆشییە لە چاخی مەسیحیدا ترسناکترین و بلاَوترین نەخۆشی بوون ، بۆیە لە ڕێگای دوعاو موعجیزەو وزەی ڕوحی بالاَوە چارەسەر کراون .

(د.محمد الهادی) دەنووسێ : لە خۆرئاوادا زۆر مەڵبەندی نەخۆشی هەیە بە ڕامان چارەسەری نەخۆشان دەکەن و دەڵێن : ڕامان هەندێ لەو نەخۆشییانە چارەسەر دەکات نوژداری پەکی کەوتووە لەبەرامبەریاندا.

بۆیە ڕامانی ڕۆژانە بۆ چارەسەرکردن و ئیجا بەخۆدان کە چاك دەبمەوە ، یان دوعا بکەی ، یان قورئان بخوێنی بەسەر ئەندامە نەخۆشەکەدا تا ئاستی ڕامان و چونە ناو باری نەستەوە ، یان لەم سەردەمەدا نوێژ کردنی بەڕامانەوە هەمووو ئەوانە چارەسەرێکی باشن بۆ نەخۆشییە ئەستەمەکان وەکو (ئایدز) و (شێر پەنجە).

(د. ئەلیکسس کاریل) دەنووسێ : ئەو هۆکارانەی ژیانی هاوچەرخ توشی هاتووە لەسەرنەکەوتن تا ئێستا دیار نین ، ئێمە ناتوانین سەرزەنشتەی زانایانی تەندروستی و پزیشکیان بکەین بۆ ئەمە ، دوورنیە زوو مردنی پیاوانی هاوچەرخ بۆ دڵەڕاوکێ و نا ئارامی ئابوری و ماندووبوون لەکارداو نەبونی سیستەمی ئەدەبی و زیادڕەوی بێ بە هەمووو بەشەکانیەوە)[٢٠٥].

دەنووسێ : هزر وەکو لەش بەهێز نییە ، شایانی باسکردنە نەخۆشییە هزرییەکان لە تەواوی نەخۆشییەکانی تر زۆرترە ، لەبەر ئەوەیە نەخۆشخانەکان ناتوانێ هەمووو ئەو نەخۆشانە وەربگرن ، کە پێویستە دەستبەسەربکرێن.

---

[٢٠٥] الانسان ذلك المجهول / د.اليكس كارل / ل:٢٠٤.

**(س.و.بیرس) دەڵێ : پێویستە لە (٢٢) کەسێ یەك کەس لە دانیشتووانی (نیویۆرك) جار جارە لەخەستەخانەیێکی عەقڵی بخەوێنرێ ، دەنووسێ : (کێشەی تەندروستی هزری و دەروونی گرنگترینی ئەو کێشانەن کۆمەڵگای هاوچەرخ توشی دەبن ، لە نەخۆشی سیل و دڵ و گورچیلەو تیفۆس و تاعون و کولێرا مەترسییان زۆرترە ، دەبێ حیسابێك بۆ نەخۆشییە هزرییەکان بکرێ ، نەك هەر لەبەر زۆر بوونی (تاوانباران) بەڵکو ئەو پێشکەوتنە پەك دەخات ڕەگەزی سپی بەدەستی هێناوە).**

**دەنووسێ : (زۆر بەی چارەسەرییە موعجیزەیی یەکان ئەوانەن مەڵبەندی پزیشکی لورد تۆماری کردون ، هەرچی بیرۆکەی ئێستامانە دەربارەی شیفا بەهۆی نوێژەوە بۆ نەخۆشییە باتۆلۆجییەکانەوە لەسەر تێبینی ئەو نەخۆشانە دادەمەرزێ بەزویی لەنەخۆشی جیا جیا چاك بونەوە ، وەکوو سیلی بریتونی و هەوی ئێسقان و برینی بۆگەن و سیل و شێرپەنجە... )**[٣٠٦].

**قورئانی مەزن ئاماژە بە مەترسی ئەم نەخۆشییە عەقڵی و دەروونیانە دەکات** ﴿ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضًا ﴾ البقرة: ١٠ .

**هەروەها ئاماژە بە جۆرەکانیان دەکات وەکو (ترس ، دڵەڕاوکێ ، بێ بڕوایی ، نا ئارامی ، نا ئومێدی ...) .**

﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا ﴾ طه: ١٢٤، **واتە : کێ گوێ بەیادو زیکری من نەدا ئەوە ژیانەکی پڕ لە ئەشکەنجەی هەیە ، چارەسەری ئەم نەخۆشییانە و پارێزەر لێیان بەهۆی یادی خواوە دەبێ بە هەمووو بەشەکانیەوە .**

---

[٣٠٦] الانسان ذلك المجهول / د.اليكسس كارل / ل: (١٧٢).

(ولیەم جێمس) دەڵێ : بڕوا لەو هێزانەیە پێویستە مرۆڤ دەستی پێوەبگرێ تا یارمەتی بدات لەژیاندا ، لەدەستدانی ، واتە : نەتوانین لەبەرامبەر بەرگە گرتنی تراژیدیاکانی ژیاندا.

(دیل کارنگی) دەنووسێ : (نوێترین زانست کە مژدە بە زانیارییەکانی ئایین بدات ، دەروون زانی پزیشکی یە ، بۆچی؟ چونکە بڕوا بوون بە ئایین و نوێژو لێ بڕان هەمووو ئەوانە بەسیانە بۆ دەرکردنی دڵەڕاوکێ لەناخداو تێ شکاندنی گێڕانەوەی ئارامی بۆی و لابردنی گرژییە دەمارییەکان[٣٠٧].

سەرژمێرییەکان لە ئەمریکا پیشانی دا ، دڵە ڕاوکێ بکوژێکی چالاکە بۆ ئەمریکییەکان لە جەنگی جیهانیی دووەمدا سێ یەکی ملیۆنێ بەدڵە ڕاوکێ مردن ، نەخۆشی دڵ (٢) ملیۆن کەسی کوشت ، یەك ملیۆن لەوانەی بە نەخۆشی دڵ مردووون دڵەڕاوکێ توشی کردوون[٣٠٨].

قورئانی پیرۆز ڕاستی فەرمووە : ﴿أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾ الرعد: ٢٨ ، واتە : بێگومان بەیادی خوا دڵان ئارام دەبن.

**( ئیعجازی ( ٦٧ ) : ڕامان و بەشی پێشەوەی مێشك**

**( الفص الدماغی الجبهي )**

---

[٣٠٧] دع القلق وابدأ الحياة / دايل كارنجى / ل: (١٦٧ – ١٧٠)

[٣٠٨] دع القلق وابدد الحياة / دايل كارنجى / ل: ٢٨.

قورئانی پیرۆز ئاماژه به بون و گرنگی ئەم بەشەی مێشك دەكات :﴿ كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًا بِٱلنَّاصِيَةِ ﴿١٥﴾ نَاصِيَةٍ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٍ ﴿١٦﴾ ﴾ العلق: ١٥ — ١٦ ، بۆچی قورئـان پێشه سـەر بـه درۆزن و هەڵەدەر ناو دەبات ؟

زانایان دۆزییانەوه كەبەشی مێشكی پێشەوه بەشێوەیەكی گەوره لـەكاتی (رامـان) و (بیركردنەوەی قووڵ) و (داهێنان) دا چالاك و گورج دەبێ ، ئەم بەشەی مێشك چەقی پێشڕەوی دەگرێ لەمرۆڤداو بەشی دەركردنی بڕیاره گرنگ و چارەنووس سازەكان داگیر دەكات له ژیاندا ، ئـەم بەشـەی مێشـك كاریگـەری زۆری هەیـه بـۆ سـەر ڕەفتـارو كردارو سۆزمان و یەكبینەی ژیانمان ، ئێمه به زاراوەی ئاسایی بـه پێشه سـەر و نێـو چەوان (تەوێڵ — الناصیة) ناوی دەبەین.

لەبەر ئەوەشه پێغەمبەر ﷺ جەختی كردۆتـه سـەر ئـەم بەشـەی مێشـك لـه سـكالاّو پاڕانەوەكانی و فەرموویەتی : (ناصیتي بیدك) ، واته : خودای من ئەم پێشه سـەرەی (بەشی فەرمان دەركردنه) ، دەیسپێرم بەتۆ له هەمووو كارەكانمدا .

دیسان له چارەسەری قورئانیدا دەست لەسەر پێشه سەر دا دەنێ ی قورئـانی بەسـەردا دەخوێنی به ڕامانەوه ، ئەمەش شوێنەوارێكی گەوره دروست دەكات .

## ڕامان و خوت خوته (الوسوسة)

﴿ ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴿٦﴾ ﴾ النـــاس: ٥ — ٦ ، ئـەم سورەته گرنگـه بـه ڕامانـەوه بخوێنرێ ، بـۆ سـڕینەوەی خـوت خوتـه (ڕاڕایی) له دڵ و دەرووندا .

(د. newber e) دوای چەند تاقی كردنەوەیێك لەسەر كەشیشه (بـودی) یـەكان ، كه ڕۆژانه یەك كاتژمێر دەچنه دۆخی ڕامـان و بـیر كۆكردنـەوه ، بینـی لـەكاتی ڕامانـدا

بەشی پێشەوەی مێشکیان چالاك دەبێ ، بەڵام بەشەکانی تری مێشك کاریان تێ ناکرێ وەکو بەشی پشتەوە شایانی باسە ناوچەی بەرپرسی لەوەسوەسەو خوت خوتە لە بەشی پشتەوەی مێشکە ، کاتێ پێشەوەی مێشك چالاك بوو بەشی پشتەوەی مێشك هێور دەکاتەوەو چارەی خوت خوتە دەکات .

هەروەها ڕامان هەست کردن بە (ژینگە) و هەر نارێکی و نائارامی یەك ژینگە پەیدای بکات کەم دەکاتەوە ، وەکوو (هاورێ ، خزم ، کۆمەڵگا) و بە دووبارە کردنەوەی ڕامان و گەردن کەچی و یاد دەڕەوێتەوە ، دیسان توێژینەوە تازەکان پیشانیان داوە ، ڕامان و یادی خودا یاد (زاکیرە) بەهێز دەکات و (هۆشیار) ی زۆرتر دەکات ، بۆیە ڕامان و یاد بۆ ئەوانە گرنگە زاکیرەیان لاوازە)[309].

گەر بڕوانینە سورەتی (الاعلى) دەری خستووە یادی خوداو ڕامان **(زاکیرە) بەهێز دەکات و مرۆڤ لە دەرخ کردن و لەبەرکردن (الحفظ) دا بە توانا دەکات و لە** لەیادچوونەوە ڕزگاری دەکات : ﴿ سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ۝١ ٱلَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ ۝٢ وَٱلَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ ۝٣ وَٱلَّذِيٓ أَخۡرَجَ ٱلۡمَرۡعَىٰ ۝٤ فَجَعَلَهُۥ غُثَآءً أَحۡوَىٰ ۝٥ سَنُقۡرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ ۝٦ ﴾ الأعلى: ١ ـ ٦ .

لێرەدا خوداوەند دوای ئەوەی فەرمان بە پێغەمبەر – د.خ – یادی خوا و ڕامان بکات، ئەنجا دەفەرمێ: پێت دەخوێنینەوە و لەیادت ناچێتەوە.

**ئیعجازی ( ٦٨ ) : ڕامان و دوانە کەسێتی ( الانفصام ) یان شیزۆفرینیا :**

(بە دوانە کەسێتی) ناوبراوە ، کە بریتییە لە نارێکی هەست و بیرکردنەوەی سروشتی ، دیاردەکانی لەکاتی هەرزەکاری یان پیری دا دەردەکەون ، درێژ خایەنە ، ون دەبێ و سەر هەڵدەداتەوە ، پێ دەچێ هۆکارەکەی باش کارنەکردنی خانەکان بێ ،

[309] الشفاء بالقرآن الكريم / ج٢ / ل:١١٩.

کە زانستەکان پێیاندا دەگاتە مێشك [310] ، بەلآم لە کۆنداو ئێستاش زۆر لە زانایانی گەورەی هاچەرخ پێیان وایە ئەم نەخۆشییە پەیوەندی بە دەسەلآت گرتنی ڕوحە زیانبەخشەکانەوە هەیە بەسەر مرۆڤدا ، پێچەوانەی ڕای (د. ئەلکسندەر/ ١٩٥٦) کە وتی : ئەم دۆخە پەیوەستە بەفرە کەسێتی یەوە ، بەلآم سۆزان (soosan) ئەم کچە ئاسیاوییە پێی وایە پەیوەستە بە ڕوحە زیانبەخشەکانەوە .

لەبەر ئەوە پێویستە بە دوعاو هیپنۆتیزم ئەم ڕوحە پیسە لەم لەشە نەخۆشە دەربکرێ ، (بیتر مالکیر) لەکتێبی (انشطار الذهن) دا ئەم بۆ چوونانەی گێڕاوەتەوە.

(ئیکلمان) شارەزا بە توێژینەوە ئیسلامیەکان (١٩٦٨) باسی کرد ئیسلام نکوڵی لەڕوودانی کاری نائاسایی ناکات ، مەسیحی کاتۆلیکی و پرۆتستانت جەخت لەسەر بیرۆکەی ڕوحی پیس چونە ناو لەش دەکەنەوە [311].

(المس) دەست وەشاندنە ﴿ مِنَ ٱلْمَسِّ ﴾ البقرة: ٢٧٥ ، وەك (القرطبي) لە (التفسير) دا باسی کردووە .

(يوسف الحاج) باس دەکات ڕوحە چەپەڵەکان کار دەکەنە سەر شێواندنی لەرەکانی ئەتیری لە مێشکدا ، یەکێ لە نوژداران باس دەکات سێ خاڵی سەرەکی لە مێشکدا داگیر دەکەن (بنکەی مۆخ ، ناوچەی (الصفيرة الشامية) و مەڵبەندی زاڵ بەسەر دەمارەکانی زاو و زێ دا) .

بڕوانە (صحايا الشيطان / يوسف الحاج / ل:٢٢٤) ، ڕابردوو شتی زیاترمان لەم بارەوە باس کردەوە .

(د.محمد الهادی) باس دەکات : (کاتێ لێکۆڵەران سەیری مێشکی ئەوانەیان کرد توشی شیزوفرینیا (الفصام) هاتون ، بینیان بەشی پێشەوەی مێشکیان بچووکترە لە بەشی

---

[310] بروانة (دليل الاسرة الطبي / د.هاني عرموش / ل: ١٣٣.

[311] انشطار الذهن / بيتر مالكير / ل: ٧٣.

پێشەوەی مێشکی کەسانی ساغ ، بۆیە دەتوانرێ بگوترێ یادو بیرکۆکردنەوەو ڕامان چالاکی لە هەر دەرمانێکی کیمیایی زیاترە بۆ چالاکی ئەم بەشە کە تووشی نارێکی بووە ، شیزوفرینیا (١٠٪)ی خانەکانی مێشك تووشی زیان دەکات ، بەلأم ڕامان و زیکرو یادی ڕۆژانە ئەم نارێکی یە قەرەبوو دەکاتەوە)[٣١٢].

**ئیعجازی ( ٦٩ ) نوێژو ڕامان**

**ئیعجازی ( ٧٠ ) نوێژو چارەسەر**

**ئیعجازی ( ٧١ ) چارەسەر بە دوعاو قورئان :**

وشەی (الصلاة) لە (صلة) وە هاتووە وەکو شێخی گەیلانی (قدس سره) لە (الفتح الرباني) دا ئاماژەی بۆ کردووە ، واتە : (پەیوەندی گرتن) .

نوێژ ئامرازی پەیوەندی گرتنە بە دونیای ڕوحەوە ، ڕامانە ، لە نوێژدا بیر کۆدەکرێتەوە ، پەیوەندی بە دونیای بالأوە دەکرێتەوە ، نوێژ یادی خوایە : ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ﴾ طـه: ١٤ ، واتە : (نوێژ بکە بۆ یادی من) گەیلانی لە (الفتح الرباني) دا ئەفەرمووێ : (الصلاة) واتە : (صلة) واتە : پەیوەندی کردن .. ﴿ فَنَادَتۡهُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٞ يُصَلِّي فِي ٱلۡمِحۡرَابِ ﴾ آل عمران: ٣٩ ، واتە : فریشتەکان بانگی زەکەریایان کرد، ئەویش لە میحرابدا نوێژی دەکرد.

ئەم نوێژە نوێژی (الحاجة) بووە داخوازی کوڕێکی تێدا دەکات ، لەم پەیوەندی ڕوحییەدا خودا وەلأمی دەداتەوە و یەحیای پێ دەبەخشێت.

---

[٣١٢] الشفاء بالقرآن الكريم / ل: ١٢٠.

﴿ وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلۡخَٰشِعِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾ البقرة: ٤٥، واتــه : به ئارام گرتن و نوێژ داوای یارمەتی لەخودا بکەن.

ڕابــردوو باســمان کــرد کــه چــۆن (د.مــیلان ریــزل) بــاس دەکــات نوێــژ لــه کاریگــەری سایکۆلۆژی ئیحایەکی زاتی دەخاتــه ڕوح دەڵــێ : (نوێــژ بــۆ شیفاو چــاك بوونــەوە ســێ بەشی جیای تێدایه دەبێ جیایان بکەینەوە :

(١) نوێژ بۆ شیفاو چاك بوونەوەی خود : ئیحا ڕەوانەی خود دەکـەی بـۆ چـالاکی چارەکردن به بەکارهێنانی پزیشکی دەروونی جەستەیی.
(٢) نوێــژ بــۆ چــاك بوونــەوەی کەســانی تــر : ئیحـا بـۆ نەخۆشـەکه دەنێـری بـه بەکارهێنانی پزیشکی دەروونی جەستەیی .
(٣) نوێژ بـۆ چـاك بوونـەوەی غـەیر بـه نادیـاری ، لێـرەدا هـەوڵی چـالاك کردنـی سایکۆکینیزیا (pk) دەدرێت[٣١٣] .

دەنووسێ : ڕێگای دووەمـی هیپنـۆتیزم نوێـژی ڕاستەقینەیه نـەك ڕۆتینـی ، کـەمرۆڤ بیری خۆی تێدا کۆدەکاتەوە به پاڕانەوەییێکی ڕاستگۆیانه ، مرۆڤ دڵی خۆی دەکاتــەوەو لەناخی دڵەوە ڕوو له کردگار دەکات ، نمونەی ئەم نوێژە که مرۆڤ پێـوەی هەڵدەسـتێ دەتـوانێ بیخاتـه جەزبـەی سـۆفی یـەوە لەگـەڵ پـەروەردگاردا ، کـاتێ هەسـت و بـیری ئاوێزانی خوا دەبێ هیچ شتێ نایهەژێنێ و هەمووو شتێ لەیاد دەکات له جیهانـدا)[٣١٤].

(ئیحاکان گۆڕانی بابەتی له لەشدا دروست دەکەن ، کۆئەندامی دەماری هاندەدات ، کـه دەسەڵاتی بەسەر تەواوی لەشدا گرتووە ، ئیحای لـەباری لـەکاتی هیپنۆتیزمـدا فشاری خوێن دەگۆڕێ لەتۆدا ، سـەرباری گـۆڕینی ترپـەی لێـدانی دڵ و پێـك هاتـەی خـوێن و شیلاوگ و هۆرمۆناتی لەشی[٣١٥].

---

[٣١٣] تدريب الادراك الحسي الفائق / ل: ٦٦-٦٧.
[٣١٤] تدريب الادراك الحسي الفائق / ل: ٥٤.
[٣١٥] تدريب الادراك الحسي الفائق / ل: ٦٤.

هەندێ زانای ئەمریکی دوای چەند ئەزمونێ بینییان کە نوێژ کار دەکاتە شێوانی دڵ و ئارام کردنەوەی کاری مێشك، خوا فەرموویەتی : ﴿ قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ۝١ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ۝٢ ﴾ المؤمنون: ١ – ٢ ، واتە : ئەو بڕوادارانە سەرکەوتون لە نوێژیان دا گەردن کەچی و ڕامانیان هەیە.

دیسان (پەیمانگای ڕاین و یستغالیا) ڕای گەیاند، ئەنجامدانی دووکار لە یەك کاتدا هزری مرۆڤ بڵاو دەکات لە ئەنجامدانی کارەکانی داو تووشی هەڵەی زۆرتری دەکات[٣١٦].

(ولیەم فالکیر) دەڵێ : ئەو کەسەی توانای بیر کۆکردنەوەو تەرکیزی هەیە دەتوانێ ڕوح لە ڕمان ڕزگار بکات ، چونکە دەتوانێ بیر لەسەر شتی چاك کۆبکاتەوەو بیرە خراپەکان بکاتە دەرەوە)[٣١٧].

گەر بڕوانیە کتێبی (اصغي الى اصابعي) زۆر بنەمای زانستی شیفای ڕوحی تێدا دەدۆزییەوە دەربارەی شیفا بەخشی لە ڕێگای نیحاو هالەی موگناتیسی یەوە کە بە نوێژو دوعا و ڕاهێنانی ڕوحی بەدەست دێت ، ئەم هالەیە بەدەست پێداهێنان دابەش دەکرێ بە لەشی نەخۆشەکەدا ، تا وزەو چالاکی بۆ بگەڕێتەوەو ئازارو نەخۆشی تێدا نەمێنێت ، وەکو لەم کتێبەدا هاتووە (دجونا) بە هالەی دەست نەخۆشان چاك دەکاتەوە .

لەکتێبی (الباراسایکولوجي سرمن اسرار الدولة / هنری کرایس/ ل:٥٠) دا باس لە (کریفوروونوف) دەکات لە روسیادا ، کە لە ساڵی (١٩٢٩) دا هێزو هالەی شیفا بەخشی نائاسایی تێدا دەدۆزرێتەوە ، زانایان دوای پشکنین دەبینن ، خۆی و کوڕەکانی تەزووی بایۆلۆجی شیفا بەخشیان تێدایە ، کاتێ ئەم وزەیە لەلەشی ئەوانەوە بەدەست پێدا هێنان بۆ نەخۆشەکە دەگوازرێتەوە ، یان ئەندامی نەخۆشی ئەو

---

[٣١٦] الشفاء / ل: ١٢٤.

[٣١٧] قوة الفكر في الحياة العملية / ل: ١٠٣.

نەخۆشە وەكو (جگەر) یان (گورچیلە) ئەو ئەندامەیە بە یارمەتی ئەو وزە ڕوحی یە بایۆلۆجی یە چاك دەبێتەوە .

ئەوانەی (كریفوروتوف) چاكیان دەكاتەوە باس دەكەن چۆن لەكاتی چارەكردندا هەستیان كردووە تەزوێكی كارەبایی بە لەشیاندا ڕەت دەبێ و بەرگەیان نەگرتووە .

ساڵی (١٩٥٦) وەزارەتی تەندروستی جۆرجیا هەڵدەستن بە تاقی كردنەوەی (كریفوروتوف) ، (٣٠) نەخۆشی لەبەردەمدا دادەنێن ، كە ئیفلیجی سادەی دەست و ئاسەواری كرداری برینسازی و سەر ئێشەی درێژ خایەن و ئازاری توندی پشت و نەخۆشی دەماری یان هەیە ، دوای چارەكرانیان لەلایەن (كریفوروتوف) وە بینرا زۆر لەوانە بە تەواوی چاك بوونەوەو هەندێكیشیان باری تەندروستیان باشتر بووە .

كاتێ دەستەكانی (كریفوروتوف) بە ئامێری (كیرلیان) وێنەی گیرا ، بینرا هالەو تیشكێ لەدەستەكانییەوە دەردەچێ چەند قاتی هالەی كەسانی ئاسایی دەبێت .

(ئادامنكۆ) دەڵێ بڵێسە ڕووناكییەكی شینی سارده لە ڕووبەری دەستەكانی و چاڵەكانی و پەنجەكانی یەوە دەردەچێ ، بڵێسەیەكی داگیرساوی گڕاوی لە شێوەی تەڵەزمی بچووكدا پێك دێنێت [٣١٨].

بێگومان پێغەمبەران و صدیقینەكان وێستگەی ئەم وزە ڕوحی یە بوون ، ئەولیایان بە پلەی جیا جیا بەشێكی كەمیان لەم وزەیە دەست كەوتووە ، وەكو روبارێ لە نۆڤیانووسێ ، كەسانی ئاسایی هەیە بە سروشتی یان بە ڕاهێنانی ڕوحی یان رامان و یۆگا ئەم وزەیە بەهێز دەكەن ، بەلام توانای ئەوانە لە چاو توانای ئەولیایان وەكو جۆگەلەیێكە لەڕوبارێك، مەبەست لەمە بەشداری خەڵكە لە توانا ڕوحیەكاندا تا سوودی لێ وەربگرن و بڕوا بەجیهانی سەرووی ماددی و نەبینراو بكەن ، كە هەستە ماددییەكان لەپەی پێ بردنی یاندا دەستەوەستانن.

---

[٣١٨] بروانة (الباراسايكولوجي سر من اسرار الدولة / ل:٥٢.

﴿ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِيَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ الأعراف: ١٠٨ ، هەمووو كارە نائاسايی يەكان بە توانای هالەی ڕوحی ئەنجام دەدرێن لە ئاستی جیاجیادا .

جگە لەمەش زانایانی ڕوحی خۆرئاوا بۆ چارەسەری ڕوحی بە (هالە) و (ئیحا) و (پەیوەندی بە ڕوحی پاكەوە) سوود یان لە نەخشەكانی قورئان وەرگرتووە .

(الطب النبوي / ابن القيم الجوزية) ـكە كردوومانە بە كوردی ـ نمونەی زیندوووی زۆری تێدایە ، وەكوو قورئان خوێندن و دوعاكردن و نوشتە بۆ نەخۆشان و فووپێداكردن و دەست هێنان بەسەر نەخۆشدا ، بوخاری) گێڕاویەوە چۆن سەحابەكان دوعا بۆ سەرۆك هۆزێ دەكەن كە مار یان دووپشكێ پێوەی دەدات ، فاتیحەی بەسەر دەخوێنێ و چاك دەبێتەوە .

لە (سنن ابن ماجة) دا هاتووە : (خير الدواء القرآن) باشترین چارەسەر قورئانە.

لە (صحيح مسلم) دا هاتووە : (ان النبي يعوذ بعض اهله ويمسح بيده اليمنى ويقول : اللهم رب الناس اذهب البأس واشف أنت الشافي ، لا شفاء الاشفاءك ، شفاء لا يغادر سقما) واتە : پێغەمبەر ﷺ (التعويذ) ی بۆ هەندێ خێزانی دەخوێندو دەستی ڕاستی بەسەردا دەهێناو دوعای بۆ دەكرد : (....)

پێغەمبەر ﷺ بە (عثمان بن ابي العاص) دەفەرمووێ كە لەوەتەی موسڵمان بووە لەشی ئازاری هەیە : (ضع يدك على الذي تألم من جسدك وقل بسم الله ثلاثا ، وقل : سبع مرات : اعوذ بعزة الله وقدرته من شر ما اجد واحذر) رواه مسلم ، واتە : دەستت لەسەر شوێنی ئازارە دابنێ و سێ جار بڵێ : (بسم الله) و (٧) جار بڵێ (اعوذ بعزة الله وقدرته من الشر ما أجد و أحاذر) .

لێرەدا چارەكردن بە دوعاو دەست بەسەردا هێنانەو سەرنج بدە!.

(ئارتەر فندلای) باس لەچارەسەری ڕوحی دەكات لە ڕێگای ڕوحە پاكەكان و نوژدارانی ئەتیرەوە : (نوژدار لە دانیشتنەكەدا ئامادە دەكرێ ، ناوەندی خەوێنراو

ئامادەیەو لەباری بێ ئاگایی دایە ، بەیارمەتی توانای ڕوحە ئامادەکان ، ناوەندەکە هەڵدەستێ بە ڕێگای دەست پێدا هێنان نەخۆشان چارەسەر دەکەن ، لەباری نەخۆشی ترسناکدا ئەو نەخۆشە دەخەوێنرێ تا لەڕێگای ناوەندە نوژداری ئەتیری چارەی بکات ، پاشان نەخۆش هەست بە هیچ ئازارێ ناکات ، بەکارهێنانی تیشکی ڕوحی کەدەست دەگرێ بەسەر لەشی نەخۆشدا هەزاران کەس چاك دەبن ، چونکە چاك بوونەوەی لەشی فیزیایی لە ڕێگای لەشی ڕوحی یەوە دەبێت) (صخرة الحق/ ارثر فندلای)[319].

**ئیعجازی ( ٧١ ) چارەسەرکردن بەدەنگی قورئان خوێندنەوە و میوزیك :**

﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾ ﴾ الأعراف: ٢٠٤ ، واتە : گەر قورئان خوێندرا گوێ بگرن و خامۆش و مات بن تاکو ڕوحمتان پێ بکرێ

واتە : بۆ کاریگەری قورئان پێویستیمان بە ڕامان و بێ دەنگی و وردبوونەوەو ڕۆچوونە ، بێگومان قورئان وەکو مێشکی مرۆڤ ئیقاعی هەیە ، هەروەها وەکو دەنگی میوزیك ، دەبینی پێغەمبەر ﷺ دەنگی خۆشی یەکێ لە صەحابەکان بە شمشاڵی (داود) (علیه السلام) ناو دەبات (لقد اوتیت مزمارا من مزامیر داود) متفق علیه .

(د.محمد الهادي) دەنووسێ : (دەنگی قورئان کۆمەڵە شەپۆلێکی دەنگی یە لەرەلەرو شەپۆلی تایبەتی خۆی هەیە ، ئەم شەپۆلانە کۆمەڵە لەرەلەرێکی پەخش دەکەن ، کاردەکەنە سەر خانەکانی مێشك و هاوسەنگی بۆ دەگێڕنەوە ، بەرگری پێ دەدات لە دژی شێرپەنجە ، کە تەنیا بریتییە لە ناڕێکی لە کارەکانی خانەکاندا ، گەر قورئانی بیست و کاری تێ کرد مێشك فۆرمات دەبێتەوە وەکو کۆمپیوتەرێکی پڕ لە ڤایرۆسات

[319] علی حافة العالم الاثیری / ج.ارثر فندلاي / ل: (١٥١).

خاوێن دەکرێتەوەو بەرنامەی نوێ ی بۆ دادەنرێتەوەو دژ ڤایرۆسەکان ئەم ڤایرۆسانە لەناو دەبەن .

(ئانی ویلیا مۆ) لە ئەمریکادا بە ئیقاعی میوزیك نەخۆشانی چارەسەر دەکات وەکو شێر پەنجەی (کۆلۆن) و (لوی پیسی مێشکی) و نەخۆشی ترو ناکامی چاکی دەست کەوتووە .

ساڵی (١٨٣٩) زانا (هنری ویلیام دوف) دۆزییەوە کە (مێشك) کاتێ بەر شەپۆل و دەنگ دەکەوێ کاریگەری چاك یان خراپی تێ دەکات ، کاتێ مێشکی دایە بەر لەرە لەرەی دەنگی جیاواز بینی مێشکەکە وەڵامی ئەو لەرانەی دەداتەوە ، پاشان زانایان دەریان خست مێشك بە درێژایی تەمەنی دەکەوێتە بەر لەرەی هەمیشەیی و هەموو خانەکان بە سیسەمێکی دیاری کراو دەکەونە بەر خانەکان لە دورپاندا ، ئەو رووداوانەی بەسەر مرۆڤدا دێن شوێنەوار لەسەر خانەکانی مێشکدا پەیدا دەکەن،هەر رووداوێکی ناخۆش کار دەکاتە سەر سیستەمی (لەرەلەری خانەیی) .

میکانیزمی کاری خانەکان لەچارەکردنی زانستەکاندا بریتییە لە (لەراندنەوە) و (ناردنی تەزووی کارەبایی) ، با لەو رێگایەوە قسە بکەین و بجولێین و پێشرەوی بکەین و لەگەڵ کەسانی تر کارلێکردن بکەین .

کاتێ زەبرو کارەساتە دڵتەزێنەکانی رۆژگار لەسەر مرۆڤ کەڵەکە دەبن ، هەندێ هەڵوێستی بێزارکەرو هەندێ لەو کێشانەی خانەکانی مێشکی و دەمارە هەستیارەکان بەتایبەتی تووشی شێوان دەکات ، ئەو بێ سەروبەرییە مێشك ماندوو دەکەن ، چونکە مێشك بەکاری زیاتر هەڵدەستێ و سوود وەرناگرێت .

منداڵ بەر لە پەیدابوون خانەکانی مێشکی دەست بە لەرینەوە (الاهتزاز) دەکەن ، مێشکی هاوسەنگەو خانەکانی لەگەڵ کارەکانیدا رێکن ، دوای لەدایك بوون هەمووو رووداوێ کار لە خانەکانی مێشك دەکات ، ئەو رێگایەی خانەکان دەلەرێنێتەوە کاریان

تێ دەکات ، تا هەندێ لەو خانانەی بۆ هەلگرتنی لەرەی بەرز ئامادە نەکراون سیستەمی لەرینەوەی تێك دەدەن و تووشی زۆرێ لە نەخۆشییە دەروونییەکان و لەشیەکانی دەکات .

زانایانی نوێ دووپاتی دەکەنەوە هەر ڕەفتارێ لەرەی تایبەتی خۆی پەیدا دەکات لەخانەکاندا ، گەر بۆ ماوەیەکی زۆر بدرێنە بەر لەرەیەکی دەنگی، گۆڕان لە لەرەلەری خانەیی دا پەیدا دەکەن .

لەرە لەر هەیە خانەکانی تیشك چالاك و ئیجابی دەکات و وزەی پۆزەتیڤیان پێ دەدات ، لەرە لەری تر هەیە ئازار بە خانەی مێشك دەدەن و لەناوی دەبەن .

زانایان زنجیری (DNA) یان لە تەواوی خانەکاندا دۆزییەوە ، کە بە ڕێگایەکی دیاری کراو دەلەرێنەوە ، ئەم زنجیرو شریتە زانیاری پێویستیان بۆ ژیان هەلگرتووەو گەر توشی هەر ڕووداو ڤایرۆس و نەخۆشییەك هاتن تووشی گۆڕان دەبن .

ئەم زانایانە دەڵێن : گەر ئەم شریتە تووشی پەلاماری (ڤایرۆس) هاتن کەمتر دەلەرێنەوە ، تاکە ڕێگای باش بۆ بەکارخستنەوەیان فۆرمات کردنەوەیانە چەند شەپۆلێکی دەنگی دیاری کراو ، کە لەگەڵ ئەم شەپۆلانەدا چالاك دەبنەوەو دەست بەلەرینەوە دەکەنەوە ، بەلاَم دەنگ هەیە زیان لەم شریتە بۆ ماوەییە دەدات .

زۆر لە چارە بەخشانی نوێ لەرینەوەی دەنگی بەکاردێنن بۆ چارەی نەخۆشی (شێرپەنجە) و نەخۆشی درێژخایەن ، کە نوژداری دەستەوەستانە لەبەرامبەریاندا ، دیسان بینیان زۆر لە نەخۆشییە دەروونییەکان وەکو شیزوفرینیاو دڵەڕاوکێ (القلق) و کێشەی نووستن سوودی لێ دەبینن ، دیسان سوودی زۆرە بۆ هەندێ خوی خراپی وەکو : (جگەرە کێشان و مودمینی لەسەر کەهولەکان و هۆشبەرەکان) ، بێگومان باشترین چارەسەر بۆ هەموو نەخۆشییەکان قورئانە ، ئەم قسەیەش بەرهەمی

ئەزموونەکی درێژە ، دەتوانم بەڵگە بێنمەوە ، کە کەسانێکی زۆر بەهۆی چارەکردن بە قورئان چاك بونەوە ، دوای ئەوەی نوژداری نوێ نەیتوانیوە چارەسەریان بکات .

گوێ گرتن بۆ ئایەتە قورئانیەکان هاوسەنگی بۆ خانەکان و دەگێڕێتەوەو توانایان پێ دەداتەوە بەباشی و بنەڕەتی کاربکەن ٣٢٠.

قورئان خوێندنەوە باشترین دەنگە بۆ دروست کردنی گۆڕانی ئیجابی لە خانەکانداو زیندەگی و چالاکی پێدانیان و گۆڕانی باش لە لەرەلەرەکانی خانەییاندا پەیدا بکات و چارەسەری لەباریان بۆ بکات .

## ئیعجازی ( ٧٢ ) خودا پەرستییەکان باشترین بەرگری و چارەسەرن بۆ نەخۆشییەکان :

﴿ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا ﴿١٠٣﴾ ﴾ النساء: ١٠٣ ، کاتەکانی نوێژ کردن لەگەڵ جووڵەکانی بوونەوەردا هاوکاتن ، وەکوو کاتەکانی نووستن و کردارە زیندەگی و فسیۆلۆجیەکانی تر.

(باتریشا کارنگتون) لە کتێبی (التأمل) دا باسی کردووە ، دیسان (د.محمد الهادي) ڕوونی کردۆتەوە لە نوێژی (بەیانی)دا هۆرمۆنەکان لەلەشدا زیاد دەکەن ، لەگەڵ بەرز بوونەوەی فشاری خوێندا پێویست دەبێت ، لەو کاتەدا مرۆڤ هەست بە چالاکی و گورجی دەکات ، هاو کات لەبەیانی دا گازی (ئۆکسجین) و (ئۆزۆن) بەرز دەبنەوە لە هەوادا کۆ ئەندامی سوڕی خوێن و دەمارو ماسولکە چالاك دەکەن .

لەنوێژی خەوتناندا لەش ماددەی (میلاتۆنین) دەڕێژێ لەش خاو دەکاتەوەو ئامادەی دەکات بۆ خەوتن ، نوێژ بەهۆی جووڵەکانی بڕوادار لە نەخۆشی (دەوالی – الدوالي) چەپاڵە دەدات و سووڕی خوێنی گورج دەکات ، دیسان ئەم جووڵە وەرزشییانەی نوێژ

---

٣٢٠ الشفاء بالقرآن الكريم ج٢/ ل:١٢٨ – ١٣٣/.

مرۆڤ له نەخۆشی دەپارێزێ وەكو نەرم بوونەوەی ئێسقان و چەمانەوەی بڕبڕەی پشت ، ڕكوع و سوجده ماسولكەی سك و قاچ و ڕان بەهێز دەكەن ، ڕیخۆڵەكان گورج دەكەن و له قەبزی ڕزگاری دەكەن ...هتد.

نوێژی به ڕامانەوە وەكو له زانكۆی كالیفۆرنیا تاقی كردنەوەی لەسەر كرا دەركەوت ئەوانە كەمتر توشی مردنی كتو پڕو نەخۆشی درێژ دەخایەن دەبن .

لەزانكۆی (روشستر) توێژینەوەیەك كرا بینرا (٨٥٪) ئەمریكی یەكان بڕوایان وایە نوێژ یارمەتی دەردەبێ بۆ چاك بوونەوە له نەخۆشی.

نوژدارێ له (سان فرانسیكۆ) (Randol phbyr d) داوا دەكات دوعا بۆ (٢٠٠) نەخۆش بكرێ كه تووشی نەخۆشی (دڵ) بوون ، بینرا ئەوانەی دوعایان بۆ كراوە باریان باشترە لەوانەی دوعایان بۆ نەكراوە .

(William Harris) هەمان تاقیكردنەوەی لەسەر هەزار نەخۆش كرد لەوانەی نەخۆشی دڵیان هەیە بینی دۆخیان باشترە لەوانەی كه دوعایان بۆ نەكراوە).

دیسان زانایانی (بەرنامە) پێیان وایە خێرو چاكە بە هەزاران دڵ و دەروون ئاسوودە دەكات ، ئەم ئاسوودە بوونە بۆ بەهێزكردنی دەزگای بەرگری (المناعة) پێویستە دژ بە میكرۆبەكان)[٣٢١].

(ڕاهێنان)

هەوڵ بدە تاقی كردنەوە لەسەر كەسێ بكە باری تەندروستی باش نەبێ ، وەكوو سەرئێشەو گرژی ... هتد.

---

[٣٢١] الشفاء / سەرچاوەی ڕابردوو / بەكورت كردنەوە.

داوای لێ بکە چەند جارێ بە قووڵی هەناسە بدات و خۆی خاو بکاتەوەو کراوە بێ بۆ وەرگرتنی ئیحاو وزەی چارەبەخش کەبۆی ڕەوانە دەکەیت .

مێشکت بەیادی خوا پاکژ بکەوە لەداڵغەو جەنجاڵی هزری ، شوێنەکی هێور یارمەتی دەرت دەبێ بۆ تەرکیز کردن ، وزەی ڕوحی بەخەیاڵ بۆ دەستەکانت ڕەوانە بکە ، تا هەست دەکەی گەرم داهاتوون و هەست بە تەزووی کەم دەکەی ، پاشان دەستت بخە سەر ئەو شوێنەی ئازاری هەیەو پێویستی بە شیفایەو بەردەوام بە خەیاڵ وزەی بۆ بنێرە ، لەگەڵ ناردنی وزەدا قورئانی بەسەردا بخوێنە ، کە باشترین ئیحای شیفا بەخشن و لەرەن بۆ چالاك کردنەوەی مێشك و گۆڕینی ئیجابی لە لەشی نەخۆش و لابردنی ئازارەکانی دا ، با ئەم ئەزموونە چەند خولەکێ بخایەنێ ، دوایی دەستت دووربخەوە بیانشۆرەوە بە ئاو ، تا هالەکەت پاکژ بێتەوە لە هەر هالەیەکی سەلبی ، کە بێ مەبەستن هەڵت گرتووە .

لە نمونەی ڕابردوودا بینیمان پێغەمبەر ﷺ قورئان خوێندن و دەست بەسەردا هێنانی فێری یارانی کردووە بۆ چارە بەخشی و لابردنی ئازارەکان.

بە ویستی خودا لە زنجیرەکانی داهاتوودا وەکو (پزیشکی دەروونی ، پزیشکی جەستەیی ، پزیشکی پاراستن) بەدرێژتر باسی زانستی پزیشکی و بەشەکانی دەکەین ، ئەم بەشەیان تەنیا باسی چارەبەخشی بوو لە ڕوانگەی ڕوحی یەوە ، گەر نا چارەکردن لە زۆر ڕوانگەوە هەیە وەکو چارەکردن بە : (شێلان و بەبۆن و بەئایۆرفیداو لە گوڵەکان و بەخۆراك و بەگژو گیا و بە ئاو و بە خەیاڵ و بە ڤیتامینات و بە یۆگاو ... هتد) کە (بیل گوتلیب) لە کتێبی (الطب البديل) دا باسی کردوون .

**ئیعجازی (٧٣) سایکۆکینیزیا :**

**( psi) هێمایەکە پاراسایکۆلۆژییەکان بۆ هەمووو ئەو دیاردانە بەکاری دێنن دەتوانن تاو و توێی بکەن ، لێرەدا بەگشتی دوو جۆر دیاردەی نائاسایی هەیە : هەستی شەشەم و سایکۆکینیزیا.**

**سایکۆکینیزیا واتە : جولاّندن و کارکردنە سەر تەنەکان بە توانای ڕوحی ، یان توانای هزر بۆ سەر ماددەو توانای جولاّندنی شتەکان و کارتێ کردونیان بەبێ پەنا بردن بۆ هیچ هێزێکی فیزیایی ناسراو ، هێمای (pk) بۆ دادەنرێ ، لەلایەن (یوری گیلەر) ئەم دیاردەیە پەرەی پێ درا ، کە بە توانای هزری و ڕوحی لە توانای دابوو کەوچکی چێشت و کلیل خوار بکاتەوە ، زانایان و لێکۆڵەران زیاتر وشەی پەی پێ بردنی هەستی سەروو** (ادراك فوق الحسی) **بەکاردێنن نەك تلەپاتی (پەیوەندی هزر بە هزرەوە) و دووربینی** (الاستبصار) **واتە : دیتنی تەنە شاراوەکان و پێشبینی و ئەو زانیارییانەی لە دەرەوەی ماددەوەن[٣٢٢].**

**لەقورئانی پیرۆز وەکو موعجیزەیێ لە چەندان ئایەتدا ئاماژە بەم دیاردەیە کراوە وەکو کارێکی نائاسایی لەسەر دەستی پێغەمبەران و صددیقینەکان ، نمونە :**

**(١) (داود —علیه السلام-) ئاسنی لەبەر دەستدا تواوەتەوە بۆ دروست کردنی زرێی جەنگ :** ﴿وَأَلَنَّا لَهُ الْحَدِيدَ﴾ سبأ: ١٠ .

**(٢) سولەیمان (علیه السلام) بەبافڕیوە ، یان ئەو زانا ڕوحییەی لەکۆشکی ئەودا کاری کردووە پێی دەفەرموێ :** ﴿أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ﴾ النمل: ٤٠ **، واتە : من تەختی بەلقیسات بۆ دێنم بەر لەوەی چاوت دابگرییەوە[٣٢٣]** ، ﴿وَلِسُلَيْمَانَ الرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ﴾ سبأ: ١٢ .

---

[٣٢٢] حروب العقل / رووناڵد . م ماكري / ل:٥٠.

[٣٢٣] **خێرایی چاوتروکاندنێ (٤٪) ی چرکەیێکە.**

واتا: (با)مان بۆ موسەخەر کردنی بە خێرایی بەیانی و ئێوارە (مانگە ڕۆژێك) دەڕۆیی.

(٣) مەریەم (علیە السلام) وەکو (صدیقة) دەتوانێ دار خورما بجولێنی و بیوەشێنێ : ﴿وَهُزِّيٓ إِلَيۡكِ بِجِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ تُسَٰقِطۡ عَلَيۡكِ رُطَبٗا جَنِيّٗا ﴿٢٥﴾﴾ مریم: ٢٥ .

(٤) پێغەمبەری ئیسلام ﷺ مانگ شەق دەکات ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ﴿١﴾﴾ القمر: ١ .

لە فەرموودەدا هاتووە ، پێغەمبەر (ﷺ) خۆر ڕادەگرێ وەکو چۆن (یوشع) (علیە السلام) ڕای دەگرێت ، لە (صحیح البخاري)دا هاتووە : پێغەمبەرێ غەزا دەکات نوێژی ئێوارە نزیك دەبێتەوە لە شارەکەدا ، بەخۆر دەڵێ (انك مأمورة وانامأمورة اللهم احبسه علینا).

لە (الصواعق المحرقة/ ابن حجر) دا هاتووە بە (اسناد صحیح) پێغەمبەر (ﷺ) سروشی بۆ دێ لەسەر ڕانی عەلی (علیە السلام) بووە ، خەریکە خۆر سەر دەنێتە سوێ ، پێغەمبەر (ﷺ) سروشی تەواو دەبێ و دەفەرمووێ : (اللهم اني علیا في طاعتك وطاعتك فاردد علیه الشمس).

لەکتێبی (الصفین / نصر بن مزاحم) دا هاتووە ئیمام عەلی لە جەنگی (سیفین)دا خۆر ڕادەگرێت ، (بڕوانە / گەردووناسی / ل: ٢٠٨).

(٥) دیسان لەسەردەمی موسادا زۆر لەم موعجیزانە ڕووی داوە ، وەکوو : شەق کردن و بەرز کردنەوەی دەریا تاخۆی و کوڕانی ئیسرائیل بەژێردا ڕەت ببن (فاوحینا الی موسی ان اضرب بعصاك البحر فانفلق فکان کل فرق کالطود العظیم) (الشعراء ٣٦).

(٦) دیسان لە ئاخر زەماندا جارەکی تر خۆر دەگەڕێتەوە ، بڕوا وایە تیراسای سوڕانەوەی زەوی بگۆڕێ و وەکو میلی سەعات بگۆڕێ ، لە خۆر هەڵاتەوە ئاوا

ببێ و لەخۆر ئاواوە هەڵبێت ، (لا تقوم الساعة حتى تطلع الشمس من مغربها) متفق عليه. ئەم دیاردانە لەسەردەمی مەهدی و مەسیح دا (علیهما السلام) دەردەکەون .

(٧) نمونەی تر ئەوەیە ئیمام عەلی دەروازەی قەڵای خەیبەر هەڵدەگرێ ، کە بە (٧) کەس ناجولێت ، پاشان دەفەرمووێ : (والله ما قلعت باب خيبر بقوة جسدانية ولكن قلعته بقوة ملكوتية ونفس بنور ربها مضيئة) بڕوانە (تفسير الشيخ الاكبر) ابن عربي / ج١/ل:٣٠٧.

لێرەدا ئیمام ئاماژە دەکات دەروازەی خەیبەری بە هێزی لەش تاونەداوەتێ ، بەڵکو بەتواناو ڕووناکی و وزەی ڕوحی دەست داوەتێ .

لەڕووی زانستی یەوە (ج.اج.رایز) دەڵێ : (ڕاڤەی ئەمە ئەوەیە هەندێ کەس بارگەی کارەبایی و موگناتیسی دەوری داون ، ئەو وێستگەیە بەرپرسیارە لە ئەنجامدانی دیاردە نائاسایی یەکان).

دەنووسێ : (ئافرەتێکی سۆڤیەتی هەیە دەتوانێ کار بکاتە سەر (قیبلە نوما)ی موگناتیسی ئاسایی و لە (٦) ئینچ دوورەوە بە ئاماژەی دەست بیجولێنێ و تیراسای بگۆڕێت .

لە ساڵی (١٩٦٣)دا بینرا پیاوێکی دەرگەوان لەیەکێ لە ئوتێلەکاندا بەسەیرکردنێ لە فیلمەکان لە کامێرادا شێوە لەسەر فیلمەکاندا پەیدا دەکات .

(ئیزن بود) مامۆستای دەروونزان لە زانکۆی (دنفر)ی پزیشکی دەربارەیی ئەم دیاردەیەی کۆڵییەوەو بینی هیچ ساختەییێکی تێدا نییە .

هەندێ لە نووسەران وەکو (سێر ولیەم کروکس) لە گۆڤاری زانستی وەرزی (١٨٧٤) باس دەکات ناوەندێك دیاردەی بەرزبوونەوە لە زەوییەوە دەبینێ ، لێرەدا کەسێك هەیە توانیویەتی لەپەنجەرەیێکەوە دەفڕێ بۆ ئەوەی بڕواتە ژورێکی ترەوە ،

بەرزبوونـەوە لـە زەوی دەكـرێ بـە سـازانی گـەردوونی (الانسـجام الكـونـی) راڤـە بكرێت[٣٢٤].

سۆفییەكان بـەم فرینـە رۆحییـە دەڵـێن رێگـا بـرین بـە خێرایـی (طـي الارض) ، رابردوو باسمان كرد كە عەللامەو عـاریف (الكلابـاذي) لـە كتێبـی (التعرف لمذهب اهل التصوف)دا دەڵێ : زانایان كۆكن لەسەر كەرامەتی ئەولیا ، هەر چەنـدە دەچێتە مەسەلەی موعجیزەكانەوە وەكو (رۆیشتن بەسەر ئـاودا ، قسـەكردن لەگـەڵ گیانـداران داو فرین و خێرا رۆیشتن لە زەویدا (طي الارض) و دەركەوتنی شتی پێش وەخت ، ئەم راستیە دەقی لەسەر هەیـە لـە قورئـان و سـوننەت ﴿أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن يَرۡتَدَّ إِلَيۡكَ طَرۡفُكَ﴾ النمـل: ٤٠ ، بەسـەرهاتی مەریـەم : ﴿أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَاۖ قَالَتۡ هُوَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٍ ۝٣٧﴾ (ال عمـــران: ٣٧) ، واتـە : هـەر كـاتێ زەكـەریا دەچـووە میحرابـی مەریـەم رۆزیـی دەبینـی ، دەیفـەرموو : لـە كوێـت بـۆ هـاتووە ، دەیفەرموو (هو من عندالله) ، واتە : لەلایەن خواوە بۆم هاتووە .

لە نامەیەكی (هایمان)دا بۆ كۆبوونەوەی سالآنەی كۆمەڵەی ئەمریكی لە ساڵی (١٩٨٠)دا كە بـۆ پێشكەوتنی زانسـتی بەسـترا ، لـەم پێشـنیارەوە (هایمـان) داوای لەناوەنـدەكانی زانستی كرد بیر لە یەكێ لەم پێشنیارە سەیرانە بكەنەوە .

(هاوڕێیەكی بەڕێزی ئێـوە دەڵـێ لەدانیشت و مێـز گردەكـی ئامـادەكردنی روحەكانـدا لـەماڵی خـۆی، یـەكێ لەدانیشـتووان داوای لەناوەندەكـە كـرد ، ئایـا دەتـوانێ گوڵـە بـە رۆژەیێـك لـەوێ ئامـادە بكـات ، گـورج سـەلكە گولەبـەرۆژەیێك كەوتـە خـوار لقـەكانی شەش پـێ دەبـوو ، ئـەم هاوڕێیـەتان شـەهادەی كەسانێكی نووسیوە بـە ئیمـزاوە ، كـە ئامـادەبوون ، هـەمووو ئەوانـەش بـێ فێـڵ و بـەڕێزن ، ئـەو ماڵـەو ئـەو ناوەنـدەش

[٣٢٤] بروانة (عصر الخوارق / ل:٨٨-٨٩)

پشـكنينى تـەواويان بـۆ كـراوە بـەر لـە مێزگردەكـەدا بـۆ بـەرايى گـرتن لـە هـەر ساختەيێك[325].

(بيردن) باس لە (كۆى نەستى مرۆيـى – اللاوعـي الجمعي) دەكـات و بـە (zar g – زارگ) ناوى دەبات ، كە دەتوانێ زياتر لە خەساندنى ئـاژەڵان ئـەنجام بـدات ، دەتـوانێ هەورى ئەستێرەكان ڕابكێشێ ، گۆى زەوى و كۆمەڵەى خـۆر بشـێوێنێ، زەوى ڕابگـرێ لە خولگەى داو ياسا سروشتييەكان بگۆڕێت[326].

لە ڕوسيادا كەسێك هەيە ناوى (بوريس ئەرمولاجيف) هەيە دەتوانێ لـە هـەوادا مەلـە بكـات ، بـە توانـاى ڕوحـى مـرۆڤ يـان تـەنێك لـە هـەوادا بـەرز بكاتـەوە . پرۆفيسـۆر (پوشـكين) لـەدواى تـاقى كردنـەوە لەسـەر بڕيـارى دا : (ئـەم كاريگـەرييـە ڕوحـى يـە ئاسايى نييەو چاوگەكەى لە تواناى كارەبايى ئيستا تيكى يەوە نييە )[327].

ديسان (نينل سێرجيفنا) هەيە لە سايكۆكينيزيا واتە تواناى ڕوحى دەتـوانێ تەنـەكان هەڵبگرێ ، ئەو باس دەكـات : لـەكاتى (تلـەپاتى) دا يـان گـەر بمـەوێ تـەنێك بجـوڵێنم دەبێ خەياڵ لە بيرى بباتە دەرەوە ، تەركيز دەخاتە سەر ئەم تەنەيە بە توندى ، لەو كاتـەدا لـە بڕبـڕەى پشـتمەوە هەسـت بـەهێزەكى زۆر دەكـەم ، تـەمێك لەبـەر چـاوم دەردەكەوێ ، دەورى تەنەكەى داوە.

ئەم دياردانە بەهۆى (هالەى موگناتيسى) ڕوو دەدەن كـە لـە ناوەنـدەوە (مـەديوم) دەر دەچێت و لە (نينل) دا تاقى دەكرێتەوە .

---

[325] حروب العقل / ل:٩٨.
[326] حروب العقل / ل: ١٣٢.
[327] الباراسايكولوجي سر من اسرار الدولة / ل:٧-٩.

(نینل) دەتوانێ ماددەی یەك كیلۆ گرامی بخاتە جووڵەوە ، ساڵی (١٩٧٠) لە تاقیگەی (لینینگراد)دا بەو وزەیە دوای تەركیزو كۆكردنەوەی دەتوانێ دڵی بۆقێك ڕابگرێت ، پرۆفیسۆر (سێرجیف) شاهیدی لەسەر ڕاستی ئەم تاقی كردنەوەیە دەدات .[٣٢٨]

## ڕاهێنان

(١) لە ژورێكی داخراودا مۆمێك داگیرسێنە هیچ شتێ كاری تێ نەكات ، دەرگاو پەنجەرە دابخە ، ڕێك داینێ ، پاشان سەیری بكەو بیری لەسەر كۆبكەوە ، ئیجا بۆ مۆمەكە بكە گڕەكەی بە گۆشەیێكدا لار بێتەوە ، لە ڕێگای چاوەكانت هالەی ڕوحی ڕەوانە بكە تا وزەكەت دەگاتە ئاگرەكەو خواری دەكاتەوە ، گەر سەركەوتی بگەڕێوە باری سروشتی خۆت تا ببینێ بڵێسەكە بۆ باری ئاسایی خۆی گەڕاوەتەوە .

(٢) قاپێكی پڕ لە ئاو بێنە با دوو لەسەر سێ یەك پڕ بێ ، لەسەر مێزێك دایبنێ ، دابنیشە سەیری بكە و تەركیزی فكرو چاوی بخە سەر ئاوەكە ، دوای ئەوەی مێشكت لە خەیاڵ و داڵغە خاوێن كردۆتەوە ، دەبینێ ئاوەكە دەست بە جووڵەو شەپۆل دان دەكات .

نموونەی موعجیزەیی لەمەدا ( ئاگری ئیبڕاهیم, و شەق كردنی دەریای موسا )یە.

[٣٢٨] الباراسايكولوجي سر من اسرار الدولة / ل : ٢٥ – ٢٧.

**ئیعجازی ( ٧٤ ) ئامادەکردنی ڕوح لە تاقیگەدا :**

**ئیعجازی ( ٧٥ ) زیندووکردنەوەی مردووان لە تاقیگەدا :**

**ئیعجازی ( ٧٦ ) تارمایی یەکان و شەبەحەکان :**

**ئیعجازی ( ٧٧ ) :دیاردەی خۆ بە لەشکردن ( التجسد ) :**

**زۆر کتێبی گرنگ لەسەر ئەم بابەتە گرنگە نووسراوە ، لەوانە کتابی** (الارواح / طنطاوي) و (على حافة العالم الاثيرى / ارثر فندلاي) و (كتاب الروح / الن كاردك) و (رحلة الارواح / د.ميشيل نيوتن) **(انسان ڕوح لا جسد/ د.مهدى عبيد) ، بێگومان تەوەری هەمووو ئایینێکی ئاسمانی لەسەر بڕوابوون بەخواو پێغەمبەرایەتی و ڕۆژی دوایی و ژیانی دوای مەرگ دادەمەزرێت ،** ﴿ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَبِٱلْـَٔاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥﴾ ﴾ البقرة: ٣ ــ ٥ .

**بەڵگەی قورئانی زۆرە لەسەر نەمری و مانەوەی ڕوح و ژیانی پاش مەرگ :** ﴿ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى ﴾ الإسراء: ٨٥ ، ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾ آل عمران: ١٦٩ **، واتە : وا مەزانن ئەوانەی لە پێناو خوادا کوژراون مردووون ، بەڵکو ئەوانە لای پەروەردگاریان زیندوون و ڕۆزی وەردەگرن.**

**ڕوحەکان جۆریان زۆرە وەکو (ڕوحی زیندووان ، ڕوحی مردووان ، جنۆکەکان ، فریشتەکان) ، بەپلە دەبنە سێ بەش : (ڕوحی باڵا ، ڕوحی ناوەڕاست ، ڕوحی پەست**

و نـزم) ، لـه سـورەتی (الواقعـة)دا بـه (اصـحاب المقـربين ، اصـحاب اليمـين ، اصحاب الشمال) ناسراون .

**له قورئاندا چەندان بەڵگەی زانستی و لۆژیکی باسکراون لەسەر بـەردەوامی ژیـان لـه دوای مەرگـداو بـوونی جیهـانی نادیـارو بەهەشـت و دۆزەخ و عـەرش و کورسـی و فریشتەکان و روحه پاکەکان و ڕوحه چەپەڵەکان ، وەکوو :**

**(١)له خەونەکاندا دیداری ڕوحەکان دەکەین :** (القرطبي) **له** (تفسير)**ی خۆیداو** (ابن القيم) **له (الروح)دا بەسەر ئایەتی :** ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ ٱلَّتِي قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَـَٔايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ ﴾ **الزمر: ٤٢ .**

**(ابن عباس) و (سعيد بن جبير) دەڵێن :( گەر مرۆڤ نوست ڕوحەکەی سەردانی ڕوحی مـردوووان دەکـات ، دوایـی ڕوحـەکانی زینـدوووان بـۆ نـاو لاشـه دەگەڕێتـەوەو ڕوحـی مردوووان دەگرێت لەلای خۆیان دەهێڵێتەوە.**

**کەواتـه : (نووسـتن) و بینینـی خەونـەکان دیـارترین بەڵگەیـه لەسـەر بـوونی ڕوح و بـەردەوامی ژیـانی دوای مـەرگ ، پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی :** (ان الـروح ليلقـى الروح) رواه النسائي **واته: ڕوح دیداری ڕوح دەکات، خەونەکان سێ بەشن : ئیلهامی خـوایی ، داڵغـەو خـەیاڵ ، ئیلـهامی شـەیتانی :** (الرؤيـا ثلاثـة : فبشـرى مـن الله ، وحديث النفس ، وتخويف من الشيطان) رواه الترمذي.

**خەونی خوایی ئەو خەونانەن دیداری پێغەمبەران و ڕوحه پاکەکان و فریشتەکانیان تێدایە، خەونی شەیتانی ئەو خەونانەن ڕوحی پیس بەشداری تێ دا دەکات ، خـەونی داڵغه ئەو خەونانـەن مـرۆڤ ڕۆژانـه بیریـان لێ دەکاتـەوەو شـەوانه (نەسـت) دروسـتیان دەکات ، لەڕابردوودا زیاتر باسی خەونەکانمان کردووه بۆ ئەوێ بگەڕێوە.**

(٢)موعجیزەی پێغەمبەران و صدیقینەکان کە مردوویان لە تاقیگەدا زیندوو کردۆتەوە ، یان ڕوحیان ئامادە کردووە ، نمونە :

١- ئیبراهیم (علیه السلام) داوای لە خوای گەورە کرد زیندووکردنەوەی مردووانی لە تاقیگەدا پیشان بدات ، تا برواکەی بگاتە ئاستی دڵنیایی و یەقین ، کە لوتکەی بروایە : ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِى كَيْفَ تُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن ۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِى ۖ قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ ٱلطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ ٱجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ٱدْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا ۚ وَٱعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦٠﴾ ﴾ البقرة: ٢٦٠ .

خوای گەورە فەرمانی پێ دەکات تاقی کردنەوە لەسەر باڵندە بکات وەکو چۆن لە (دەروونزانی نوێ)دا یان لە زانستی ڕوحی نوێ تاقی کردنەوە لەسەر ئاژەڵان دەکرێ ، بچێ پارچە پارچە یان بکات و دوایی هەر پارچەیە لەسەر شوێنەکی بەرز دابنێ ، دوایی بانگیان بکات ، گورج بەزیندوویی بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە .

(٢)موسی (علیه السلام) وەکو لە بەسەرهاتی مانگا زەردەی کوڕانی بەنی ئیسرائیلیدا هاتووە لە سورەتی (البقرة)دا ، کاتێ موسی (علیه السلام) لەسەر داواکاری کەسووکاری کوژراوێکی ئیسرائیلی داوا لە خوا دەکات بکوژەکەی ئاشکرا بکات ، خودا داوا دەکات مانگایەکی زەرد بکڕن و بیکوژنەوەو بەبەشێکی مانگاکە لە کوژراوەکە بدەن ڕێك زیندوو دەبێتەوە یان ڕوحی ئامادە دەبێ و ناوی بکوژەکەی ئاشکرا دەکات : ﴿ فَقُلْنَا ٱضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا ۚ كَذَٰلِكَ يُحْىِ ٱللَّهُ ٱلْمَوْتَىٰ وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٧٣﴾ ﴾ البقرة: ٧٣ .

(شێخ طنطاوی الجواهري) ئاماژە دەکات لە مانگی ئابی (١٨٨٢)دا سێ کەس لەشاری (ح) دادەنیشن لەسەر مێزی ئامادەکردنی ڕوحەکاندا بۆ قسە کردن لەگەڵیاندا ، دوای

جێگیر بوونی دۆخەکە مێزەکە دەست بە جوولّە دەکات ، پیشانی دەدات حەزی لە ئاخاوتنە ، ئەم گفتوگۆیە لەنێوانیان ڕوودەدات :

پ : کێ بوو لە مێزەکەیدا ؟ و: بەرگ درووبەکی کوژراوە .

پ: چۆن کوژرای ؟ و : شەمەندەفەر لێمی داو کوشتمی .

پ: کەی ئەمە بوو ؟ و : بەر لە سێ ساڵ .

پ : لەکام ڕۆژە ؟ و: لە ٢٩/ئاب/١٨٧٩ دا.

پ : ناوت چی یە ؟ و : (سیجوار لیکوبسیك).

پ : لەکوێی ؟ و : لە بارمن .

پ : باوانت ماوە ؟ و : بەڵێ .

پ : تۆ وەستای یان پیشەکاری ؟ و : بەشاگرد بەکرێ کاردەکەم.

پ : تۆ بەختەوەری ؟ و : بەڵێ زۆر .

پ : حەز دەکەی بە باوانت بڵێین ؟ و : نەء.

پ : بۆچی ؟ و : چونکە باوانم بڕوایان بە ژیانی پاش مەرگ نیە .

پ : بەڵکو بڕوا پەیدا بکەن ؟ و : نەء تەنیا گاڵتەیان پێ دێ.

پ: چۆن بوو ڕووداوی کوشتنەکەت؟ و : لە (ئونتربار) ناسراوم هەبو بە ڕێگادا ڕۆیشتم چاوم کز بوو شەمەندەفەرم نەبینی پانی کردمەوە .

پ : چی دەکەی ؟ و : ناتوانم ئەوە باس بکەم .

دوای ئەوەی دانیشتووان ئەم ڕووداوە واقی وڕماندن سۆراغی ڕووداوەکەیان کرد ، لە بەڕێوبەرایەتی شاری (بارمن) ... وەڵامەکەی کت و مت وەکو قسەکانی مردووەکە دەرچوو کە ئامادەکرابوو[329].

٣-یان عیسی (علیه السلام) مردووو زیندووو دەکاتەوە : ﴿ وَأُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾ آل عمران: ٤٩ . واتە : مردووو زیندووو دەکەمەوە بە ویستی پەروەردگارم .

٤-دیسان یەکێ لە موعجیزەکانی پێغەمبەری ئێمە ﷺ زیندووو کردنەوەی مردووان و قسە کردن بووە لەگەڵ مردووواندا ، خەونەکانی ئێمەش ئەم ڕاستییانە دەسەلمێنن ، (السیوطي) لە (الحاوي)دا و (ابن شاهین) لە (ناسخ الحدیث ومنسوخه)دا گێڕاویانەوە ، کە خودا دایك و باوکی پێغەمبەر ﷺ زیندووو دەکاتەوە بڕوای پێ دێنن : (سألت ربي –عزوجل- فأحیا لي فامنت بي ثم ردها) ، (النووی) دەڵێ : دوور نیە ئەم فەرموودەیە ڕاست بێ کە پێغەمبەر ﷺ داوای کردووە باوانی بۆ زیندووو بکاتەوە و بڕوایان هێنابێ ، پێغەمبەر ﷺ ئاستی لەوە بەرزترەو لای خوا هیچ شتێ دژوار نییە)[330].

دیسان لە فەرموودەی (متفق علیه) دا هاتووە پێغەمبەر ﷺ قسە لەگەڵ کوژراوانی بەدردا دەکات ، کاتێ هاوەڵەکان دەڵێن بۆ ئەوان گوێیان لێیە؟ فەرمووی : (والذي نفسي بیده ما انتم با سمع منهم) متفق علیه ، واتە : سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئێوە لە ئەوان چاکتر نابیستن.

بێگومان مردووان گوێیان لە تەپەی پێی ئەو کەسانەیە جەنازەی ئەویان هێناوە : (ان المیت یسمع قرع نعالهم اذا ولوا منصرفین) رواه البخاري.

---

[329] کتاب الارواح / العلامة طنطاوي جواهر / ل:٣١-٣٢. بەکورت کردنەوە .

[330] الحاوي للفتاوی / السیوطي / ل:٦١٤.

مردووان گوێیان لەسەلامی زیندووانە : (ابن عبدالبر) بە (اسناد صحیح) گێڕاویەوە وەکو لە (التمهید) و (الروح / ابن القیم) دا هاتووە : (ما من مسلم یمر علی قبر اخیە کان یعرفە في الدونیا فیسلم علیە الارد الله علیە روحە حتی یرد علیە السلام) ، واتە : هەر موسڵمانێ بەگۆڕێ دا ڕەت دەبێ و دەیناسێ و سەلامی لێ دەکات خوا ڕوحی دەگێڕێتەوە تا وەڵامی سەلامی دەستێنێتەوە .

(بەیهەقی) لە (سعید بن مسیب) گێڕاویەوە : لەگەڵ ئیمامی عەلی دا (رضي الله عنە) چووینە گۆڕستانێ و بانگی گۆڕستانی کرد : ( یا أهل القبور السلام علیکم ورحمة الله وبرکاتە خبروونا باخبارکم ، ام نخبرکم ؟ فسمعنا صوتا و علیك السلام ورحمة الله وبرکاتە یا امیر المؤمنین خبرنا عما کان بعدنا ...) ، واتە : سەلام و بەرەکەتی خواتان لێ بێ ئەی خەڵکی گۆڕستان ، ئایا ئێوە هەواڵی لای خۆتان باس دەکەن یا ئێمە باسی بکەین ؟ گوێ بیستی دەنگێ بوم وتی : ئەی میری بڕواداران هەواڵمان بدەیێ دوای ئێمە چی قەرماوە ... ٣٣١.

٥- (ئیلهام) و کەشف و شهودی عاریفان و خەونەکانی ئێمە بەڵگەن لەسەر بەردەوامی ژیانی دوای مەرگ ، دەتوانین بە نوێژی (الحاجة) پەیوەندی ڕوحی ئەنجام بدەین،چۆنیەتی ئەنجامدانی نوێژەکە :

(١) نیەتم وایە نوێژی (الحاجة) دەکەم دوو ڕکعەت بە سوننەت بۆ بەخزمەت گەیشتنی پێغەمبەر ﷺ یان بۆ بینینی هەر ڕوحێ یان داواکردنی هەر مەسەلەیێکی تر.

(٢) با نوێژەکە بەر لە نووستن بێت.

(٣) مێشکت پاکژبکەوەو نوێژەکەت بابێ داڵغە بێ و قسە مەکە لەدوای نوێژەکەدا ، بەخەیاڵی بابەتەکەوە بخەوە : (فنادتە الملائکة وهو قائم یصلي في المحراب).

---

[٣٣١] حجة الله علی الالعالمین ، یوسف النبهاني / ل:٦١٣.

**(٤) زۆر یاد بکەو سەلأوات بخوێنە :**

**(د.میلان ریزل) دەنووسێ : (با ئێستا رو لە نوێژ بکەین ، کە دەتوانرێ پێی بگوترێ ئامادەکردنی ڕوحەکان و دەتوانرێ هەمان ناوی پێ بگوترێ ، بەلأم جیاوازی یان ئەوەیە ئێمە دەمانەوێ پەیوەندی بەڕوحی چاکەوە بکەین**[٣٣٢] **.**

**(باشترین و سادەترین ڕێگا بۆ ڕامان ئەنجامدانیەتی لە شەواندا بەر لە چوونە سەر جێگا ، با دەفتەرو قەڵەمێکت پێ بێ بۆ نوسینی تێبینی یەکان لەکاتی شەودا . لەکاتی چاوەڕوانی نووستندا پرسیارێ بکە یان نوێژ بکە بۆ وەلأم دانەوە ، هەوڵ بدە بخەوی و پرسیارەکەت با لەمێشکت دابێ ، هیوا بخوازە خەونێ ببینی یارمەتی تۆ بدات بۆ چارەکردنی کێشەکەت)**[٣٣٣] **.**

**(د.**علی الوردي**) دەنووسێ : دەتوانین بڵێین ئوممەتی ئیسلامی لە هەمووو ئوممەتێ پتر گرنگی یان بە خەون داوەو پیرۆزیان ڕاگرتووە ، تەنیا موعتەزیلەکان و هەندێ لە زانایانی کەلام نەبێت.**

**لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە خەونی ڕاست بەشێکە لەسروشی خوا ، ناودارترین فەرمووده لەم بارەوە ئەم دوانەن : (خەونی ڕاست بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی) سەحابەکان نیگەران بون لەرەکە دوای ئەو سروش دوایی دێ ، بەلأم فەرمووی : (**ذهبت النبوة وبقيت المبشرات**)**[٣٣٤]**. ئارانی کردونەوە وەك ڕابردوو باسکراوە ، شایانی باسە گەیلانی (رحمە الله) فەرموویەتی وشەی (**الصلاة**) واتە : نوێژ لە وشەی (**الصلة**)ەوە وەرگیراوە ، واتە : (پەیوەندی گرتن) . مەبەست پەیوەندی گرتنە بە ڕوحەکان و کردگاری مەزنەوە.**

---

[٣٣٢] تدريب الادراك الحسي الفائق / ل:٨٥.

[٣٣٣] تدريب الادراك الحسي الفائق / ل: ٩٢.

[٣٣٤] الاحلام / ل:٣٧.

(ابن خلدون) دەڵێ : (گەر مرۆڤ بەر لە نووستن لەدەروووندا باش خۆی ئامادە بکات لە پێناو بیرۆکەیێکی دیاری کراودا ، ئەو بیرۆکەیە لە خەوندا دەبینێ و سوودی لێ دەبینێت)[335] .

(ابن القيم الجوزية) دەنووسێ : خەون سێ بەشە (خەونی خوایی ، خەونی شەیتانی ، خەونی دالغە).

خەونی ڕاست چەند بەشێکە :

(١) خەون هەیە قسەو ئیلهامی خوایە لە خەوندا لەگەڵ بەندەی دا ڕای دەگەیێنێ ، وەکوو (عبادة بن الصامت) و کەسانی تر باسیان کردووە .

(٢) خەون هەیە فریشتەی خەونان دروستی دەکەن .

(٣) خەون هەیە قسە کردن و ژوانە لەگەڵ مردووواندا ...[336] .

(ئالن کاردك) دەنووسێ : (ڕوحەکان بەردەوام کار دەکەنە سەر ژیانی ڕەوشتی و ژیانی ماددی و سەر خودی ماددەو بیرەکان).

(پەیوەندی ڕوحەکان لەگەڵ مرۆڤدا بەردەوامە ، ڕوحە باشەکان بەرەو چاکەمان ڕێنوما دەکەن ، لە ئەزموونی ژیانماندا بەهێزمان دەکەن و یارمەتیمان دەدەن بە ئازایانە بەرگەی بگرین ، بەلام ڕوحی چەپەڵ بۆ خراپەمان گومڕا دەکەن ، لەکاتی سەرگەردانیمان چێژ وەردەگرن).

گفتوگۆی ئەڕواح لەگەڵ مرۆڤدا ئاشکرایە یان وەسوەسەو شاراوەیە ، گفتوگۆی نادیار بەهۆی کاریگەری چاك یان خراپ دەبێ بۆ سەرمان بێ ئەوەی بزانین ، دەبێ لێکیان

---

[٣٣٥] الاحلام / ل:٤٩.

[٣٣٦] الروح / ل:٥٢.

جیا بکەینەوە ، بەلآم گفتوگۆی خراپ بەهۆی نوسین و قسەو دەرکەوتنی ماددی تر دەبێ ، لە ڕێگای ئەو ناوەندانەوە دەبێ ئامرازی ڕوحی پێك دێنن[٣٣٧] .

قورئـــــان فەرموویــــــەتی:﴿ ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ۝٥ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ۝٦ ﴾الناس ٥ ــ ٦ .

لێرەدا (وەسوەسە) ئاماژە بۆ فریودانی ڕوحی چەپەڵە بۆمان لە ڕێگای ئاخاوتنی شاراوەوە لە جنۆکەو مرۆڤەکان .

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ ﴾ فصلت: ٣٠ ، مەبەست لە ڕێنومایی ڕوحی پاکە بۆمان .

(ئالن کاردك) دەڵێ : ڕوحەکان لە تواناو زیرەکی دا وەکو یەك نین ، نە لە زیرەکی و ڕەوشتدا ، ڕوحی پلە یەکەم ڕوحە بەرزەکانن کە بە کەماڵ و زاناو نزیکی لەبارەگای خوا جیا دەکرێنەوە ، دیسان ویستنی چاکەو بەرزی ویستیان ، ئەوانە فریشتەکانن واتە ڕوحی پاکژ ، پلەکانی تر وردە وردە لەخوار کەماڵەوەن و دور دەکەونەوە ، ڕوحی پیس زۆربەی ئارەزووەکانمان هەڵدەگرن لە کینەو حەسادەت و فیزو هەوا ، بە خراپە شادمان دەبن[٣٣٨].

دەڵێ : (دوای ئەوەی ڕوح لاشە بەجێ دێڵێ بۆ دونیای ڕوحی دەگەڕێتەوە ، کە لەوێوە هاتووەو لەدونیای ماددی دا بونەکی تازەی دەست پێ دەکات ، ماوەیەکی زۆر یان کەم لەدونیای ڕوحی دا دەمێنێتەوەو گەڕۆکە ، بەو پێ یەی ڕوح چەند جاران خۆی بە

[٣٣٧] کتاب الارواح / الن کاردك / ل:٢٩.
[٣٣٨] کتاب الارواح / ل: ٢٧.

لەش دەکات (نجسد) ئێمە هەمووومان چەند ژیانەکی ترمان بەسەر بردووەو لە ئاستی جیا جیادا لە پێشکەوتندا دەژین ، لەسەر زەوی دایان لە جیهانی تردا)[339].

(کاتێ ڕوح دەگەڕێتەوە بۆ دونیای ڕوحی بە هەمووو ئەوانە شاد دەبێتەوە لە زەویدا ناسیونی ، ژیانی ڕابردووی دێتەوە یادو چاکەو خراپی بیر دەکەوێتەوە )

قورئـانیش فەرموویـەتی : ﴿ يَوْمَ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَـٰنُ مَا سَعَىٰ ﴿٣٥﴾ وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ ﴿٣٦﴾ فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴿٣٧﴾ وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٣٨﴾ فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٤١﴾ ﴾ النازعـات: ٣٥ – ٤١ ، واتـه : ڕۆژێکە مرۆڤ چی کردووە یادی دەکەوێتەوە دۆزەخ دەرئەخرێ بۆ کەسێ ببینێ ، کێ یاخی بوو بێ و فەرمانی خودای جێبەجێ نەکردبێ، ژیانی دونیا و ڕابواردنی هەڵبژاردبێ لە ژیانی دوای زیندووکردنەوە دۆزەخ شوێنیەتی، هەرکەسێکیش لە گەورەیی وپەروەردگاری ترسابێ و دەروونی لە هەواو ئاوە زوەکان پاکژ کردبێتەوە ، ئەوە بەهەشت جێگایەتی .

گەیلانی فەرموویەتی : (گەر من وەفاتم کرد ئەی ڕۆڵە تۆ من دەبینی دەمناسی دەربارەی و چەپدا) –سوپاس بۆ خوا لە خەوندا چەند جارێ بە خزمەتی گەیشتوم و زیارەتم کردووە- .

پەیوەندی کردن بە ڕوحەکانەوە لە ڕێگای سۆفیگەری و تەریقەتەوە لە ئیسلامدا و (خۆ ڕاهێنان)

(١) (حجە الاسلام الغزالی) باسی ئەهلی تەریقەت دەکات کە ئەوانە هەمووو جووڵەو ئارامی یەکیان لەدەرەوەو ناوەوەدا لە ڕووناکی پێغەمبەرایەتی

[339] کتاب الارواح / ل: ٢٧.

وەردەگرن ، لەدوای ڕووناکی پێغەمبەرایەتی ڕووناکی یەك نییە ڕووناکی لێ وەربگرن.

یەکەم مەرج بۆ پاك بوونەوە دەڵێن : پاکژ کردنەوەی دڵەوە هەمووو شتێ جگە لە خوا ، ئەمە یەکەم مەرجە ، کلیلەی بەردەوامی ئێوەیە ، بۆ دەست کردن بە نوێژ ڕۆچواندنی دڵە بە تەواوی لە یادی خوا ، دوا یەکەی فەنابوون و هەڵوەشانە بە تەواوی لەیادی خوادا ، سەردتای تەریقەت بە موشا هەدەو موکاشەفە دەست پێ دەکات ، تا لە بێداری دا فریشتەکان دەبینن لەگەڵ ڕوحی پێغەمبەراندا ، گوێیان لەوتەی ئەوان دەبێ و سوودیان لێ دەبینن[340] .

بەو پێیە (تەریقەت) باشترین ڕێگایە بۆ ڕاهێنان و وەرزشی ڕوحی و گەشەدان بە ڕوح و پێ هەڵابردنی و پاکژ کردنەوەی سینەو تەرکیزی فکری و چونە ناو (نەست)ەوە بۆ پەیوەندی کردن بە دونیای ڕوحی یەوەو بینینی گەردوونی نا دیارو نواندنی کاری نائاسایی لە تاقیگەدا ، لەلای (غەزالی) بە بێ بونی مورشید ئەم بەهرەیە بەدەست دێت، واتە : بە پاکژ کردنەوەی دڵ بەیادی خواو ڕۆچون لە نوێژدا .

(٢) (قطب الاولياء سيد عبدالقادر الكيلانی)ە -قدس سره- فەرموویەتی : (ابو القاسم الجنيد) دەفەرمووێ : من قسەم نەکرد تا هەر چل ئەبدال شاهیدییان بۆ دام ، لەوانە سەری سەقەگی ، بە قسەی ئەوانم نەکرد تا پێغەمبەرم (ﷺ) بینی فەرمووی : ئامۆژگاری خەڵکی بکە ، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە قسە بکەیت)[341] .

(ابو القاسم الجندي) فەرموویەتی : (الصوفي) لە وشەی (الصفا) وە هاتووە ، کە خۆی لەخودی خۆی پاکژ کردۆتەوەو دڵی بۆتە بالوێز لەنێوان خۆی و پەروەردگاری

---

[340] المنقذس الضلال / ل: ٥٠.

[341] الفتح الرباني / ل: ٢٧١.

مەزنیدا ، صۆفی نابێ بە صۆفی تا پێغەمبەر ﷺ لە خەوندا نەبینێ فەرمانی پێ نەکات و ڕێگای نەدات"[342].

گەیلانی دەفەرمووێ : (ئەی لاو دڵت پاکژ بکەوە بە خۆراکی حەلاڵ ئەوە خوای مەزنت ناسیوە ، پارو و پۆشاك و دڵت خاوێن بکەوە ئەوە دەبی بەبێ گەرد (صافي) ، وشەی (التصوف) لە وشەی (الصفا)وە هاتووە ، نەك پۆشینی خوری (صوف) ، صۆفی ڕاستگۆ ئەوەیە دڵی خۆی تەنیا خوای گەورەی تێدا دەهێڵێتەوە ، ئەمەش بەگۆڕینی جل و ڕووخسار و زەرد هەڵگەران و گێڕانەوەی بەسەرهاتی پیاوچاکان و جولاندنی پەنجە بە (سبحان الله) و (لا الە الا الله) بە دەست نایێ ، بەڵکو بەوە بەدەست دێ ڕاست گۆ بی لە داواکردنی حەقداو زوهد لە دونیاداو دەرهاویشتنی هەمووو شتێ لەدڵدا ، جگە لە خوای گەورە نەبێت)[343].

لە تەریقەتی قادری دەروێش و لە نەقشیدا دەبێ صۆفی یان مرید لە ڕێگای شێخی مورشیدی تەواو و کامڵ ببێ بە قوتابی ڕێگای عیرفان ، بەلام لای غەزالی ئەگەر (مرید) لەسەر ڕێگای غەزالی ڕاهێنان بکات و بەردەوام بێ لەسەر زیکرو خلوەو گۆشەگیری و کەم خۆراکی و کەم نووستن و بەتەواوی ڕووی کردە خوای گەورە لە ڕێگای پێغەمبەرەوە ﷺ یەکەمجار ڕێگای خەونانی بۆ دەکاتەوە ، فەرمانی بەهەندێ کاری باش پێ دەکرێ لەزیکرو شتی ترو زیکر بە تەسبیحەوە .

(جونەید) لە ئاخری ژیانی تەسبیحی هەڵگرت ، لێیان پرسی بۆچی ؟ وتی : هەر شتێ ئێمەی بەخوا گەیاندبێ قەت وازی لێ ناهێنین.[344]

گەیلانی وەکو (ثامر عبدالحسن العامري) لە (موسوعة العشائر العراقية / ج٦/ل: ١٤٧)دا باس دەکات کە ئەو خەڵکی (پشدەر) بووە دەفەرمووێ : (گەر دڵ ڕاست بوو

---

[342] الفتح الرباني / ل: ٢٤٠.
[343] الفتح الرباني / ل: ٩٩.
[344] لەسەر نووسینی (محمد محمد جابر/ المنقذ من الضلال / ل:٨٦.

**نزیکترین شت دەبێ لەخوای گەورە ،گەر دڵ کار بە قورئان و سوننەت بکات نزیك دەبێتەوە ، گەر نزیك بۆوە چی هەیەو لەسەریەتی دەیبینێ و دەیزانێ ، ئەوە دەزانێ خوا چی هەیەو غەیری ئەو چی هەیە ، حەق چی هەیەو بەتاڵ چی هەیە ، گەر بڕوادار بە ڕووناکی پەروەردگاری ببینێ ئەی صدیقینەکان و نزیکەکان چۆن ئەو بەهرەیان نابێ ، پێغەمبەر ﷺ لە هۆشیاری سەیرکردنی بڕوادار دا هەیە چونکە بە ڕووناکی خوا دەبینێ** : (اتقوا فراسة المؤمن فانه ينظر بنور الله) رواه الترمذي.

**دیسان عاریفی نزیکی بارەگای خوا ڕووناکی پێ دەدرێ نزیکی خۆی لەخوای گەورەو نزیکی خوای لەدڵی دەبینێ ، ڕوحی فریشتەکان و پێغەمبەران و صددیقینەکان و ڕوحیان دەبینێ ، ئەحواڵ و پلەیان دەبینێ ، هەمووو ئەوانە بەدڵ و پاکژی ڕوحەکەی ، ئەو هەمیشە بەشادی لەگەڵ پەروەردگاری گەورەی دایە ، ئەو ناوەندێکە لە کردگاری وەردەگرێ و بەسەر خەڵکی دا پەخشی دەکات**[345].

**شێخی بەسڕی فەرموویەتی : (گەر پیاوانی خوا ببینن دەڵێن : شێتن ، گەر ئەوانە سەیری ئێوە بکەن دەڵێن ئەوانە قەت بڕوایان بەچاکی نەهێناوە ، (خلوە کردنەکەت نا دروستە) ، چونکە خلوە کێشان (گۆشەگیری) بریتییە لە کۆکردنەوەی هزر لەسەر خوای شکۆدارو نەبێ نایهێڵێتەوە، ئەمە ئەم شەقامەیە پێغەمبەران و ڕەوانە کراوان و ئەولیایان لەسەری بوون**[346].

**بڕوادار ئەو کەسەیە کۆچی بە خۆی کردووە ، یاوەری مورشیدەکەی دەکات پەروەردەی دەکات و فێری دەکات ، هەر لە منداڵی یەوە لەفێرکردندایە تا دەمرێ لە یەکەم حاڵی دا)**[347].

[345] الفتح الرباني / ل:١٩٨.
[346] الفتح الرباني / ل: ١٨١.
[347] الفتح الرباني / ل: ١٨١.

گەیلانی جیاوازی نێوان موعجیزەی پێغەمبەران و صدیقین و نێوان کەرامەتی ئەولیا دەکات ، هەروەها ئاستەکانی بڕوا جیادەکاتەوە : (گەر بەندە پلە بە پلە ئیسلامی بڕی و بەرەو ئیمان گواستییەوە ، لە ئیمانەوە بۆ یەقین ، لە یەقینەوە بۆ زانین ، لە زانینەوە بۆ زانست ، لە زانستەوە بۆ خۆشەویستی ، لە خۆشەویستی بۆ ئەوینداری ، ئەوکاتە گەر بێ ئاگا بوو هۆشیار دەکرێتەوە ، گەر پشتی کردەوە ڕووی تێ دەکرێ ، گەر بێ دەنگ بوو قسەی لەگەڵدا دەکرێ ، هەمیشە هۆشیارو ساف دەبێ ، چونکە قاپی ڕوون بۆتەوە ، لەدەرەوە ناوەوەی دەبینێ ، ئەو بێدارییە لە پێغەمبەرەکەی ﷺ بەمیرات دەگرێت ، چاوەکانی دەخەون و دڵی بە ئاگایە ، دواوەی خۆی دەبینێ چۆن پێش خۆی دەبینێ، دەتوانێ خۆی لە قەرەی پێغەمبەر ﷺبدات لە سیفەتەکانی ئەودا بەشداری بکات ، بەڵام (ئەبدال) و (ئەولیا)ی ئوممەتی ئەو پاشماوەی خۆراك و خواردنەوەی ئەو دەچنە سەر ، دڵۆپێك لەدەریای مەقامی ئەو بەدەست دێنن ، گەردێ لەچیای کەرامەتی ئەو یان دەست دەکەوێن ، چونکە دەستیان بە ئایینی ئەوە گرتووە ، ئایینی ئەو سەر دەخەن ، شەرح و زانستی ئەو بڵاودەکەنەوە تا پەسڵان (قیامەت) سەڵات و سەلام لەخۆی و میراتگرانی بێت[348].

بێگومان گەر کەرامەتی ئەولیا دڵۆپێك بێ لە ئۆقیانوسی کەرامەتی پێغەمبەرایەتی ، ئەوە بەشێکی زۆر کەمتر دەست زانایانی ڕوحانی دەکەوێ تا لە تاقیگەدا موعجیزەو کەرامەتی ئەولیایان بسەلمێنن بە مەبەستی بینینی حەقیقەتەکان و ڕێنومابون بۆ ڕێگای ئیسلام.

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾ فصلت: ٥٣ .

## گەواهی زانایانی خۆرئاواو زانستی ڕوحی نوێ بۆ پەیوەندی کردن بە ڕوحەکانەوە :

---

[348] الفتح الرباني / ل: ١٤٧.

گەر بڕوانینە کتێبی (الروح والخلود / عبدالعزیز جادو) گەواهی چەند زانای جیهانی و بیر تیژی گەورەی تێدا دەخوێنینەوە لەسەر ڕاستی ئامادەکردنی ڕوحەکان لە تاقیگەدا ، کە دەیسەلمێنێ ڕوح بوونی هەیەو ژیان لە پاش مەرگ بەردەوامە ، وەکوو لە نامە ئاسمانییەکاندا باسکراوەوبە موعجیزەو کەرامەت لە تاقیگەدا بینراوە ، ئەمەش بەرهەمێکی تری هیپنۆتیزمەوە .

(روبەرت هیر) مامۆستای کیمیا لە زانکۆی بنسلناین دا دەڵێ : پاش بەدەست هێنانی توانای ناوەندی (مەدیوم) تا ئاستێکی تەواو بۆ ڕاگۆڕینەوە لەگەڵ هاوڕێیە ڕوحەکانمان ، پێویستیم بەوە نییە تۆمەتی ساختەکاری لەناوەندی ڕوحی لا بدەم.

(ئەدیسون) داهێنەری کارەبا دەڵێ : من دەربارەیی دەکۆڵمەوە ، لەو ڕوانگەوە پێشکەوتنی گەورەم بەدەست هێنا ، بەتایبەتی لەو مەسەلانەی پەیوەستن بە ژیانی پاش مەرگ و پەسلان ، من دەڵێم دەبێ ڕوح دوای جیابونەوەی لەلەش دەبێ بژێ ، هەمووو بیرەکانی من بۆ یەك کێشە ئاڕاستە دەبێ ، ئەویش کێشەی ژیانی بەردەوامە لەدوای مەرگ و ئەو ناوچانەیە ڕوحی بەرەو بەرز دەبێتەوەو شێوە وەردەگرێ و سروشتی پەیوەندی چۆنە لەگەڵ ژیانی زەمینی ئێمەدا.

زانای ئینگلیزی (ریچارد هودجسون) دەڵێ : من و مامۆستا (هایسلوپ) بەر لە (١٢) ساڵ لێکۆڵینەوەکانی خۆمان دەست پێ کرد ، هەردووکمان ماتریالستێ بووین و بڕوامان بەڕوح نەبوو ، مەبەست لەم لێکۆڵینەوە لابردنی پەردەی درۆو ساختە بوو ، بەڵام ئیمرۆ بڕوای تەواوم هەیە کە دەتوانرێ ئاخاوتن لەگەڵ ڕوحی مردووواندا بکرێ بەڵگەی ڕاست و حاشا هەڵنەگرم لایە.

(سیر ولیام کروکس) ناودارترین سروشت ناس لەسەدەی ڕابردوودا سەرۆکی کۆمەڵەی زانستی بەریتانی و دۆزەرەوەی کیمیایی و سروشت وەکو توخمی (پالیوم و شوشەی پارێزەر) تیۆری ماددەی تیشکدەرەوە (المشعة) دەڵێ : (من ناڵێم پەیوەندی و تەماس بەستن بە ڕوحەکانەوە دەگونجێ ، بەڵکو دەڵێم : ئەمە بەکرداری ڕوویداوە).

(سروشت ناسی مەزن ، مامۆستای سروشتی ناسی لە زانکۆی (دبلن) و ئەندامی کۆمەڵەی زانستی بەریتانی (سێرولیەم باریت) دەنووسێ : (یەکەم شت : بوونی دونیای ڕوحی سەلماوە ، دووەم ، ژیانی دوای مەرگ ، سێ یەم : توانای پەیوەندی بەستن بە مردووانەوە کە چوونەوە ناو دونیای ڕوحی یەوە ).

(سێر ئولیڤەر لودج) بەڕێوبەری زانکۆی بێرمینگهام ، ئەندامی کۆمەڵەی پادشانشینی ، گەورەترین فیزیکی سەدەی بیستەم) دەنووسێ : (شتێکی لۆژیکی نییە بڕوات وابێ گیان بە مردنی لەش لەناو دەچێ ، بەڵکو پاش مردنمان و کۆتایی هاتنی تەمەنی کورتی زەویمان دەمێینەوە ، بەڵگەی زانستی فراواندا پێوەی هەڵساوم).

(کامی فلا ماریون) گەردوونناسی و دامەزرێنەری دەزگای کۆمەڵناسی فرەنسی ، دەڵێ : (لێرەدا مرۆڤ چەند شتێکی نەناسراوی هەیە سەر بە ڕوحن ، تەزووە ڕوحیەکان دەتوانن هەواکان ببڕن ، ئێمە لە ناوەندی جیهانێکی نادیاردا دەژین ، ئەو پێك هاتە ڕوحیانە دوای مەرگیش دەوام دەکەن ، کە لەش شی بۆتەوە ، تلەپاتی (الفراسة – التخاطر) لە نێوان مردووان و زیندووواندا هەیە ، چۆن لەنێوان زیندووواندا هەیە).

(شارل ریشیە) (مامۆستای فسیۆلۆجی کۆلێژی پزیشکی زانکۆی پارس ، کە بەخشندەی نۆبڵ لە فسیۆلۆجیادا وەردەگرێ لە ساڵی (١٩١٣) دا دەنووسێ : (دەتوانرێ بەهۆی توانایەك بە دیداری ڕوح شاد ببین و ئەو ڕاستی یانەمان بۆ ئاشکرا بکات کەبینین و بیستن و بەرکەوتن ناتوانن پیشانی یان بدەن).

(ڕاڤەی ڕوحی بە تەنیا دەتوانێ هەمووو ئەو ئاکامانە ڕوون بکاتەوە کە ئەم توێژینەوانە ئەنجامیان داوە)[٣٤٩].

---

[٣٤٩] مع القرآن في العالمه الرحيب / د.عماد الدين خليل / ل:٦٥-٦٨.

سەدان زانای تری ناوداری خۆرئاوایی گەواهی لەسەر ئەم ڕاستییانە دەدەن و کەدەرنجامی تاقی کردنەوەکانیانە لەسەر ڕوح و دونیای ئەتیر ، لەسایەی هیپنۆتیزم دا .

(د.میشیل نیوتن) لە کتێبەکەیدا (رحلة الارواح)دا شاهیدی کەسێك تۆمار دەکات کە لە حاڵەتی خەواندنی موگناتیسی (هیپنۆتیزم)دا دەڵێ : (ئای ، ئەی خوایە ئەوە منم ، بەڕاستی من نەمردوم ، ئەی وانییە ؟ مەبەستم وایە لەشم مردووە کەچی من بەرز دەبمەوە ، لەشم لەسەر قەرەوێڵەی نەخۆشخانە کەوتووە ، هەمووو ئەوانەی لە دەوری منن پێیان وایە مردووم ، بەڵام نەمردووم ، حەزدەکەم هاوار بکەم ، ها ئەوەتا من زیندووم و نەمردووم ، ئەمە ناچێتە عەقڵەوە ، نەخۆشەوانەکان سەرم دادەپۆشن ، ئەوانەی دەیانناسم دەگرین ، پێیان وایە مردووم ، بەڵام زیندووم ، ئەمە سەیرە ، چونکە لەشم بەڕاستی مردووە کەچی من بۆ ئاسمان بەرز دەبمەوەو زیندووم).

ئەم وشانە کەسێك دەیڵێ لەباری خەواندنی موگناتیسی قووڵدایە ، سەر لەنوێ ئەزموونی مردن دەبینێت[350].

## چۆن ڕوحەکان دەتوانن پەیوەندیمان پێوە بکەن ؟ خۆ بەلەشکردن ( التجسد ) چۆن ڕوو دەدات؟

﴿ فَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا ﴾ مریم: ١٧ ، واتە : ڕوحی خۆمان ناردە لای مەریەم خۆی بەلەش کرد لە شێوەی مرۆڤێکی تەواودا.

[350] رحلة الارواح / ت: احمد رمو / ل: ١٢.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : : (من رانی فقد رانی فان الشیطان لن یتمثل بی) رواه البخاري ، واتە : كێ من لە خەونـدا ببینێ ئەوە منم ، شەیتان ناتوانێ خۆبخاتە سەر شێوەی من.

لێرەدا دەردەكەوێ ڕوحی مردووان و ڕوحی پاك و ڕوحی چەپەڵ دەتوانن خۆیان بە لەش بكەن ، تا ئێمە بتوانین پەیوەندییان پێوە بكەین و ئەوانیش بتوانن پەیوەندی بە ئێمەوە بكەن لەباری خەون و هیپنۆتیزمدا ، واتە : نووستنی دەستكرد.

(بۆل جیبیە) قوتابی (باستۆر و بەڕێوبەری پەیمانگای باستور لە نیویۆرك) دەڵێ : (خۆ بەلەش كردن (التجسد – التمثل) بەهۆی ئەو ڕوحانە ڕوودەدات لە ڕێگای ئەو هێزەوە كار دەكەن لەناوەندەكان (الوسطاء) وەری دەگرن ، لای زانایان ئەوە سەلماوە ، كە چاویان بەو نیشانە دەكیانە كەوتووە لە تەك ناوەند (خەوێنراو)دا )[351].

(ج.ئارتەر فندلای) سەرۆكی كۆمەڵەی ڕوحانی بەریتانی و دوای لێكۆڵینەوە بڕوا بە پێغەمبەری ئیسلام دێنێ و لەنامەیەكی دا بۆ (فهمي ابو الخیر) وەرگێری كتێبی (علی حافة العالم الاثیري)دا دەنووسێت : (تەواوی ئایینەكان بنەمایێكی ڕوحیان هەیە ، من بە گرنگی یەوە هەمووو ئەو شتانەم خوێندووەوە تۆ لەبارەی ئیسلامەوە نوسی بوت ، من پێم وایە (محمد - ﷺ-) وەكو عیسا (علیه السلام) پیاوێكی ڕوحانی بووە كە ئیمرۆ پێیان دەگوترێ ناوەندی بالاً (الوسیط الراقي)[352].

لە پەیوەندییەكی ڕوحی نێوان ئارتەر فندلای و ڕوحێكدا لە ژووری ئامادەكردنی ڕوحەكاندا لە ڕێگای ناوەندێكەوە (ئارتەر فندلای) چەند پرسیارێ لەم بارەوە لەم ڕوحە ئامادەبووە دەكات كە ڕافەی ئەم ئایەت و فەرموودەی ڕابردوو دەكەن دەربارەی (التمثل)دا واتە : (خۆ بەلەش كردن –التجسد-)دا :

---

[351] رحلة الارواح / ت: احمد رمو / ل: ٦٨.

[352] علی حافة العالم الاثیري / ج. ارثر فندلاي ، ت.فهمي ابو الخیر / ل:١٣.

-ئێواره باش (مستر فندلای) ،

وەڵام : ئێوارەت باش ئەی (گرینتری).

پ: من خۆشحاڵم ئیمشەو ئامادەبووی ، دەمەوێ بۆم باس بکەی جیاوازی نێوان نووستن و دۆخی نەست (الغیبوبة) چی یە؟

و: نووستنی ئاسایی ، ئەو نووستنەیە لەشی فیزیای پێویستی پێیە ، تەواوی لەش خەوتووە لەدڵ نەبێ و لێ دەدات ، ئەمە نووستنی ئاسایی یە ، کەمێ ڕوح لەش بەجێ دەهێڵێ ، بەڵام لەکاتی نەست و هیپنۆتیزم (الغیبوبة)دا ئێمە ڕوح ڕادەکێشینە لایێک ، بەڵام پەتێك لە نێوان ڕوح و لاشەدا هەیە ، گەر ئەو پەتەیە پچرا گورج مردن ڕوودەدات ، ئەم ڕوحە پەیوەست دەمێنێ بە لاشەوە ئێمە لەلەشی دوور دەخەینەوە ، بۆیە بێ هۆش دەبێ و ڕوح لەنێوان لەش و ئێمەدایە.

پاشان پرسیار لەو ڕوحە دەکەن چۆن ئەم دیدارە ڕوودەدات ؟ ئایا کاتێ قسەمان لەگەڵدا دەکەن لەرەکانیان نزم دەکەنەوە؟

وەڵام : بەڵێ : کاتێ ئێمە پەیوەندی دەکەین دۆخی زەوی وەردەگرین .

پ: چۆن لەرەلەرەکانت هێواش دەکەنەوە ؟

و: ڕاڤەی ئەم دۆخە دژوارە ، ئێمە دەتوانین ماددەی (ئۆکتۆپلازم) لە ئێوەو دانیشتووان وەردەگرین ، کاتێ ئەمە ڕووی دا هەست دەکەم لەسەر زەوی نیشتەجێ بووم.

پ: چۆن لەکاتی قسەکردنی ئێمەدا گوێمان لێ دەگرن ؟

و: بــەهێواش کردنــەوەی لــەرەکانمان تــا بتــوانن لــەرەکانی دەنگــی هــەوای ئێــوە وەربگرن[٢٥٣].

ڕابردوو بینیمان بە دەقی ئایەتی : ﴿ اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا ﴾ الزمر: ٤٢ ، واتە : ڕوحەکانی زیندووەوان و مردوووان لەخەونـدا ژوانـی یـەکتری دەکـەن ، وەکـوو لەم ئایەتەدا دەردەکەوێ .

(الحــاکم) گێڕاویــەوە (عوســمــانی کــوڕی عــەففان) بــەیانی هەڵســا لــە خــەو وتــی : (پێغەمبەر ﷺ م لە خەوندا بینـی بـەمنی فـەرمووو (یـا عثمـان افطـر عنـدنـا) واتـە : ئەی عوسمان لای خۆمان ڕۆژو بشکێنە. (خوایان لێ ڕازی بێت).

یان (ام سلمه) گێڕاویەوە وەکو (الحاکم) گێڕاویـەوە : (سلمی) دەڵێ : بەخزمـەت ئـوم سەلمە گەیشتم دەگریا ، وتم : بۆچی دەگری ؟ وتی : پێغەمبەرم ﷺ لەوخەوندا بینی دەگریا ، وتم بۆ دەگری ؟ فەرمووی : ئێستاکە شەهید کردنی حوسێنم بەرچاو کەوت (سەلامی خوایان لێ بێت).

ئیمام عەلی (علیه السلام) لە پێغەمبەری ﷺگێڕاوەتەوە : (ما من عبد الا امتـة ينـام فيمتلىء نوما الايعرج بروحـه الـى العرش ...) رواه الحـاكم والطبرانـى . واتـە : هەر کەسێ بخەوێ بەقووڵی ، ڕوحی بەرەو عەرش بەزر دەبێتەوە .

(الحكيم) لە (نوادر الاصول) دا گێڕاویەوە : (رؤيا المؤمن كلام يكلم به العبد ربـه في المنام) واتە : خەونی بڕوادار ئاخاوتنی نێوان مرۆڤ و خودایەتی .

(النسـائي) لـە (خزيمـة) گێڕاویــەوە پێغەمبــەر ﷺ م لــە خەونــدا بینــی لەســەر ناوچاوانی ئـەو کوڕنوشـم دەبـرد ، کـاتێ بـۆم گێـڕاوە فـەرمووی : (ان الـروح لتلقـي الروح) ، واتە : ڕوح دیداری ڕوح دەکات .

---

[٢٥٣] على حافة العالم الاثيري / ل:١١٧-١١٨.

**(ابن سعد لە (سالم بن عبد) گێڕاویەوە : ئەنصاریٚ گێڕایەوە : لە خوا پاڕامەوە عومەرم پیشان بدات (رضي الله عنه) لە خەوندا ، دوای بیست ساڵ لە خەونمدا بینی ، وتم : ئەی خەلیفەی موسڵمانان چیت کردووە ؟ وتی : (الان فرغت ولولا رحمة ربي لهلكت) .**

**واتە: ئێستا لە هەڵسەنگاندنی کارەکانم تەواو بوون، ئەگەر بەزەیی خودا نەبوایە بە هیلاك دەچووم !**

**(مەیمونی کوردی) گێڕاویەوە : (عروه بن البزار)م لە خەوندا بینی لەدوای مردندا ، وتی : فلاّن کەس ناودێرە درهەمێکی ئەوم قەرزە لەلایە ، لە دەلاّقەیێکی ماڵەوەمدایە بیبە بیدەیە ، کاتیٚ بەیانی بوو بەو ناو دێرەم وت ، ئایا لای عروه پارەت هەیە ؟ وتی : درهەمێك قەرزی لایە ، منیش چوومە ماڵی ئەو درهەمەم دۆزییەوەو بۆم برد !)[354].**

**من برادەرێکی زۆر خۆشەویستم هەبوو بەناوی (احمد) شەنگە لەگوندی چیوەی سەروو لە دۆڵی خۆشناوەتی ، ئەو کوڕە گەنجە لە بڕواو چاکەو سەخاوەت نمونەی کەم بوو ، خۆشەویستی هەموو کەس بوو، بەنەخۆشی هەوکردنی ڕیخۆڵە کوێرەوە وەفاتی کرد ، من ئەوکاتە لە مزگەوتی ئەویٚ (ئیمام و خەتیب) بووم ، لە ڕۆژی تازیەکەیدا ئەو لە خەونمدا پێم وابوو (٥٠) هەزاری منی لایە ، سبەینیٚ برایەکی بەناوی (د.سابیر) بانگی کردم و جیای کردمەوەو وتی : براکەم پیاویٚ (٥٠) هەزاری بۆ تۆ دابوو بە ئەو، لەسەرەمەرگدا لە نەخۆشخانەی رزگاری هەولێر بەمنی وتوە ، کە بیدەمەوە تۆ .**

---

[354] شرح الصدور / السيوطي / ل:٢٥٣.

ئەم نمونانە زۆرەو هەمووو كەسێ كۆمەڵێ خەونی لەو جۆرانەی لایە ، كە دیداری مردووان و زیندووان دەسەلمێنێت ، تا یەقین بە ئێمە بدەن ژیانی دوای مەرگ بەردەوامە ! .

لە فەرموودەدا هاتووە دیداری نێوان مردووان و زیندووان بە خۆبەلەشكردن و هێوش كردنەوەی لەرەی ڕوحەكان دێتەدی ، بۆ خۆ گونجاندن لەگەڵ لەرەی ماددەی دۆخی زەوی دا ، چونكە لەرەكانی دونیای بەرزەخ و زەوی لەیەك ئاستدا نییە وەكو باسكرا .

(ابن عبدالبر) لە (التمهيد) دا بە (اسناد صحيح) گێڕاویەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم ) فەرموویەتی: (ما من مسلم يمر على قبر اخيه كان يعرفه في الدونيا فيسلم عليه الارد الله عليه روحه حتى يرد عليه السلام) ، واتە : هەر موسڵمانێ بە گۆڕی برایەتی ناسراوی خۆیدا ڕەت دەبێ و سەلامی لێ دەكات ، كە لە دونیادا ناسیویەتی ، ڕۆحی بۆ دەگێڕێتەوە تا وەڵامی سەلامی دەداتەوە .

(الارد الله عليه روحه) مەبەست لە گێڕانەوەی ڕوحەكەیە بۆ زەوی تا خۆی لەگەڵ دۆخی زەوی بگونجێنێ بۆ وەڵامدانەوەی سەلام ، بەڵام بۆچی ئێمە گوێمان لێ نابێ ؟ چونكە چڵكی دڵمان بەرایی دەگرێ و ناتوانین بكەوینە دۆخی نەست و سووكە خەو پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم ) فەرموویەتی: (لو لا تمريغ قلوبكم لسمعتم ما اسمع) رواه احمد ، واتە : گەر چڵكی دڵتان نەبوایە من چیم دەبیست ئێوەش دەتان بیست.

**سێ ڕاهێنانی ڕوحی لە تاقیگەی ڕوحی نوێ دا بۆ تەماس گرتن و پەیوەندی بەستن:**

لە كتێبی (الارواح / الشيخ طنطاوي جوهري)دا (٦) ڕێگای نووسیوە بۆ پەیوەندی كردن بە ڕوحەكانەوەو ئامادەكردونیان لە ژووری ئامادەكردندا ، ئێمە سێ ڕێگایان

باس دەکەین بەمەبەستی فێرکردنی خولیایان و قوتابیان و مریدانی ڕێگای عیرفانی ، وەکو ڕابردوو ڕاهێنانەکانی عیرفانی ئیسلامیمان باس کرد ، کە بەپاك کردنەوەی دڵ و نوێژی بە ڕامانەوە و زیکرەکان و خلْوە بە دەست دێت :

ڕێگای یەکەم / خۆت و یارانت لەبەردەم خوانێکی بێ کوچکەدا دادەنیشن ، دەستەکان لەسەر مێزەکە دادەنێن بێ ئەوەی بە توندا دانیشتبن ، هەمووو لایەك دەستەکان پێکەوە دەلکێنن ، چارەکە کاتژمێرێ ئاوا دەمێننەوە ، گەر ئەو کورسییە نەجولاّ سبەینێ دووبارەی دەکەنەوە ، کاتێ کورسییەکە جولاّ ، داوا لە ڕوحی ئامادە بکە ئەو هاوڕێیەتان بۆ ڕەوانە بکات خۆتان دەتانەوێ قسەی لەگەڵدا بکەن ، یان هەر مامۆستایەکی مەبەستتانە ، گەر ئامادەبوو ، لێرەدا چەند ڕێگایەك هەیە لەسەری ڕێك دەکەون ، چونکە وەڵامەکە بە دوو لێدان لە کورسییەکە یان دوو یان سێ ... دەبێ ، یان دەڵێ : وەڵامەکە گەر یەك لێدان (زەربە) بێ ئەوە پیتی ئەلفە ، دوو لێدان (بائە) ... هتد ، یان پیتەکان باس دەکات بە (ابـب ....) ، ئەو پیتانەی لێیان دەدات دەنووسرێنەوە ، پاشان پیتەکان کۆدەکرێنەوەو مانا بەخش دەبن ، بەڵام بۆ سەرەتاکان هەندێ تێکەڵی و شێوان پەیدا دەبێت.

ڕێگای دووەم / خۆتان و یارەکانتان یان خێزانتان دانیشتوون و فنجانێك لەسەر مێزەکە دادەنێن ، لەسەر پەڕەیەکی خاوێن پیتی (هەجاء) دەنووسن لە (أ تاوەکو یا) با پەڕەکە دەوری خوانەکەی دابێ ، فنجانەکە سەرەو خوار بکەنەوە ، پەنجەکان لەسەر بنکەی دابنێن ، تا چارەکێ دەوام دەکات ، گەر مێزەکە یان خوانەکە نەجولاّ شەوی داهاتوو دووبارەی بکەنەوە ، ئاوا هەفتەیێ یان مانگێ تا شەشە مانگ خەریك دەبن ، تۆ هەڵسوڕێنەری خەڵکەکە بە ، هەمووتان لە ڕووحە چاکەکە ڕابمێنن و بیری لێ بکەنەوە ، کە لەو شوێنە ئامادە دەبێت ، گەر ئامادە بوو داوا بکە ناوی بزانیت و فنجانەکە بجولێنێ ، پەنجەکان لەسەری دانراون و بەبەرکەوتن ، پیت پیت ڕوو لە پیتەکان دەکات ، تۆش دەیان نوسی و دەیانخوێنیەوە ، کەتێ یان بگەی و لەجێ ی خۆیان بن.

ڕێگای سێ یەم / ناوەند دەست لەپەڕەیێ دادەنێ و قەڵەمی بەدەستەوەیە ، ڕوحەکە دەسەڵاتی بەسەردا دەگرێ و دەیجوڵێنێ ، ئەمەش پێی دەگوترێ : (نووسینی ئامرازی —الالی-) ، چونکە نووسەر نازانێ چی نووسیوە ، نوسین و نامەی سەیرو نامەیان بە زمانی تر بۆ دێ ، هەروەها وێنەو نەقشی جوان و زانیاری جیاجیان بۆ دێت ، جار هەیە شەبەح و خێو (تارمایی) و ڕووناکی و وێنەی دەستی مرۆڤ بە ڕووناکی دەردەکەوێ ، هەروەها ڕووخساری درەوشاوە ، خەڵکەکە دەڵێن : دەستیان بەر شەبەح و تارمایی کەوتووە ، ئەم ڕێگایە بە (خەواندنی موگناتیسی) نەبێ دروست نابێت[355].

**شەبەحەکان چین؟**

خوا دەفەرموێ﴿ فَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا ﴿١٧﴾ ﴾ مریم: ١٧ ، شەبەحەکان بەر لە هەمووو شتێ دەرکەوتن و بینیان بەڵگەیەکی ترە لەسەر شێوە ژیانی تر لە دەرەوەی بازنەی ماددی دا ، بەڵگەیەکە لەسەر بەردەوامی ژیان لەدوای مردندا ، لەسەر شەبەحەکان و دەرکەوتنیان زۆر نووسراو هەیە ، دەیان و سەدان ڕووداوی واقیعیان تۆمار کردووە ، لەوانە کتێبی (العالم الارواح والاشباح) کە ئێمە سوودمان لێ وەرگرتووە ، کتێبی (خليل حنا تادرس)ە .

(ڕوونالدم ماکری) دەنووسێ : (زۆربەی پاراسایکۆلۆجییەکان ئەوە بەباش دەزانن شەبەحە بە ڤیژەکان لە بواری پسپۆڕی خۆیاندا زامن بکەن ، هەرچەندە کەسیان ئەم وشەیە بەکارناهێنن ، شەبەحە بە هەراو دەنگە دەنگەکان باشترین دیاردەن کە بۆ توێژینەوە لە تاقیگەکاندا بەکەڵك بێن ، ئەوانە چەند هەفتەو چەند مانگێ لە

[355] کتاب الارواح / طنطاوی / ل: ١٤٥-١٤٦.

ماڵەکاندا دەمێننەوە ، شوشەکان دەشکێنن و دەرگاکان و پەنجەرەکان لەنیوە شەودا دەکەنەوەو پاشان بزر دەبن)[356].

لە ساڵی (١٨٥٨ز)دا (چارلس داروین) کتێبی بنەچەی جۆرەکان (اصل الانواع) ی بڵاوکردەوە ، ئەو ململانێی تیۆری (پەرەسەندن –التطور-) پەیدای کرد بۆ ڕاڤەی شتە نادیارو ئایینەکانی جیهان هاوکات بوو لەگەڵ دەرکەوتنی زانستی ڕووحەکان (spiritualism) و هەوڵدان بۆ پەیوەندی بەستن بە مردووەکانەوە ، ئەو هاوکاتییەکانی هانی دەرکەوتنی دیاردە ڕوحییە نائاساییەکانی دا ، ساڵی (١٨٤٨) دوو برا بەناوی (مارگریتا) و (کاترین فوکس) گوێیان لە دەنگی لێدان دەبێ لە ماڵی دایک و باوکیاندا لە ناوچەی (هایدزفیل) دا لە (نیویۆرک)دا ، ئەم لێدانی دەرگایە ئەم دوو برایە بۆ ڕوحەکانیان گێڕایەوە .

پاشان (دانیشتنی ئامادەکردنی ڕوحەکان) بڵاوبوّوە ، تا لە (کۆشکی سپی)دا ژنی سەرۆکی ئەمریکا (لنکولن) بەناوی (ماری تود) ویستی پەیوەندی بە دایک و باوکی کۆچکردوویەوە بکات .

ئاساییە ماتریالیستەکان و بابایانی پەرەسەندن لەسەدەی نۆزدەدا هەوڵی ئەوە بدەن بیسەلمێنن دەتوانرێ ئەو دیاردانە ڕاڤەی زانستی بۆ بکەن نەك ئایینی .

وشەی (پاراسایکۆجیا - parapsychology) واتە : (تەك دەروون) ، یەکەم جار لە هەشتاکانی سەدەی (١٩) دا زاناو لێکۆڵەری جیهانی نادیار (ماکس دیسوار) ئەم وشەیەی داهێنا ، کە لەم سات و کاتەدا یەکەم توێژینەوە دەربارەی دیاردە ڕوحیەکان و هیپنۆتیزمدا دەست پێ دەکات ، دامەزراوەی کۆمەڵەی دیاردە ڕوحیەکان لە

[356] حروب العقل / ل:٥١.

لەندەندا لە سالّی (١٨٨٢) دا دامەزراو دوای سێ سالّ هەمان کۆمەڵە لە ئەمریکادا دامەزرا)[٣٥٧].

(کولن ولّسن) باس لە (ریفا) دا ئەم (ناوەند) مەدیومە ، لەلایەن خەوێنەرەکەیەوە (ام.فوریتە) دەخەوێنرێت ، ئەمەش لە ڕێکەوتی (١٨٥٥)دا ، ڕیفای پێی وایە ئەو ڕوحانەی ئەو پەیوەندی پێوە کردوون خۆیان بە رووحی (جنۆکە) ناساندووە ، هەندێ لەوانە خۆیان بە رووحی مردوووان ناساندووە)[٣٥٨].

مێژونووس (ام . ای ریچاردسون) دەربارەی ئەم بۆچوونەی گوایە شەبەحەکان ئاشی (ویلنلنن) یان داگیر کردووە ، ئاماژە دەکات (گەر بمانەوێ ژمارەی سەردانەکانی دونیای نادیار بزانین ، کە لەم دواییەدا باسکراوە ، ئێمە بۆ ئەوە سەرنجمان ڕادەکێشرێ کە ڕۆژانی ناوەندەکانی سەروی سروشتی لەسەرەتادایە ، ترسەکانی ئەو شەبەح و جنۆکانە خەریکە دەسەڵات بەسەر ڕەگەزی مرۆڤدا دەگرن)[٣٥٩].

یەك لەو شەبەحانەی دەرکەوت شەبەحی (فاتیمایە) وەك لە گۆڤاری (الطاهرة) دا هاتووەو شوهرەتێکی جیهانی وەرگرتووە : (فاتیما) ناوچەیەکی بڵندە ، کە دەکەوێتە لایەکی دووری کیشوەری ئەورووپاوە ، دەکەوێتە وڵاتێکی بچووکی وەکو (پورتوگال) ، ئەم ناوە لە ناوی حەزرەتی فاتیمەی کچی پێغەمبەرە ﷺ هەڵکەنراوە ، بۆتە ئارامگایەك بۆ سەردانی خەڵك و لەو شوێنەدا خەڵکی کە بە (خانمی خاوەن مەلەوانگە) ناسراوە لەخوا دەپاڕێنەوە .

ئەم بەسەرهاتە کورتەکەی ئەمەیە :

سێ منداڵی گوندنشین بەناوی (جاسینتا)ی تەمەن (٧) ساڵ و (فرانسیکۆی) تەمەن (٩) ساڵ و (لوسیا) ی تەمەن (١٠) ساڵە ، کە بینەرەکی سەرەکی ڕووداوەکەیە ، لە

---

[٣٥٧] حروب العقل / ل:٤٩.
[٣٥٨] ما بعد الحياة / ل:٨٧.
[٣٥٩] ما بعد الحياة / ل: ٨٢.

سالّی (١٩١٦)دا دوای سالّێ لـه بیـنین ڕووناکی یـەك دەدرەوشـێتەوە لەبەرامبەریانـداو دەفەرمووێ : (مەترسن من ڕوحی پاکی ئاشتیم ، خوایە من بـڕوام بـە تۆیـەو خۆشـم دەوێـی ، داوای لێ خـۆش بـوون بـۆ ئەوانـە دەکـەم بڕوایـان پێـت نییـەو تۆیـان خـۆش ناوێت) .

دوای ئـەوە دووجـار لـە هـاوین و پـایزدا خـۆی نیشـان دان ، هـەمووو جـاران دەیـوت : قوربانی بکەن ، داوای لێ بوردن بۆ تاوانباران بکەن و داوا بکەن بـۆ ڕێنومـا بوونیـان . لـە ئایـاری (١٩١٧) ئـەو منداڵانـە دووجـار هالـە ڕووناکییەکـە دەبیـنن ، لەسـەرەوەی (داربـەڕوو)ەوە ، ڕووناکییـەکی مـەزن دەردەکـەوێ ، لـە ڕوونـاکی خـۆر درەوشـاوەتردو دەڵـێ : مـن (فاتیمـا)م، مەترسـن مـن فاتیمـەی کچـی پێغەمبـەرم ﷺ، لەبەهەشـتەوە هاتووم ، دەمەوێ بەردەوام بۆ ئێرە بێن .

دوای ئـــەوە هـــەمووو مـــانگێ دەردەکـــەوت ، دواجـــار دوای شـــەش جـــار دەرکـــەوتن لەبەرامبەر (٧٠) هەزار کەسدا ، کە بۆ دیتنی کۆبووبوونەوە کارێکی نائاسایی ڕوویدا . لە کت و پڕدا باران وەستا ، خۆڵەرزی و وەستا ، لەبـەر چاوی خـەڵکی سـووڕایەوە . وەکـو ئـەوەی خەریکـە بکـەوێ بەسـەریاندا ، پاشـان خـۆر گـەڕایـەوە ئارامگـای خـۆی . یەکـــەمجار لـــە ڕۆژنامـــەی (لیســـبون) ی کـانونی دووەمــی ئــەم مانگــەدا ڕووداوەکــە بڵاوکرایەوە ، دوای دوو سێ ساڵ بە نەخۆشی سییەکان (فرانیسکۆ مارتو) و (جاسینتا مـارتو) دەمـرن ، (فاتیمـا) بـەر لـەوە پێـی گوتبـوون تـەنیا ئـەوە دەمێنێتـەوە ، واتـە (لوسیا) تا ئایینپەروەری بە خەڵکی ڕابگەیـەنێت ، مردنـی ئـەو دوو منداڵـەش بـڕوای خەڵکی پتر بە ڕاستگۆیی منداڵەکاندا، چونکە پێی گوتبوون بەم زووانـە دەگەڕێتـەوە. لەگەڵ خۆیاندا بۆ بەهەشتیان دەبات.

لـە سـاڵی (١٩١٩)دا بـە ڕەسمـی ئـەم شـوێنە کرایـە پەرسـتگا . لـە سـاڵی (١٩٦٧) دا پاپـا (پـۆڵس)ی شەشـەم خـۆی سـەردانی شـوێنەکە دەکـات بـە مەبەسـتی ڕێزگـرتن لـەو شـوێنەیە ، هـەروەها پاپـا (پـۆلس) ی دووەم لـە سـاڵی (١٩٨٢) سـەردانی دەکـات ، تـا

سوپاس گوزاری و ڕێز بۆ خانمی ئیسلام (فاطمـة) (علیها السلام) بنوێنێت ، چونکه خودا له تیرۆر ڕزگاری کردبوو [٣٦٠].

بێگومـان ئەمـەش نموونەیەکـە لـەو نموونانـەی مانـەوەی ڕوح لـە دوای مـەرگ دەسەلێنێت.

(د.شتاینر) پێی وایە (لە جیهانی توخمەکانـدا ڕوحەکانی زەوی (نـەوم) دەبینین ، هەروەها ڕوحەکانی ئاو (ئەنـدین) و ڕوحەکانی هەوا (سەلەف) و ڕوحەکانی ئاگر (سەمیندل) دەبینین.

(دبلیو ای ئیسفنز وینتز) کەلای ناییەکانی خۆرهەلأت قسەکانی بەبەلگە وەردەگیرێ لە کتێبی سەرچاوەیدا (الایمان بالجن في الاقطار الكنتية) دا دەنووسێ : (دەتوانین بەلگەی زانستی بێنینەوە لەسەر بوونی گیانداره نادیارەکان ، له جنۆکه و دێو و خێو و جنۆکه جۆراوجۆرەکان و مردوووان[٣٦١].

دیسان باس له (هیوم) دەکات له (لنـدن) دا که گوایه ڕوحەکان گرنگیان پێداوه ، (ئەلیزابیث باریت) و (روبرت) ی مێردی سەردانی دەکەن ، لەم سەردانەدا دەبینن چەند دەستێکی شەبەحی شێوه ماددی دەردەکەون له هەوادا موسیقا دەژەنن)[٣٦٢].

دیسان دەنووسێ : (له سالی (١٨٩٧) دا دەنگ و باس بلأودەبێتەوه که مالی (بالکن) له نوسکوتلەندا دا شەبەحی تێدایه ، یەکێ له ئەندامی کۆمەلەی ڕوحی بەو بڕوایه گەیشت بە مەبەستی راو و راوه ماسی ، بەکرێ ی بگرێت ، هێشتا بە تەواوی دانەمەزرا بوو ، تەواوی دیارده نائاساییەکانی بینی ، وەکوو دەنگی ترس و قیژەی

---

[٣٦٠] مجلة الطاهرة ، عدد ٧٠ / ١٩٩٥/ طهران / ل: ١١-١٧.

[٣٦١] ما بعد الحياة / ل: ٦٣.

[٣٦٢] ما بعد الحياة / ل: ٩٦.

شەبەحەکان و تەپەی پێیەکانیان و هەندێ بوونەوەری تری نامۆ ، لێرە شەبەح هەیە سەر جەفی سەرینەکان دەدڕن)[٣٦٣].

کتێبی (الارواح / ئالن کاردك) و کتێبی (تعلیمات الروح / موسیس) سورن لەسەر ئەوە لێرەدا ڕوحی زیانبەخش هەیە لەدەورماندا ، زۆربەیان ڕوحانێکن وا بەستەن بە زەوییەوە ، یان نازانن مردووون ، یان نایانەوێ شوێن بگۆڕن .

بە کورتی شەبەحەکان ڕوحە پاکەکانن یان ڕوحە چەپەڵەکانن بۆ سوود گەیاندن یان زیان گەیاندن دەردەکەون و ئەوانەی ڕۆشن بینن دەیان بینن . دوای ئەوەی لەرەلەری لەشی ئەتیریان هێواش دەکەنەوە ، ڕوحە پاکەکان بۆ سوود گەیاندن دەردەکەون و ڕوحە چەپەڵەکان بۆ زیان گەیاندن خۆیان دەردەخەن .

نمونەیەکی تری بەرز لەم شەبەحانە ، ئەو ڕووداوەیە (فرید مجید) لە کتێبی (غرباء) دا باسی کردووە ، لە ڕۆژنامەی (جريدة الجديد) ی بەغدادی کە لە ڕۆژی (١٩٦٦/٩/١٨) دا دەرچووە ، لە ژمارە (١٣٩٩) دا بلاوی کردەوە : (د.س. دیر میچل) لە (فیلادلفیا) دا بەر لە چەند مانگێ لەشەوێکی تاریك و ساردو سەرماو باراناوی بە چڕە هەور ، کە ئەو ولاتەی داپۆشیوە ، بەفر خۆش خۆش دێتە خوارەوە ، جەنابی پزیشك زوو دەگەڕێتەوە ماڵەوە ، پێچەوانەی ڕۆژانی تر ، خەریك بوو خەوی لێ بکەوێ زەنگی ماڵەکەی لێ دەدەن ، دەڕواتە دەر بزانێ کێ یە ئەو زەنگە لێ دەدات ، کاتێ دەرگا دەکاتەوە چی دەبینی ! منداڵێکی حەوت ساڵانەیە یان هەشت ساڵانە ، لەسەر لێواری دیوارەکە هەڵتو تەکاوە دەم و چاوی لەبەر بەفر دیار نەبوو ، لەسەرمان هەڵدەلەرزییەوە ، جلەکانی تەڕ بووبوون ، تا ملپێچی دەوری ملی تا لەسەرمای ڕەشەبا بپارێزێ تێراو بوبو ، بەدەنگی نزم منداڵەکە دەیگوت : توخودا دکتۆر لەگەڵمدا وەرە دایکم ببینە زۆر نەخۆشەو پێویستی زۆری بە پزیشك هەیە ، نوژدار لەو کاتەدا ئەو ڕوڵێ نانەی پێ خۆش نەبوو ، بەلام هەست کردن بە ئەرك و

---

[٣٦٣] ما بعد الحياة / ل: ١١٣.

بەرپرسیاری ڕقەکەی خواردەوە ، بۆیە داوای لە منداڵەکە کرد لە هۆڵەکە بمێنێتەوە چاوەڕێ بکات تا خۆی ئامادەباش دەکات ، لە ماوەیەکی کەم خۆی گۆڕی چوونە ماڵی منداڵەکە ، کە زۆر لەماڵی پزیشکەوە دوور نەبوو ، منداڵەکە لە پێشییەوە دەڕۆیشت تا گەیاندیب-یە ئەو ژوورەکەی دایکەکەی ئەوی لێیە ، بە چرپاندن وتی : دایکە نەخۆشەکەم ئا لەم ژوورەیە ، فەرموو بچۆ ژوورەوە .

نوژدار سەیری کرد ئەو ژنە زۆر نەخۆشەو لەبارێکی مەترسیدایە ، تووشی هەوی سی یەکان (ذات الرئـة) بووە ، کاتێ پشکنینی بۆ کرد بینی لە قۆناغێکی مەترسیدار دایە ، بەڵام بە شێوازێ دواندنی تا دڵنیای بکات و وتی : زۆر باشە کچەکەت بەدوای مندا ناردووە ، بەڵام دەبوایە جلی ئەستووری لەبەردا بوایەو جلەکانی زۆر تر بوونایە ، ئەو مل پێچەی بەس نەبوو لەسەرمای بگێڕێتەوە ، یان لە بەفرو تەزرە ، بەڵام کاتێ بینی دایکەکە چاوی دەرپەڕیوەو بە واق ڕمانەوە سەیری دەکات وەك قسەکانی بەلاوە ڕاست نەبێ ، سەری سوڕما ، پاشان بەدەنگێکی نزم - چونکە نەخۆشییەکە بێ تاقەتی کردبوو- وتی : ئەی پزیشك ئەوە ڕێتێ نەچووە ، چونکە کچەکەی من مانگێ زیاترە مردوووە ، لەماڵەوەدا تەنیا دەژیم و (٦) ڕۆژە لە جێگادا کەوتووم ، من جل و بەرگی ئەوم لە سندوقێ دا هەڵگرتووە ، بڕۆ سەیریان بکەو مل پێچەکەشی لەوێ دایە ، نوژدار ناوچاوانی خوراندو وتی : ئایا دراوسێ کەتان کچی لەو تەمەنەی هەیە؟ وتی : نەخێر تەنیا پیرەژنێکم دراوسێ یە لەگەڵ کچەکەی دایەو نازانێ من نەخۆشم ، نوژدارەکە چوو سندوقەکەی کردەوە بینی هەمان جل و بەرگە منداڵەکە پۆشینی و مل پێچەکەشی لەوێدایە ، هاوکات ئەو جلانە وشك بوون و ناکرێ بەر لەچارەکێ تەڕ بووبن .

کاتێ دکتۆر ئەم ڕووداوەی پێشنیاری زانایانی ڕوحانی کرد بەوردی لە ڕووداوەکیان کۆڵییەوە ، گەیشتنە ئەو ئاکامە بڵێن : ڕوحی منداڵە مردوووەکە هەستی بە ئازاری

**دایکی کردووەو کەسیش نەبووە یارمەتی بدات دکتۆر بانگ بکات ، بۆیە بەم شێوەیە خۆی دەرخستووە ، بەڕاستی ئەمە ڕووداوێکی سەیر بووە**[٣٦٤].

**دیسان گۆڤاری (الصیاد / ژمارە (١٨١٦) لە ساڵی (١٩٧٩) دا باسێ دەنووسێ بەناوی** (اسطورة البيت الملكوت) **مەبەست لە خانوێکە لە ئیماراتی عەرەبی ، کەس ناتوانێ بڕواتە ناوی و بمێنێتەوە ، چونکە جنۆکەی تێدایە ، ئەوەی لەوێ دا بمێنێتەوە یان دەمرێ یان نەخۆش دەکەوێت.**

**لە قورئانی پیرۆزدا نمونە زۆرە لەسەر دەرکەوتنی ڕوحەکاندا ، وەکوو دەرکەوتنی میوانەکانی (ئیبراهیم –علیە السلام-) :** ﴿ وَلَقَدْ رَاوَدُوهُ عَن ضَيْفِهِۦ فَطَمَسْنَآ أَعْيُنَهُمْ فَذُوقُوا۟ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿٣٧﴾ ﴾ القمر: ٣٧ .

**گەلی لوت (علیە السلام) شوێن سۆراغ میوانی ئیبراهیم و لوت کەوتن ، بەڵام خوداوەند دەربارەی ئەواندا چاویان کوێر دەکات و نایان بینن ، ئەوان پێیان وایە ئەو میوانانە مرۆڤی ئاسایین نازانن ڕوحێکی پاکن ، خۆیان بەلەش کردووەو وەکو شەبەح دەرکەوتوون و سزای ئەوان لەژێر فەرمانی ئەواندایە .**

**خوای گەورە فەرموویەتی :** ﴿ فَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا ﴾ مریم: ١٧ **، بێگومان هەندێ جار ڕوحەکان وەکو شەبەح دەردەکەون و هەندێ کەس هەندێ جار دەیانبینن ، بەتایبەتی ئەوانەی ڕۆشن بینن ، لەناو کتێبی عاریفاندا زۆر ناوبانگی دەرکەوتنی حەزرەتی (خدری زیندە) هەیە ، کە خۆی پیشان داون و بینیویانەو زیارەتیان کردووە .**

(البخاري) **گێڕاویەوە (سعید بن جبیر) دەڵێ : بە (ابن عباس)م وت :** (نوف الباكلي) **پێی وایە موسای هاوڕێ** (خضر) **هەمان موسای کوڕانی ئیسرائیل نییە (ابن عباس)**

---

[٣٦٤] غرباء وخارقون ودخلاء / فريد مجيد / ل:١٦٦.

(رضی الله عنه) فەرمووی : (كذب عدوالله)[٣٦٥] ، واتە : دوژمنی خوا ڕاست ناكات

بێگومان ئەم دۆخەی شەبەحەكانی تێدا دەبینرێت لەنێوان خەو و بێداری وایە و بە (النعاس) یان سووكە خەو دەناسرێت ، (سوید بنورگ) باس دەكات (سووكە خەو دۆخێكە لە نێوان خەو و بێداری دایە)[٣٦٦].

قورئانی پیرۆز ئاماژە بەم دۆخە دەكات و دەفەرمووێ : ﴿ ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْ ﴾ آل عمران: ١٥٤ ، واتە : پاشان دوای ئەو خەمەی بەسەرتاندا هات دامان بەزاندە سەرتان ئارامی سووكە خەوە كۆمەڵێ لە ئێوە دەگرێتەوە .

بەو پێیە سووكە خەو ئەوانە دەگرێتەوە ڕوح پاكن و ئامادەیی ڕوحییان هەیە ، لە غەزای بەدری گەورەدا خودا فریشتەی ناردە خوار تا كۆمەكییان بكەن لەم جەنگەدا ﴿ أَنِّى مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُرْدِفِينَ ﴾ الأنفال: ٩ ، پێغەمبەر ﷺ هەندێ لەیارانی فریشتە دەبینن كە دابەزیون دەجەنگن.

(د.شتاینر) پێی وایە لە ڕابردودا پەیوەندییەكی توند لە نێوان مردووان و زیندووواندا هەبوبێ ، بەشێوەیێ توانیویانە شوێن گەشتی خزمانی مردووانیان بكەون لەدوای ژیاندا ، بەڵام وردە وردە توانای فیراسەو دوربینییان لەدەستداوە[٣٦٧].

كاتێ (ئارتەر فندلای) پرسیار لەڕوحێكی ئامادە دەكات چۆن ئێوە دەتوانن قسەمان لەگەڵدا بكەن لەزەوی دا ؟

---

[٣٦٥] تفسير القرآن العظيم / ج٣/ل:١٢٦ / ابن كثير.
[٣٦٦] ما بقة الحياة / كولن ولسن / ل:١٦٧.
[٣٦٧] ما بعد الحياة / كولن ولسن / ل:١٦٤.

و: بە بەلەش کردنی دەم و زمانی ئەتیرمان.

پ: چۆن ئەمە ڕوودەدات ؟

و: لەناوەنــدو ئامــادەبووان لــەدونیای ڕوحــی دا کیمیــا گــەرێ بــڕێ لــە مــاددەی (ئیکتۆپلازم) وەردەگرێ ، ماددەیەکی تـری ئاوێتـە دەکـات ، گـەردو ماددەکـە ئاوێتـەی یـەکتری کـران کیمیـاوی یـە دەتـوانێ هـەردوو دەسـتەکانی بەلـەش بکـات ، دوایـی بـە دەستی خۆی دەمامکێ دروست دەکات لە دەم و زمان دەچێ ، ئـەو ڕوحـەی مەبەسـتی گفتوگۆیــە دەم و ڕوی دەخاتــە نــاو دەمامکــەوە بــەدەوری دەم و زمــان و گــەروەوە دەنووسێ ، سەرەتا دژواری دەبینین لەجوولأندنی ئەو مـاددە قوڕسـەدا ، دوایـی ئاسـان دەبێـت ، دیسـان بـەرگی ئـەتیری ماددەیـەکی تـری شـێوە فیزیـایی دایدەپۆشـێ ، کـاتێ هەوای بە ناودا دەڕوا هەوای ئێوە دەلەرێتەوەو گوێتان لەدەنگ دەبێت .

پ: ئایا چۆن ئەو هەوایە بەدەست دێنن ، ئاسایی یەکانیش بەلەش دەبن؟

و : بەلێ لە خۆبەلەش کردنی تەواودا[٣٦٨].

لە قورئـانی پـیرۆزدا وشـەی ﴿فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا﴾ مـریم: ١٧ ، ئاماژەیـە بـۆ خـۆ بەلەش کردنی تەواو .

**ئیعجازی ( ٧٨ ) پێشینی یەکان ( التنبؤآت ) :**

خوێندنـەوەی داهـاتوو پێشـبینی کـردن بەڵگـەیێکی تـرە لەسـەر هـەبوونی گـەردوونی نادیارو جیهانی سەروی زەمەن و شوێن.

قورئـانی پـیرۆز بەشـێکی زۆرمـان لـەم نمونانـە پیشـاندەدات ! دەبینـی یوسـف (علیـه السلام) خەون دەبینـێ کـە (١١) هەسـارەو مـانگ و خـۆر کوڕنوشـی بـۆ دەبـەن : ﴿إِنِّي

---

[٣٦٨] علی حافة العالم الاثيري / ارثرفندلاي / ل:١١٠.

رَأَيۡتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوۡكَبٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ رَأَيۡتُهُمۡ لِي سَٰجِدِينَ ﴾ یوســـف: ٤ ، لێـــرەدا پێشبینی دەكات داهاتوو یوسف دەبێتە پێغەمبەر (علیە السلام) (١١) براكانی و دایك و باوكی كوڕنوشی بۆ دەبەن ، هاو كات ئاماژە دەكات هەسارەكانی خۆر (١٢)یـە ، زەوی هێمایە بۆ یوسف ، ئەنجا تەواوی تەنەكانی تر لە خزمـەت زەوی دان ، كـە هێمایـە بـۆ یوسـف (علیـە السـلام) ، (عـەتارد) ، زوهـرە ، زەوی ، مـەریخ ، موشـتەری ، زوحـەل ، ئورانوس ، نیپتۆن ، پلۆتۆ ، سێرس ، چاڕۆن، (٢١٣ UB ٢٠٠٢).

بڕوانە (گەردووناسی/ نووسەر) ، ئەمەیە جیاوازی لەنێوان پێشبینی پێغەمبـەران و غەیری ئەوان! یان دەبینی دوو زیندانی بەندیخانـە ، كـە یوسفی تێدایـە دوو خـەونی پێشـبینی دەبیــنن : ﴿ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَعۡصِرُ خَمۡرٗاۖ ﴾ یوسـف: ٣٦ ، یوســف (علیە السلام) ئەم خەونە بەمەوە مانا دەكات ، كە هێمایە بۆ ڕزگاری ئەم زیندانییەو گەڕانەی بۆ كاری خۆی كە گوشینی شەڕابە.

دووەم خــەون دەبینــێ : ﴿ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَحۡمِلُ فَوۡقَ رَأۡسِي خُبۡزٗا تَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِنۡهُۖ ﴾ یوسـف: ٣٦ ، ئەوەیان خەون دەبینی نـانی لەسـەر سـەر دانـاوە باڵنـدە لێ ی دەخـوات . یوسـف (علیە السلام) ئاوا مانای دەكات ، كە داهاتوو لەسێدارە دەدرێ و باڵنـدە سەری دەكۆڵن.

یـان پادشـای میسـر (ئـەخناتون) خـەون دەبینـێ ، كـە ﴿ إِنِّيٓ أَرَىٰ سَبۡعَ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖۖ ﴾ یوسـف: ٤٣ ، واتـە : من حەوت مانگای قەڵەوم بینـی حـەوت مانگـای كزیـان خـوارد ، حـەوت گوڵە گـەنمی سەوزو حەوت گوڵە گەنمی وشك.

یوسف (علیە السلام) ڕاڤـەیان دەكـات ، كـە داهـاتوو (٧) سـاڵان گرانـی و ووشـكە سـاڵی دەبێ و حەوت ساڵان پـێش ئـەوە زەوی بـە پیـت و بەرەكـەت دەبێـت ، لـە ڕێگـای ئـەم خەونەوە (میسر) لە گەورەترین كارەساتی برسێتی وگرانی ڕزگاری دەبێت.

یان خودا مژده به دایکی موسا (علیـه السلام) دەدات : ﴿إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ القصص: ٧ ، واته : (ئێمه موسا بۆ تۆ دەگێڕینـەوەو دەیکەینـه یـەکێ لـه پێغەمبـەران) خـودا لـه نوێـژی (حاجـەت) دا مـژده بـه زەکـەریا دەدات : ﴿أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَىٰ﴾ آل عمران: ٣٩ ، واته : خودا مژدەت پێ دەدات به یەحیا .

(طـالوت) پێشـبینی بـه سـوپاکەی دەدات خـوا بـه ڕوبـارێ تاقییـان دەکاتـەوه :﴿قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ﴾ البقرة: ٢٤٩ ، خودا مـژده دەدات بـه پێغەمبـەر ﷺ له خەونی پێشبینی دا که ئەوان دەچنه (المسجد الحرام)ەوه ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ﴾ الفتح: ٢٧ ، خودا مـژدەی گرتنـی مەککـەی پـێ دەدات : ﴿إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ﴾ النصر: ١ .

قورئان پێشبینی هاتنی چەرخی زانستی دەکات له خۆرئاوادا : ﴿سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ﴾ فصلت: ٥٣ ، دیسـان مـژده دەدات خەڵکی خۆرئاوا ڕۆژ به ڕۆژ دوای بینینی ڕاستییەکان و لێکۆڵینەوه زیاتر بـەرەو ڕوی ئیسلام دێن.

ئاماژه دەکات مرۆڤ دەڕواته دەرەوەی زەوی : ﴿لَتَرْكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٍ﴾ الانشقاق: ١٩ ، چەندان پێشـبینی تـر لـه قورئانـدا دەخوێنیـەوه ، که هـەمووو ئەوانـه دەیسـەلمێنن قورئان ڕەوانه کراوی خوایه ، کـه ڕابـردوو ئێستا و داهاتوو لـەلای ئـەو وەکو یەکـەو لەسەر یەك ڕاسته هێڵه ، مرۆڤ به ویستی ئەو نەبێ ناتوانێ پەییان پێ ببات : ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَىْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ﴾ البقـرة: ٢٥٥ ، پێشـبینی بـۆ ڕەوانـەکراوانی خودا موعجیزەیه ، بۆ ئەولیایان کەرامەتەو سەلمێنەری موعجیزەی پێغەمبەرانه ، بـۆ

غەیری ئەوانە سەلمێنەری موعجیزەو کەرامەتەکانە ، پێشبینی زۆر گرنگە بۆ مرۆڤ ، چونکە داهاتوو دەخوێنێتەوە ، چارەنووس دیاری دەکات ، مەترسی یەکان پیشان دەدات ، یان ئەو مژدانەیان تێدایە ، کە خۆشی بۆ مرۆڤ دەهێنن .

(غەزالی) لە (کیمیاء السعادة / ل:٨٦)دا دەنووسێ : دڵ دوو و دەرگای هەیە : یەکەمینیان بۆ خەونەکانە ، دووەم بۆ دونیای بێدارییە ، کە دەرگای ڕواڵەتیە بۆ دەرەوە ، گەر مرۆڤ نووست دەرگای هەستەکان دادەخرێ ، دەرگای دەروونی بۆ دەبێتەوە ، غەیبی دونیای مەلەکوتی و لەوحی مەحفوزی بۆ دەبێتەوە وەکو خۆر دەبێ ، ڕەنگە خەونەکەی پێویستی بە هەندێك لێکدانەوە هەبێت .

پێغەمبەران و صدديقينەكان و ئەولیایان خاوەن پێشبینی گەورە بوون ، وەکو مژدەیێ بۆ ئەوان .

گومانی تێدا نییە هەر سەرکردەیێکی سیاسی یان سەربازی ، یانِ حکومی ، یان ئەمنی گەر پێشبینی نەبوو بۆ داهاتوو ناتوانێ لەکارەکان و پرۆژەو پلانەکانی سەرکەوتن بەدەست بێنێت ، و دەکەوێتە هەڵەی گەورەوە .

یەکێ لە موعجیزەی پێغەمبەران پێشبینی کردن بووە بۆ داهاتوو ، صدديقينەكان و ئەولیاکان لەم بەهرەیە بەهرەمەند بوون ، قورئان و فەرموودەکان پڕن لە پێشبینی کردن و خوێندنەوەی داهاتوو وەك ئەوەی نووسرابنەوە ، ڕابردو و داهاتو و ئێستا لەسەر یەك ڕاستەهێڵ ڕیز دەکەن و سنووری زەمەن و مەکانیان بەزاندووە .

پێغەمبەران و صدديقينەكان سوود لە سروش و ئیلهامی خوایی وەردەگرن ، ئەولیایان پشت بە ئیلهام و خەونی خوایی دەبەستن ، لەرێگای زیکرو نوێژو نوێژی حاجەوە : (ذهبت النبوة وبقيت المبشرات) (رواه البخاري) هەرچی زانایانن پشتیان زیاتر بە ئەستێرە گەری و ڕامان (التأمل) بەستووە ، لەکۆندا بە پێشبینی یەکانیان هاتۆتە دی ، لەلایەن پادشایان پشتیان بەقسەکانیان بەستراوە .

گەورەترین پێشبینی کەر لە مێژووی نوێ دا (نوستراداموس) بووە ، بەر لە (٥٠٠) ساڵ پێشبینی کردووەو زۆر نووسەر ڕافەیان بۆ شیعرەکانی کردووە و رەمزەکانیان باس کردووە ، لەوانەش (تنبوات نوسترا دا موس/ ت:جمیل حمادة) و (تنبوات نوسترا دا موس/ منصور عبدالحکیم).

نوستراداموس دەڵێ : ( گەر تۆ بتوانی تەرکیز بخەیە سەر ئەو شوێن و ڕێگایانەی لەگەڵ پەیوەندی گەردوونی دیاری کراودا دەگونجێن دەتوانی پێشبینی بکەیت ، هەروەها لە ڕێگای ئیلهامەوە).

لەناو کوردیشدا (عێل بەگی جاف) هەیە ، کە لە چەند دێرە هۆنراوەیێکدا پێشبینی دوای خۆی کردووە ، بەتایبەتی ڕووداوەکانی ئاخیر زەمان لە کوردستان و دونیادا.

لە (الصحاح) و (المساند) و (المعاجم) و (السنن) ە (المصانف)ەکانی فەرموودەکاندا باسێکی تایبەتە هەڵبژێراوە بەناوی (الفتن) ، کە باس لە نیشانە بچووکەکان و گەورەکانی هاتنی قیامەت دەکەن .

نووسراوی تایبەتی لەلایەن فەرمووده زانە مەزنەکانەوە نووسراوە ، ناودارترینیان (الفتن / نعیم بن حماد)ە و (البرهان فی علامات مهدی اخر الزمان / المتقي الهندي) و (الملاحم والفتن / ابن طاوس) و (النهایة في الفتن والملاحم/ ابن کثیر) و (الاشاعة لاشراط الساعة / للعلامة السید محمد البرزنجي)یە هەروەها (محمد عیسی داود) کتێبەکی گرنگ دەنووسێ بەناوی (المفاجئة) کە (جفری ئیمام علی) تێدایە لەبارەی ڕووداوەکان و پێشهاتەکانی ئاخر زەمان.

(السید علی عاشور) کتێبەکی نووسیوە بەناوی (ماذا قال علي عن اخر الزمان) ، ئەمانەش کۆمەڵە کتێبێکی نوێیە لەڕاست پێشبینی یەکانی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ڕووداوەکانی ئاخر زەمان ، کە وەکو موعجیزەیەکی گەورەو بێ وێنە دەردەکەون و ڕۆژ بەڕۆژ لەکاتی خۆیاندا دێنەدی و دەبینرێت:

(١) إحذروا مرة اخرى المسيح الدجال على الابواب / محمد عيسى داود.
(٢)المهدي المنتظر على الابواب / محمد عيسى داود.
(٣)المهدي المنتظر قبل الهر مجدون وبعد الهر مجدون.
(٤)الانباء الغيبية لرسول المصطفى / عبدالمجيد مير دامادي .
(٥)علامات ظهور الامام المهدي / عباس تبريزيان.
(٦)السيناريو القادم لاحداث آخر الزمان / منصور عبدالحكيم.
(٧)المهدي في مواجهة الدحال / منصور عبدالحكيم.
(٨)العراق في القرآن والحديث والشجرة النعمانية / الشيخ ابن عربي / محمد عرب.
(٩)نهاية امة الاسلام بين النبوة والسياسية / د.احمد حجازى السقا .
(١٠) عودة المسيح المنتظر لحرب العراق بين النبوة والسياسية / د.احمد احمد علي السفا.
(١١) رحلة الى الدار الاخرة / محمود المصري.
(١٢) اقترب خروج المسيح الدجال / هشام كمال عبدالحميد.

**وە سەدان کتێبی تر .**

**هەندێ لە نیشانە بچووکەکانی ڕۆژی دوایی وەکوموعجیزە دەردەکەون :**

**(١) هاتن و وەفاتی پێغەمبەری ئاخر زەمان** ﷺ (بعثت انا و الساعة كهاتين) رواه مسلم ، **واتە : من و قیامەت پێکەوە هاتووین وەکو ئەم دوو پەنجە ، پەنجەی شەهادە و ناوەڕاستی پێکەوە نووساند.** (اعدد ستا بين يدي الساعة : موتى) رواه البخاري ، **واتە : لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی شەش نیشانە بژمێرە لەوانە مردنی من .**

(٢)دەرکەوتنی ئاشوب لەدوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ وەکو کوشتنی عومەرو عوسمان و عەلی و حەسەن و حوسەین ... هتد (سەلام و ڕەزامەندی خوایان لەسەر) ، نەمانی خەلافەت و هاتنی پادشایەتی : (ان بين يدي الساعة فتنا كقطع الليل المظلم) رواه احمد. (تكون بعدي خلفاء عدة نقباء بني اسرائيل) رواه نعيم بن حماد ، واتە : دوای من خەلیفەکان دێن وەکو نەقیبەکانی کوڕانی ئیسرائیلن لەژمارەدا (١٢) کەسن.

(اول هذه الأمة نبوة ورحمة ، ثم خلافة ورحمة ، ثم ملكا عضوضا) رواه نعيم بن حماد ، واتە : سەرەتای ئەم ئوممەتە پێغەمبەرایەتی و ڕەحمەتە پاشان خەلافەت و ڕەحمەتە ، پاشان پادشانشینی ستەمکارە ، دەفەرمووێ : (ثم يصير جبرية و عبثا) ، واتە : پاشان دەبێتە زۆرداری دکتاتۆری ، (سيكون بعد الجبابرة رجل من اهل بيتي يملأ الارض عدلا) رواه انعيم بن حماد ، واتە : پاش دکتاتۆران کەسێك دێ لەوە جاخی من (مەهدی) زەوی پڕ لەدادگەری دەکات .

(ويل للعرب من شرقد اقترب) رواه البخاري ونعيم ، واتە : هاوار بۆ عەرەب لەشەڕێ لێیان نزیك کەوتۆتەوە .

(٣)(الامام علي) و (ابن مسعود) گێڕاویانەوە پێغەمبەر فەرموویەتی: (آفة هذا الدين بنو أمية) (نعيم بن حماد) وە پێغەمبەر ﷺ پێشبینی هاتنی کارەساتی بەنو ئومەییەو بەنو عەببا سی کردووە، دەفەرموێ : (ويل لامتي لشيعتين : شيعة بني امية وشيعة بني عباس) (نعيم) .

(٤) نەمانی ڕاسپاردە : (اذا ضيعت الامانة فانتظر الساعة) رواه البخاري ، واتە : گەر سپاردە نەما چاوەڕێ ی قیامەت بکە .

(٥)بلاّوبوونەوەی داوێن پیسی و لادانە جنسی یەکان و حەلاّڵ کرانی : (لا تقوم الساعة حتى تتسافدوا في الطريق) رواه ابن حبان ، واتە : قیامەت نایەت تاوەکو گوێ درێژ لەجادەو ڕێگاکان کرداری جنسی دەکرێت .

(٦) **خواردنـــەوەی مـــاددە کـــەهولی یـــەکان و هۆشـــبەرەکان :** (ویشـرب الخمـر) اخرجه مسلم ، **واتە : شەراب دەخورێتەوە .**

(٧) **زۆربـوونی بومەلـەرزە :** (لا تقـوم السـاعة حتـى تکثـر الـزلازل) ، **واتـە : قیامەت نایەت تا بومەلەرزە زۆر نەبێت.**

(٨) **حوکم نەکردن بە قورئـان و شـەریعەت لـە دەسـتوورو یاسـادا :** (ان من اشراط الساعة ان يرفع العلم ويثبت الجهل) متفق عليه .

(٩) **زۆربوونی شاهیدی بەدرۆو شاردنەوەی ڕاسـتی :** (ان بين يدي السـاعة ... شهادة الزور وكتمان شهادة الحق) رواه احمد.

(١٠) **پەیدابوونی ئاسایش لەنێوان وڵاتی عێراق و حیجاز بۆ حەج کردن :** (لا تقوم السـاعة حتـى يسير الراکب بين العـراق ومکـة لا يخـاف الا ضلال الطريق) رواه احمد / صحيح.

(١١) **بەرزکردنەوەی کۆشکەکان لەشارو دێهات لەلایەن شوان و گاوانەکانـەوە :** (واذا تطاول رعاء البهائم في البنيان فذاك من اشراطها) .

(١٢) **بـەهۆی نـەمانی ئاسـایش زۆر بـوونی پـۆلیس وەکـو پۆلیسـی مـەدەنی و ئاسـایش و نەهێشـتنی تـاوان و دارسـتان و هاتوچـۆ:** (سيكون فـي اخـر الزمان شرطة) رواه الطبراني.

(١٣) **زۆر بـوونی جنێـو و بوختـان و نـەمانی شـیرازەی خێـزان و بـەزەیی و سـیلەی خزمایـەتی و هەڵسوکەوتی خـراپ لەگـەڵ دراوسـێ :** (لا تقـوم السـاعة حتـى يظهـر الفحـش والتفـاحش و قطيعـة الـرحم وسـوء المجاورة) رواه احمد / صحيح.

(١٤) **زۆر بـوونی سـوو (الربـا) و حـەرام خـۆری کـە سیسـتەمی سـەرمایەداری پیادەی دەکات :** (بين يدي الساعة يظهر الربا) رواه الطبراني.

(١٥) **دەسەڵات دەکەوێتە دەست نەوانەی لەو ئاستەدا نین و شایستە نین :** (لا تقوم السـاعة حتـى يكـون اسـعد النـاس بالـدونيا لكـع ابـن لكـع) رواه احمد ، **واتە : قیامەت ڕوونادات تا بەختەوەرترین کەس بەدونیا کەسان نادان دەبن :** (سيأتي النـاس سنوات خداعات ، يصدق فيهـا الكـاذب ويكذب فيها الصـادق ، ويؤتمن فيها الخـائن ويخـون فيهـا الامـين ،

وينطق فيها الروبيضة) رواه الحاكم واحمد ، واته : له داهاتوودا چەند ساڵێك دێته پێش فریودەره ، درۆزن به ڕاستگۆ دادەنرێ ، ڕاستگۆ به درۆزن دادەنرێ ، ناپاك به دەست پاك دادەنرێ ، دەست پاك به ناپاك دادەنرێ ، کەسانی نا کەس بەکەس لەکاروباری گشتی دا قسه دەکات .

(١٦) سەلامی تایبەتی و بەرژەوەندی : (ان بين يدي الساعة تسليم الخاصة) رواه احمد. ، لەنزیك قیامەتدا کەسانێ هەیه سەلام لەیەکتری دەکەن تەنیا لەبەر ئەوەی دەیناسی .

(١٧) زۆربوونی مردنی کت و پڕ : بەهۆی جەڵتەی دڵ و ڕوداوی ڕێگاو بان و تیرۆرو کارەساتی سروشتی مردنی کت و پڕ زۆر دەبێت : (ان يظهر موت الفجأة) رواه الطبراني في الاوسط.

(١٨) نزیك بوونەوەی کات : بەهۆی فڕۆکەو ترومبێل و موبایل و ئینتەرنێت و تەلەفزیۆنەکان کات نزیك دەبێتەوه : (لا تقوم الساعة حتى يتقارب الزمان) رواه احمد.

(١٩) دەرکەوتنی دیاردەی سفوری ئافرەت : (نساء كاسيات عاريات مائلات مميلات رؤسهن كأسنمة البخت المائلة) رواه مسلم ، واته : ژنانێکن جل و بەرگیان لەبەر بەڵام ڕووتن ، لەنجەو لار دەکەن و سەرنجی خەڵك ڕادەکێشن ، سەریان وەکو پشتی لاری وشتر وایه .

(٢٠) زۆر بوونی باران، کەمی ڕووەك بەهۆی پیسبوونی ژینگه : (لا تقوم الساعة حتى يمطر الناس مطر اعاما ولا تنبت الارض شينا) رواه احمد.

(٢١) زۆربوونی بازرگانی : (وتفشو التجارة) رواه احمد ، مەبەست لەبازرگانی ناوخۆو دەرەوەیه .

(٢٢) نزیك بوونەوەی بازاڕەکان بەهۆی ئامرازی هاتوچۆ : (وتتقارب الاسواق) رواه احمد.

(٢٣) **زانست و فتوا لـه منـدالكاران وەردەگيرێ نـەك لـە زانـاو مـوفتى يـەكان :** (ان مـن اشـراط السـاعة ان يلـتمس الالعـالم عنـد الاصـاغر) رواه الطبراني.

(٢٤) **زۆربـوونى ژنـان و كـەمى پيـاوان : بـەهۆى جـەنگ و كوشـتار لەگـەڵ داگيركاراندا يان بەهۆى جەنگە ناوخۆيى يـەكان :** (وتكثـر النسـاء ويقل الرجال) رواه البخاري.

(٢٥) **زۆربوونى درۆ لەسەر زمـان و لـەناو ڕاگەياندنەكانـدا :** (ويكثـر الكـذب) رواه احمد.

(٢٦) **دەركـەوتنى قەڵـەم و زۆربـوونى كتێـب و چـاپەمەنى :** (ان بـين يـدي السـاعة ... ظـهور القلم) رواه احمد.

(٢٧) **زۆر بـوونى قسـەى قەڵـەو و كـەمى كـردەوە : (ويفـتح القـول ويخـذل** العمل) رواه الحاكم.

(٢٨) **دەركەوتنى جەنگى كەنداو لەگەڵ عێراقدا بەهۆى زێڕى ڕەش كە نەوتە** : (يقتتل عند كنزكم **هذا ثلاثة كلهم إبن خليفة...) رواه ابن ماجة .**

(٢٩) **هاتنى گەمارۆى ئابوورى بەسـەر عێراقـدا لەلايـەن خۆرئـاواوە : (يوشـك** اهل العراق ان لا يحبي لهم قفيز ولادرهم قلنـا من اين ذلـك؟ قـال العجم يمنعون ذاك) رواه مسلم.

**ديسـان ئـەم جـەنگى كەنـداو و گـەمارۆى ئابوريـيـە و نيشـانەى گـەورەى دەركەتنى سەردەمى مەهدين.**

(٣٠) **جەنگى ناوخۆ لـە عێراقـدا : هـەر لـە سـەردەمى ئومـەوى و عەبباسـى و عوسمـانى تـا دەگاتـە حـوكمى بـەعس و دواى نـەمانى بـەعس جـەنگى نـاوخۆيى لـە عێراقـدا هەڵدەگيرسـێ تـيرۆر پەيـدا دەبـێ بـەهاتنى ئازاديبەخش كۆتايى دێت : (سالم بـن عبـدالله بـن عمـر) گێڕاويـەوە : يـا** اهـل العـراق لا أسـألكم للصـغيرة واركـبكم للكبيـرة ، سـمعت ابـي عبدالله ابن عمر سمعت رسول الله (صلى الله علية وسلم) ان الفتنـة تجي من ها هنا وأميء بيده نحو المشرق حيت يطلع قرنـا الشيطان وانـتم يضـرب بعضـكم اعنـاق بعـض. (رواه مسـلم) ، **واتـە : ئـەى**

خەڵکی عێراق من پرسیاری گوناهی بچووکتان لێ ناکەم ، بەڵکو ئۆباڵی گوناهی گەورەتان دەخەمە سەر ، لەباوکم عبدالله کوڕی عومەر بیستومە ئاژاوەکە لێرەوە دێ ، ئاماژەی بۆ خۆرهەڵات کرد ، کە هەردوو حزبی شەیتان لەوێ دەردەکەون ئێوە لە گەردنی یەکتری دەدەن .

(٣١) لێرەدا ئاماژە کراوە مەبەست لە خۆرهەڵات (المشرق) عێراقە.

دووەم شت جەنگی ئاخر زەمان یان جەنگی سەفیانی و مەسیحی دەججال لەوێوە سەر هەڵدەدات ، کە حزبی بەعس و خۆرئاوا بەرپای دەکەن.

(٣٢) ڕزگاری عێراق و ئازادبوونی باکوری عێراق : (ثم تطلع الرايات السوود من قبل المشرق فيقتلونكم قوما لم يقتله قوم فاذا رايتموه فبايعوه ولو حبوا على الثلج فانه خليفة الله المهدي) ، رواه ابن ماجة: صحيح .

خۆر هەڵات کوردستانە ، کە ناوچەیەکی شاخاوی و بەفراوییە ، ئیمام عەلی (عليه السلام) وتار دەدات و دەفەرمووێ : (وارتفع علم العماليق في كردستان) (وويل للبغداديين من سيوف الاكراد) ، کوردستان ناوچەیەکی فراوانە ، لە پەیماننامەی (لۆزان / ١٩٢٥) بەستەمکارانە بەسەر دەوڵەتە دراوسێکاندا دابەش کرا .

لێرەدا پێغەمبەر ﷺ پێشبینی دەکات کوردستان ڕزگار دەبێ لە عێراقدا ، پاشان ئیمام عەلی پێش بینی دەکات گەر باکوری عێراق ئازادبوو ئاڵای گەورە پیاوانی کورد دەرکەوت بەغداش دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی کورد ، دوای ئەوەی جەنگی پێ دەفرۆشێ ، یان بەهەر ڕێگایەکی تر بێت ، کە ئێستا نایزانین.

(٣٣) (ابن عربی) لە (منظومة) کەیدا دەنووسێ :

وتملك الكرد بغداد وساحتها الى فريسان من شرق العراق[٣٦٩].

---

[٣٦٩] سلوا عليا / هشام ال قطيط / ل: ٤٢٠.

(٣٤) رزگاری تورکیا (قوستەنتینییە) : (لا تقوم الساعة حتى يغزوها سبعون الفا من بني اسحاق) رواه مسلم .

(٣٥) (الطيبى) لە (الكاشف عن حقائق السنن /٨١/١٠)داو (الشيخ صفي الدين المبار كفوري) لە (منة المنعم على شرح مسلم)داو (ابن كثير) لە (النهاية في الفتن والملاحم/٧٧/١) و (منصور على الناص) لە (التاج /ج٥)دا دەفەرموون ئەوانە کوردەکانی شامن ، لە راڤەی (الطيبي) دا هاتووە : (واتە : کوردانی شامی موسڵمان ، کە کوڕانی ئیسحاقی پێغەمبەرن ﷺ) ئەوانە تورکیا ڕزگار دەکەن .

سەدان نیشانەی تر ئاماژەیان پێکراوە ، ئەمانە مشتێکن لە خەرمانێك ، هەمووو ئەو پێشبینی یانە موعجیزەیێکی گەورەن بۆ پێغەمبەری ئیسلام ﷺ ، کە سنووری زەمەن و شوێن دەبڕن و داهاتوی جیهان و مرۆڤایەتیت بۆ دەخوێننەوە ، تا مرۆڤی بڕوادار سوودیان لێ وەربگرێت و بڕوای قایم تر بێ بە ئیسلام و لەبەرامبەر کارەساتەکان و تاقی کردنەوەکان خۆڕاگر بێ و خۆی نەدۆڕێنێ و تەوەقوعی سیاسی و سەربازی بەهێز بێت ، مادام بڕوادار بزانێ سەرکەوتن بۆ ئیسلامە هەرگیز ورەی ناڕوخێ و بەردەوام دەبێ لە خەبات و هەوڵەکانی دا ، (واخرى تحبونها نصر من الله وفتح قريب وبشر المؤمنين) الصف... .

## هەندێ لە نیشانە گەورەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی کە وەکو موعجیزە دەردەکەون :

(١) دەرچوونی ئازادیبەخشی جیهانی (المنقذ) : لە ناو هەمووو نامە ئاسمانییەکاندا مژدە بە هاتنی ئەم ئازادیبەخشە دراوەو نیشانەکانی هاتنی باسکراوە ، ڕۆڵی ئەو ڕوونکراوەتەوە ، باسی حکومەتە جیهانییەکەی کە دادگەری و یەکسانی دایدەپۆشێ کراوە ، دوای ئەوەی حکومەتی سەرمایەداری

و زۆرداری کۆتایی دێنێت ، لەم چاخەدا ئیسلام لە تەواوی جیهاندا وەکو یەکەمجار لەمێژودا پراکتیك دەبێت.

قورئانی پیرۆز فەرموویەتی : ﴿ وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ ﴾ الأنبياء: ١٠٥ ، واتە : لە زەبوردا نوسیومانە دوای تەورات چاکە خوازان زەوی بەمیراتی دەگرن.

گەر بگەرێینەوە بۆ (كتاب المقدس) ئەم دەقە لە زەبوردا ماوەو دەسکاری نەکراوە : (اما الودعاء فيرثون الارض ويلذون في كثرة السلامة) كتاب المقدس / ل: ٨٥٧.

کەواتە : مەسەلەی ئازادیبەخش هەر ڕەنگدەرەوەیێکی ئایدۆلۆژیای ئیسلامی نییە بەڵکو موورکێکی جیهانی وەرگرتووە ، کە تەواو و ئایینەکان و مەزهەبەکان ڕویان تێ کردووەو ئەو کەسایەتی یەکی جیهانی یە و کەس گومان لەبوونی ناکات ، تەنیا گومان لەوە دایە ئەو کەسایەتی یە بەرزە کێ یە ؟ مەسیحییەکان و جولەکەکان و زەردەشتی یەکان و هندۆسەکان و ...هتد ، هەمووویان لەچاوەڕوانی هاتنی دان .

مەسیحی بڕوایان بەگەڕانەوەی (مەسیح) هەیە ، زەردەشتی بڕوایان بە گەڕانەوەی (بەهرام) هەیە ، (هیندۆس) بڕوایان بە گەڕانەوەی (فیشنو) هەیە ، (مەجوس) بڕوایان بە ژیانی (ئوشیدر) هەیە ، بوزییەکان چاوەڕێ ی (بودا)ن . ئیسپان بڕوایان بە گەڕانەوەی شا (روزریق) هەیە ، مەگۆل دەڵێن : (جەنگیزخان) دێتەوە ، هەروەها بلیمەتان خۆرئاوا باس لەم ئازادیبەخشە دەکەن ، کە دونیا پێویستی پێ یەتی .

(برتراندروسل) دەڵێ : ( دونیا چاوەڕێ ی چاکسازێکە دونیا لەژێر یەك ئاڵاو دروشمدا کۆبکاتەوە) .

(ئەنشتاین) دەڵێ : (ئەو ڕۆژەی ئاشتی و خۆشی دایدەگرێ نزیکە ، لەو ڕۆژەدا خەڵکی یەکتریان خۆش دەوێ و برای یەکترین).

(بەرنادشۆ) ئەم ئازادیبەخشە بە (سۆپەرمان) ناو دەبات (بڕوانە کتێبی (برنادشو / عباس محمود العقاد).

ناوی ئەو وەکو ناوی پێغەمبەرە ﷺ ، پێغەمبەریش ﷺ ناوی زۆر بووە : (لا تذهب الدونيا ولاتنقضي حتى يملك العرب رجل من اهل بيتي يواطيء اسمه اسمي) رواه الترمذي باسناد حسن صحيح. واتە : دونیا ناڕوات و بەسەرناچێ تا پیاوێ لە وەجاخی من عەرەب نەخاتە ژێر دەسەلاتی خۆی ناوی وەك ناوی منە ، مەهدی لە وەجاخی پێغەمبەرە ﷺ لە پشتی فاطمة زەهرایە (سەلامی خوایان لێ بێ) : (المهدي منا اهل البيت يصلحه الله في ليلة) رواه احمد / اسناده صحيح ، واتە : مەهدی لەخۆمانەو وەجاخە ، خوا لەیەك شەودا ئامادەی دەكات و پەیامی مەهدی پێ ڕادەگەیێنێت.

ئەو لە خۆرهەلات دێت ، لە پشتی حوسێنە : (ثم تطلع الرايات السوود من قبل المشرق فيقتلونكم قتلا لم يقتله قوم فاذا رايتموه فبايعوه ولو حبوا على الثلج فانه خليفة الله المهدي) .

(ابن كثير) لە (النهاية) دا دەڵێ : فەرمووده صەحیحەو ، بەو پێیە مەهدی لەخۆر هەلاتەوە دەردەكەوێت ، ئازادیبەخش خاوەن كەسایەتی یەكی بەرزی ڕوحی و عیرفانی یەو جەمسەرە : ( في المحرم ينادي مناد من السماء : الا ان صفوة الله من خلقه فلان ، فاسمعوا له واطيعوه في سنة الصوت والمعمعة) رواه نعيم بن حماد ، واتە : لە موحەرەمدا بانگكەرێ بە ئیلهام بانگ دەكات لە ئاسمانەوە ، فلان كەس هەڵبژاردەی خوایە بۆ خەلافەت ، بەگوێی بكەن ، ئەوەش لەكاتی شەڕو پێكداداندا دەبێت .

دوای ڕزگاری كوردستان و ئێران و عێراق و توركیا و شام ڕو لە قورس دەكات و ڕزگاری دەكات : (وقضينا الى بني اسرائيل لتفسدن في الارض .... خلال الديار) (الاسراء ٤-٥ ....).

لێرەدا قورئـان پێشـبینی دەکات بەنـدە ئازاکـانی خـوا دوجـار ئیسـرائیل دەشـکێنن دوای ئـەوەی دەگـەن بـە دەسـەڵات ، بـەڵام بـەهۆی دەسـەڵاتی ستەمکارانەیان خودا دووجار لەناویان دەبات ، یەکەمجار لەسەر دەستی (نەبوخدنەسر) بووە لە (٥٨٩/٩/٥ پ ز) دا ، لەجاری دووەمدا لە دەستی مەهدی دەبێت ، (بڕوانە / العراق القران والحديث / محمد عرب / ل: ٨٤).

لە دەسەڵاتی مەهدی دا هەمووو کێشە ئایدیاکان و ئابووریەکان و سیاسی یەکان و کۆمەڵایەتی یەکان چارەسەر دەبن: (يملأ الارض قسطا و عد لا كما ملئت ظلما وجورا) رواه الحاكم.

واتە : زەوی پڕ لە دادگەری دەکات وەکو چۆن پڕ لە ستەم بووە ، (كيف انتم اذا نزل ابن مريم فيكم و امامكم منكم) رواه البخاري ، واتە : ئێوە چۆن دەبن کاتێ کوڕی مەریەم دابەزییە ناوتان پێشەوا لە خۆتانە کە ئازادیبەخشە.

شێخی نوورسی فەرموویەتی : گەر ساداتی ئال و بەیت بە تەواوی یەك بگرن و ببنە یەك تیپی یەك گرتوو ، ئەو کاتە ئایینی ئیسلام دەکەنە رابیتەیەکی پیرۆزو تەوەری رابون بۆ ئوممەت ، هیچ سوپایێ لەدونیادا ناتوانێ بەرەو ڕویان خۆی بگرێت ، ئەو سوپایە بەهێزو زۆرە خاوەن دەسەڵاتە ئالی موحەممەدەو سوپای تایبەتی مەهدییە [٣٧٠].

(٢) دابەزینی عیسای مەسیح :

﴿ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ﴾ النساء: ١٥٩ ، واتە : ئەهلی کیتاب بەر لە مردنی بڕوای پێ دێنن .

مەسیح هاریکاری ئازادیبەخشی ئالی موحەممەد دەبێ ، وەکوو دووەم و موعجیزەی نوێ بۆ دونیای تەکنەلۆژی عەلمانی سەرمایەداری دەردەکەون

٣٧٠ (القسم السابع من المكتوبات التاسع والعشرين) و (اشراط الساعة / ل: ٥٩-٦٢.

، بۆ سەلماندنی ڕاستی یە یەکانی ڕوحی و ماددی لە تاقیگەدا ، گێڕانەوەی مەردوم بۆ ئیسلام .
(يأتي المسيح من قبل المشرق ويقتل الدجال) رواه الطبرانی ، واتە : مەسیح لە خۆرهەلآت دێ دەججال دەکوژێت.

(٣) هاتنی دەججال : (يخرج الدجال من قرية هي بالعراق) رواه نعيم حماد ، واتە : ئەو لە ئاوەدانییەك دەردەچێ لە عێراقدا .
(يخرج الدجال ثم عيسى ابن مريم (عليه السلام) ) رواه نعيم ، واتە: دەججال دەردەچێ پاشان کوڕی مەریەم (عیسا –علیه السلام-) دەردەچێ .

بێگومان ئەمە ڕەمزە بۆ ئەمریکاو ڕوسیا ، کە دەججال یەکیان پێ دەگرێت ، بەپێی فەرموودەکان دەججال توانای ماددی و ئابوری و کاری نائاسایی زۆرە ، کە سیحرو جادو و هیپنۆتیزم و ئەستێرە گەری بەکاردێنێت ، بەلآم کارە نا ئاسایی یەکانی مەهدی و مەسیح پلانەکانی ئەو هەلدەوەشێننەوە .

(٤) دەرچوونی : (دابة الارض) :

﴿ ۞ وَإِذَا وَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ ﴾ النمل: ٨٢ ، واتە : گەر بەڵێنی خوا هاتەدی بونەوەرێکمان لەزەوی بۆ هێنانە دەر قسە لەگەڵ خەڵکی دەکات ، کە خەڵکی بەرامبەر ئایەت و بەلگەکانی ئێمە یەقینیان نییە .
ئیمام عەلی دەفەرمووێ : (تكلمهم كلاما) ، واتە : بە ئاسایی قسەی ئاسایی یان لەگەڵدا دەکات .
(مەلا و زانا محمد متولی الشعراوی) هەندێ لەو بۆ چوونانەی باس کردون لەبارەی دەرکەوتنی ئەم موعجیزە گەورەیە باسکراون ، هەندێ دەڵێن : ئەو (دابەیە) بریتییە لە (جساسة) ، هەیە دەڵێ : مرۆڤێکە .

هەیە پێی وایە میکرۆبەکانە کە مرۆڤ نەخۆش دەکات ، ئەمەش دوورە دەربارەیی یەوە[٣٧١] .

(٥) یەئجوج و مەئجوج :

وشەی (یەئجوج و مەئجوج) دوو وشەی عیبری یە ، یان یۆنانی یە واتە : (گاگ GOG) (ماگاك – MAGOG) ، وەکوو (ئازاد ئەبوکەلام) لە کتێبی خۆی دا باسی کردووە[٣٧٢] .

لەسەردەمی (زولقەرنین) دا لە رزگاری جیهانی دا ، کە ئازادی بەخشی ئەو سەردەمە بووە سنوورێکی دەست کرد لەنێوان ئەوان و ستەمدیدەکاندا دروست دەکات ، وەکوو لە سورەتی (الکهف) دا گەڕاوەتەوە : ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ ﴾ الكهف: ٨٣ ، جارەکی تر ئەم بەربەستە لەلایەن (یەئجوج و مەئجوج) دەشکێنرێ و گەلانی دونیا داگیر دەکەنەوە ، مەبەستی ڕاستەقینە لەم میللەتە ئیمپریالیزمی تازەیە ، واتە : ئەمریکاو ڕوسیاو چین و ولاتە زلهێزەکانی ترە .

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (ویل للعرب من شر قد اقترب فتح اليوم من ردم يأجوج ومأجوج) رواه البخاری ، واتە : هاوار بۆ عەرەب لەشەڕێ نزیك کەوتەوە ، ئیمڕۆکە بەربەستی یأجوج و مەئجوج کرایەوە .

جارەکی تر لەسەر دەمی ئازادیبەخشە خۆرئاوا جیهان داگیر دەکات و تاك جەمسەری حوکم دەکات ، تا ئازادیبەخش دێ ، هەم یاسای مێژوی زولقەرنەین دووبارە دەکاتەوە ﴿ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحْوِيلًا ﴾ فاطر: ٤٣ .

بەپێی پێشبینی عاریفان و پێشبینی گەران و ئەم ڕووداوانە لە نزیك (٢٠٠٠) ی زاینی و نزیك (١٤٠٠ك) دا دەست پێ دەکات :

---

[٣٧١] الدار الاخرة ، محمد متولي الشعراوى / ج١ / ل: ٣٥٠.

[٣٧٢] المهدي المنتظر / الشيخ محمود الغرباوي / ل:١٦٩.

بۆ نمونه : (دانیال) پێغەمبەر (علیه السلام) فەرموویەتی : (طوبی لمن اردك ایام الف والا ربع مأة) [٣٧٣] ، واتە : خۆشحاڵی بەوانەی دەگەنە ساڵی (١٤٠٠) .

(مهندس ادهم سلێمان) کە لە گەورە پیاوانی خۆرهەڵاتی چاوەڕێیانی نزیك بوونەوەی قیامەتە پێی وایە ئەم فەرمووده : (لینزلن ابن مریم حكما) بەپێی کەشفی سۆفی یە بڕوا پێ کراوەکان ساڵی (١٩٨٠) کۆتایی دەوڵەتی جولەکەیە[٣٧٤] .

(منصور عبدالحكيم) زۆرێ لە ڕاڤەکانی (تنبوات نوستر‌ا داموس) ی ڕاڤەکردوون کە ئاماژە بەهاتنی ئازادی بەخش و دەججال دەکەن لەنزیل ساڵی (٢٠٠٠)دا : (لەم فارس مەملەکەتە کە فراوان دەبێ تا دەگاتە مەمالیکی ئەوروپا ، شارەکە ئاگر دەدات ، جەنگی خوێناوی ڕوودەدات ، پیاوی ئاسیایی مەزن بە سوپایەکی زۆری وشکانی و دەریایی یەوە .

لێرەدا (نوستر‌ا داموس) ئاماژە دەکات سوپای پێشەوا لە وشکانی و دەریاوە لە وڵاتی فارسەوە خاچ دەشکێنێ و ئەوروپا رزگار دەکات .

لە ساڵی (١٩٩٩) و (٧) مانگ دا پادشای ترس لە ئاسمانەوە دێ پادشای مەگۆلی مەزن بۆ ژیان دەگێڕێتەوە ، پێش و پاش شەڕ لە خۆشی دا دەبێت.

بەپێی ئەم پێشبینی یە سەرە داوی جەنگی جیهانیی سێ یەم لەسەر دەستی ئازادیبەخش و دەججال لەنزیك ئەم سەرە سەدەیە دەست پێ دەكات .

دەڵێ : (ژمارەی حەوتە گەورەکە کۆتایی دێ ، لەکاتێ دا دێ سەرەخۆشی لە کەوتن زۆر دەبێ ، دوو نیە لە سەدەی دووهەزارەی بەختەوەر ، کاتێ

---

[٣٧٣] المهدي المنتظر / الشيخ محمود الغرباوي / ل:١٦٩.

[٣٧٤] القرآن محاولة لفهم عصري / د.مصطفى محمود / ل:٢٨٩.

مـردوووان لـه گۆڕيـان دێنـه دەر). بڕوانـه (تنبـوات نوسـترا دامـوس / ت:جميل حماده / ل:٤٢٠-٤٢١.

(٦) دوكـەڵ : ﴿ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ يَغْشَى النَّاسَ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١﴾ ﴾ الدخان: ١٠ - ١١ ، قورئـان پێشـبينی هـاتنی دووكـەڵێ دەكات لـه ئاخر زەمانـدا كه خەڵكی تووشـی زيـان دەكـات ، وەكـوو لـه (گەردووونناسـی) و (زەوی ناسـی) و (ژينگـەزانی) باسمـان كـردووه ئـەم ئايەتـه پێشـبينی پـيس بوونی هەوا دەكات بەهۆی دووكەڵ و گازی كارگەكان لـەجيهانی تەكنـەلۆژيادا ، كه كارەسات و ڕووداوی گەوره بۆ ژيانی زەوی دروست دەكات .

(د.سامی ريحانا) كتێبێكی نووسيوه : بەناوی (الالعالم من مطالع القرن /٢١) ئامـاژه بـەو كێشـه گەورانـه دەكـات ، كـه بـەروه ڕووی سـەدەی (٢١) دەبێتـەوه ، وەكـوو كێشـەی چـەكی نـاوكی و كێشـەی ژينگـەيی و كێشـەی گەرم بوونی زەوی و ... هتد)

(ئەو هۆيانەی ژينگەو هەوا پيس دەكەن بۆ نمونه : پاشماوەكانی پيشەسازی و پيس بوونی ڕووبارەكان و زۆربوونی مردوووان بەهۆی زۆری نەخۆشييانەوه ، لەناو بردنی خاك و دارستانەكان بۆ نيشتەجێ كردن ، داخورانی خاك و لەناوچوونی توخمی ڕووەكی گياندراان ، پيشەسازييەكان و سوتاندنی خەڵوزی بەردين ، زۆربوونی خوێ بەهۆی پەينی كيميايی ، نەمانی باڵندەكان كه بەشداری دەكەن له هاوسەنگی ژينگەدا ، پيس بوونی هەوا ، زۆر بوونی دانيشتووان ، زيادبوونی چالاكی ئابوری و ناوچەی

کارگەکان و هۆیەکانی گواستنەوەی ئامێری)[375]. ﴿ ظَهَرَ ٱلۡفَسَادُ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ بِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِي ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعۡضَ ٱلَّذِي عَمِلُواْ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿٤١﴾ ﴾ الروم: ٤١

(فەساد) مەبەست تێك چوونی ژینگەیە لە هەمووو بوارێکەوە .

(٧) هەڵاتنی خۆر لە خۆرئاواوە : ﴿ يَوۡمَ يَأۡتِي بَعۡضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفۡسًا إِيمَٰنُهَا لَمۡ تَكُنۡ ءَامَنَتۡ مِن قَبۡلُ ﴾ الأنعام: ١٥٨ ، واتە : هەندێ موعجیزەی پەروەردگارت دێ، کەس بڕوای دادی نادات ئەگەر پێشوو بڕوای نەهێنابێت.

ئاشکرایە وەکو لە (گەردووونناسی) و (زەوی ناسی) باسکراوە ، زەوی یەکێکە لە (١٢) هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆر پێچەوانەی میلی سەعات دەخولێتەوە ، بەڵام ڕۆژێ دێ ئەم ڕێڕەوەی بگۆڕێ ، زەوی وەکو میلی سەعات بخولێتەوە ، ئەو کاتە لە خۆرهەڵاتەوە ئاوا دەبێ و لە خۆرئاواوە هەڵدێت و ئەمەش نیشانەیەکی گەورەی قیامەتە .

لە فەرموودەدا هاتووە : ئەم موعجیزانە یەکێ لەوانە : (طلوع الشمس من مغربها) رواه مسلم ، واتە : هەڵاتنی خۆرە لە خۆر ئاواوە .

(ج.ا.ج- رایز) دەنووسێ : (عەمانوئیل فلیکوسکی) لە کتێبی (عوالم في تصادم) گریمانی کردووە کەسیستەمی خۆری بەرەو ڕووی چەند زەبرێ بۆتەوە ، ئەو پێی وایە کلکدارێکی زەبەلاح بەهەسارەی (مەریخ) کەوتووەو لە ئەنجامدا (زوهرە) پەیدا بووە ، بۆیە ئەم هەسارەیە دەگمەنە و پێچەوانەی هەسارەی تر دەخولێتەوەو خۆری لە خۆرئاواوە هەڵدێ ، لەکاتی پشکنینی (مانیر٢) دا لە دەوری دا سروشتی دەگمەنی تری بەدی کرد.

---

[375] الالعالم في مطالع القرن / ٢١/ العميد الدكتور سامي ريحانا / ل:٥٦/ج١ ، (گەردوون ناسی ، زەوی ناسی ، ژینگە ناسی) نووسەر سەیر بکە.

ئـەم زەبـرە زلەیـە هاوسـەنگی زەوی تێـك داو زۆر گۆڕانكاری تێـدا پەیـدا كـرد ، لەوانـە گـۆڕینی تـەوەی زەوی ، كـە ماوەیـەك خـۆر تێیـدا وەسـتا ، وەكوو لە گێڕانەوەی ئایینی دا باسكراوە (یوشع) خۆر ڕادەگرێت).

(ئەدگار كیس) پسپۆڕی ئـەمریكی لـەبواری دیـتن لـەدوورەوە دەڵـێ : سـێ كارەسـات بـەر زەوی كـەوتووە ، لـەنێوانی (١٠٠٠٠) سـاڵ و (٢٨٠٠٠) سـاڵ و (١٢٥٠٠٠) سـاڵدا ، كارەسـاتی تـریش هەیـە بـەردەوام هەڕەشـە لـە زەوی دەكەن ، لێرەدا ئاماژە هەیە شارستانی مرۆیـی بـەپێی حیسابی زەمـەنی گەردوونی كاتی یە.[٣٧٦]

وە قورئان ئاماژە دەكات هەمان كارەسات دووبـارە دەبێتـەوە : ﴿ وَإِن يَرَوْاْ كِسْفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ سَاقِطًا يَقُولُواْ سَحَابٌ مَّرْكُومٌ ﴿٤٤﴾ ﴾ الطـور: ٤٤ ، واتـە : گـەر تەنێكی ئاسمانی ببینن خەریكە دەكـەوێت بـەزەوی دا دەڵێن : هـەورێكی كەڵەكەیە.

ئاشكرایە كلكدارەكان لای زانایانی گەردووننـاسی نوێ، بەستەڵەكن و وەكو هـەورێكی كەڵەكـە وان .(ئیسحاق نیـوتن) بـەر لـە (٢٥٠) سـاڵ پێشـبینی دەكات ساڵی (٢٠٢٠) زەوی تووشی كارەساتێكی سروشـتی كاولكـار دەبێـت ، وەكوو (زیـد محمـود علـی) لـە كتێبـی (التوقـع السیاسـی / ل:١٦) دا باسـی كـردووە .

لە كتێبی (ظهور الامام المهدي / ١٩١٥)دا هـاتووە ، كـە دوور نیـە سـاڵی (١٩١٥) تـەنێك بـەر زەوی بكـەوێ و ڕێـڕەوی زەوی بگـۆڕێ و كارەسـات بـۆ زەوی پەیـدا بكـات ، كـە چـاخی زوهـرە ، ئـەم كتێبـە نووسـراوی (جـابر البوشی)یە ، ٢٠٠٦ دەری كردووە .

هەرچـی (منصـور عبـدالحكیم)ە دەنووسـێ : (لەوانەیـە سـاڵی (٢٠١٩) نـەیزەكێ لەئاسمانـەوە بـەر زەوی بكـەوێ ، بـەناوی ( NT-7 – ئـێن تـی

---

[٣٧٦] عصر الخوارق / ل:١٠٢.

حەوت) ، کە لێ کۆلەران سالی (٢٠٠٢) بەو ناوە ناویان نا ، ئەم تەنەیە خێرایی (٢٨ کم /چ) داو تیراسای ڕووەو زەوییە ، گەر خوانەخواستە بەر زەوی بکەوێ یەك کیشوەر لەناو دەبات و کەش و هەوا دەگۆڕێ و کار دەکاتە سەر تەواوی زەوی .

لە مانگی نیسانی (٢٠٠٢) دا ئاژانسی (ناسا) ڕایگەیاند نەیزەکێ تیرەی کیلۆمەترێ زیاترە (٨٧٨) سالّ لە زەوی دوورە ، دوور نیە گەر بەر زەوی بکەوێ بۆشاییەك پەیدا بکات تیرەکەی (١٦کم$^2$) بێ و ملیۆنەها کەس بکاتە قوربانی ... هتد[٣٧٧] .

ئایا دەکرێ ولاّتی ئەمریکا بەنیازکێکی لەناو بچێت ؟ بێگومان ئەوە خوا خۆی دەزانێت! [٣٧٨] .

هەمووو ئەو پێشبینیانە ئەوە دەردەخەن هەمووو سیناریۆگانی ئاخر زەمان خەریکی تەواو بوونە و ڕۆژ بە ڕۆژ لەوێران بوونی زەوی نزیك دەکەوینەوە ، کە وەکو بۆمبایەکی تەوقیت کراو ئامادەکراوەو لەهیکرادەتەقێتەوەو خۆی و ژیانی سەر ڕوی زەوی لەناو دەبات : إِذَا زُلۡزِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ زِلۡزَالَهَا ۝١ وَأَخۡرَجَتِ ٱلۡأَرۡضُ أَثۡقَالَهَا ۝٢ ﴾ الزلزلة: ١ – ٢ .

جگە لەمەش ئەم چەرخەی دەچینە ناوییەوە بەچەرخی (دۆلکە) ناسراوە ، کە گۆڕانێکی ڕوحی و ئاینی تێدا بەڕێوەیە ، هەمووو ئەو موعجیزانەو دەیان موعجیزەی تر لەم چاخەدا دەبینرێت ، کە تەکنەلۆژیاو زانستی ڕوحی نوێ تێ ی دەکەوێتەوە حەپەسان و سەرسوڕمانەوە .

(ج.اج.رایز) دەنووسێ : ئەم چاخەی لێ ی باز دەدەین چاخی نەهەنگ (الحوت) ە ، کە پڕە لە زانستی ماددی ، بەلاّم ئێمە ناتوانین هەرسیان بکەین

[٣٧٧] السينا ريو القادم الاحداث اخر الزمان / منصور عبدالحكيم / ل:١٨٧.
[٣٧٨] السينا ريو القادم الاحداث اخر الزمان / منصور عبدالحكيم / ل:١٨٧.

، کاریگەری (دۆلکە) هۆشیارییەکی ڕوحی پەیدا کردووە ، بەهۆیەوە دەکرێ گۆڕانی ڕوحی لەو زانستانەدا پەیدا ببێ ، کە لە دۆزینەوەی زیاتری ئەو دیاردانە خۆیان بنوێنن ، لەدیاردەکانی هەستی شەشەمەوە پەیدا دەبن[٣٧٩] ، ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ ٩ ﴾ الصف: ٩.

## ڕاهێنان

(١) پاڕانەوەو نوێژی (الحاجة) باشترین ڕێگایە بۆ بینینی خەونی پێشبینی و ئیلهامی خودایی ، (وەکو باسکرا) .

(٢) پرسیارێ بکە لە مێشکدا بەر لە ئێواران ، یان نوێژ بکەو بپاڕێوە ، بیرت کۆ بکەوەو ڕابمێنە ، چارەکان دابخە ، هەناسەی قووڵ بدە بۆ خاوبوونەوە ، بۆ گەیشتن بە دۆخی سووکە خەو (النعاس) با پرسیارەکەت پەیوەندی هەبێ بە پێشبینی یەوە .

(الشیخ عبدالرزاق) لە موعجەمی عیرفانی یەکەیدا باس دەکات : (ئیلهامی خوایی بە (خاطر الحق) ناو دەبرێ ، ئیلهامی فریشتەیی بە (ئیلهام) ناودەبرێ ، ئیلهامی دالغەیی بە (الهاجس) ناو دەبرێت ، ئیلهامی شەیتانی بە (الوسوسە) دەناسرێت)[٣٨٠].

## قوتابخانەو بۆچوونەکان دەربارەی خەون و ئیلهامی پێشبینی :

---

[٣٧٩] عصر الخوارق / ٩٩.
[٣٨٠] عصر الخوارق / ٩٩.

وەکو (د.علی الوردی) لە کتێبی (الاحلام) ، باسی کردووە قوتابخانەی (فرۆید) گەورەترینی هەڵەکانی لەڕوی بایۆلۆجی و دەروونی ئەوەیە کاتێ (نەست) دەکاتەوە و دەڕواتە ناو ئۆقیانوسە فراوانەکەی تەنیا یەك غەریزەی تێدا دەبینێ ، ئەویش غەریزەی جنسی (سێکسی)یە ، ئەو ئایدیایەش لەو ژینگەیەوە سەرهەڵدەدات فرۆیدی تێدا ژیاوە ، ئاشکرایە (فرۆید) لە شاری (ڤییەنا)دا ژیاوە ، ئەم شارە بەر لە جەنگی جیهانی یەکەم پایتەختی ئیمپڕاتۆرێکی گەورە دەبێ ، کە لە نەریتی کۆنی خۆی دا قووڵ بۆتەوە ، ژنانی ئەو دەڤەرەیە لەڕوانگەی خواردن و خواردنەوە تێربوون ، بەڵام لە ڕووی غەریزەی جنسی یەوە تینوبوون ، لەبەر ئەوە ئەم کپ کردنە جۆرەها نەخۆشی جنسی یان بۆ پەیدا دەکات ، فرۆید هەلی بۆ ڕەخسا زۆرێ لەو جۆرە نەخۆشانە بچنە لای ، بۆیە ئەو پێی وابوو بە (قیاس) هەمووو خەڵکی نەخۆشییەکانیان لەم تەزرەیە ، گەر ئەو لەژینگەیێکی تر ژیابایە تیۆرەکەی بەو شێوەیە نەدەبوو.

گەر بڕوانینە (منداڵ) لەدیدگای فرۆیدەوە دەبینین لادانی زانستی زۆری پێوە دیارە ، دەبینی هەموو جووڵەو هەستەکانی منداڵ ، کە نەزانی یان پێوە دیارەو کرچ و کاڵی یان تێدا دەبینرێ ئەو بە مەبەستێکی شەهوەتی و هەوەسباز لێکیان دەداتەوە ، کاتێ منداڵ گەمە بە شەرمگەی خۆی دەکات ، کاتێ مەمکی دایکی دەمژێ یان پەنجەی خۆی بە نیشانەی ئارەزووبازیان راڤە دەکات ، یان باس لە گرێ ی (ئودیب) دەکات ، گوایە منداڵ ڕقی لە باوکەو بەو گرێ یە خۆشی دەوێ و ویژدانی سروشتی ڕایدەکێشێ خۆشی بوێت ، چونکە ململانێی دەکات لەچێژوەرگرتن لەدایکی .

هەر چەندە (فرۆید) بەدوای ئەوەدا دەربارەی ئارەزووی جنسی پەشیمان بۆوە ، بەتایبەتی لە مەسەلەی لێکدانەوەی خەوندا ڕایگەیاند زۆر شتی تر کاری تێ دەکات وەکو برسێتی و تینوەتی ، بەڵام (ئەدلەر) شۆڕشێکی گەورەی لەبەرامبەردا دروست کرد ، سەرەتا قوتابی ئەو بوو ، بەڵام دوای لێکۆڵینەوە لێ ی هەڵگەڕایەوەو ئیمرۆش پەیڕەوانی زۆرن.

(ئەلفەر ئەدلەر) پێی وابوو تیۆری فرۆید نادیارە ، ئارەزووی جنسی ئەوەندە گرنگ نییە وەك مامۆستایەكی گوێی پێ داوە .

(ئەدلەر) دەڵێ : منداڵ هیچ لە ئارەزووی سێكسی نازانێ و هەست بەهیچ مەیلێك ناكات ، ئەو تەنیا شتێكی تر دەزانێ ، ئەویش هەست كردنە بە كەمتوانایی : (الشعور بالنقص).

ئەو پێی وایە خەونەكان هێنانەدی ئەو هیوایانەیە مرۆڤ لەكاتی بێداریدا خولیایانە و دەپەرێ دەستیان بەسەردا بگرێت ، تیۆری ئەویش بێ رەخنە نیە ، چونكە لەیەك روانگەوە راستی یەكان و لایەنەكانی تر پشت گوێ دەخات . بەلاَم لەتیۆری فرۆید راسترە[٣٨١] .

بێگومان لە ئیسلامدا خەونەكان سێ جۆرە : خەونی خوایی ، خەونی شەیتانی ، خەونی دالْغە ، كە قوتابخانەی فرۆید چەقی لەسەر بەستووە ، خەونە پێشبینی یەكان بەتەواوی قوتابخانەی فرۆید لەڕاست خەوندا هەرەس پێ دێنن ، پێشبینی یە قورئانییەكان و پێشبینی یەكانی سوننەت و پێشبینی كەران هەموویان بەكۆی دەنگ لە قازانجی تیۆری ئەودانین.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (من رانی فقد رانی فان الشیطان لن یتمثل بي) رواه البخاري (رابردوو ماناكراوە).

سەرباری ئەوەش زانستی روحی ئیسلامی و عیرفانی و میتا فیزیكی كۆن و نوێ هەموویان بوونی گەردوونی نادیار دەسەلمێنن ، كە زەمان و مەكان تێیدا ناخوێندرێتەوە ، لە هەر كۆڕێ دادەنیشی گەر باسی خەونی پێشبینی بێتە گۆڕێ كەست دەست ناكەوێ چەند نمونەیەكی لە ژیانی خۆیدا هەڵنەرێژێ ، كە رووداوەكانی رابردووی ئەویان پێشبینی كردووەو دوایی وەكو دۆخی هاتونەدی.

[٣٨١] الاحلام / د.علي الوردي / ل:٩٢-٩٨ / بە كورت كردنەوە .

یەکێ لە لێکۆڵەرانی خەون (مامۆستا راین) لەناوەندی زانستی دا دان بە خەونی پێشبینی دا دێنێ ، چەند نمونەیەك دێنێتەوە ، لەوانەیە : پیاوێکی ناسراو دەیەوێ لەکاتی لاوی دا سەفەر بکات ، بەلأم لە خەونی دا پێی وایە ئەو سواری شەمەندەفەر بووەو لە رێگادا تووشی بەرکەوتن بووە ، بۆیە سۆپەی گالیسکە دەکەوێ بە سەری داو ، ئازادی زۆری لێ دەدات ، بۆیە بەترسەوە بێداربۆوە و نەیاری نواند لەوەی سەفەر بکات ، لەرۆژی داهاتوو بینی خەونەکەی هاتەدی ، سۆپەی یەکێ لە گالیسکەکان دوای بەرکەوتنی شەمەندەفەر کە بەر کەسێ کەوتووەو مردوووە .

هەروەها یەکێ لەلێکۆڵەرە ناودارەکانی تر بەناوی (تیرل) گرنگی بەخەونەکان دەدات ، لەیەکێ لە کتێبەکانی دا بەناوی دەربارەی پێشبینی خەونەکاندا کۆمەڵە بەسەرهاتێك دەنووسێتەوە ، لەوانەش : (ئوکنر) کە کەسایەتی یەکی بەریتانی یە لەساڵی (١٩١٢) دا دەیەوێ بەپاپۆڕی ناوداری (تایتانك) سەفەر بکات ، بەلأم خەون دەبینێ پاپۆڕەکە نقوم بووەو سەرنشینەکان و کەشتی یە وانەکان لەدەوری دا مەلە دەکەن ، شەوی داهاتوو هەمان خەونی بینی یەوە ، بەلأم هیچ گرنگی یەکی بەو خەونانەداو سوور بونی خۆی بۆ گەشتەکە دەرخست ، بەر لەهەفتەیێك لەبەرێ کەوتنی ئەو کەشتی یە لە ئەمریکاوە بروسکەیێکی بۆ هات سەفەرەکەی دوا بخات ، لەبەر ئەوە (ئوکونر) ئەم بلیتەی بری بوی هەڵی وەشاندەوە ، لە ئینگلترا مایەوە چاوەڕێ ی بروسکەی تر دەکات ، کاتێ بیستی ئەو پاپۆڕە نقوم بووە ، دوای ئەوەی بەر چیایەکی گەورەی سەهۆڵ کەوتووەو کەسانێکی کەم نەبووە دەرنەچوون ، زۆر بەلایەوە سەیر بوو)[٢٨٢] .

بێگومان بەلای فرۆیدیزمەکانەوە ، یان ماتریالستەکانەوە ئەم خەونانە بەرێکەوت دروست دەبن ، ئەم بۆ چوونەش بۆ ئەوان سەرمان سەرناهێنێ ، چونکە ئەوان پێیان وایە ، کە تەواوی گەردوون بەماددەو ژیانەوە بێ مەبەست بەرێکەوت دروست بووە ،

---

[٢٨٢] الاحلام / د.علي الوردي / ل:١٤٥-١٤٦.

بەلاّم بێگومـان ژمـارەی بـۆ شـوماری ئـەو هـەموو خەونانـە بیرۆكـەی ڕێكـەوت پـوچ دەكەنەوە .

ئەگەر ئەم پێشبینی یـەی سوودیان لـەدونیای غـەیب وەرگرتـووە ، لەگـەڵ (پێشهاتی سیاسی) بەراوردیان بكـەن ئـەو كاتـەی بۆمـان دەردەكـەوێ ئـەم دوو دیاردەیـە چـەندە لێك دوورن !

له ساڵی (١٩٣٩) دا (میسینیك) كه خـاوەنی توانایـەكی ڕوحـی زۆربـووە پێشبینی كـرد ئەگەر (هیتلەر) لەشكر كێشی بكـات بـەرەو ڕوسـیا ئـەوە شكەست دێنێـت ، (هیتلـەر) بەم پێشبینی یە زۆر تـوڕە بـوو ، بڕیـاری دا هـەر كەسـێ (میسینك) بكوژێ (٢٠٠٠٠٠) ماركی پێ بدات لەبەر ئەوە ئەڵمانیا بەجێ دێڵێت[٣٨٣] .

بێگومان زۆرێ له سەركردە سیاسییەكان و پادشایان لـەزەمانی خۆیانـداو ئێستاش بـۆ دۆزینەوەی چارەنووس و داهاتوو ساڵی (١٩٤٥) كۆنگرێسی ئەمریكی قسەی لەبەر ئەوە دەكـات مەڵبەنـدێكی یـەك گرتـوی ئەسـتێرە گـەڕان دابنـێ ، لەئـەمریكادا (٣٠٠٠٠) ئەستێرە خوێنەر هەیە ، سەرباری ئەوانەی ئاشنان بە تلەپاتی و دوربینی و پێشبینی كردن[٣٨٤] .

ئـەم پێشبینی كەرانـە كاریـان لـەكاری پێشهاتی سیاسـی یـەكان جیایـە كـە پشـت بـە هەڵسەنگاندنی ژیر دەبەستن .

قورئانی پـیرۆز ئـەم دوو بۆچـوونە لێـك جیـا دەكاتـەوە ، دەبینـی كـاتێ (قوسـتەنتین) لەساڵی (٣٢٥ز) دا بووە ئیمپڕاتۆری ڕۆمان كه هیچی لەكاروباری حكومـەت و سیاسـەت نـەدەزانی ، بۆیـە (فوكـاس) شۆڕشـی لـەدژدا كـردو بـووە پادشـای (ڕۆم) ، دوای ئـەوەی دڕندانە كۆتایی بە خێزانی شاهانەی ڕۆمان هێنا باڵوێزی ڕەوانەی كیسرا (پـەروێز)ی

---

[٣٨٣] الابراج / حمید الازري / ل:٤٨.
[٣٨٤] التوقع السیاسی / ل:٩.

نێران کرد ، کوڕی (نەوشیروان)ی دادوەر بوو ، ئەم کیسرایە بۆ شاد (مورس) دڵسۆز بووەو کچی خۆی پێ داوە ، بۆیە بە باوکە ناوی بردووە ، ئەم کیسرایە بە سوپایەکی گەورەوە پەلاماری وڵاتی رۆم دەدات و تێکی دەشکێنێت.

دوای ئەوە (هرقل)ی کوڕی سوپایەکی گەورە کۆدەکاتەوە بەنهێنی بەکەناری ڕۆمانی دا دەڕوات و ئیمپراتۆریەتی رۆمی دەگرێ و (فوکاس) ی ناپاك دەکوژێت ، بەڵام فارسەکان لە لەشکرکێشی دەوام دەکەن وبەهاتنی حوکمی هیرقلیش دەست بۆ ئاشتی راناکێشن و سنووری بۆ لەشکر کێشیەکانیان دانانێن.

(هرقل) پەلاماری دەسەڵاتی فارسی دا لەدوای داگیرکرانی بەشێ لەئیمپراتۆریەکەی ، توانی سەرکەوتن بەدەست بێنێت.

قورئان پێشبینی ئەم سەرکەوتنەی رۆمەکان دەکات ، دوای ئەوەی فارسەکان ساڵی (٦١٦ ز) ڕۆم و ناوچەکانی خۆرهەڵاتی ڕۆم داگیر دەکەن : ﴿ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ۝٢ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ۝٣ فِي بِضۡعِ سِنِينَ ﴾ الروم: ٢ — ٤ .

(جین) دەڵێ : کاتێ قورئان ئەم پێشبینی یەی کرد ، زۆر لە واقیعی ئەو کاتەوە دووربوو ، چونکە ئەو (١٢) ساڵەی (هرقل) حوکمی تێدا کرد جاڕی هەرەس هێنانی ئەم ئیمپراتۆرییەی دەدا[٢٨٥] .

سەرنج بدە لەگەڵ باس کردنی ئەم پێشبینی یە مەزنەدا ، ئاماژە بە ئیعجازێکی جوگرافی گەورە دەکات ، و ئاماژە دەکات ئەو ناوچەیە ، کە (دەریای مردووو)دو نزمترین شوینە لە زەویدا ، و لە (ادنی الارض) ناوی بردووە ، ئەمەش یەکێکە لە جیاوازییە بەرچاوەکانی نێوان پێشبینی یە موعجیزەیی یەکانی قورئان و غەیری قورئاندا ، (٢٩٥) مەتر لەئاستی دەریاوە نزمترە .

---

[٢٨٥] بەکورت کردنەوە لە (الاسلام يتحدي/ وحيد الدين خان / ل:١٣١ — ١٣٥ وەرگیراوە .

بێگومان کاتێ قورئان ئەم پێشبینی یەی کرد ، سیاسی یانی قورەیش هەرگیز ئەم پێشهاتەیان نەدەکرد ، بەڵکو پێیان وابوو جارەکی تر ڕۆمەکان سەرناکەونەوە !

گەر بڕوانینە مێژو زۆر لە سەرکردە سیاسییەکان و بلیمەتەکان کە بڕوایان بە غەیب نەبووەو پێشهاتی عەقڵی یان بۆ خۆیان کردووە ، بەلاّم زەمەن بە ڕەهایی ئەم پێشهاتانەی نەهێناوەتەدی ، چارەنووسی گەلیان بەرەو لەناوچوون بردووە ، وەکوو : (ناپلیۆن) و (مارکس) و (ئەدۆلف هیتلەر) و کەسانی تر.

ناپلیۆن گەورەترین سەر لەشکری جیهانی سەردەمی خۆی بوو ، سەرکەوتنە خێراکانی لەسەرەتادا پیشانیاندەدا دەبێ بە هاوشانی (قەیسەر) و (ئەسکەندەری مەقدونی) ، ئەوە دەیگوت چارەنووسی ئەو تەنیا سەرکەوتنە بەسەر زەویدا ، کەچی کاتێ (١٢/یونیە/١٨١٥) کاتێ لە (پاریس)ەوە بە لەشکرێکی مەزنەوە کەوتە ڕێ تا شکەست بە دوژمنانی بێنێ لە ڕێگادا ، لەماوەی (٦) ڕۆژدا گەورەترین دۆڕان بەرەو رووی سوپاکەی بۆوە ، لەسەر دەستی (دوق و بجنتون) هاتەدی ، کە پێشڕەوی سوپای ئینگلتراو ئەڵمانیاو هۆڵەندای دەکرد .

لە (بەیانی حزبی شیوعی)دا ، کە لە ساڵی (١٨٤٨)دا دەرکرا ، پێشهاتی کرد ، (ئەڵمانیا) یەکەم وڵات دەبێ شۆڕشی تێدا ئەنجام دەدرێ ، کەچی تا ئیمڕۆ شۆڕشی لەم جۆرە لەم وڵاتەدا ڕووی نەداوە.

لە ساڵی (١٨٤٩) دا (کارل مارکس) وتی : (کۆماری سوور لە ئاسمانی پاریس دا دەردەکەوێ) کەچی تا ئیمڕۆ ئەم ئالاّیە لە بەسەر خەڵکی پاریسدا هەڵنەهات .

یان (هیتلەر) لە وتارە ناودارەکەیدا لە (میونخ) لە (١٤/مارس/١٩٣١) دا وتی : (من بە ڕێگای خۆم دا دەڕۆم ، بڕوا تەواوم وایە سەرکەوتن بۆمن نووسراوە) ، تەواوی

دونیاش شاهیدی ئەوەیە ئەوەی بۆ قەدەری ئەم سەرکردەیە نووسراوە تێك شكان و دۆڕان بوو)[٣٨٦].

پێغەمبەری ئیسلام ﷺ خەونەكان دەكات بە سێ بەشەوە : خەونی خوایی ، خەونی شەیتانی و خەونی دالغەو خەیاڵ ، كە (نەست) دروستیان دەكات .

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ تِلْكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهَا إِلَيْكَ ﴾ هود: ٤٩ ، ﴿ وَلَا أَعْلَمُ الْغَيْبَ ﴾ الأنعام: ٥٠ ، كەواتە : غەیب تەنیا لای خودایە ، تەنیا خوا دەیزانێ و كەس ناتوانێ بیزانێ ، تەنیا بەو برە ڕێژەی یە نەبێت كە خۆی بە سروش و ئیلهام ڕەوانەی سەر دڵی پێغەمبەران و صددیقینەكان و ئەولیایانی دەكات ، جار هەیە لە ڕێگای خەونی ڕاستەوە هەندێ لە ئاییندەو چارەنووس بۆ مرۆڤەكان ئاشكرا دەكات ، تا بڕوابونیان بە (غەیب) دابمەزرێ و بزانن ، لەسەروی دونیای ماددەوە گەردوونی نادیاریش هەیە ، كە زەمان و مەكان حوكمی تێدا ناكات ، مرۆڤ لەدوای مردندا بەیەكجاری بۆ ئەوێ كۆچ دەكات .

(مستردن) ئەم لێكۆڵەرە ناودارە بەریتانی یە كتێبەكی نوسیوە بەناوی (تجربە مع الزمن) ، ئەم كتێبە لە ناوەندی زانستی دا لەوێ دەنگی دایەوە ، ئەو پێی وایە (زەمەنی داهاتوو بە هەموو ڕووداوەكانیەوە لەپێشمانەوەیە وەكو چۆن زەمەنی ڕابردوو لە پشتمانەوەیە ، ئێمە لەڕێگای خەونەكانمانەوە دەتوانین چۆن تەماشای ڕابردوو بكەین ، ئاواش سەیری داهاتوو بكەین ، بەڵام لە توێژینەوەی خەونەكانماندا ڕاهاتووین سەیری دواوە بكەین نەك داهاتوو ، ئەمەش وەكو كەسێكە سەر قادرمەیێ دەكەوێ تەنیا تەماشای دواوەی خۆی دەكات كە پێ یەكانی لەسەر دادەنێ و

[٣٨٦] بەكورت كردنەوە لە (الاسلام يتحدي/ وحيد الدين خان / ل:١٢٧-١٢٨) وەرگیراوە

هەڵدەگرێ ، هیچ گوێیە بەبەشی سەرەوە نادات ، کەچی گەر سەری بەرز بکاتەوە پێش خۆشی دەبینێت)[٢٨٧].

## جیاوازی نێوان خەونی سروشتی و خەونی هیپنۆتیزم :

(د.علی الوردی) دەنووسێ : (کاتێ مرۆڤ بەنووستنێکی ئاسایی خەوت ، نەستی (اللاشعور) لە جڵەوی خۆی دەردەچێ ، خەونی جۆراو جۆر پەیدا دەبێت ، هەرچی خەونی هیپنۆتیزمە لە خەونی سروشتی جیایە ، چونکە بە ئیحاو پێ گوتنەکانی خەوێنەرو ویستی ئەو دەخەوێت ، بەو پێیە خەوێنەر (المنوم) چی بە خەوێنراو بڵێ ئەوە دەبینێت، ئەو کەسەی لە هیپنۆتیزم دا دەتوانرێ بە ئیحاکان خەونەکان دروست بکرێن و خەیاڵەکان بکرێن بەواقیع)[٢٨٨].

قورئانی مەزن دەربارەی ئەم دیاردەیە فەرموویەتی : ﴿ سَحَرُوٓاْ أَعۡيُنَ ٱلنَّاسِ ﴾ الأعراف: ١١٦ ، واتە : چاو بەستەکی لەچاوی خەڵکی کرد .

دیسان لە حاڵەتی هیپنۆتیزم دا داڵغەو خەیاڵی خودو کەسانی تر زۆر دزە دەکاتە ناو نەستی خەوێنراوە .

هەرچی (هـ.س وارین H.C warren)ە دەنووسێ : (خەواندنی موگناتیسی – Hypnotism) بارێکی دەست کردە ، بە نووستنی ئاسایی دەچێ ، بەڵام لە ڕووی فسیۆلۆجیاوە لێک جیان ، بەوە جیا دەکرێتەوە توانای وەرگرتنی ئیحاو تەلقینی زۆری هەیە[٢٨٩].

---

[٢٨٧] الاحلام ١١٧.

[٢٨٨] الاحلام /١١٧.

[٢٨٩] انشطار الذهن / بيتر مالكير / ل: ١٣٥/ ت: د.حلمي نجم.

پێشەوا عەلی (کرم الله وەجهە) ئاماژە بەهۆکاری دروست بوونی خەونەکان دەکات و لە پێغەمبەری مەزنی ﷺ گێڕاوەتەوە ، (حاکم) کە (الذهبي) لە (سير الاعلام النبلاء) بە (امام المحدثين) ناوی دەبات گێڕاویەوە : (عومەری کوڕی خەتتاب بەدیداری پێشەوا عەلی گەیشت (ڕەزاو سەلامی خوایان لێ بێ) ، وتی : ئەی باوکی حەسەن بۆچی پیاو جار هەیە خەونەکەی درۆ دەردەچێت؟ وەڵامی دایەوە : بەڵێ ، لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە فەرموویەتی : (ما من عبد ولا امة ينام عند العرش فتلك الرؤيا التي تصدق ، والذي يستيقظ دون العرش فتلك الرؤيا التي تكذب).

واتە : گەر بەندە نوست و لەخەوەکەیدا قووڵ بۆوە ، ڕوحی بەرەو عەرش بەرز دەبێتەوە ، ئەوەی دەگاتە عەرش و بێدار نابێتەوە خەونەکەی ڕاست دەردەچێ ، بەڵام گەر نەگەیشتە عەرش و خەبەری بۆوە ئەو خەونەی دەیبینێ ڕاست دەرناچێت ، ، کەواتە : ئەو کەسانە خەونی ڕاست دەبینن ڕوحیان ئەوەندە پاك بۆتەوە دەگاتە عەرشی خوا ، بەڵام ئەو کەسانەی ڕوحیان پاکژ نەبۆتەوەو ناتوانێ بگاتە عەرشی خوا لەبەر بوونەوەدا خەونەکانی ڕاست و دروست دەرناچێت ، چونکە ناگاتە ئاستی مەلەکوتی ئیلهامی خوایی وەربگرێ ، یان لە ڕوحی پەست ، یان داڵغەو خەیاڵەکان زاڵ دەبن بەسەر نەستی دا ، چونکە نەیتوانیوە بیری کۆبکاتەوەو لەوەسوەسەو داڵغەکانی خاوێن بکاتەوە .

گەر بڕوانیە گەورە پیاوان و سەرکردەکان لە پیاوان و ژنان لە قورئاندا ، لە غەیری پێغەمبەران وەکو : ((زولقەرنەین) و (دایکی موسا) و (طالوت) و (مەریەم) بەتەنیا پشتیان بە پێشهاتە عەقڵییەکان نەبەستووە ، بەڵکو پشتیان بە ئیلهامی خوایی بەستووە ، بەپلانی مەلەکوتی کاروباری ئایینی و سیاسی و سەربازی خۆیان بەڕێوە بردووە ، تاوەکو تووشی کاری سەلبی و هەرەمەکی نەبن و بۆ ڕێکەوت و هەلەکان بەجێیان نەهێڵن ، بەڵکو بەپێی داخوازی ئاسمانی کارەکانیان بڕوێنن و بتوانن کێشە

کۆمەلایەتیەکان و سیاسی یەکان و ئایینی یەکان و سەربازییەکان ...هتد ، چارەسەر بکەن ، چارەنووسی خۆیان و گەلەکەیان بە ئاقارێکی مەترسیداردا نەبەن.

بڕوانە سورەتی (الکهف ٨٣-٩٩) و سورەتی (مریم ١٦-٣٢) و سورەتی (القصص ٧-١٣).

دیسان نوێکەرەوەکانی ئوممەتی موحەممەد ﷺ لەلایەن خوداوە هەمان بەهرەو توانای ڕوحی یان پێ دەدرێت تا بتوانن لەو ئاستەدا بن ئایینی خوا نوێ بکەنەوە : (ان الله يبعث على كل مأة سنة من يجدد لها دينها) یان هاتووە : (ان الله ليقيض لهذه الامة على رأس كل مأة سنة من يجددلها امر دينها يلهمة الله العلم الهاما) رواه ابو داود ، واتە : خودا لە هەمووو سەرەسەدەیێکدا کەسێك دەنێرێ ئایینی ئەو نوێ بکاتەوە ، خودا بە ئیلهام زانستی فێر دەکات .

(القضاني) گێڕاویەوە ﷺ فەرموویەتی : (من اخلص لله اربعين صباحا تفجرت ينابيع الحكمة من قلبه على لسانه) واتە : کێ (چل) بەیانی بۆ خوا دڵسۆزی پەیدا بکات ، خودا کارزانی و دانایی لەدڵیەوە هەڵدەقوولێنێ بۆ سەر زمانی .

ئەمەش ئاماژەیە بۆ خلوەی چڵ ڕۆژی ، بۆ عیبادەت و یادو ڕامان و ڕۆژو بەدڵسۆزی و پاکژی یەوە .

## پێنج خشتەکییە پێشبینی یەکانی خواناسی گەورە ( عێل بەگی جاف )

ئەم شاعیرو پێشبینی کارو خواناسە مەزنە بەر لە (٤٠٠) ساڵ لەمەوبەر پێشبینی نیشانەکانی ئاخرزەمان و هاتنی ڕزگاری بەخشی کردووە ، بە (مەولا) و بە (عەلی) ناوی دەبات ، گەر کورد ئەم شاعیرەی نەبوایە شیعری کوردی بێ بەش دەبوو لەم جۆرە شاعیرانەو دەبو بە نەنگی یەك لەم بوارەدا ، ئەو دەفەرمووێ :

من بە قەولی گۆران دەکەم    قسە لەژێر هەوران دەکەم

هەمووی لەبۆ سۆران دەکەم     ئیتاعەی دەوران دەکەم

هەروا بووەو هەروا دەبێ

ئەو سا ئەدای وەفا دەکەم     شەرم پڕ شۆڕ سەودا دەکەم

هەر تەماشای دونیا دەکەم     ڕوو بە توری سینا دەکەم

هەروا بووەو هەروا دەبێ

ئێران پڕ لە ئاگر دەبێ     حوکمی سوڵتان قاهر دەبێ

ستەم لە خەڵك سادر دەبێ     دەورە دەوری نادر دەبێ

هەروا بووەو هەروا دەبێ

خاسان وەبێ وەتەن دەبێ     مورغان دوور لە چەمەن دەبێ

شاهان وەبێ کەفەن دەبێ     دەوران وەکامی زند دەبێ

هەروا بووەو هەروا دەبێ

دەوران بەدەست قەجەر دەبێ     تەیمور لەخەو بەر دەبێ

گەلێ سەران بێ سەر دەبێ     ئاشوب و شۆڕو شەڕ دەبێ

هەروا بووەو هەروا دەبێ

جیهان پڕ له غەوغا دەبێ
ئەداکەرێ پەیدا دەبێ
مونکەر گەلێ ڕیسوا دەبێ
فیتنەو شەڕێ بەرپا دەبێ
هەروا بووەو هەروا دەبێ

نیوەی ئێران هی روس دەبێ
ئەوەی هیچ بێ ناموس دەبێ
ئەو سا زەرپان لەمس دەبێ
دین و ئیمان زۆر سس دەبێ
هەروا بووەو هەروا دەبێ

شۆڕش له ئێرانێ دەبێ
سەری جۆش و گرانی دەبێ
گەلێ مەردان فانی دەبێ
رفی دۆستی گیانی دەبێ
هەروا بووەو هەروا دەبێ

چاپوك سوارێ دەنگ دەکا
سەیدو شکاری پەلەنگ دەکا
هەر ساعاتێ سەد ڕەنگ دەکا
دونیاو خەڵك پڕ شەنگ دەکا
هەروا بووەو هەروا دەبێ

مەردان مەردی گەزاف دەكەن
هەم بەڕاستی خەلاف دەكەن

قسان بە تیر قەلاف دەكەن
بەرێگای دوور مەساف دەكەن

هەروا بووەو هەروا دەبێ

گەلێ دلْم بەتەنگ دەبێ
سەدای تۆپ و تفەنگ دەبێ

شەڕی سەرباز بەشەنگ دەبێ
ئێران دیلی فەرەنگ دەبێ

هەروا بووەو هەروا دەبێ

رەخشی رۆستەم ئیزهار دەبێ
ئەسپی ئاسن ڕەهوار دەبێ

دو دلْ شەو دێر بەكار دەبێ
گەلێ شت هەن ئاشكار دەبێ

هەروا بووەو هەروا دەبێ

تیغی مەولام بڕان دەبێ
سپای قەجەر قڕان دەبێ

سەر لە مەیدان فڕان دەبێ
ناری دۆزەخ گران دەبێ

هەروا بووەو هەروا دەبێ

دەور دەوری ڕەزا دەبێ
لەدوای ڕەزا غەزا دەبێ

لەدوای غەزا فەزا دەبێ مەردوم دەست بەنزا دەبێ

هەروا بووەو هەروا دەبێ

ئێران وەکو فەرەنگ دەبێ پڕ نەخش و ڕەنگاو ڕەنگ دەبێ

کوڕ وەکو کچ قەشەنگ دەبێ مایل بەشۆخ و شەنگ دەبێ

هەروا بووەو هەروا دەبێ

تەیرێ وەکو رەعدو بەرق دەبێ گوێچکەی لە دوکەڵ غەرق دەبێ

دەشت و دەری پێ لەق دەبێ بەڕوی هەوا مۆڵەق دەبێ

هەروا بووەو هەروا دەبێ

خاسان وەبێ مەلومن دەبێ کام دێ بەکامی ژن دەبێ

زەوق و زەینەت و سیار دەبێ خەلقی ژنان وشیار دەبێ

هەروا بووەو هەروا دەبێ

مانگ رویانی دەوڵەتی بادەخورانی خەڵوەتی

کۆتا لیباس و سەریەتی جامە سپی و خەت خەتی

هەروا بووەو هەروا دەبێ

(عێل بەگی) دێ دلگیر دەبێ		فەرەنگستان زنجیر دەبێ
ئێران و رۆم نەخچیر دەبێ		ئەوسا فەزاتە سخیر دەبێ
هەروا بووەو هەروا دەبێ

هەمووو شاهان بێ رادەبێ		لەپڕ شەڕو هەرا دەبێ
کەم خەلق وەحوکمی شادەبێ		چەرخ و چرا وەپا دەبێ
هەروا بووەو هەروا دەبێ

گاگا قەحتی و قەتار دەبێ		خەلقی زەمان هۆشیار دەبێ
نا هەمواری هەموار دەبێ		ئەوسا سەری ئاشکار دەبێ
هەروا بووەو هەروا دەبێ

تاعەت بە مەجبوری دەبێ		دێ بازاڕی بلوری دەبێ
چینی و فەغفوری دەبێ		گوڵبانگی جمهوری دەبێ
هەروا بووەو هەروا دەبێ

کاری مەردان نامەردی بوو		دەورانەکەی ڕەنگ زەردی بوو

دەواگەشی دڵ دەردی بو　　رۆژگاری دڵ سەردی بوو

هەروا بووەو هەروا دەبێ

بانگی یاری زولاڵ دەبێ　　دەنگی ئەزان بیلال دەبێ

ناجی بەعیلم و حاڵ دەبێ　　ئەوسا زاڵم بێ حاڵ دەبێ

هەروا بووەو هەروا دەبێ

ئاوازی سازی حەوت سەری　　ناڵەی کۆسی حەیدەری

را لە ڕوخانی ئەنوەری　　دانە دووڕی بێ موشتەری

هەروا بووەو هەروا دەبێ

نەومرد لە ڕووی دەوران دەبێ　　ناڵەی شێرو بەوران دەبێ

مەولام لەسەر ئێران دەبێ　　قەڵای دوژمن وێران دەبێ

هەروا بووەو هەروا دەبێ

شەربەتی خوا وەك هەنگ دەبێ　　هەرکەس بیخوا خۆش ڕەنگ دەبێ

دوژمن گەڵێ بێ ڕەنگ دەبێ　　ژینی تاریك و تەنگ دەبێ

هەروا بووەو هەروا دەبێ

دوو سوپای گەورە بە جەنگ دەبێ
نالّەی تۆپ و تفەنگ دەبێ

دونیا تاریك و تەنگ دەبێ
شەڕی سەرباز بە شەنگ دەبێ

هەروا بووەو هەروا دەبێ

دیوانی گورگ و مەڕ دەبن
دەشتی بەغداد بەشەڕ دەبێ

گشتی بۆ زیو و زەر دەبێ
خەلکی ساجان بێ فەڕ دەبێ

هەروا بووەو هەروا دەبێ

دیوان کەڕیو و تازی دەبێ
سەر لەمەیدان بازی دەبێ

پەنجە گەزان قازی دەبێ
ئەوسا مەولام ڕازی دەبێ

هەروا بووەو هەروا دەبێ

عەلی لە غەیب پەیدا دەبێ
دوولّدولّ بۆ شەڕ شەیدا دەبێ

مونکر خوار و ڕیسوا دەبێ
دیسان جیهان ئاوا دەبێ

هەروا بووەو هەروا دەبێ

ئەو وەخت دەنگی جیهاد دەبێ نوختەی یاران هاتهات دەبێ

دیدەی مونکەر زوڵمات دەبێ سەیری مەولام نەشات دەبێ

هەروا بووەو هەروا دەبێ

حەفتاو دوو دین یەك دین دەبێ سەر دەفتەری ئەمین دەبێ

زاڵم لەزارو شین دەبێ دڵی گەلێ بەکین دەبێ

هەروا بووەو هەروا دەبێ

عیل بەگی دی دڵشاد دەبێ لەدەردو غەم ئازاد دەبێ

یارانی گشت لەیاد دەبێ دوژمن لەزاری و داد دەبێ

هەروا بووەو هەروا دەبێ

## چەند پێشبینی یەکی ( خواجە حافظ )ی شیرازی :

شێخ (حافزی شیرازی) چەند سەدە لەمەوبەر چەند پێشبینی یەکی گەورەی کردووە ، کە خودا بە خەون و ئیلهام پێی بەخشیوەو لەچەند دێڕە هەڵبەستێدا باسی کردوون ، خوداوەند ئەم شاعیرە خواناسانەی وەکو (حسان بن ثابت) بەڕوحی پاك

یارمەتی داوە ، وەکوو پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (اللهم ايده بروح القدس) رواه احمد ، واتە : خوایە (حسان) بەڕوحی پاك کۆمەکی بکە .

بێگومان هەمووو شاعیران و خواناسان و فەیلەسوفان و زانایانی خواناس و وەلی بەهرەکانی خۆیان لە ئیلهامی خوایی فریشتەیی وەرگرتووە ، وەکوو فەرمووەتی : ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُ ﴾ البقرة: ٢٨٢ .

ئەوەتا (خواجە حافز) باسی چەرخی سەدەی بیست و بیست و یەکەم دەکات لەسەردەمی مانگی دەستکردا :

ئین چ شورەست کە دەر دەوری قەمەر می بینەم

هەمە ئافاق پڕ ئەز فیتنە و شەرمی بینم

هەر کەسی روزی بهی میگە لەبەر ئەز ئەیام

عیللەت ئانەست کە هەر روز بەتەرمی بینەم

ئەبلەهانرا هەمە شەربەت زو گولاب و قەندەس

قوتی دانا هەمە ئەزخونی جگەرمی بینەم

سەپی تازی شودە مەجڕوح بەزیی بالان

تەوقی زەر دین هەمەدر گەردنی خەرخەر من بینەم

دوختەران هەمە جەنگ ئەست و جەدەل رمی بینەم

هیچ ڕوحمی نەبرادەر بە برادەر دارەو

هیچ شەفەقەت ئەپدەر را بەپسەر می بینەم

پەندی حافظ بشنه و وجوابه برەو نیکی کون

کەمەن ئین پەند بە ئەز دورو گەوهەر می بینەم

واته :

ئەوە چ هەراو بەلآیێکە لەسەردەمی مانگی دەستکردا دەیبینم هەموو ئاسۆ پڕ لە ئاژاوەو شەڕ دەبینم.

هەر کەسە دەیەوێ سبەینێ یان لە ئیمڕۆ شادتر بێ ، بەلآم رۆژ بە ڕۆژ دژوارتر دەبن.

بێ عەقڵ و نەزان هەمیشە شەربەت و گولآویان لە پێشە، داناو زانا بەخوێنی منداڵەکەی نانی دەست ناکەوێت.

ئەسپی ڕەسەن لەژێر کورتاندا بریندار دەبێ ، تەوقی زێڕ لە ملی کەران و نا،فامدا دەبینم.

کچان لەگەڵ دایکیاندا شەو و ڕۆژ شەڕیانە ، کوڕان هەمیشە لەگەڵ باوکیاندا بەدکاری دەکەن و چاکەی باوکیان باس ناکەن . برا ڕوحم و بەزەیی بە برا ناکات ، نە باوك بەزەیی بە جگەر گۆشەی دا دێ و ئەوە نابینم، پەند لە حافز وەربگرە ، چونکە ئەو ئامۆژگارییانەم بۆ تۆ لەو سەردەمەدا لە دوڕو گەوهەر باشترن.

بەم شێوەیە دەبینی ڕاستی یەکان وەکو خۆی درەوشاوەن ، کە هیچ هەورو تۆزو گەردێ بەرایی نەگرتوون ، دەربارەی ڕابردوو و ئێستا و داهاتوو هیچ نازانن ، تەنیا من و تۆین بەربەستی زەمەن ئەو ڕاستی یانەی لێ ون کردووین و نایان بینین ، چونکە لە بازنەیەکی داخراوی ئەو زەمەنە داین ، بەلآم ئەوانەی لەبەرزایی ئەو بەربەستانەوە دەڕوانن و خوای کردگارو زەمەن و کات ڕێگای پێداون ئەو بەربەستانە

لەبەر چاویان هەڵبگیرێ ، ئەوان دەتوانن ئەو ڕاستی یانەو واقیعانە ببینن ، بەبێ بەربەستی زەمان.

کەواتە : کێشەکان لە خودی ڕاستییەکاندا نییە ، بەڵکو کێشەکە لەوەدایە ئێمە لەدواوەی بەربەستەکانەوە زیندانی کراوین ، هەرچی ڕەوانە کراوانی خوداو ئەولیایانن مرۆیانەی ناسوتی یان هەوڵی داوە لە پشتەوەی پەردەوەیان زیندانی بکات ، بەڵام لاهوتی یەکەیان کە لەلایەن خواوە پێ یان دراوە توانای پێ داون ئەو بەربەستە بشکێنن ، تا لەو کۆت و زینجیرە ئازاد بن و سەیری ئاسمانی ڕاستی یەکان بکەن ، ئەو کەسەی لە ژووردایەو دەیەوێ ئاسمان ببینێ دەبێ بڕواتە دەر بۆ سەربان و ناتوانێ لە جوغزی ژووردوە ئاسمان و دیاردەکانی ببینێت.

ئەمەیە جیاوازی لەنێوان ئێمەو پێغەمبەران و صددیقینەکان و ئەولیایان ، جیاوازی ئێمەو ئەوان لە پەیوەندی بوونیان بە (غەیب)ەوە وەکو ئەو کەسە وایە دەزگایێکی پێیە بۆ وەرگرتنی دەنگە دوورەکان ، یان وەکو ئەو کەسەیە تەلەکسوبی پێ یە کەچی کەسانی تر ئەوەیان نییە ، یان وەکو ئەو کەسە وایە وردبینی پێیە تا دەتوانێ گەردیلە نادیارەکان ببینێ و سەیریان بکات ، یان وەك گەردیلە نادیارەکان ببینێ و سەیریان بکات ، یان وەك ئەو کەسەیە تەلەکسوبی گەورەی پێیە سەیری مەجەڕەکان و ئەستێرەو تەنە دوورەکان دەکات و کەسانی تر ئەوەیان نیە ، هەرچی پیاوانی خودان خوای گەورە گەورەترین دەزگای کەشف و ئیلهامی پێ بەخشیون بۆ سەیرکردنی ڕاستی یەکان ، کە لە دەرەوەی بەربەستی زەمەنی یەوەن و لەبەر چاوی خەڵك و هەستی ئەوانەوە نییە .

گەر خودا ئەو توانا ڕوحییەی بە پیاوان و ژنانی تایبەتی خۆی نەدابایە لە پێغەمبەران و صددیقینەکان و ئەولیایان ڕاستی و ناڕاستی و حەق و ناحەق بۆ خەڵکی ئاشکرا نەدەبوو ، هەرچی فەیلەسوفان و بلیمەتانی خواناسە ، خوداوەند بە ئاستێکی زۆر کەم لەو غەیبەی ئاگادار کردوونەوە ، سەیر کە توانای دووربینی

گالیلۆو تەلەکسوبی رادیۆیی و تەلەکسوبی (فلاك ستاف) کە تیرەی هاوێنەکەی (٦١) ئینجە چەندە جیاوازییان هەیە بۆ سەیرکرن و بینینی تەنە دووره ئاسمانییەکان .

ئەم بەشدارییەش بۆ نزیك خستنەوەی هزری فەیلەسوفان و دانایان و بلیمەتانە لەئاسۆی غەیب ، تا بتوانن بە توانا هزری و ڕوحی یەکانیان پشتگیری لە پەیامی پێغەمبەران بکەن ، کە لە سۆنگەی غەیبەوە ڕەوانە کراون .

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾ فصلت: ٥٣ .

بۆ نمونە : (ڕۆبرت موریس بینج) سروشت ناس لە ئەمریکا دەڵێ : (گەر بڕوامان بە خوا هەبێ ، دەبێ بڕوامان بە توانای ئەو هەبێ ، کە هەندێ دەربارەییە غەیبەکانمان بۆ والاّ بکات ، کە ئێمە بەهۆی ناتەواویمان ناتوانین پەییان پێ ببەین ، ئێمە لە نامە ئاسمانییەکاندا زۆر ڕاستی دەربارەی غەیب دەبینین ، ئەو ڕاستییانە لە ڕێگای پێغەمبەرانمان پێ گەیشتوون ، کە خودا بۆ ئەوان غەیبی کەشف کردووە ، ناکرێ ئەو پێشبینییانە ملیان بۆ کۆتی زەمەن کەچ کردبێت). (الله يتجلى في عصر العلم : ل١٤).

**ئیعجازی ( ٧٩ ) کەی قیامەت ( پەسلاّن ) ڕوو دەدات؟**

**ئیعجازی ( ٨٠ ) تەمەنی گەردوون تا کوێ یە ؟**

**ئیعجازی ( ٨١ ) ئایا جیهانی نەتیری نەگۆڕ و نەمرە؟**

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴿٤٢﴾ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ ﴿٤٣﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ ﴿٤٤﴾ ﴾ النازعات: ٤٢ — ٤٤ ، واتە : پرسیارت لێ دەکەن لەبارەی کاتی وێران بوونی

گەردوون و قیامەت کەی ڕوودەدات ؟ تۆ چیت داوە لە باس کردنی ئەوە ! کۆتاییەکەی لای پەروەردگارتە.

کەی قیامەت دادێ و زەوی گەردوون تەقینەوەی یەکجاری دەست پێ دەکات ؟! سەعاتی سفری تەنیا لای خودایەو بۆ کەس ئاوەڵەی نەکردۆتەوە ، نە پێغەمبەران و نەصددیقینەکان و نەزانایانی فیزیایی و گەردوونی ئەوە نازانن ، هەرچەندە بە خەملاندنی ماتماتیکی و فیزیایی زۆر تیۆرو گریمانکارییان لەو بارەوە گوتووە ، هەتا میتافیزیکی نوێ ناتوانێ قسەی لەسەر بکات ، قورئان فەرموویەتی : إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ ﴿١﴾ وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتْ ﴿٢﴾ وَإِذَا ٱلْجِبَالُ سُيِّرَتْ ﴿٣﴾ وَإِذَا ٱلْعِشَارُ عُطِّلَتْ ﴿٤﴾ وَإِذَا ٱلْوُحُوشُ حُشِرَتْ ﴿٥﴾ وَإِذَا ٱلْبِحَارُ سُجِّرَتْ ﴿٦﴾ ﴾ التكوير: ١ – ٦ ، واتە : کاتێ خۆر پێچرایەوە ، کاتێ ئەستێرەکان تاریک داهاتن ، **کاتێ چیاکان بوونە تۆزو گەرد بە هەوادا** ، کاتێ هەورەکان لەباران کەوتن ، **کاتێ دڕندەکان کۆکرانەوە ، کاتێ دەریاکان بوونە ئاگر.**

﴿ إِنَّهُۥ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ ﴿١٣﴾ ﴾ البروج: ١٣ ، واتە : خوایە شتەکان دەست پێ دەکات و دروستیان دەکات و دەیان مرێنێ و دەیان گێڕێتەوە .

﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ كَيْفَ يُبْدِئُ ٱللَّهُ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥٓ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿١٩﴾ ﴾
العنكبوت: ١٩ ، واتە : ئایا نابینن خوا چۆن دەست بە دروست بوون دەکات و چۆن دەیان مرێنێ و دەیانگێڕێتەوە ؟

(جون کلوڤەر مونسا) زانای کیمیایی و ماتماتیکی ئەمریکی هاوچەرخ دەنووسێ : (هەرکەسێ سەیری گەردوون بکات و بە زیرەکی لێوردبوونەوە تێوەی ڕامێنێ سەرنجمان بۆ سێ جیهان ڕادەکێشێ دەربارەیەقینەکان ، کە بریتین لە : (جیهانی

ماددی و جیهانی هزری و جیهانی گیانی ، ئەوەی کیمیا لەو مەیدانەدا پێشکەشی کردووە پێویستە سنووردار بێ ، چونکە لەو بوارەدا مشتێکە لە خەرمانێك).

دیسان دەڵێ : (کیمیا نیشانمان دەدات هەندێ ماددە هەیە خەریکی لەناوچوونن ، بەڵام هەندێ بە خێرایی زۆرو هەندێ بە خێرایی کەم ، بەرەو لەناوچوون دەڕۆن ، بەو پێ و دانگە ماددە تا سەر نابێ و کۆتایی هەیە ، کەواتە ئەزەلیش نییە)[٣٩٠].

(د.ئەدوارد لوتر کیسیل) زندەوەرزانی هاوچەرخی ئەمریکی دەنووسێ : (یاسای دووەمی دینامیکای گەرمی ئەوە دەسەلمێنێ گەردوون ئەزەلی نییە . لێرەدا بەردەوام گواستنەوەی گەرمی هەیە لە تەنە گەرمەکانەوە بۆ تەنە ساردەکان و پێچەوانەش ڕوونادات بە توانای زاتی ، واتە : لە تەنە ساردەکانەوە گەرمی بۆ تەنە گەرمەکان بگەڕێتەوە ، واتە : گەردوون بەرەو ئاستێ دەڕوات پلەی گەرمی تێدا یەکسان دەبێ و سەرچاوەو کانیاوی وزەی وشك دەکات و لەبن دێت ، ئەو کاتە هیچ کردارێکی کیمیای و سروشتی ڕوونادات و شوێنەواری ژیان لە گەردووندا کۆتایی دێت)[٣٩١].

پاشان قورئانی پیرۆز بەهەشتییەکان و بەهەشت بە نەمرو هەمیشەیی و هەمیشەیی وەسف دەکات : ﴿ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴾ البينـة: ٨ ، هەروەها دۆزەخ و بێ بڕوایان بە نەمرو نەگۆڕ وەسف دەکات : ﴿ فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴿٢٣﴾ ﴾ الجن: ٢٣ .

لە زانایانی ڕوحی تازە (نارثر فندلای) دەڵێ : (مرۆڤ لەلەش و دەروون و ڕوح پێك دێ ، لەش ئەوەیە دەیبینین ، دەروون هزرە ، گیان لەشی ئەتیرە کە پێکاو پێکی لەشی فیزیایی ئەو لەشی فیزیایی پێکەوە دەبەستێتەوە ، مردن تەنیا جیابوونەوەی لەشی ئەتیرییە لە لەشی ماددی ، ئەم لەشە ئەتیرییە هزر یان دەروون لەگەڵ خۆیدا دەبات ،

---

[٣٩٠] الله يتجلى في عصر العلم / جون كلوفر مونسا / ل: ٢٥-٢٧. کە وەرمان گێراوە بۆ کوردی.
[٣٩١] الله يتجلى في عصر العلم / ضون كلوظر مونسا / ل: ٢٥-٢٧.

ئەو کاتە لە ڕوانگەی ئەتیرییەوە دەڕوانینە گەردوون نەك لە ڕوانگەی ماددییەوە ، ماددە ئەوەندە نابوتە ئاوری لێ نادرێتەوە ، هەرچی ئەتیرییە یان ئاسمان ماددەیەکی حەقیقی یەو ، لەرەلەری زۆرترە ، ئەو جیهانی ڕاستی یە کە ئاوڕی لێ دەدرێتەوە ، وەکو زانیومانە گەردوونێکی نەگۆرە ، بەلاّم گەردوونی ماددی هەمیشە لە گۆڕاندایە و بەرەو شی بوونەوەو لەناو چوون دەڕوات ، بەلاّم لە گەردوونی ئەتیری و ڕوحی دا هیچ شوێنەوارێکی لەم شێوەیەی تێدا نیە ، هەمووو شتێ لەناویدا جێگیرەو ، بەلاّم هەرچی (جەهمی یەکان)ن پێیان وایە (بەهەشت) و (دۆزەخ)یش کاتین.

هەرچی (ابن تیمیە) و (ابن القیم الجوزیە) یە باس لە وێران بوونی (دۆزەخ) دەکەن.

(ابن تیمیە) دەڵێ : گەر سزای دۆزەخ خاڵی کۆتایی نەبێ ئەوە ڕەحمەتی خوا بوونێکی نابێ.

لەم بارەوە زۆر نووسراو هەیە وەکو (حادي الارواح / ابن القيم الجوزية) و لەوێدا ئاماژە بەم واتایە دەکات ، بەلاّم (الالباني) لەکتێبی (رفع الاستار الابطال اول القائلين بفناء الدار) ی (محمد بن اسماعيل الامير الصنعانى)دا پەرچی ئەم بۆچوونە دەداتەوە ، ئاشکرایە ناکۆکییەکە بۆ ڕاڤەی ئەم ئایەتە دەگەڕێتەوە (الا ماشاء ربك) ﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُواْ فَفِى ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ عَطَآءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ ﴿١٠٨﴾ ﴾ هود: ١٠٨ ، (سەلەف) لە مانای ئەم (الاستثناء)ە دا ناکۆکن ، هەیە پێی وایە بەهەشت و دۆزەخ کاتین وەکو جەهمی یەکان ، هەیە ئەم (الا) یە وەکو (محمد بن الضحاك) باس دەکات واتە : (الاستثناء) بۆ خوایە ، بەلاّم ئەم کارە ناکات ، هەیە پێی وایە تەمەنی یان ئەوەندەی تەمەنی ئاسمانەکان و زەوییە ، گەر

---

[391] على حافة العالم الاثيري / ل:٢٥.

خوا بیەوێ تەمەنەکە زیاد دەکات ، هەیە پێی وایە مەبەست لە ئاسمانەکان و زەوی بەهەشت و دۆزەخە .... هتد.[٣٩٣]

لە کتێبی (مجمع البحرين/ الطريحي) دا لە (الشيخ ابو علی) گێڕاویەوە : (الا ماشاء ربك) مەبەست لەوانەیە لە دۆزەخەوە دەبرێنە بەهەشت ، ئەوە ماوەی مانەوەیە لە ئاگردا، هەرچی (السيوطي)یە پێی وایە : ئەم (الا) یە بۆ (الاستثناء) نییە ، بەڵکو مانای (سوی) دێ ، وەکوو دەڵێ ی : (لي عليك الف درهم الا الفين اللذين لي عليك ، اي سوى الفين)، واتە : هەزار درهەمی منت لایە ئەو دوو هەزارە نەبێ کە لای تۆیەو هی منە ، واتە : جگە لەو دوو هەزارە).

واتە : ئەوەندەی ماوەی ئاسمانەکان و زەوی لەوێدا نەمر دەبن ، ئەو زیادەیە نەبێ کەلای خوا بڕانەوەی نییەو مانای نەمری و مانەوەو جاویدانی دەگەیێنێت ، ئەمە لای (عەرەب) بۆ ئەبەدی بەکارهاتووە)[٣٩٤].

لە (حادي الارواح) دا هاتووە : (ابن مسعود) دەڵێ : ڕۆژێ دێ دۆزەخ دادەخرێ دوای ئەوەی سەدەها ساڵ مانەوە ، (الشعبي) دەڵێ : زووترینییان ئاوەدان دەبێ و زوتر لەهەردو دونیا وێران دەبێت.

قورئانی پیرۆز فەرموویەتی : ﴿ لَّٰبِثِينَ فِيهَآ أَحۡقَابٗا ﴾ النبأ: ٢٣ ، واتە : بێ بڕوایان چەندان سەدە لەوێ دا دەمێننەوە .

(شيخ الاسلام ابن تيمية) لە (ابن مسعود) و (عمر) و (ابي سعيد) و کەساتی تر گێڕاویەوە : خوداوەند ماوەیەکی دیاری کراوی بۆ دۆزەخ داناوە ، پاشان نامێنێ و سزاکەی دەبڕێتەوە ، گێڕاویانەوە :( يوم يخرجون فيها) واتە : ڕۆژێ دێ دەربچن.

---

[٣٩٣] حادى الارواح / ابن القيم الجوزية / ل:٢٥٣-٢٥٤ سەیر بکە.

[٣٩٤] البدور السافرة / السيوطي / ل:٤٦٣.

بەلاّم ئەوانەی دەلّێن : ئاگری دۆزەخ برانەوەی نییە ، دەلّێن : ئەوانەی بێ بڕوان هەمیشە تا سەر لەدۆزەخدان و بەهەشتیان لێ حەرامە ، ناچنە بەهەشتەوە تا پەت (کندر) بەکونی دەرزیدا نەچێت[395].

لە فەرموودەشدا هاتووە : (من قال : لا الـه الا الله مخلصا دخل جنة) رواه البزار/صحيح ، واتە : کێ بەدلّسۆزی بلّێ (لا الـه الا الله) (هیچ پەرستراوێکی بەحەق نیە جگە لە الله) دەڕواتە بەهەشتەوە ، بەلاّم دوای پاك بوونەوە لە دۆزەخدا.

پێغەمبەر ( صلى الله عليه و سلم ) فەرموویەتی:(ما قال عبد لا الـه الا الله قط مخلصا الا فتحت ابواب السماء حتى تفضي الى العرش) رواه الترمذي / صحيح ، واتە : هەر بەندەیێ بەدلّسۆزی بلّێ (لا الـه الا الله) (هیچ پەرستراوێکی بەحەق نیە جگە لە الله) دەرگاکانی ئاسمانی بۆ دەکرێنەوە تا دەگاتە عەرش.

بە شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ تەواوی خەلّکی گوناهبار دەچنە بەهەشتەوە ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (يخرج من النار من قال : لا اله الا الله ، وكان في قلبه من الخير ما يزن ذرة) رواه مسلم ، واتە : دەڕواتە دەر لە دۆزەخ کێ گوتبی (لا اله الا الله) و گەردیلەیێ لەکێشدا چاکەی لەدلّدا هەبووبێت.

پێغەمبەر ﷺ پێچەوانەی ڕای موعتەزیلەکان لە بەرزەخ و پەسلاّندا شەفاعەت دەکات : (و وفاتى خير لكم تعرض اعمالكم على فما رايت من خير حمدت الله ، وما رايت من شر استغفرت لكم) رواه الهيثمي باسناد صحيح ، واتە : مردنم بۆ ئێوە پێ باشە ، کردەوەی ئێوەم پیشان دەدرێ ، گەر چاك بوو سوپاس و ستایشی خودا دەکەم ، گەر خراپ بون داوای لێ بووردنتان بۆ دەکەم .

لە دەقی قورئاندا هاتووە : ﴿ وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ﴿٦٤﴾ ﴾ النساء: ٦٤ ، واتە : گەر

[395] حادي الارواح / ل: ٢٦٣ سەیر بکە.

ئەوان ستەمیان لە خۆیان کردو هاتنە لات داوای لێبوردونیان لە خوا کردو پێغەمبەر ﷺ داوای لێ بوردنی بۆ کردن ، خودا دەبینن لێ بووردەیەو بەبەزەیی یە .

ئەم حاڵەتە لە دونیا و بەرزەخ وپەسلاّندا بەردەوامە.

## ئەو هۆکارانە چین زەوی لەناو دەبەن؟

لە کتێبی (گەردوونناسی) و (زەی ناسی) و (کارەساتە سروشتییەکان) و (ژینگەزانی) دا باسمان کردووە ، کە زانایانی گەردوونناسی باسیان کردووە ، زەوی بەهۆی تۆز و گەرد و غوباری گەردوونی کە زەوی دادەپۆشێ و ساڵانە (٤٠) ملیۆن تەن بەزەوی دەکەوێ ، بەهۆی تیشکە گەردوونیەکان و ئاگر پژێنەکان (بورکان) و بومەلەرزەکان و تەقینەوەی خۆری لەناو دەچێت[٢٩٦] ، بەلاّم کەی ؟ ئەوە خوا دەزانێت.

بێگومان گەرم بوونی (گۆی زەوی) لەم پەنجا ساڵەی ، ڕابردوودا و گۆڕانی ئاو و هەوای زەمینی بەهۆی بەرز بوونەوەی پلەی گەرمایی زانایانی تووشی دڵەڕاوکێ و ترس کرد ، چونکە مەترسی یەکی ژینگەیی گەورە بۆ سەر ژیانی زەمینی دروست دەکات ، مەترسی جەنگی ناوکی و زیادبوونی گەرمی زەوی و کون بوونی چینی (ئۆزۆن) ، هەمووو ئەوانە کارەساتی گەورەی سروشتی بۆ زەوی پەیدا دەکەن ، بڕوا وایە دەرچوونی تۆزو گەردی ئەستێرەکان کە ساڵانە(٤٠) تەن زەوی دادەپۆشی بەرایی خۆر بگرێ و چەرخی بەستەڵەکی بۆ زەوی بگێڕێتەوە.

بڕوا وایە تیشکە گەردوونی یە کوشندەکان وەکو (ئێکس) و (گاما) و (سەر بنەوشەیی) زیندەوەران بکوژن و سیستەمی (بۆ ماوەیی) و (جینی) مرۆڤ لەناوببەن ، بەردەوامی بورکانەکان بۆ سەر زەوی کاری گەورەی کردۆتە بەرزو نزمی زەوی و ئاو

---

[٢٩٦] مفاهيم يجب ان تصحح / السيد محمد بن علوي المالكي / ل:٢٠١.

و هەوایەکەی ، بەر لە (٣٠) ملیۆن ساڵ بورکانێ زەوی دەگرێتەوە کاریگەرییەکی گەورە دەکاتە سەر ژیانی ئاژەڵی ، گەر جارەکی تر دووبارە بێتەوە ژیان دەسڕێتەوە .

زانایان بڕوایان وایە چالاکی بەردەوامی خۆر دەبێتە هۆی لەناوچوونی زەوی .

(کالدیر) پێی وایە (بەرزبوونەوەی ڕێژەی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن لە هەوادا ڕەنگدەرەوەی بەرز بوونەوەی پلەی گەرمی یە نەك هۆکاری ئەوە بێ ، هۆی سەرەکی زۆر بوونی ساڵ لەدوای ساڵ چالاکی خۆرییە ، چالاکی خۆری کاردەکاتە سەر زیادبوونی ڕێژەی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن ، نەك ئەو ببێتە هۆی گۆڕان لەناو و هەوادا[٣٩٧].

بێگومان ئەو (تسونامی)یەی ساڵی (٢٠٠٤) ئۆقیانوسی هیندی و کەنارەکانی ئەندەنووسیای گرتەوە پلەکەی (٩,٣) پلە بوو بە پێوانەی ڕێختەر ، لە ساڵی (٢٠٠٦) دا دووبارە بۆوە ، بەڵام پلەکەی کەمتر بوو ، (٦٣٧) کەسی کوشت ، بەڵام (تسونامی) ٢٠٠٤ کاریگەرییەکەی پەڕیەوە بۆ وڵاتانی ترو گەیشتە سۆماڵ و کینیاو باشووری ئەفریقیا (٢٠٠,٠٠٠) کەسی کردە قوربانی ، زۆربەی کوژراوان ئەندەنووسی بوون ، زانایان دەڵێن : گەر پلەی بومەلەرزە بگاتە (١٢) پلە بە پلەی ڕێختەر زەوی دوو کەرت دەکات[٣٩٨].

وەکو لە کتێبی (الزلازل والبراكين / د.ايمن الاسكندراني)دا هاتووە : ئێمە لەزەوی لەسەر بۆمبایەکی تەوقیت کراودا دەژین ، ناخی زەوی لە پلەی گەرمی (٧٠٠٠) دایە ، ڕۆژانە (٣٠٠٠٠) بومەلەرزە ڕوودەدات ، بەڵام کەمێ لەوانە هەست پێ دەکەین ، ڕۆژێ دێ لە هیکرا ئەم بوومەلەرزە گەورەیە ڕووبدات و زەوی ببێتە یەك پارچە ئاگرو زەمین لەرزەو بورکان تەواوی زەوی بگرێتەوە ، تا چیاکان و ئۆقیانوسەکان دەبن بەیەك پارچە گڕو دەتەقنەوە ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ﴿١﴾

---

[٣٩٧] الكوارث / ل:٢٣-٢٥ بەکورت کردنەوە .

[٣٩٨] الكوارث الطبيعية / خالد حداد / ل : (١٠-١٥) سەیر بکە.

تێبینی: کتێبێکی تایبەتیمان لە ژێرچاپدایە بەناوی ( کارەساتە سروشتیەکان و وێران بوونی زەوی ).

وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ﴿٢﴾ ﴾ الزلزلـة: ١ ــ ٢ ، بـەلام کـەی ئەمـە ڕوودەدات ؟ بێگومان سەعاتی سفر لای خۆیەتی و خۆی ئەمە دەزانێ کەی ئـەم ڕووداوە ڕوودەدات ! ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلْ إِنَّمَا ٱلْعِلْمُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢٦﴾ ﴾ الملـك: ٢٥ ــ ٢٦ ، واتـە : پرسـیارت لێ دەکـەن کـەی ئـەم بەڵێنـەی (هـاتنی قیامـەت) دێتـە دی ؟ تـۆ بڵـێ زانیـاری ئـەوە لای خوایـە ، مـن تـەنیا وشـیار کەرەوەیێکی بەرچاوم .

(ئێر فنج ولیام نوبلوچی) سروشت ناسی تازەی ئـەمریکی دەنووسـێ : (بڕوابـوون بـە ئایین دۆزراوە زانستی یەکان پشت ڕاستی دەکەنەوە ، زانست زۆر لەو پێشبینی یانـەی سـەلماند کیتـابی پـیرۆز هێنـاونی ، گومـانی تێـدا نییـە داهـاتو زانسـت ڕاسـتی زۆر لـەو کاروبارانـەی بـۆ دەردەکـەوێ لـەم کتێبـەدا هـاتوون و هێشـتا زانسـتمان دەسـتی پـێ نەگەیشـتوون . بـۆ نمونـە : گەردوونناسـی ئامـاژە دەکـات گـەردوون سـەرەتای هەیـەو کۆتـایی هەیـە ، گـەردوون بـەرەو کۆتـایی یـەکی مسـۆگەر دەڕوات ، ئـەم ڕایـە لەگـەڵ زانستدا ناگونجێ کە دەڵێ : ئەم گەردوونە ئـەزەلی یـەو سـەرەتای نییـە ، یـان ئەبـەدی یەو کۆتایی نییـە ، گـەردوون لەسـەر بناغـەی گـۆڕان دامـەزراوە ، لـەم ڕایـەدا ئـایین و زانست یەك دەگرنەوە)[٣٩٩].

زانای بەریتانی ناودار (نیوتن) دۆزەرەوەی هێزی کێشکردن ، ئـەو بـەر لـە (٢٥٠) سـاڵ پێشبینی کرد کۆتایی زەوی (٢٠٢٠) دەبێت[٤٠٠].

بە حیسابی گەردوونناسی خۆر لە چرکەیێکدا (٦٧٤) ملیۆن تەن هایـدرۆجین دەگۆڕێ بە (٤) ملیۆن تەن گەرمی و وزە ، پلەی گەرمی نـاخی خـۆر (٢٠) ملیـۆن پلـەی سـەدی یە ، پلەی گەرمی سەر ڕووی خۆر (٦٠٠٠) پلەی سەدییە ، پێنج بلیۆن ساڵە خـۆر بـەو

---

[٣٩٩] الله يتجلي في عصر العلم / ل:٥٣.
[٤٠٠] التوقع السياسى / زيد محمود على / ل:١٦.

برەیە ڕووناکی بە زەوی دەدات ، گەر ئەو برە گەرمی یە لەداهاتوودا زیاد بکات ناوی ئۆقیانوسەکان دەکولێ : خۆر بەشی (٥) بلیۆن ساڵی تر سوتەمەنی بۆ زەوی پێیە ...[٤٠١].

قورئان ئاماژە دەکات خۆر دەکشێ ﴿إِنَّهَا تَرْمِي بِشَرَرٍ كَالْقَصْرِ ﴿٣٢﴾﴾ المرسلات: ٣٢ ، وەکوو لە گەردووناسیدا باسکرا.

لە فەرمووودەدا هاتووە : (تدنى الشمس يوم القيامة) رواه مسلم ، واتە : خۆر لە قیامەت لە خەڵکی نزیك دەبێتەوە.

(د.فياض النجم) دەنووسێ : (خۆر بەهۆی فشاری ناوخۆ لە کشاندا دەبێ ، دەگۆڕێ بە زەبەلاحی سور (العملاق الحمراء) ، پاشان دەتەقێتەومو بۆ گرگنی سپی (الاقزام البيضاء) دەگۆڕێ لەقەبارەی زەوی دا[٤٠٢].

قورئانیش ئاماژە دەکات دوای کشانی خۆر بچووك دەبێتەوە ﴿إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ ﴿١﴾﴾ التكوير: ١ ، واتە : کاتێ خۆر پێچرایەوە و بچووك بۆوە.

بێگومان چۆن گەردوون لەهیکرا پەیدا بووەو لەهیکرا لە کت و پڕێکدا دەتەقێتەوە ، بەلام کەی ؟ ئەم وەلامە لای خوای گەورەیە ﴿وَمَا أَمْرُ السَّاعَةِ إِلَّا كَلَمْحِ الْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ﴾ النحل: ٧٧ .

واتە: ڕوودانی قیامەت و تەقینەوەی گەردوون لەماوەی چاوتروکانێکە یان کەمترە لەو.

---

[٤٠١] بروانة (الموسوعة الفلكية الحديثة / عماد مجاهد / ل (١١٥).

[٤٠٢] علم الفلك / د.فياض النجم / ل:٢٧٧.

**ئیعجازی ( ٨٢ ) بەکارهێنانی هیپنۆتیزم و فیراسەو کەشف بۆ پاراستنی ئاسایشی نیشتیمانی و دۆزینەوەی تاوانباران و هاریکاری کردنی پۆلیس و دادگا:**

(اتقوا فراسة المؤمن فانه ينظر بنور الله) رواه الترمذی ، واتە : **خۆت لە دوربینی بڕوادار بپارێزە ئەو بە ڕووناکی خوا دەبینێت.**

**بێگومان ئەم فەرموودەیە دەری دەخات ئەولیایان دەتوانن بە دوربینی** (الفراسة – الاستبصار) **تاوانباران بدۆزنەوەو ناخیان بخوێننەوە و تاوانی ئەوان لە جیهانی داتادا وەکو فیلمێ ببینن .**

**(ڕوونالد م. ماکری) باس دەکات : (لە روسیادا (هیپنۆتیزم) زۆر مەیلی دەدرێتێ ، لە راپۆرتەکی ئاژانسی هەوالگری بەرگری دا هاتووە ، (هیپنۆتیزم) لە روسیادا وەکو بەکارهێنانی تیشکی سینی بلاّوە ، کە لە نوژداری و فسیۆلۆجی و دەروونزانی دا بەکاردێ ، دیسان لە لێکۆڵینەوەی پۆلیسی دا بەکار دەهێنرێ.**

**ڕاستر وایە هیپنۆتیزم دەتوانرێ وەکو یارمەتی دەرێ بەکاربێنرێ بۆ پاراستنی ئاسایشی نیشتیمانی و دۆزینەوەی تاوانباران و سیخوڕان ، نەك وەکو کامیرایەکی شاراوە پشتی پێ ببەسترێ ، چونکە لە هیپنۆتیزم دا چەند حالّەتێ ڕوودەدات ، جێگای وردبوونەوەو تێبینی کردنە : (د.نورن) دەلّێ : ئەوانەی دەخەوێنرێن بە هیپنۆتیزم حوکمێکی ڕەخنەی لاوازیان هەیە ، بە زوویی وەلاّمی ئیحای نەستەکان دەدەنەوە کە خوێنەر ئیحایان دەکات ، گەر خەوێنەر چەند بڕوایەکی لە دلّدابێ دەربارەی ئەوەی شاهیدەکە بینیویەتی یان قوربانی یەك یان دەربارەی ناسنامەی تاوانبارێ شتی لەدلّدا بێ ، زۆر بە ئاسانی بە ئیحا بۆ بیری خەوێنراوان دەگوازرێتەوە ، دیسان بیرو بڕواکانی خەوێنراو دەربارەی ئەم بڕوایانە بۆ چەند یادەوەرییەکی ساختە دەگۆڕێن ، شاهیدی پێ بەڕاست دادەنرێ و سوێند دەخوات ڕاستە ، دادگا ڕێگا**

بە پۆلیس دەدات ، بە وەرگرتنی وەلامی شاهیدەکانی ژێر خەواندنی موگناتیسی بەلام لەژێر قەیدو بەندێکی فەرزکراودا[403].

بەلام لە سۆفیگەریدا ڕوح پاکژ بۆتەوە لە دالغەو خەیالی دەروونی و دەرەکی و ئیحای شەیتانی، بۆیە زیاتر لە هیپنۆتیزم پشت بە بینینەکانی دەبەسترێت ، نمونەی (یا ساریة الجبل الجبل) ی عومەری کوری خەتتاب بەلگەیێکە لەسەر ئەم ڕاستی یانە .

(ئەلیکسس کاریل) دەڵێ : سۆفیگەری لە بەرزترین ئاستی دا لە هونەرێکی وردایە ، سیستەمێکی زۆر وردی هەیە ، یەکەم شت بەزوهدو دونیا نەویستی دەست پێ دەکات ، کەواتە دورە مرۆڤ بەبێ ڕاهێنان کردن لەسەر زوهد لەدونیا بڕواتە مەملەکەتی سۆفیگەرییەوە ، چۆن مرۆڤ بەبێ ڕاهێنانی وەرزشی نابێتە وەرزشەوان)[404].

دەنووسێ : (مرۆڤ زیاتر کاسەی ئایینی خواردۆتەوە نەك جامی فەلسەفی ، ئایین بناغەی خێزان و ژیانی کۆمەلایەتی یە لە شارستانی دا)

دەنووسێ : (چاو و بینینی موگناتیسی و ڕەوانەکردنی بیرەکان لە تێبینی زانستی دا چەند زانستەکی سەرەتایین کێ ئەو توانایەی پێ بەخشرا بێ دەتوانێ بیری شاراوەی کەسانی تر ببینێ ، بەبێ بەکار

بەکارهێنانی هەستی ماددی ، دیسان هەست بە ڕووداوی دوور دەکەن ، لە ڕوانگەی فەراغی یەوە بێ یان زەمەنی یەوە بی ، ئەم سیفەتە ئەدگارەیە لە خەلکێکی کەم دا گەشە دەکات)[405].

سەرهەنگ(موقەددەم جون ئەلکساندەر) لە گۆڤاری (ملتری دیفیو) ی سەربازی دا بلاوی کردەوە : (بەکارهێنانی هیپنۆتیزمی تلەپاتی بەوە دەناسرێ توانایەکی لە

---

[403] حروب العقل / ل: ٣٧-٣٨.
[404] الانسان ذلك المجهول / ل: ١٥٩.
[405] الانسان ذلك المجهول / ل:١٤٧.

ڕادەبەدەری هەیە ، دەتوانرێ بەکرێ گیراوان بە قووڵی دا بنێرن بێ ئەوەی کەس بە بەرنامەیان بزانێت.

(فەرمانگەی دادوەری لە ویلایەتی کالیفۆرنیا چەند زانیارییەکی تایبەت دەبەخشێ دەربارەی بەکارهێنانی کەسانی خاوەن هەستی شەشەم لە لێکۆڵینەوەی تاوانی دا).

ئەم زانیارییانە دەڵێن :

دیاری کردنی ئەو ناوچە جوگرافییەی کەسەکەی تێدا ون بووە .

قەتیس کردنی ئەو بەڵگانەی دەبێ چەقیان لەسەر ببەسترێت.

ڕامان لەسەر زانستە گرنگەکان و بایەخ پێدانیان .

دابین کردنی ئەو زانیارییانەی لە (لێکۆڵەر) شاراوەن.

زانیارییەکانی کالیفۆرنیا هۆشیاری دەدەن تا ئەو کەسانەی هەستی شەشەمیان یارمەتیان نەدەن بەرزە ناتوانن زانیاری سەد لە سەد بدەن ، ئەوان ناتوانن شوێنی پۆلیس بگرنەوە ، بەڵام دەوری لێکۆڵینەوە دەبینن ، لێرەدا زۆر لێکۆڵینەوە هەیە ئەم ئاگامانە پشت ڕاست دەکەنەوە لە وتارێکدا هاتووە بە ناو و نیشانی (ئیدارەی ئەوانەی توانای لە ناسایی بەدەریان هەیە لە لێکۆڵینەوەی تاوانی دا) ، لە گۆڤاری فەرمی (پیاوانی پۆلیس) دا هاتووە کە ئەو تاکانەی هەستی ڕوحییان بەرزە دەتوانن چالاکی بێ وێنە پیشان بدەن لە لێکۆڵینەوەدا .

لە ساڵی (١٩٨٢) دا پەیمانگای لێکۆڵینەوەی (ستانفۆرد) یەکەم توێژینەوەی زانستی خۆی بڵاوکردەوە ، پشتگیری لە بەکارهێنانی ئەو کەسانە کرد توانای ڕوحییان هەیە ، دیسانەوە لێکۆڵینەوەیەکی تر بۆ تاو توێ کردنی ئەم مەسەلانەو پشتگیری کردنی ئەوە بوو دوو زانای (تاوان ناس) پێی هەڵسان بەناوی (وایتی س. هوبارد) و (ریموند دبلیو وورنك) بەناو و نیشانی (تاوان ناسی نائاسایی – علم الاجرام الخارق) ، کە

باس لـه توانـای بـەکارهێنانی ئـەو کەسـانە دەکـات هەسـتی شەشـەمیان هەیـە لـە بەکارهێنانیان بۆ لێکۆڵینەوەی تاوانی[٤٠٦].

ڕابردوو باسمان کرد کە موسا (علیـه السلام) بـۆ دۆزینـەوەی تاوانبـارێ، کوژراوەکە زیندووو دەکاتەوە بە ویستی خوا (بڕوانە سورەتی بقرە ٦٧).

## ڕاهێنان

(١) نوێژی (الحاجة) و (الاستخارة) ئەنجام بدە بۆ دۆزینەوەی تاوانباران و شتی ون بوو .

(٢) لەهیپنۆتیزمدا دوای خەواندنی مەدیومەکەو دەرهێنانی ڕوحەکەی دەیبەیە شوێنی دیاریکراو ، دەتوانی زەمەن بگێڕیەوە ، بۆ دۆزینەوەی تاوانباران و شتی ون بوو ، بەلأم ئەم دۆخە تەنیا بۆ یارمەتی دان بەکاردێنرێ نەك جێگای پۆلیس بگرێتەوە ، چونکە غەیبی ڕەهای تەنیا هی خوایە .

## دوا وتە

بـە کـورتی لـەم کتێبـەدا بـۆت دەردەکـەوێ ڕۆشـنبیری گیـانی و ڕوحـی ، ئـەرك و بەرپرسیاری زانـاو ڕوحانییـە موسـڵمانەکان و دەوڵەتـە ، کـە ڕۆڵـی سـەرەکی دەبیـنن لەبەرەو پێش بردنـی ڕێـڕەوی شارستانی دا ، ئامـانجی نێمـە لـەم کتێبـە ڕوحـی یـەدا بلأوکردنەوەی ڕۆشنبیری ڕوحی یە بۆ میللەتی کورد ، بۆ بەرەو پێش بردونیان.

---

[٤٠٦] حروب العقل / ل:٣٥.

دیسان ڕۆشنبیری ڕوحی حاڵی کردین جیهان دووبەشە ، بینراو و نەبینراو ، هەرچی ژیانی کاتی یە لەسەرزەوی دا ، گەردوونی نەبینراو جیهانی گەورەیە ، کە مرۆڤ لە حاڵی نووستن و ئیلهامدا پێی دەگات و دوای مردن بەیەکجاری بۆ ئەوی بار دەکات .

دیسان حاڵی بوین ئەم دونیایە شوێنی تاقی کردنەوەیە ، ئەوکارە چاکانەو خراپانەی مرۆڤ دەیکات لەدونیای ڕوحی دا دەیدۆزێتەوە ﴿ وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرًا ﴾ الکهف: ٤٩ .

حاڵی بوین قورئان و موعجیزەو کەرامەت و زانستی ڕوحی لە تاقیگەدا دەیسەلمێنن کردگار ئەم بوونەوەرەی دروست کردووە بەدیوی ڕوحی و ماددییەوەو جیاوازی نێوان هەردوو دیوەکان بۆ خێرایی لەرەکانیان دەگەڕێتەوە .

حاڵی بوین ڕۆشنبیری ڕوحی دڵ و دەروون و سینە ، لە ئیحا سەلبی یەکان پاکژ دەکاتەوە و دەرگا بۆ ئیحا ئیجابیەکان دەکاتەوە ، کە مرۆڤ بەرەو ڕێنومایی ۽ دونیای مەلەکوتی دەبات و کەسایەتییەکەی کامڵ دەکات.

بۆمان دەرکەوت ڕۆشنیری ڕوحی بناغەی هەمووو ئایین و فەلسەفەو عیرفانێکە .

بۆمان دەرکەوت مردن تەنیا جیابوونەوەی ڕوحە لەجەستەو مردن لەم دونیایەدا لەدایك بوونەوەیە لەدونیای ڕوحی دا.

ڕۆشنبیری ڕوحی فێرمان دەکات چۆن دڵ و هزرمان بۆ ئیلهامەکان بکەینەوەو دڵمان لەبەرامبەر وەسوەسەو ئیحا بەدەکان دابخەین. ١

ڕۆشنبیری ڕوحی فێرمان دەکات چۆن لە ڕێگای خودا ناسی و یادو نوێژو پاڕانەوە پەیوەندی پیرۆزو خۆشەویستی لەگەڵ کردگاری خۆشەویستی ببەستین و بگەینە مەقامی فەناو ئاستی مرۆڤی کامڵ بەدەست بێنین.

تێ دەگەیشتین پێویستە ڕامان و گەردەن کەچی و دڵسۆزی هەبێ لە خواپەرستی یەکانماندا بۆ پەیوەندی بەستن بە خوداو جیهانی مەلەکوتی یەوە ، بەپێی دڵسۆزیمان پەیوەندی ڕوحیمان پتەو دەبێ ، پەیوەندی ڕوحی تەنیا بەچەند وشەو دروشمێکی ڕۆتینی دروست نابێت .

بۆمان دەرکەوت مرۆڤ گەورەیەو لەجیهانی ماددی دا بچووك دیارە ، تەنیا لەدونیای ڕوحی دا گەورە دەبێ و ئاستی دەردەکەوێت لەو ئاستە دا دەبێ خوداوەند خۆی بۆ بنوێنێت .

دەردەکەوێت ئەم سەردەمە بەسەر چوو ، کە دەگوترا ئایا لێکۆڵینەوە لە (ڕوح) حەلاڵە یان حەرامە !

دەرکەوێ عیرفانی ئیسلامی گەورەترین ڕێگایە و ڕەسەنترین مەزهەبە بۆ گەیاندنی مرۆڤ بە گەردوونی نادیارو کردگارەکەی ، کە ئامانجی سەرەکی ژیان لەوەدایە و بەختەوەری جاویدانی لەمەدایە .

دەردەکەوێ ئیسلام تاکە ئایینە ماددەو ڕوح پێکەوە گرێ بدات ، پێویستە مرۆڤ گرنگی بە هەردووکیان بدات ، چونکە دو شتی دژ بە یەکتر نین ، بەڵکو تەواوکەری یەکترن ، مرۆڤ دەبێ لەسەر پەیژەی ماددییەوە بەرەو پەیژەی تر هەڵگوازێ بۆ گەیشتن بە (خودا) کەشکۆدار.

پاشان کۆمەڵە ڕاهێنانێکمان هێناوەتەوە ، بە پشت بەستن بە عیرفانی ئیسلامی و میتافیزیکی نوێ تابتوانێ وەرزشی ڕوحی بکات و توانا ڕوحیەکانی بەهێز بکات بۆ ئاشنا بوون بە گەردوونی نادیارو کردگارەکەی و دونیای ژیری ئەوێ ، تا دەربکەوێ ئیسلام کردارییە (پراکتیك) نەك تیۆری .

بۆمـان دەردەكـەوێ كەسـايەتی سـەركەوتوو لـە دۆزینـەوەی ڕۆڵـی ڕوحـی دایـە ، لەدۆزینەوەو تەقاندنەوەی توانا ڕوحی یەكان دایە كـەمرۆڤ بـۆ پـێ هـەڵبردنی خـۆی سوودیان لێ وەربگرێت [٤٠٧].

بۆمان دەركەوت كۆمەڵگاو شارستانی یەك ڕوح و ماددەی پێكەوە گرێ نەدابێ نـاتوانێ دەوام بەتەمەنی بدات زوو دەڕوخێت و هـەرەس دێنێت، گـەر مـرۆڤ كتێـب و شـیعری عاریفـانی ئیسلامی دەخوێنێتـەوە ، وەكـوو شـیعرەكانی مەولـەوی و نـالی و وەفـایی و مـەحوی ، یـان كتێبـەكانی وەكـو : (الفتح الربـاني / الكيلانـی) و (مكتوبـات الامـام الربـاني) و نوورسـی و شـیعرە سۆفی یـەكانی مـەولانای ڕۆمـی و نووسـراوەكانی (ابـن عربـي) ... هتـد ، ئـەو كاتـە لەگـەردوونی مـاددی و ڕوحـی تـێ دەگـات ، تـێ دەگـات خوداوەنـد چـاوگی بوونـە و نادیـارە ، بـەڵام لـە هـەمووو شـتێ دا خـۆی دەردەخـات ، بەتایبەتی لەمرۆڤدا . كە لوتكەی بوونەو بنچینەی بوونـە ، مـرۆڤ پێویسـتە بەچـەند قۆناغێكـدا بـەرەو خـوا پـەروازە بكـات ، كـە ڕێگـای صـۆفی گەرییـە ، بـۆ نمونـە : (جەلالەدینی ڕومی) پێی وایە گەردوون پڕە لە سۆزو ئەوینی خوایی ، هـەمووی شـتێ شـەیدا و ئەوینـداری ئـەوەو بـووە بەكڵپـە خۆشەویسـتی یـەكی داگیرسـاو كـە هـەرگیز ناكوژێتەوە بەرەو ئەو پەروازە دەكات ، وەكوو لە (مثنوي معنوی) دا باس دەكات .

بۆ نمونە دەڵێ :

- ئەو تەمەنەی بەبێ ئـەوین بەسـەر بـراوە هـەرگیز مەیـژمێرە ، ئـەوین ئـاوی ژیانە ، بەدڵ و گیانت پەسەندی بكە .
- ئەوانەی ئەویندار نین وەكو ماسی یەك وان لەچاو چونە دەرەوە ، بـەمردووو سیسەڵەیان بژمێرە گەر وەزیریش بن .

[٤٠٧] بڕوانە ( كەسایەتی ئیسلامی گەنج / نووسەر ) كە لە ژێر چاپدایە، وە كتێبی ( چەند ڕاستیەك لەبارەی سۆفیگەری/نووسەر) خەریكی نووسینی نەوین.

- ئەو ڕوحەی عیشقی حەقیقی دروشمی نییە ، بوونی ئەو شورەیی و ئەنگییە پێویستە لەئارادا نەبێ.
- ڕوح لە عیشق هەزار جۆر فێر دەبێ ، لەو ئەدەبەی لەحوجرەو قوتابخانەکان دەست ناکەوێت.
- لەپێناو ئەو عیشقە دا بمرن ، گەر لەو عیشقە دا بمرن تەواوی ڕوحتان قبوڵ کردووە .
- بمرن ، بمرن لەو وڕێنەیەی نەفس جیاببنەوە ، ئەم دەروونە وەکو کۆتە ، ئێوەش وەکو دیل وانە .
- بمرن بمرن ، لەم هەورەیە سەربکەون ، گەر بە سەر ئەو هەورەدا سەر کەوتن هەموووتان دەبنە مانگی یەك شەوەی درەوشاوە .
- ئەی دڵ لەم ماڵە ڕابکە لە نامۆیەو گیراوە ، بەرەو باخچەو هەیوان ، کە ئاسمان خاکی ئەوە .
- بمرن ، لەو مردنە ترس داتان نەپۆشێ ، ئێوە لەو خاکە بەرزترن ، دەست بەسەر ئاسمانەکاندا بگرن.
- بمرن ، بمرن ، لەبەردەم پادشای جواندا ، گەر لە پێناو پادشای جواندا بمرن هەموووتان دەبنە پادشایەکی ناودار.[٤٠٨].

بێگومان مرۆڤ بەبوونی عەقڵی و ڕوحی خۆی بەهای خۆی دەناسێ ، گەر نا لە ئامرازێکی ڕوت زیاتر هیچی تر نییە . (دیکارت) لایەنی ڕوحی و بیرکردنەوەی کردە بەڵگە لەسەر بوونی خۆی وکردگار وتی : (من هەم ؟ من بیر دەکەمەوە ، کەواتە من هەم) بێگومان مرۆڤ بەبێ ڕوح و هزر هیچ شتێ نییە ، بەبێ بونی ژیانی دوای مەرگ ژیان هیچ واتایەکی نییە ، کەواتە : تەنیا لە بازنەی ئیسلامدا مرۆڤ هەست بە بەهای خۆی دەکات و لەمانای ژیان تێ دەگات و ژیان هەردوو دونیاو بەختەوەری هەردوو

---

[٤٠٨] التجليات الروحية في الاسلام / ل: ٥٩٦ / د.جوزيثى سكاتون / احمد حسن انور.

دونیا دەتوانێ بەدەست بێنێت و ، بەژیانی جاریدانی مەلەکوتی شاد ببێت ، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ ﴾ الانشقاق: ٦ .

مرۆڤ تەنها لە پەیامی ئیسلامیدا وەڵامی راستی پرسیارەکانی خۆی دەدۆزێتەوە ، کە نەخشەی سوڕی ژیانی ئەویان هەلگرتووە : لەکوێ هاتووە ؟ بۆ کوێ دەچێت ؟ فەلسەفەو ئامانجی بونی ئەو لەسەر زەوی چییە ؟ بێگومان بەلگە قورئانیەکان دەربارەی سرووش و پێغەمبەرایەتی و ژیانی پاش مەرگ (المعاد) ئەوەندە ڕۆشنن ، کە هەمووو چین و توێژەکان و ئاستەکان لەفەیلەسوفان و زانایان و سیاسی یەکان و یاسازانان ... هتد ، دەتوانن سوودیان لێ وەربگرن .

ئیسلام دەربارەی بوونەوەر ژیان و هەردو دیوی گەردوون تەنیا هەستی نەکردووە بە پێوەر بۆ زانینەکان ، بەلکو زانست و فەلسەفەو عیرفان و میتافیزیکو سروش هەموویان ئامرازێکن بۆ پەی پێ بردنی گەردوونی بینراو و نەبینراو ، هەرچی دونیای نەبینراوە ناتوانرێ لە بازنەی زانستی ماددی دابخزێتە ژێر تاقی کردنەوەوە ، لێرەدا (هزرو هەست) و (هەست و نەست) بەشداری دەکەن لەو بازنە زانستی یەدا ، قورئان رەخنە لە بنەمای بیرکردنەوەو فەلسەفەی ماتریالیستی دەگرێ ، پەرچی ئەوانە دەداتەوە کە بڕوایان وایە دەبێ خودا ببینرێ ، ئەگەر وجودێکی زاتی هەبوایە دەبینـــــرا : ﴿ وَإِذۡ قُلۡتُمۡ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهۡرَةٗ ﴾ البقـــرة: ٥٥ ، جولەکەکان وتیان بە موسا (علیه السلام) تا خوا بە ئاشکرا نەبینین بڕوای پێ ناکەین ، لەسەر ئەم بنەمایە بۆ مارکسی جولەکە تیۆری ماتریالستی خۆی داڕشت و وتی : هەست پێوەری (زانین) و پەی پێ بردنە ، ئەوەی هەستەکان پەی پێ نەبەن و جۆرێکی نییە و بەشێکە لە ئەفسانەکان.

خـوای گـەورە فەرموویـەتی :﴿ لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَٰرَ ﴾ الأنعام: ١٠٣ ، واتە : چاوەکان خوا نابینن ئەو چاوەکان دەبینێ و پەیان پێ دەبات ، بەلام

لەسایەی زانستی ئەزمونی ڕوحی نوێ دا لە تاقیگەدا سەلمێنرا کە گەردوون و مرۆڤ دیوی دەرەکی و دیوی ناوەوەی هەیە ، ماددەو لەش لە هەر ئاستێ دابن ناتوانن خۆیان بناسن ، ، پەیکەری بەردێك و لەشی ماددی مرۆڤ هیچ کام خۆیان ناناسن ، بەڵام بەچاوی خۆمان دەبینین مرۆڤ و گیانداران سەیری دەوروبەری دەکات و دەزانێ ئەو لە کوێیە و چی لە دەوری دا ڕوودەدات ، کەواتە : شتێ لە مرۆڤ و ئاژەڵاندا هەیە لە سەرووی ماددەوەیەو لەجیهانی ئەوان جیایەو دوای مردن دەمێنێتەوە .

مرۆڤ لە سروشتدا ئامادەیی کەماڵی تێدایە ، دەیەوێ بگاتە (حەقیقەتی ڕەها) و لەناوی دا فەنا ببێ و هەڵوەشێ و بگاتە دوندی کەسایەتی کامڵ و سەرکەوتوو ، هەست کردن و شەوقی بەو ژیانە نەمرییە لەناخی هەموو کەسێکدایە ڕوێنراوەو ڕەگ و ریشەی سروشتی دا کوتاوە ، ئەمەش مانای بونی ژیانی مانەوەو نەمری دەگەیێنێ کە بڕانەوەو کۆتایی لەدواوە نییە .

گەر سەیرێکی فەلسەفەی (ئیشراقی سەهرەوەردی) بکەی دەبینی دەری خستووە هەموو تەنێك پێویستی بەنوری ڕەها هەیە ، کە بە هەستەکان پەییان پێ نابردرێ .

گەر نووسراوەکانی (صدر المتألهين) دەخوێنییەوە دەری دەخات زانست خودی خۆی ئەو بوونەوەرەیە ڕوتە لە ماددەو ، هەر زانستەك لە مادده داڕنابێ مل بۆ یاساکانی کەچ ناکات .

بێگومان کێشەی دونیای ئیمڕۆ تەنیا کێشەی خاوەنداریێتی و ئابوری و ئازادی نییە ، بەڵکو کێشەی دونیای ئیمڕۆ لە (قەیرانی ئیمان) دا چەق دەبەستێت ، واتە قەیرانی بڕوا بوون بە خوداو سروش ، سیستەمی شیوعەتی یەتی روخاند و خەریکە دونیای خۆرئاواش بەرەو هەرەس هێنان و ڕێگایەکی داخراوی دەبات .

قورئانی پیرۆز فەرموویەتی : ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا ﴾ طه: ١٢٤ ، واتە : کێ پشت لە یادو پەیامی من بکات ژیانەکی دژواری دەبێت ، بەڵام دوای

ئەوەی مرۆڤ بەهۆی قەیرانی ئیمان تووشی کێشەکان دەبێ و باجی تاوانەکانی دەدات بەناچاری بەرەو بڕوابوون بەخوا دەگەڕێتەوە .

(د.چارلس ستاینمتز) کە یەکێکە لە گەورەترین زانایانی جیهان ، کاتێ لێیان پرسی : کام لێکۆڵینەوە لە داهاتوودا گەورەترین پێشکەوتن بەدەست دێنێ؟ وتی : (گەورەترین دۆزینەوە لە ڕوانگەی ڕوحی یەوە دەبێ ، ئەو ڕۆژە دێ خەڵکی تێ یدا فێر دەبن ، گەشتە ماددیەکان خۆشی یەك ناهێنن ، سوودی یان ئەوەندە نییە پیاوانی و ژنان بەهێز بکات و توانای داهێنانیان پێ ببەخشێ ، ئەو کاتە زانایانی دونیا کارگەکانیان بەرەو لێکۆڵینەوە لە خوداو نوێژ دەگۆڕن ، کاتێ ئەو ڕۆژە هات خەڵکی جیهان وەچەیەکی زۆر پێشکەوتوتر دەبینن لەو پێشکەوتنانەی چوار وەچەکانی ڕابردوو نەیان بینیوە[٤٠٩] .

(گریسی موریسون) سەرۆکی ئەکادیمی پێشوی زانستی لەنیویۆرك دەنووسێ : (بێگومان ئێمە لە جیهانەکی فراوانی شاراوە نزیك دەبینەوە ، کاتێ دەزانین تەواوی مادده لە ڕووی زانستی یەوە تەنیا رواڵەتێکی یەك بوونی جیهانی یە ، کە لە جەوهەردا کارەبایی یە ، بەلام گومانی تێدا نییە ڕێکەوت دەستی لەپێك هێنانی گەردووندا نییە ، چونکە ئەم جیهانە مەزنە گەردن کەچی یاسایێکە.

پێ هەڵاچوونی مرۆیی ئاژەڵی تا ئاستی گیاندارێکی بیرکەرەوەو هەست کەر بە بونی خۆی ، هەنگاوێکی مەزنترە لەوەی لە ڕێگای پەرسەندنی ماددی و بەبێ مەبەستێکی داهێنان هاتبێتە ئاراوە .

گەر واقیعی یەت و مەبەست قبوڵ بکەی ، مرۆڤ بەو نیازدی تەنیا ئامرازێکە ، بەلام چی ئەم ئامرازە هەڵدەسوڕێنی ؟ چونکە بەبێ هەڵسوڕان سوودی نابێ ، زانست هۆی ئەوە ناگەڕێ کێ هەڵی دەسوڕێنێ و پێشی وانییە ماددی بێت ، لە پێشکەوتندا گەیشتووینە ئاستێ دڵنیامان بکات خوداوەند بڵێسەیەك لە (ڕووناکی و نور) ی خۆی

[٤٠٩] الله وعلم الحديث / د.عبدالرزاق نوفل/ ١٩.

بەمرۆڤ داوە ، هێشتاش مرۆڤ لە قۆناغی منداڵی دایە لەڕوی سروشتەوە ، دەستی کردووە بەوە هەست بە بوونی خۆی بکات کە گیان (ڕوح)ە ، ئەو پەیتا پەیتا هەڵدەچێ تا ئەو بەخشیشە بناسێ و بەهۆی غەریزەکەی هەست بکات ئەو (ئەمر)ە[٤١٠].

قورئان لەدەیان ئایەتدا پێشبینی پێشکەوتنی ماددی و ڕوحی دەکات لەزەوی دا ، کاتێ حوکمی ئیسلام دەسەلاتی جیهانی بەدەستەوە گرتووە : ﴿ وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِنْ بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ ﴿١٠٥﴾ ﴾ الأنبياء: ١٠٥ ، واتە : لە زەبوردا نوسیومانە دوای تەوڕات زەوی بەندە ئەولیاکانم بەمیراتی دەگرن.

لە فەرموودەدا هاتووە : (اذا اقترب الزمان لم يكد رؤيا المؤمن يكذب) رواه مسلم ، واتە : (گەر ئاخر زەمان نزیك بۆوە دوور نیە خەونی مرۆڤی بڕوادار هەموویان ڕاست بن).

بەم شێوەیە دەبینین بڕوابوون بەخواو پێغەمبەرایەتی و ڕۆژی دوایی ، سێ کوچکەی سەرەکی بڕوای موسڵمانن ، بڕوا بوون بە خودا چاوگی سەرەکییە، گەردوون سەرچاوەی لێ گرتووە ، بەدیوی دیارو نادیاریەوە ، بڕوابوون بەرۆژی دوایی ۆ دیوی نادیاری گەردوون ئەو چارەنووسەیە دیاری دەکات مرۆڤ لێ ی دەگیرسێتەوەو کاروانی گەشتەکەی تێدا دەوەستێت ، پێغەمبەرایەتی نەخشەی سووری ژیانە ، تێ ی دەگەیەنێ لەکوێ هاتووە ؟ بۆ کوێ دەچێ ؟ ئامانجی هەبوونی چیە ؟ کاتێ مرۆڤ بێ بەش بوو لەم زانیارییانە ، ژیانی ئەو بێ هودەو ئامانج دەمێنێتەوە .

کاتێ مرۆڤ شکۆی ڕوحی و هەڵچوونی مەعنەوی لە دەستدا ، تەنیا وەکو ئامرازێکی ڕوت سەیر دەکرێ ، ئەمەش دابەزینەکی ڕوحی و مەعنەوییە کەسایەتی مرۆڤ تەفرو تونا دەکات ، هەمووو بەختەوەرییەکانی دەکوژێت .

---

[٤١٠] العلم يدعو للايمان / كريسي موريسون / ل: ١٩٠.

قورئـان سـەرەنجمان ڕادەکێشـێ لـەبوونی گـەردوونی دیـارو نادیـار مەبەسـتی بـەرزی بەپشـتەوەیە ، بـێ هـودەیی لـە پشـت دروسـت کردنـی گـەردوون و ژیانـەوە ، لەگـەڵ کەماڵی پیرۆزی کردگارو کارزانی باڵای دا پێچەوانەوە دێتـەوە ، لەوانـەش مـرۆڤ ، کـە هەرچی ئاسمانەکان و زەوییە بۆ ئەوی ڕام کردووە و کردویە بەسەرداری هەسـارەکەی ناچێتەوە عەقڵـەوەو لۆژیـك قبـوڵی ناکـات هـیچ مەبەسـتێکی بـەدواوە نـەبێت : ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ ﴾ المؤمنـون: ١١٥ – ١١٦ ، واتـە : ئایـا پێتان وایە بـێ هـودە دروسـتمان کـردون و ئێـوە بـۆ لای ئێمـە ناگەڕێنـەوە ، بـا شـکۆو بەرزی بۆ خودا ، پادشای حەق ، جگە لەو خوای تر نییەو خـاوەنی عەرشـی گـەورە و بریقەدار و حورمەتە .

﴿ وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ ﴿٣٨﴾ ﴾ الـدخان: ٣٨ ، واتـە : تەنـە ئاسمانەکان و زەوی ئەوەی لەنێوانیاندایە بێ هودە و مەبەست دروستمان نەکردوون .

بەم شێوەیە بۆمان دەرکەوت ، کە خوای گەورە بۆ حاڵی کردنی ئێمەی مـرۆڤ پـەیامی ئاسمـانی خـۆی نـاردووە ، مـرۆڤ دەتـوانێ بـەهزرو زانسـت و لۆژیـك و ئـەزمون و لێکۆڵینەوە ڕاستی یەکان بدۆزێتەوە ، کە نامەی ئاسمانی بۆ ئێمە یـان ڕوونکردۆتـەوە ، کە پـەیامی خەلافەتـە ، پێویسـتە مـرۆڤ بـە ئەرکـەکانی ئـەو خەلافەتـە هەڵسـتێ ، چونکە بەرپرسیارە لەبەرامبەر خوای شکۆداردا .

(وصلى الله على سيدنا محمد واله الطاهرين)

**دیارترین سەرچاوەکان :-**

(١) قورئانی پیرۆز.
(٢)نهج البلاغة / شرح الشيخ محمد عبدة / المكتبة العصرية .

(٣)عرز الحكم / الاميدي التميمي.
(٤)تفسير ابن كثير / دار الفيحاء / دمشق.
(٥)تفسير الطبري / دار السلام / الرياض.
(٦)التفسير الكبير / للرازي / دار الكتب العلمية / بيروت.
(٧)تفسير الجواهر / طنطاوي جوهري / دار الكتب العلمية / بيروت.
(٨)مفردات الراغب الاصفهاني / تحقيق صفوان عدنان / دارذوي القربي.
(٩)معجم مجمع البحرين للطريحي / مؤسسة الاعلى.
(١٠) كتاب الروح / ابن القيم الجوزية / مؤسسة المختار.
(١١) شرح الصدور / للسيوطي / دار الكتاب العربي.
(١٢) الفتح الباري على صحيح البخاري / العسقلاني.
(١٣) صحيح مسلم بشرح النووي / دار ابن الهيثم.
(١٤) سنن ابن ماجة بشرح السويطي / دار المعرفة.
(١٥) سنن النسائي بشرح السندي / دار المعرفة.
(١٦) الجامع الصغير للسيوطي / دار الكتب العلمية / بيروت .
(١٧) مسند احمد بشرح الساعاتي الفتح الرباني / بيت افكا الدولية.
(١٨) مستدرك الحاكم / دار الكتاب العربي.
(١٩) البدور السافرة في الامورا الاخرة / للعلامة السيوطي / مؤسسة الكتب الثقافية .
(٢٠) شرح المقاصد / سعدالدين التفتازانى (دار الكتب العلمية/لبنان).
(٢١) المطالب العالية / لعلامة الرازي / دار الكتب العلمية .
(٢٢) تهافت التهافت / ابن رشد / المكتبة العصرية.
(٢٣) الفصل / ابن حزم الظاهري / دار ابن الهيثم.
(٢٤) الحاوى للفتاوى / السيوطى / دار الكتاب العربي .
(٢٥) الفرق بين الفرق / منصور البغداوي / دار الطلائع .
(٢٦) الدارة الاخرة / محمد متولي الشعراوى / مكتبة التراث الاسلامى .
(٢٧) موسوعة الفلسفة / د.عبدالرحمن البدوي / ذوي القربى .
(٢٨) مقدمة ابن خلدون / مكتبة الفرات.
(٢٩) حادي الارواح / ابن القيم الجوزية ، دار الكتب العلمية .
(٣٠) شرح العقيدة الطحاوية ابن العز / الكتب الاسلامى.
(٣١) شرح العقيدة الطحاوية ، السقاف / دار الامام الرواس.
(٣٢) دار الاخرة / محمود المصري / دار التقوى.

(٣٣) حجـة الله علـى الالعـالمين / الشـيخ يوسـف النبهـاني / دار الكتـب العلمية .
(٣٤) ضحايا الشيطان / يوسف الحاج احمد / دار ابن حجر.
(٣٥) اهوال القبور / الحافظ ابي الفرج / المكتبة العصرية.
(٣٦) العقائد الاسلامية / السيد سابق / دار الكتاب العربي.
(٣٧) دائـرة المعـارف القـرن العشـرين / فريـد وجـدى / دار المعرفـة / بيروت.
(٣٨) شفاء السقام / شيخ الاسلام السكي / دار الكتب العلمية.
(٣٩) حقيقة العالم الموت / المجلسي / منشورات ذوي القربى.
(٤٠) اصول العقائد / السيد موسوي اللاري / ايران.
(٤١) الجامع الصغير / السيوطي / دار الكتب العلمية.
(٤٢) الدر المنثور / للسويطي / دار التراث العربي
(٤٣) الفتوحات المكية / ابن عربي / دار الصادر.
(٤٤) رسائل ابن عربي / دار الكتب العلمية.
(٤٥) مجموعة الرسائل الغزالي / ابراهيم امين احمد / المكتبة التوفيقية .
(٤٦) الرسالة القشيرية / دار الكتاب العربي.
(٤٧) التعرف لمذهب اهل التصوف / ابوبكر الكلاباذي / مكتبة الكليات الازهرية.
(٤٨) لطائف الاعلام في اشارات اهل الالهام / الشيخ عبدالرزاق القاشانى / دار الكتب العلمية.
(٤٩) التصوف / د. ابو العلاء عفيفى / دار الشعب / بيروت.
(٥٠) التعريفات الجرجاني / مؤسسة التأريخ العربى.
(٥١) حقائق عن تصوف / عبدالقادر عيسى / المقدام النشر والطباعة .
(٥٢) التصوف الاسلامي /تورانديه / منشورات الجمل .
(٥٣) الفـرق الصـوفية فـي الاسـلام / سبنسـر تـر منجهـام / دار نهضـة العلمية.
(٥٤) ما هو التصوف / الشيخ امين النقشبندي / ت: محمد شريف احمد.
(٥٥) السر الحق الامتناني / شيخ الاسلام محمد بن عبدالحي الكتاني / دار الكتب العلمية.
(٥٦) ابن عربي حياته ومذهبه / اسين بلاثيوس / ت: عبدالرحمن البدوي / دار القلم / بيروت .
(٥٧) الانسان الكامل / د. عبدالرحمن البدوي.

(٥٨) الفتح الرباني والفيض الرحمانى / السيد القطب ، عبدالقادر الكيلاني / مكتبة العصرية / بيروت .
(٥٩) التجليات حسن انور / الهيئة العصرية / ٢٠٠٨.
(٦٠) الانسان ذلك الكائن الفريد / جون لويس / بغداد.
(٦١) الانسان ذلك المجهول / اليكس كارل / ت: سفقيق اسعد فريد / مكتبة المعارف / بيروت.
(٦٢) الانسان وقواه الخفية / كولن ولسن / دار التربية / بغداد .
(٦٣) الانسان روح لا جسد / د.رؤف عبيد.
(٦٤) كتاب الارواح / الشيخ طنطاوى الجوهري / دار الكتب العلمية .
(٦٥) مبادئ الفلسفة / اس رابوبرت / ت: احمد رمو / دار علاء الدين.
(٦٦) جذو المصادفة / اثر كويستلر / ت: د.فوزية ناجي / بغداد.
(٦٧) القوى الخفية / انيس منصور / دار الرافدين للنشر.
(٦٨) تأملات لادراك الروح / المعلم تشوا كوك سوي / دار الخيال .
(٦٩) العالم الارواح والاشباح / خليل حنا تادرس / الالعالمية للكتب والنشر.
(٧٠) التنويم المغناتيسى / محمود سعيد / دار التربية .
(٧١) ما بعد الحياة / كولن ولسن / ت: د.فاضل سعدوني / بغداد.
(٧٢) غرباء وخارقون ودخلاء / فريد مجيد / بغداد / ١٩٩٠.
(٧٣) انشطار الذهن / بيتر ماكلير / ت حلمي نجم / دار الرشيد / بغداد .
(٧٤) الابراج / حميد الازري / مكتبة المدبولي / القاهرة .
(٧٥) شمس المعارف الكبرى / الشيخ احمد بن علي البوني / مؤسسة النور للمطبوعات .
(٧٦) ابو معشر الفلكي / دار المحجة البيضاء.
(٧٧) اينشتين والنظرية النسبية / د.محمد عبدالرحمن مرحبا / بغداد / ١٩٨٢.
(٧٨) الاحلام بين العلم والعقيدة / د.على الوردي / دار دجلة القروون بيروت.
(٧٩) خوارق اللاشعور / د.على الوردي / دار الدجلة القروون / بيروت.
(٨٠) دراسات في العالم الروح / السفير عزت على البحيري / مكتبة الناخذة.
(٨١) كتاب الروح / الن كاردك / ت. جورج حداد / التكوين دمشق.
(٨٢) على حافة العالم الاثيري / ج.ارثر فندلاي / ت:فهمي ابو الخير.

(٨٣) عصر الخوارق / ج.اج.رايز / ت . ماجدة صبيح / بغداد.
(٨٤) الباراسايكولوجي / ظواهر وتفسيرات / سامي احمد الموصلي/ دار الحرية.
(٨٥) الاسئلة الخالدة / سامي احمد الموصلي / المكتبة الوطنية بغداد / ١٩٨٩.
(٨٦) سل الحسام الهندي / محمد امين بن عمر بن عبدالعزيز / مطبعة اراس.
(٨٧) الفراسة / العلامة فخرالدين الرازي / مكتبة القران.
(٨٨) قراءة الكف / د.احسان حقى / العرفان للطباعة والنشر.
(٨٩) الكف / جان ريناك / ت: د.علاءالدين الصباحي / المكتبة الالعالمية / بغداد.
(٩٠) نداء الروح / د.فاضل صالح السامراي / مكتبة القدس / بغداد.
(٩١) التوقع السياسى / زيد محمود على / مطبعة المنارة / اربيل.
(٩٢) باب النوم وباب الاحلام / د.على كمال / بغداد / ١٩٩٠.
(٩٣) فلسفة القروون السطي / د.عبدالرحمن البدوي / ط١٩٧٩/٣/ دار القلم /بيروت.
(٩٤) الالعالم في مطالع القرن (٢١) / العميد الدكتور / سامي ريحانا/نوبلس.
(٩٥) الشفاء بالقرآن الكريم / د.محمد الهادي / نوبلس.
(٩٦) القلق / مصطفى عبدالسلام الهيتي / مكتبة النهضة.
(٩٧) الطب النفسي للجميع / د.عبدالمناف الحسين الجادري/ بغداد / ١٩٩٠.
(٩٨) المهدي المنتظر / محمود الغرباوي / دار الكتاب العربي / دمشق.
(٩٩) الموسوعة الطبية الفقهية / د.احمد محمد كنعان / دار النفائس.
(١٠٠) السيناريو القادم لاحداث اخر الزمان / منصور عبدالحكيم / دار الكتاب العربي.
(١٠١) الاسلام يتحدي / وحيدالدين خان / دار البحوث العلمية .
(١٠٢) العلم يدعوا للايمان كريسمى موريسون / ت:الاستاذ محمود صالح الفلكي / القاهرة / نيويؤرك .
(١٠٣) الله يتجلى في عصر العلم / جون كلوفرمونسا / القاهرة.
(١٠٤) بدبدها روحي وروانى / محمد مهدي عليخواه / جمال الحق.

